# کوردستان

# و

# بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد


بەپێنوسی

جەلال تاڵەبانی


وەرگێڕانی لەعەرەبیەوە: ح-ا


چاپی یەکەم- بەیروت

١٩٧٠

- ناوی کتێب/ کوردستان و بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد
- ناوی نوسەر/ جەلال تاڵەبانی- بەزمانی عەرەبی
- وەرگێڕانی: ح- ا

تیراژ/١٠٠٠ دانە

- بڵاوکار/کتێبخانەی جەمالی عەلی باپیر
- ساڵی چاپ/
- لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە (١٧٢٦ ) ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە.

زانـای سـۆڤیەتی (ن. مـار) تیۆرەکـەی لەسـەر بنـچینەی نەریتـەکانی گـەلی کـوردو تایبەتمەندیـە کۆمەڵایەتیـەکانی دانـاوە، ئـەو دەڵێـت نەریتـەکانی کـورد هاوشـێوەی نەریتەکانی رەگەزەکانی پێشوون وەك نەریتەکانی هاوسەرگیریی لەگەڵ کچانی مـام بـۆ نمونەو نەریتەکانی گۆرانی ووتن کە لە بین یان گەروەوە دەردەچێت.

سەرەڕای ئەوەی کە زانا (مار) نکوڵی ئەوە ناکات زمانی کوردی ئێستا زمـانێکی ئارییـە، بەڵام ئەو ئەمە بەوە ڕاڤە دەکات کەوا کاریگـەریی هیندۆئێرانیەکانـە لەسـەر کوردەکـان، هەروەها بڕوای وایە کـە زمـانی کـوردی لەجەوهەریـدا زمـانی دانیـشتوانە رەسـەنەکانە و بەزۆرێك لەتایبەتمەندییە رەسەنەکاندا جیادەکرێتەوە.

زانای روسیی (کونیك)[1] بەپشتبەستن بەکۆمەڵە بەڵگەیەکی مێژوویی ئەوەی سـەلماندووە کە پەیوەندییەکی تونـدوتۆڵ هەیـە لـەنێوان کوردەکـان و گـەلانی تـری شارسـتانیدا کـە لەکۆندا لەئاسیای ناوەڕاستدا ژیاون "پەیوەندی لەنێوان زمانی کوردی و زمـانی ئێرانیـدا کردۆتە بەردی گۆشـە لـەبونیادنانی تیۆرەکەیـدا کـە دەڵێـت: کوردەکـان لەبنـچینەیەکی ئارین وەك ئێرانیەکان و گەلانی تری ئاسیای بچووك".

هەریـەك لەبـەرێزان "رینـان" و "دورن " و" لـرش" کەلـە لێکۆڵـەوەرانی مێـژووی گـەلی کوردن لەم ڕایەدا کۆکن لەگەڵیدا".

بەدڵنیایشەوە لۆژیکی زانستی راوبۆچون و گێڕانەوە ئەفسانیەکان فەرامۆش دەکـات کـە هەندێك لەنوسەرە کۆنەکانی عەرەب و فارس باسیان کردووەو بەمدوایەش بەرێز رەشـید فیل دووبارەیکردۆتەوە لەبارەی گێڕانەوەی بنچینەی هەموو گەلی کورد بۆ (کردی کـوڕی عامر) یان (سامی کوڕی نوح) یان بۆ جنۆکەکان یان خێوەکانی سلێمانی دانا !

پێـشموانیە پێویـست بکـات ئـەو سـەلماندن و بەڵگـە مێژووییانـە بهێنینـەوە بـۆ پوچەڵکردنەوەیان چونکە بەئاشکرا دیارە پڕوپـوچ و بـەتاڵن و مـشتومڕکردن لەسـەریان تەنها کات بەفیرۆدانەن بۆیە ئێستا دەچمە سەر باسکردنی کورتەی ڕای خوا لێخۆش بوو ئەمین زەکی بەگ مێژوونوسی کـوردی و دانـەری کتێبـی– مێـژووی کـوردو کوردسـتان–

---

[1] – سەرچاوەی پێشوو لا ١٩.

هەر لەکۆنترین چاخەکانەوە هەتا ئێستا- کە ساڵی ١٩٣١ بەزمانی کوردی و ساڵی ١٩٣٦ بەزمانی عەرەبی لەقاهیرە چاپکراوە.

ئەم کتێبە بەڕاستی بەیەکەم لێکۆڵینەوەی زانستی دادەنرێت کە مێژوونوسێکی کوردی هاوچەرخ نوسیبێتی لەبارەی رەسەن و بنچینەی گەلی کوردەوە کە مێژوونوسی روسی "باسیل نیکیتین" لەبارەیەوە ووتویەتی مێژوویەکی درێژو ئاڵۆزە)[٢].

## راوبۆچوونی ئەمین زەکی

بەپێچەوانەی راوبۆچوونی هەندێك لەمێژوونوسانەوە هەوڵدەدەن لەتوێژینەوەکانیاندا بنچینەی هەر نەتەوەیەك بگێڕنەوە بۆ هۆزێك یان رەگەزێکی دیاریکراو هەروەك چۆن لەکاتی باسکردنی رەچەڵەکی هەر تاکێکدا ئەمە رووددەدات، بێئاگا لەوەی یان خۆیان بێ ئاگا دەکەن لەڕاستیەك کە نەتەوە جیاوازەکان بەشێوەیەکی ئاسایی لەتوانەوەی هۆزو رەگەزە جۆراوجۆرەکانەوە دروست دەبن لەبۆتەی نەتەوە (بە چەمکە نوێیەکەی) بەهۆی کارلێکە مێژوویی و ئابوریی و کۆمەڵایەتی و ئایینی و رامیاریەکان و بەهۆی کاریگەری رەوش و بارودۆخە جوگرافی و مێژوویەکانەوە دەبێت[٣].

بەپێچەوانەی راوبۆچونی ئەوانەوە تیۆرەکەی ئەمین زەکی بەگ چڕدەبێتەوە لەسەر خاکی کوردستان بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستیە کە توێژینەوە لەنیشتمانی ئەو نەتەوەو کۆمەڵانەی لەسەری ژیاون پێداویستیەکی بەڵگەهەڵنەگرە بۆ زانینی بنچینەی گەلەکەو پاشانیش بۆ دروستبوونی نەتەوە بەچەمکە زانستیەکەی ئەو دەڵێت[٤]:-

" کوردستان نیشتمانی یەکەمی وەچەی دووەمی مرۆڤایەتیە (پاش تۆفانەکە) و شوێنی بڵاوبونەوەیەتی بۆ شوێنەکانی تر بەپێی روداوە مێژوییەکان و لەسەرەتای مێژووەوە گەلانی جیاکانی زاگرۆسیان تێدا ژیاوە کە پێکهاتوون لە گەلەکانی (لۆلۆ)و (گۆتی) و (خالدی- کالدی) و (سۆبارو- هۆری) گەلی عیلامیش لەوپەڕی خۆرهەڵاتی باشوریەوە

---

[٢] - باسیل نیکیتین لەکتێبی کوردەکاندا لا ١٠ چاپە یەکەمە عەرەبیەکەی.

[٣] - سەیری کتێبی مامۆستا عبدالفتاح ابراهیم بکە لە (زانستی کۆمەڵناسیدا) بابەتی میللەتان و نەتەوەکان.

[٤] - مێژووی کوردو کوردستان لا ٦٣-٦٤ یەکەم چاپە عەرەبیەکەی.

نیشتەجێ بوون بەرەچاوکردنی هەندێك لێ تێکەڵبوون و هاوشێوەیی زمانەوانی هەندێك لەخۆرهەڵاتناسەکان بۆ ئەوە چوون کە ئەم گەلانە لەزنجیرەو وەچەی قەوقازیەکانن.
ئەم گەلانە بێجگە لە گەلی عیلامی بریتین لەبنچینەی زۆر کۆنی گەلی کورد".
ئەمین زەکی زاناو شارەزا بەردەوام دەبێت و دەڵێت:-

" وا دیارە کە لێشاوی کۆچبەرەکانی رەگەزی ئاری (هیندۆ-ئەوروپی) بۆ چیاکانی زاگرۆس لەلایەك و بۆ خۆرهەڵاتی و خۆرئاوای لەلایەکی ترەوە- وا گومان دەبرێت ئەم کۆچانە لەسەدەی دەیەم و نۆیەمی پێش زاینەوە دەستی پێکردووە[٥] پاشماوەی دانیشتوانە رەسەنەکانی ناوچەی شاخەکانی زاگرۆس و وڵاتی کوردستانیان خستبێتە ژێر دەسەڵاتی ئەو کۆچەرە نوێیانەوەو هەموویانی کردبێت بەئاری و گەلی میدیش بەهێزترین و گەورەترین گەل بوون لەنێوان ئەو کۆمەڵ و گەلە کۆچەرانەدا، کەلەسەرەتاوە لەخۆرهەڵاتی دەریاچەی ئورمیە نیشتەجێ بوون و پاش ئەمانیش گەلە ئاریەکانی تریش کۆچیان کردووە بۆ لایان وە ، پارس، مانای، بارسیوی، بارث، کاردشۆس".[٦]



[٥] - کرزون- لەپێشەکی گەشتەکەیدا بۆ ئێران دەڵێت. ئەگەری زۆری ئەوە هەیە ئەم کۆچە بیست سەدە پێش زایین ڕویدابێت. بڕوانە کوردو کوردستانی ئەمین زەکی بەگ لا ٦٤ چاپە عەرەبیە یەکەمەکەی.
[٦] -سەرچاوەی پێشوو.

## ڕای نوسەر

لای من گەلی کوردی ئێستا ریشەو بنەچەی خۆیی پێش هەزاران ساڵ بەڵکو دەیان هەزار ساڵ لەنیشتمانەکەی کوردستاندا دۆزراوەتەوە. گەڕان و پشکنینە شوێنەواریەکانی ئەم دواییە لەناوچەکانی ئەشکەوتی (شانەدەر) و دوکان (چەمی رێزان – زەرزی) و ناوچەکانی تر ئەوەیان سەلماندووە کە نیشتمانی گەلی کورد (کوردستان) هەر لە دەیان هەزار ساڵەوە نیشتەجێکراو و ئاوەدان بووە واتە لەکوردستان کۆمەڵی مرۆیی نیشتەجێ هەبووە پێش هاتنی ئەو کۆچەرانەی کە زانا ئەمین زەکی بەگ باسی کردوون بەهەزاران ساڵ. گومانی تێدا نیە ئەو گەل و کۆمەڵە مرۆییانەی دواتر هاتوونەتە کوردستان ئاسمان هەڵینەلوشیون و زەوی پەنهانی نەکردوون، بەڵکو تێکەڵبوون و لەگەڵ دانیشتوانە رەسەنەکاندا بەهۆی کاریگەری فاکتەرە ئابوریی و رامیاری و ئایینی و سەربازییەکان و هی ترەوە ئاوێزان بەیەك بوون.

بەتێپەڕبوونی کاتیش، هۆزو گەلە هاتووەکان لەگەڵ نیشتەجێکاندا لەبۆتەی نەتەوە ئێستای کوردیدا تواونەتەوەو نەتەوەی کوردیان پێکهێناوە وێڕای ئەوەی لەیەك بنەچە دیاریکراو نەبوون بەڵکو ( ئاوێتەیەکی زۆر تێکەڵ بەیەك بوون و هەندێکیان لەهەندێکی تریان جیادەکرێنەوە لەنێوان هۆزێك و هۆزێکی تردا) وەك ئەوەی لێکۆڵینەوەکانی دکتۆر (هامی) لەبارەی کوردەکانەوە سەلماندویەتی. بۆیە تیۆری (خوێنی پوخت– کۆنپەرستیانەی پڕوپوچ کە یەکێکیان ویستبوی بیڕفێنێتە ناو مێژووی کوردییەوە تیۆرێکی پوچ و بەتاڵە لێرەو لەهەموو مێژووی کوردیشدا هەروایە.

بەدڵنیایەوە هەستان بە پشکنین و لێکۆڵینەوەی زانستی بۆ شوێنەوارە مێژووییەکان کە لەکوردستاندا هەن ئەو ئاڵۆزیە لادەبات کە ریشەو بنچینەی گەلی کوردی لەئامێز گرتووەو هەندێك لەقۆناغەکانی مێژووە دووردرێژەکەشی روونده‌کاتەوە. بەتایبەتی کە چەندین ناوچە هەیە لەکوردستاندا خاوەن شوێنەوارێکی مێژوویی گرنگن و پشکنین و لێکۆڵینەوەی پێویستیان بۆ نەکراوەو دەستی زانایانی شوێنەوارناسیان پێنەگەیشتووە. هەروەك مامۆستا ب . نیکیتین لە لاپەڕە ١٣٩ کتێبەکەیدا (کوردەکان/ چاپە عەرەبیە یەکەمەکەی) دەڵێت: (پانتاییەکی فراوان هەیە بۆ گەڕیدەو زانایانی شوێنەوارناس کە

هێشتا زانست باسی نەکردون. هەروەها دکسۆنیش سەردانی ئەو ناوچانەی ولآتی کردووەو ووتوویەتی ئەو ولآتانەی کە وێرانکاری و قەلآی شوێنەواریان تێدایە وەك ئەوانەی کوردستان پێکدێنن زۆر کەمن، ئەم ولآتە بەهەشت یان باخچەی زانایانی شوێنەوارناسە !)

بەلآم ئەوەی کە گومانی تێدا نیە ئەوەیە نەتەوەی کوردیی بەشێوەیەکی مێژوویی لەسەر خاکەکەی کە کوردستانە دروستبووەو هەزاران ساڵە تێیدا نیشتەجێیە، گومانی تێدا نیە نەتەوەی کورد ڕاستیەکی واقیعی و ئاشکرایە نکوڵیکردنی یان هەوڵەکان بۆ لەناوبردنی شوێنەوارو روخسارە مێژوییەکانی یان بەعەرەبکردن و بەفارسکردن یان بەتورککردنی هیچ سودێکیان نابێت.

بەڵکو بەپێچەوانەوە نەتەوە- وەك روداوێکی مێژوویی بابەتیانە- هەر دەبێت بەقۆناغەکانی پێگەیشتن و کامڵبووندا بڕوات لەرێگەی رزگاربوون لە داگیرکاری بیانی و داگیرکەر و پاشانیش ئیستغلالکردنی ناوخۆیی وەك چۆن بەقۆناغەکانی پەیدابوون و گەشەکردندا ڕۆیشتووە.

ئەوە خواست و ئیرادەی حەتمیی مێژووە کە هەردەبێت یاساکانی بەسەر نەتەوەی کوردیشدا جێبەجێ بکرێن.

## کوردستان یان وڵاتی کوردان

### ماناکەی و دیاریکردنی

کوردستان واتە وڵاتی کورد، ئەم گوتەیە پێکدێت لەدوو ووشە ئەوانیش (کورد)و (ستان) کە مانای وڵات یان شوێن دەگەیەنێت، بۆ نمونە ئەفغانستان یان بلوجستان مانای وڵاتی ئەفغان، و وڵاتی بەلوج دەگەیەنن.

ناوی کوردستانیش چەندین سەدەیە نراوە لە نیشتمانی گەلی کورد بۆیە کوردستان ناو نیە یان هێمای بزوتنەوەیەکی دیاریکراو نیە وەك پاکستان بۆ نمونە، بەڵکو کوردستان ناوێکی جوگرافی و مێژوییە بۆ وڵاتی کوردان[٧].

## ڕاوبۆچوونی ( شاکر خصباك )

دکتۆر شاکر خصباك کە عەرەبیەکی عێراقی پسپۆڕە لەجوگرافیای کۆمەڵایەتی کوردستانی عێراقدا لەبارەی کوردستانەوە دەڵێت:[٨] " ناوەندە جوگرافیەکەی ڕووبەرووی چەندین ڕاڤەکردن بۆتەوە لەگەڵ ئەوەی کە گوزارشتی ڕەگەزپەرستی بۆ ووشەی کوردستان بەشێوەیەکی گشتی واتە ئەو وڵات یان شوێنانەی کەوا کورد تێیاندا نیشتەجێیە، بەڵام سنوری جوگرافی بۆ ئەم گوزارشتە هەمیشە پێکنەهاتووە، ڕەنگیشە کۆنترین ئەو سەرچاوانەی کە دەستەواژە یان گوزارشی (کوردستان)ی تێدا هاتبێت بریتیە لە سەرچاوە یۆنانیەکان.. نوسەرە یۆنانی و ڕۆمانیەکان کوردستانیان بەناوی –

---

[٧] – ئەمە دەڵێم چونکە هەندێك لە ڕەگەزپەرستە دەمارگیرەکان پێیان وایە کوردستان هێمایەکی دروستکراوە ! ! بۆ بزوتنەوەیەکی جیاخواز بەڵکو مەسەلەکە گەشتۆتە ئەوەی کە هەندێکیان پێیان وایە تەنها هێنانی ناوی کوردستان جوداخوازیی و کوفرە ! ! لەڕاستیشدا ئەوە شۆڤێنیزمی کوێرانەیە کە ئەم جۆرە تێڕوانینانەی هەیە.

وەگەرنا کوردستان ووشەیەکە هەر لەسەدان ساڵ لەمەوپێشەوە بەکاردەهێنرێت بۆ ئاماژەدان بەنیشتمانی گەلی کورد، ئەوەش هەتا پێش دەرکەوتنی بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی کوردی کە داوای ئەوە بکات مافە نەتەوایەتیەکان بدرێنە گەلی کورد.

[٨] –لا ١٣–١٤ لەکتێبی دکتۆر شاکر خصباك – الکرد و المسالة الکردیة – چاپە عەرەبیە یەکەمینەکە– چاپخانەی (الرابطة) بەغداد.

کوردونس–سان کوردیای– سریانیەکانیش کاردۆو مەبەستیش لەم ناوانە ئەو شوێنانەیە کە کاردۆخیەکان تێیدا نیشتەجێ بوون کەدەکەوێتە چیاکانەوە لەنێوان دیاربەکرو نصیبین و زاخۆوە، ئەگەرچی سنورەکەی بەتەواوەتی روون نەبووەو ئەو ناوچەیەش هەموو ئەو شوێنانەی نەگرتۆتەوە کە بەواقیعی کورد تێیاندا نیشتەجێیە.. بەڵام نوسەرە عەرەبە کۆنەکان ناوە یۆنانیەکانیان بەکارنەهێناوە لەکاتی قسەکردن لەبارەی وڵاتی کوردانەوە بەڵکو پێیان دەووت– هەرێمی چیاکان – ئەم هەرێمەش ئەو ناوچەیەی دەگرتەوە کە دەکەوێتە باکوری خۆرئاوای ئێران هەتا ئورمیەو لەپێدەشتی عێراقەوە درێژدەبێتەوە هەتا بیابانی گەورەی ئێرانی و ناوچە چیاییەکان دەگرێتەوە لەباشوری خۆرهەڵاتی ئازربایجان لەواقیعدا هەرێمی چیاکان بەسەر ئەو ناوچەیەدا جێبەجێ دەبێت کە نوسەرە یۆنانیەکان ناویان نابوو –میدیا– دواتریش مێژوونوسە عەرەبەکان هەمان ئەم ناوچەیان ناونا عێراقی عەجەمی بۆ ئەوەی لەعێراقی عەرەبی جیابکەنەوە".

هەر لەمبارەیەوە دکتۆر خصباك لە لا ١٤–١٥ دا دەڵێت:– بەڵام ووشەی کوردستان وەك زاراوەیەکی مێژوویی وادیارە بۆ یەکەمجار لەسەدەی دوانزەیەمی زاینیدا بەدیارکەوتووە لەسەردەمی سەلجوقیەکاندا کە سوڵتان سنجار، بەشی خۆرئاوای هەرێمی چیاکانی بەشکردووەو خستویەتە ژێر فەرمانڕەوایی خزمێکی خۆیەوە کە سلێمان پاشایە، ئەم ویلایەتە نوێیە هەموو ئەو زەویانەی دەگرتەوە کەلەنێوان ئازربایجان و لوڕستان – سنە– دیناوار، هەمەدان وکرمانشاندا درێژدەبنەوە.

سەرەڕای ئەو ناوچانەی دەکەونە خۆرئاوای چیاکانی زاگرۆسەوە وەك شارەزور[1] و کۆیسنجقەوە.

---

[1] – شارەزوور زارلوەیەکی کونە بەکارهێنرلوە بۆ ئامـاژەدان بەناوچەکانی لیواکانی سلێمانی –کەرکوك– ئەربیل– و قەزاکانی خانەقین و مەندەلی و شارەبان–بەشێك لێی– هەندێك جاریش هەروەها لیوای موسڵیش. لەسەردەمی عوسمانیەکاندا هەتا لەتۆمارە رەسمیەکاندا بەکارهێنرلوە، هەتا ئێستاش بەرێوەبەرایەتیەکانی تاپۆی عێراقیی لەناو تۆمارەکانیاندا ئەم زاراوەیە بەکاردەهێنن بەو مانایە پێشتر بەکورتی باسمان لێوە کرد. بگەڕێرەوە بۆ– بلدان الخلافة الاسلامية– کە لوسترانج نوسیویەتی لا ١٨ چاپە فارسیەکەی کە مەحمود عرفان وەریگێڕاوە– بەشی شەشەم لاپەڕە ٩٢–و پێشتر لا ١٠٩ و سیانزەیەم لا ٢٠٠.

مێژوونوسە عەرەبەکان دواتر ئەم زاراوە جوگرافیەیان بەکارهێناوە. یەکەم دەرکەوتنیشی لەکتێبی – نزهـة القلـوب–[10]ی مستەوفی قەزوینیە کەلەساڵی ٧٤٠ ك نوسیویەتی. وادیارە ئەم زاراوەیە دواتر گشتێنراوەو هەموو ئیمارەتە دەرەبەگایەتیە کوردییەکانی لەتورکیاو ئێران گرتۆتەوە–.

لەلاپەڕەی ١٦ کتێبەکەیدا کەپێشتر ناومان هێنا دکتۆر خصباك دەڵێت– لەواقیعدا کوردستان زاراوەیەکی جوگرافی و رەگەزییە لەهەمانکاتدا– دکتۆر خصباك لەدرێژەی قسەکانیدا سەبارەت بەسنوری کوردستان پشتیوانی لەڕای مێجەر ئەدمۆنس دەکات کەدواتر باسی دەکەین و دەڵێت:– ئەگەر لوڕمان بە کورد دانا وەك ئەوەی کە زۆرێك لە بەڵگە مێژوویی و زمانەوانیەکان ئەمە دەسەلمێنن ئەوا سنوری کوردستان درێژدەبێتەوە هەتا کەنداوی فارسی بەدرێژایی چیاکانی زاگرۆس[11].

دکتۆر خصباك بەردەوام دەبێت و دەڵێت: کەواتە کوردستان وڵاتێکی خاوەن سنوری سروشتیە و خاوەن دانیشتوانێکە لەرەگەزێکی تایبەت و جیاوازن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە سنورێکی سروشتی هەیە بەڵام سنورێکی سیاسی نێودەوڵەتی نیە–..

---

[10] – نزهة القلوب.. کتێبێکی حمدالله المستوفی لەساڵی ٧٤٠ك نوسراوە و تێدا زۆر ناوی کوردستان هاتووە.

[11] – سەرچاوەی پێشوو لا ٢٠.

# ڕاوبۆچوونی نیکیتین

مێژوونووس ب . نیکیتین لەبارەی بابەتەکەوە دەڵێت[12]:

"– گوتە یان ووشەی کوردستان بەواتای وڵاتی کوردان دێت.. کە ناوچەیەکی فراوانەو سنوری ڕامیاریی نیە. سنجار کە دوایین پادشای سەلجوقیەکانە ئەم ناوەی ناوە لە یەکێك لەناوچەکانی شانشینەکەی ئەوەش لەسەدەی دوانزەیەمی دوای زایندا. ئەم ناوچەیەش چەند ویلایەتێکی لەخۆدەگرت زنجیرە چیاکانی زاگرۆس دەکەوێتە نێوانیانەوە لەخۆرهەڵاتی ئەم زنجیرەیەوە ویلایەتی هەمەدان و دینەوەر و کرمانشان و لەخۆرئاوایەوە هەردوو ویلایەتی شارەزوورو سنجار هەیە. بەڵام پایتەختەکەی ئەوا قەڵای –بهار– دەکەوێتە باکوری خۆرهەڵاتی هەمەدانەوە و ئەم ناوچەیە پێش سەدەی دوانزەیەم پێی دەوترا– چیاکانی جەزیرە– یان دیاربەکر و قەزوینیە[13] لەکتێبەکەیدا – نزهة القلوب– ساڵی ٧٤٠ ك واتە لەسەدەی چواردەیەمی زایینیدا–" نیکیتین دەڵێت[14]:

" لەسەدەی پانزەیەمدا کوردستان زۆربەی بەشەکانی لەدەستداو فارس دەستی گرت بەسەر هەردوو ویلایەتی هەمەدان و لوڕستانداو لەکوردستانی فارسی تەنها ویلایەتی ئەردەڵان مایەوە لەگەڵ سنندجی پایتەختیدا لەکۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەهەمدا عوسمانیەکان ناوی –کوردستان–یان نا لە یەکێك لەویلایەتەکانیان کە لیوای دەرسیم و لیوای موش و لیوای دیاربەکری دەگرتەوە".

لەو چەند دێڕەی پێشەوە ئەوە هەڵدەهێنجرێت کوردستان تەنها نیشتمانی گەلی کوردە سەرەڕای نەبوونی سنورێکی ڕامیاریی نێودەوڵەتی بۆی و سەرەڕای دابەشبوونی لەنێوان وڵاتانی عێراق و ئێران و تورکیاو– بەشێکی کەمیشی دەکەوێتە سوریاوە– و پانتاییەکەی هاتۆتەوە یەك بەهۆی ئەو داگیرکاریە بیانیانەوە بۆ ناوچەکەو هەڵکشان و کۆچکردنی هۆزە عەرەبیەکان بەرەو کوردستان لەعێراق و سوریا، بۆ نمونە شاری موصڵ کە ئێستا مۆرکێکی عەرەبی زاڵی هەیە پێشتر لەسەدەی چوارەمی کۆچیدا

---

[12] – باسیل نیکیتین لا ٢٥ لەکتێبی (الاکراد) چاپی یەکەم بەیروت.

[13] – دانەری کتێبی – نزهة القلوب– ناوی حمدالله المستوفي القزويني.

[14] – ب– نیکیتین لەکتێبی الاکراد لا ٢٥ چاپە عەرەبیە یەکەمەکە.

زۆرینەی هەرە زۆری دانیشتوانەکەی کورد بوون بۆ نمونە، لۆسترانج -لەکتێبەکەیدا- ولآتانی خەلافەتی خۆرهەلاتی- کە سالی ١٩٠٥ لە لەندەن چاپ بووە دەلێت- دانیشتوانی موصلٌ لەسەدەی چوارەمی کۆچیدا بەشێوەیەکی گشتی کورد بوون-.
دەکرێت هەمان شتیش بوترێت لەبارەی شاری تکریتەوە کەهێشتا چەند کۆمەلێکی بە بنچە کورد تێیدا نیشتەجێن بەتایبەتی ئەندامەکانی هۆزی - کیکی- کوردیی [١٥].

## راوبۆچوونی نوسەرانی عەرەب

جوگرافیناسە عەرەبە کۆنەکانیش سنوری عێراقیان بەهێلێك دیاریکردووە کە بە باکوری -ئەنبار-دا دەڕوات لەسەر فورات بۆ تکریتِ لەسەر کەناری دیجلە و ئەم دوو شارەش سەر بەعێراق بوون.
دکتۆر فازل حسێن لە لا ٧٨ی کتێبەکەی کێشەی موصلدا دەلێت: " بۆ ئەم ئامانجەش لیژنەکە- لیژنەی کۆمەلەی گەلان- پێداچونەوەی کرد بەنوسینی مێژونوسەکان و جوگرافیناسە عەرەبە کۆنەکان و ژمارەیەکی گەورە لە نەخشە عەرەبیەکان و سەدان نەخشەی ئەوروپیدا کە لەنێوان سەدەکانی شانزەیەم و بیستەمدا کێشراون هەروەها کتێبە گەورەکانی هەموو سەدەمەکان و سەرچاوە جوگرافیە بەکارهاتووەکان لەقوتابخانە ئامادەییەکانی عەرەبیدا لەمصر، دواجار لیژنەکە گەیشتنە بوونی سێ ناوچەی روون و ئاشکرا: عێراقی عەرەبی، جەزیرە و کوردستان. عێراق لەباکورەوە لەهیت- تکریت تێناپەڕێت یان ناوچەی چیای حەمرین. جەخت لەوە نەکراوەتەوە کە بەشێك لە زەویە جێی ناکۆکیەکان هیچ رۆژێك لەناو عێراقی عەرەبیدا بوویێ .
جەختیشکراوەتەوە لەسەر ئەوەی کە لەهەموو ئەدەبیاتە جوگرافیەکاندا هەر لەرزگارکردنی عەرەبیەوە هەتا مێژووی لێکۆلینەوەی لیژنەکە (١٩٢٥) دانەنراوە و پێناسەنەکراوە و ئەو ناوچانە جێی ناکۆکین رۆژێك لەرۆژان بەشێك بووبن لەعێراق و

---

[١٥] - بروانە کتێبی (بلدان الخلافة الشرقية) نوسەرەکەی Le Strange بەشی دووەم، لا ٢٦ لەچاپە فارسیەکەی.

لەرابردودا ناوی (عێراق) مەئلوف و باو نەبووە لای دانیشتوانی موصڵ وەك ناوێك بۆ وڵاتەكەیان".

هەروەك چۆن شاری كەركوكیش كوردەكان بونیادیان ناوە و ناوچەكە نیشتمانی – گوتیەكان– بووەو پێش هاتنی عەرەب بۆ باشوری عێراق ئەمان لەو ناوچانەدا نیشتەجێ بوون.

مامۆستا فائق سامەڕائی لەكاتی پەنابردنی بۆ قاهیرە لەسەردەمی عبدالكریم قاسمدا توێژینەوەیەكی نوسیوەو تێیدا جەختی لەو ڕاستیە كردۆتەوە كە سنوری كوردستانی باشوریی چیای حەمرینە كە بەدەیان میل دەكەوێتە باشوری كەركوكەوە سامەڕائی لەبارەی سنوری كوردستانەوە نوسیویەتی و دەڵێت[16]: كوردستان بەفراوانترین ماناكەی واتە ئەو وڵاتەی كەوا كوردەكان تێیدا نیشتەجێن وەك كۆمەڵێكی یەكگرتووی هاوچەشن لەخەڵك. ئەم وڵاتەش دابەش دەبێت لەنێوانە عێراق و توركیاو ئێران و لەگەڵ هەندێك درێژبوونەوەدا لەیەكێتی سۆڤیەت و سوریادا لەباكورەوە سنورەكە بەشێوەیەكی نزیكیی بەناو یەریڤان و ئەرزەڕۆم و ئازربایجاندا دەڕوات واتە بەكەوانەیەك كە مرعش دەكەوێتە ناویەوە هەتا حەڵەب.

لەباشوری خۆرئاواشەوە بەتەنیشت قەدپاڵەكانی گردەكاندا دەڕوات هەتا ڕوباری دیجلە و پاشانیش بەخۆرهەڵاتی ئەم روبارەدا بۆ خوارەوە و لەدوای ئەوەشەوە لەگەڵ هێڵی چیای حەمریندا بەرەو باكور پێچدەكاتەوە هەتا مەندەلی لەسەر سنوری عێراق ئێران– سامەڕائی هەروەها ئەوە روندەكاتەوە هەروەها توركمان و نەستورییەكان لەكوردستاندا دەژین و ئامازە بەبوونی توركمان دەكات لەكەركوك و توزو كفری و ئەربیل و تەلعەفەر.

بەڵام مێژوونوسی عەرەبی عێراقی مامۆستا عبدالرزاق الحسنی[17] لەبارەی سنوری كوردستانەوە دەڵێت: كوردەكان لەشارەكان و گوندەكاندا دەژین كە لەسنورەكانی ئێران و عێراقەوە دەست پێدەكەن لەسەر هێڵێكی ڕاست كەلە چیای حەمرینەوە

---

[16] – بگەڕێرەوە بۆ كتێبی – خناجر و جبال– ی رزگاریخوازانی عێراق كە بەرێز ئەحمەد فەوزی نوسیویەتی لا ٢٠–٢١ چاپی عەرەبی یەكەم.

[17] –الأستاذ عبدالرزاق الحسني لەكتێبەكەیدا – العراق قدیما وحدیثا– لا ٢٣–٢٤ لەچاپە عەرەبیەكە.

درێژدەبێتەوە هەتا چیای سنجار هەتا دەگاتەوە بەسنوری عێراقی سوریی، هەروەك چۆن مامۆستا هلال ناجی پارێزەر لەم بارەیەوە دەدوێت[18] لەتوێژینەوەکەیدا کە لەقاهیرە نوسیویەتی وەك لێکۆڵینەوەیەك لەلایەن نەتەوەییە عەرەبەکانەوە بۆ کێشەی کوردی، باس لەمەسەلەی نەوت دەکات و دەڵێت: بەهەموو ڕاشکاویەکەوە هەندێك لە نەتەوەییەکان نەیاری ئەوەن گەلی کورد مافە نەتەوەییەکانی پێبدرێت بەهۆی بوونی نەوتی کەرکوکەوە لەکوردستان بۆیە مامۆستا ناجی داوای بەلاوەنانی ئەم بیرۆکەیە دەکات بەتایبەتی چونکە نەتەوەی عەرەب خاوەن دەرامەتێکی نەوتیی زۆر زۆرە و دەنوسێت: " لەواقیعدا مەسەلەی کورد جێی بایەخێکی گەورەیە نەك لەبەرئەوەی کە ناوچەیەکی جیاییەو کوردەکان تێیدا نیشتەجێن و لەعێراق جیادەبێتەوە لەبەر ئارەزووی خەڵکەکەی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێك بۆ خۆیان بەڵکو لەبەر راوبۆچوونی زۆرێك لەخەڵك کە سەربەخۆیی بوونی کوردەکان بەواتای داماڵینی سەرچاوە نەوتییە زۆرەکانە لەعێراقی عەرەبیمان و بێبەشبوونی ئێمەیە لێیان. لێرەوەیە کە بایەخ بە یەکێتی عێراقیی تاوداربوو دەدەن ئەمەش لەبنچینەوە وەهمێکی هەڵەیە.

نەتەوەی کوردی ڕاستیەکی واقیعی و حاشاهەڵنەگرە و کوردەکانی عێراقیش خاوەن مۆرك و بنەمای نەتەوەیی روونی خۆیانن و لەبەرژەوەندیی نەتەوەی عەرەبیە دان بەمافی کوردەکاندا بنێت لەبڕیاردان لەسەر چارەنوسیان لە چوارچێوەی یەکێتیەکی فیدراڵیی یان کۆنفیدراڵیدا ،بۆ نمونە، بەمەش ئەمە دەبێتە سەرەتای هاریکاریی و برایەتیەکی بەردەوام نەك گوێپێنەدان و فەرامۆشکردنمان بۆ واقیع و مێژوو و هیواکانی گەل هۆکارێك بن بۆ ئەوەی ئەم گەلە ئازادی خۆی بەهێزی چەك بەدەست بێنێت، ئیتر زووبێت یان درەنگ ئەگەر سەریش نەکەوت ئەوا خەنجەرێکی خیانەت دەبێت لەپشتی هەموو بزوتنەوە نەتەوەییە عەرەبیە رزگاریخوازەکان لەعێراقدا زیاتر لەوەش لەکاتی ئەو ریفراندۆمەدا کە بەریتانیا رێکیخست بۆ دانانی میر فەیسەڵ بە پاشای عێراق شاری کەرکوك دەنگی دا لەدژی ئەوەی بلکێنرێت بەعێراقی عەرەبیەوە وەك چۆن ئەمە خودی بەڵگەنامە عێراقیەکان و بەریتانیە فەرمیەکان جەختی لەسەر دەکەنەوە هەروەها

---

[18] – خناجر وجبال لا ٧٠ چاپە عەرەبیە یەکەمەکە.

زۆرینەی شاری کەرکوك هێشتا کوردن و پاش ئەوەش تورکمان دێت کە ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی شاری کەرکوك پێکدێنن. بەڵام عەرەب هێشتا کەمینەیەکن کە رێژەیان لە ١٠٪ تێپەڕ ناکات لەژمارەی دانیشتوانی کەرکوك ئەو ناوچانەش کە نەوتی لێدەرهێنراوە تەواو ناوچەی کوردین و پڕە لەگوندی کوردی و بێجگە ئەوان کەسی تری تێدا نەبووە.. هەتا ١٩٦٣ تا ئەو کاتەی کە حکومەتی ئەوسا هەستا بەڕاگواستنی هاوڵاتیە کوردەکان لەگوندەکانیان و هێنانی هۆزی عەرەبی و نیشتەجێکردنیان لەو گوندانەدا ئەمەش بە بەرچاوی رای گشتی جیهانیەوە.

## ڕاوبۆچوونی ئەدمۆنس

*لەبارەی سنوری کوردستانەوە مێجەر ئەدمۆنس[19] لەکتێبەکەیدا – کوردەکان و تورکەکان و عەرەب دەڵێت:*

"کوردستان واتە ئەو زەویەی کوردەکان وەك كۆمەڵێکی هاوچەشن لەسەر نیشتەجێن– دابەش بووە لەنێوان تورکیاو عێراق و ئێرانداو چەند درێژبونەوەیەکی کەم لەسوریاو یەکێتی سۆڤیەت، سنورەکەی لەباکورەوە درێژدەبێتەوە لەگەڵ ئەو هێڵەی کێشراوە لەئەریڤان–ئەرزرۆم–ئازربایجان پاشان لاردەبێتەوە بەدەوری مرعشدا بەرەو حەڵەب و لەباشوری خۆرئاواش درێژدەبێتەوە لەگەڵ گردە تەلآنتەلآنیەکاندا بەرەو دیجلە پاشان کەمێك لەباکوری چیای حەمرینەوە بۆ خاڵێك لەسەر سنوری عێراقی ئێرانی لەنزیك مەندەلی. لەخۆرهەلآتیش لەئێران سنوری کوردەکان بەرەو باشوری خۆرهەلآتی ئەریڤان دەڕوات بۆ ئەوەی ناوچەی ماکۆو بەشێك لەخوی و ڕەزاییە و مەهاباد بگرێتەوە–سابلاَخ و سەقزو سنەو کرمانشان، بەڕێز مامۆستا شاکر خصباك پسپۆڕی عەرەبی لەجوگرافیای کوردستانی عێراقدا کەپێشتر باسمان کرد پشتیوانی لەڕاکەی ئەندمۆنس دەکات ئەو ڕایەی خۆی بۆ ڕاکەی ئەدمۆنس زیاد دەکات کە لوڕ کوردن و بەمەش کوردستان دەگاتە کەنداوی فارسی".

مامۆستا دیرك کینین[20] لەبارەی هەمان بابەتەوە نوسیویەتی: کوردستان واتە ئەو زەویەی کە زۆرینەی ڕەهای دانیشتوانەکەی پێکدەهێنن و ژمارەیان زۆر لەژمارەی کەمینەکانی تر زیاترە کەلەناویاندا دەژین. ئەم زەویە دۆڵ و چیاو گردو پێدەشتی تێدەکەوێت ئەمە خاکی کوردە چیاییەکانە هەندێکیان هەتا ئەمڕۆش کۆچەرین و کوردی پێدەشتەکان گەنم دەچێنن یان لەشارەکاندا دەژین و هەندێکیان زۆر کۆنن.

بەپێچەوانەی نەبوونی سامانی کانزایی کوردستان خاوەنی دەوڵەمەندترین کێڵگەی نەوتە لەجیهاندا... خاوەنی یەکێك لەدەوڵەمەندترین کێڵگەکانی نەوتە لەجیهاندا.. لەسنوری

---

[19] – بگەڕێرەوە بۆ کتێبی مێجەر س. جی ئەدمۆنس بەناونیشانی : ( Kurds Turks and Arabs)

[20] – بگەڕێرەوە بۆ کتێبی دیرك کینین بەناونیشانی (The Kurds and Kurdistan) لا ١ چاپی یەکەمی ئینگلیزیەکەی ساڵی ١٩٦٤.

باشوریەوە ئەم کێڵگانە  شاری کەرکوك دەگرنەوە و کێڵگەی تریش هەن لەباکور لە عەین زالە و بەتمەو چەندین کێڵگەی تر لەناوچەکانی تر بەڵام کێڵگەی کەرکوك دەوڵەمەندترینیانە".

هەروەك چۆن مێژوونوسی کورد ئەمین زەکی بەگ نەخشەیەکی کێشاوە بۆ ئەو ناوچانەی کە زۆرینەی رەهای کورد تێیدا نیشتەجێن و لەکتێبی مێژووی کوردو کوردستاندا بلاویکردۆتەوە.

## رای نوسەر

بەبروای من کوردستانی ئێستا- ئەو ولاتە یان شوێنەیە کوردەکان تێیدا نیشتەجێن- لەگەڵ بوونی کەمە نەتەوەی تر لەناویاندا نیشتەجیٚ بوون- بەدرێژایی مێژوو هاتۆتەوە یەك و کەمبۆتەوەو ئاستەمە بەشێوەیەکی وورد دیاری بکرێت، بەلام دیاریکردنی مومکینە بەتایبەتی چونکە کوردە نیشتەجێکانی هێشتا لەسەری دەژین هەندیٚ ناوچەی نەبێت کە زەوتکراون و دوای دەرکردنی دانیشتوانە کوردەکانی خەڵکی تریان تێدا نیشتەجێکراوە.

من پێموایە پێویستە بابەتی کەرکوك ناکۆکی نەوروژێنێت چونکە گەلی کورد بەرهەڵستی جیابوونەوە دەکات لەعێراق یەکەم و چونکە سامانی عێراق باکوری و ناوەراستی و باشوری پێویستە بۆ جەماوەری زەحمەتکێش بێت بەعەرەب و کوردو تورکمانیەوە دووەمیش: چونکە نەوتی کوردستان نەوتی عێراقە ناکرێت سودی لێوەربگیرێت بەبیٚ عێراق و بەبیٚ یەکێتی عێراق سێیەم: چونکە نەتەوەی عەرەبی پێشکەواتنخواز تەماحی خستنەسەرو پێوەکاندانی نییە. بابەتی کەرکوك پێویستە نەبێتە جێی ناکۆکی و جیاوازی مادام عەرەب و کورد سورن لەسەر ئەوەی پێکەوە بژین لەسایەی یەك ولاتدا و مادام هەمووان سورن لەسەر ئەوەی بەرەنگاری جوداخوازیی و تیهەڵکێشکردن ببنەوە.

بروام وایە نەخشەکەی خوالێخۆش بوو ئەمین زەکی بەگ دەشێت بۆ ئەوەی ببێتە بنچینەیەك بۆ کێشانی نەخشەی ناوچەی کوردستان ئەگەر ئەوەمان بەهەند وەرگرت کە

ئەم نەخشە رەگەزییە واتە ئەو کوردانە دیاری دەکات ئێستا نیشتەجێن نەك ئەو کوردستانەی کەمینە نەتەوەییەکان تێیدا لەگەڵ کوردەکاندا دەژین.
گومانی تێدا نیە مەسەلەی سنوری نێوان نەتەوە بەیەکداچوەکان کە چەندین سەدە لەگەڵ یەکدا ژیاون لەسایەی یەك وڵاتدا ئاڵۆزترین و زەحمەت ترین گیروگرفتەکانە بەتایبەتی ئەگەر هەروەها هاتنەکایەی فاکتەر یان هۆکارە ئابوریی و نەوتیەکانمان لەبەرچاوگرت لەم بابەتەدا. لەگەڵ ئەوەشدا چارەسەرکردنی مەحاڵ نابێت ئەگەر راستی و روداوە مێژوویی و ماسیەکان رەچاوکران و بەرۆحی لێبوردنی نەتەوەییەوە چارەسەرکرا بەدوور لە چاوتێبڕین و بەرژەوەندیخوازیی.

# بایەخی ناوچەی کوردستان

شوێنی کوردستان بڕبڕەی پشتی رۆژهەلاتی ناوەڕاست داگیردەکات، زۆربەی شاخاوییە، چیاکانی پێدەشتی بەپیت لەئامێز دەگرن، چەندین روباریش بەناویاندا دەڕوات گرنگترینیان دیجلەو فورات و زێکانیانە وەك زابێ و سیروان و لەکوردستاندا ژمارەیەکی زۆر کانی و روبارو جوگەی تر هەیە.

بەتەنیشت بایەخی ستراتیژی ناوچەی کوردستان و گرنگی شوێنەکەی خاوەن سامانگەلێکی کانزایی و نەوتی زۆریشە. ئەمەش بایەخێکی تری پێدەبەخشێت.

مامۆستا باسیل نیکیتین[21] دەڵێت:

(... ناوچەی کوردستان بایەخێکی جوگرافی و ئابوریی گەورەی هەیە، یەکێکە لەبەیەکگەیەنەرەکانی نێوان خۆرهەلات و خۆرئاوا، تێیدا ژمارەیەکی زۆر کانیاوی نەوتی ئۆرگانیی هەڵدەقوڵێت بۆ جیهان، لەبەرژەوەندی هەموو جیهاندایە ئاشتی باڵ بەسەر ئەم ناوچەیەدا بکێشێت.. گومانیشی تێدا نیە ویژدانی جیهانی دەیەوێت بنەماکانی دادپەروەریی و بنەماکانی مافی مرۆڤ بەرقەراربێت).

تایبەتمەندیەکی تری کوردستان ئەوەیە خاوەن جوانیەکی سروشتی و خاکێکی بەپیتە و تێیدا میوە زۆرە، بەزۆریی ناوچەیەکی شاخاویی و خاوەن لوتکەی بەرزو بڵندە کە – سرکۆن بە– شمشێری ڕوو لەئاسمان کردووی وەسفکردون– لەچیاکانیدا درەخت و گوڵی جۆراوجۆر دەڕوێن و تێیدا هەندێك جار کانی و تاڤگە هەیە. لەزستاندا لەسەر لوتکەی چیاکان و لەچەندین ناوچەی کوردستان بەفر دەبارێت.

بەڵام کەشی مامناوەندییە ئەگەرچی بەرزاییەکانی لەزستاندا ساردو لەهاویندا کەشیان خۆش و فێنکە.. لەپایزو زستان و بەهاردا باران دەبارێت و لەدەشتەکاندا لەهاویندا پلەی گەرما بەرزدەبێتەوە..

کوردستان بەهارێکی جوان و سەرنجڕاکێشی هەیە و لەهاوینیدا زۆربەی ئەو میوانەی لەخۆرهەڵاتدا ناسراون هەن وەك ترێ و سێو و قەیس و قۆخ و گێلاس و هەنارو هەنجیرو هەرمێ و ئەوانی تر..لەچیاکاندا بەڕوو مازوو و چەند جۆرێك میوە هەیە.. کوردستان

---

[21] –باسیل نیکیتین لەکتێبەکەیدا الاکراد لا ١١– یەکەم چاپی عەرەبیەکەی.

بەزۆری گەنم و برنج و تـوتن بەرهـەم دەهێنێـت، هـەروەها لۆكـەو چـەوەندەر و چـەندین جۆری سەوزی ناسراو بەرهەم دێنێت، بەدڵنیاییەوە كوردستان دەبێتە جوانترین ناوچەی جیهان و وڵاتێكی گەشتیاریی نایاب ئەگەر لەزوڵم و زۆرو ستەمكاری رزگاری بێت، ئەگەر دەستەكانی ئاوەدانی و بونیادنانی پێبگات، كاتێك كە سامانەكەی یـان بەشـێك لێـی بـۆ نوێكردنـەوەی ئـەم وڵاتـە كڵۆڵـە خـەرج بكرێـت و ئـاوەدان بكرێتـەوەو جـوان بكرێـت، بەتایبەتی كە سروشت دیمەنی جوان و دڵـڕفێن و هاوینەهـەوارو چـیاو دۆڵـی زۆر جـوانی پێبەخشیوە، نوسەری كتێبی–نواعیر الفرات– ڕاستی ووتوە یان لەنێوان عەرەب و كورد دا وەسفی كوردستانی كردوە بەوەی كە (وڵاتی جوانی و شەیدابوونە)..

رۆژنامەنوسـی هۆڵەنـدی مالیبـار لـە لا ٢١٥ لەكتێبەكەیـدا (نـواعیر الفـرات) یـان لـەنێوان عەرەب و كورد دا نوسیوتی: ( كوردستان وڵاتی شەیدایی و جوانیـە دەرونـەكان گوشـاد دەكات و ئیلهامی شیعرو خەیاڵیان پێدەبەخشێت، تێیدا گـردو دۆڵـەكان بڵاوبوونەتـەوەو دیمەنەكانی بێزارو بێتاقەتی لەدیدو روخساری عێراقیەكاندا لادەبات ئەوانەی كـە بینینـی دەشتەكان و درێژبوونـەوەی بیابانـەكانی نێـوان هـەردوو روبـار مانـدووی كـردوون، چـیا بەرزەكان دەوریان داوە كە لوتكەكانیان بەفر دایدەپۆشـێت و لەسـەری كەڵەكـە دەبێـت هەتا وەك ئەوەی ئاسۆی ئاسمان ببڕن و لەنێو چەم و پێدەشتەكانیدا ئەسـتێڵ و كـارێزو كانی هەیە كە ئاویان لێدەقوڵێت و لەدەنگی قوڵپی ئاوەكەیان ڕاز و خواز دەبیسترێت كە پێیان دڵ دێوانەو شەیداو سەوداسەری خۆشەویستی دەبێت.

لەم ناوچە جادو شەیداكەرەدا كوردەكان ژیانێك دەژین پڕ لە چالاكی و زیندەگیی، جوڵە خۆی تێدا دەنوێنێت وەك چۆن لە ڕژانی ئاو لەبەرزایی چـیاكانەوە بـۆ لێژاییـەكان خـۆی دەنوێن، كوردەكـان بەسروشـتی خۆیـان شـاعیرن و شـەیدای ئـازادی و ئاشـتین و داب و نەریتی باوباپیرانیـان زینـدو دەكەنـەوەو گـۆرانی بـە وتوێـژو كارەكانیانـدا هەڵـدەدەن و سوارچاك و جەنگاوەری ئازاو دلێرن ئەوان هەتا لە مێژووی نوێیاندا ژیانیان بەخشیوە بۆ خەباتكردن لەپێناو ئازادییاندا.. هەروەها لە لا ٢١٩دا دەڵێـت: (مـن باشـترین چـاكترینی یادەوەرییـەكانی كوردەكـان لای خـۆم دەپـارێزم و وێنـەكانی ئـەم وڵاتـە لەیادەوەریمـدا

دەمێنێتەوە کە نیشتمانی جوانی و شەیداییەو وێنەی گەلە سەربەرزەکەی کە باشی میوانداریی و بەوەفاییەکەیان سەرسامی کردم.

هەڵە دەکات ئەوەی وا بزانێت کوردستان وڵاتی هۆزە دڕندەکان و خێڵە کۆچەرییەکانە، چونکە ئەو سەردەمە بەسەرچوو کە تێیدا کوردستان تەنها وڵاتی کۆچەری و شوانەکان بوو، ئێستا زۆرینەی هەرە زۆری هۆزەکانی کوردستان نیشتەجێ بوون.. تەنها چەند هۆزێك ماونەتەوە نیمچە گەڕۆکن. شارە کوردییە کۆنەکان و نوێیەکانیش فراوان بوون. ئەمڕۆ لەکوردستاندا شارەکانی کرمانشان و دیاربەکرو کەرکوك هەن کە سەدان هەزار کەسیان تێدا نیشتەجێیە، هەروەها شاری سلێمانی و خانەقین و ئەرزنجان و ئەرزەڕۆمی تێدایە کە پیشەسازی و چەندین کارگە لەوێ هەن، هەروەها شاری تر هەیە بۆ نمونە: ئەربیل، بەتلیس، سنە، مهاباد، وان، کە ئەمانە تەواو شاری کوردین و خاوەن روخساری هاوچەرخ و شارستانین.

نەك تەنها ئەمە بەڵکو خودی کوردستانی کۆن تەنها وڵاتی شوان و کۆچەرییەکان نەبووە.. چونکە کوردستان چەندین شاری زۆر دێرینی تێدایە بۆ نمونە، وەك شاری هەولێر.

مامۆستا ب. نیکیتین[٢٢] دەڵێت: کوردستان تەنها وڵاتی کۆچەریی و جوتیارەکان نەبووە بەڵکو- شارو گوندانێك هەبوون کە تێیاندا پیشەسازییە دەستییەکان گەشەیان کردووە کە لە نەریتە کۆنەکانیەوە بەدیارکەوتووە، دەکرێت شارەکانی (بەتلیس)و (سنە)و (مەهاباد) بەنمونە بهێنینەوە ئەمانە تەواو شاری کوردین و تێیاندا پیشەسازییە دەستیەکان بەهەموو شێوەکانیانەوە پەرەیان سەندووە.. پیشەسازی چەرم و کانزاو تەختە..

(سرکیسیان) لەوتارێکیدا لەبارەی عبدخان سید بتلیسی کوردیەوە لە بەشی هەشتەمدا وردکارییەکی وروژێنەر باس دەکات لەبارەی پارچە هونەرییەکان و چەکەکان و خشڵەکان و دەستنوسەکانەوە کە ئەم بەرێزە هەیبوون.. بەلاّم لەلایەنی هێڵەکانی گەیاندنەوە ئەوا کوردستانی ئەمڕۆ خاوەن هێڵی ئاسنە بەتەنیشت هێڵەکانی گەیاندنی

[٢٢] -ب - نیکیتین لەکتێبەکەیدا کوردەکان- الاکراد- لاپەرە ٤٤-٤٥چاپە عەرەبیە یەکەمەکە.

ووشکانیە دوورەکانی ترەوە. بەتایبەتی لەکوردستانی عێراق و تورکیا، لەئێران هەروەها هێڵەکانی گواستنەوەو گەیاندن بۆ ئۆتۆمبیل هەیە هەروەها درێژکردنەوەی ئەو هێڵە ئەنجام دەدرێت کە بە کرمانشان و سەقزو مەهاباد و رەزاییەدا دەڕوات بۆ کوردستانی تورکیا.

ئێستا ئۆتۆمبیل ئامرازی گواستنەوەو هاتوچۆی بنەڕەتیە و پاشانیش شەمەندەفەر دێت پاشان ئاژەڵ دێت.

لەکوردستان چەندین رووبار هەن بەناوبانگترینیان (دجلە و فورات)ن کە دوو رووبارن لەکوردستانی تورکیاوە هەڵدەقوڵێن و لقەکانی دیجلەش وەك زێی گەورەو زێی بچوك و سیروان (دیالی) و هەروەها (رووباری ئاراس) و بەتلیس و بۆتان و غاما سیاب و جاغاتو درێژی ئەم رووبارانەش لەکوردستان بەمشێوەیەن (رووباری دیجلە ٦٠٠ کم )و (رووباری فورات ٦٤٧ کم) و (زێی بچووك ٤٥ کم) و (زێی بچووك ٢٠٠ کم) و هەردوکیان دەڕژێنە ناو دیجلەوە و جاغاتو (٢٤٠کم) لە کوردستان دەریاچەیەکی گەورە هەیە ئەویش (دەریاچەی وان)ە دەریاچەی ئۆرمیە دەکەوێتە سەر سنور لەنێوان کوردستان و ئازربایجان و هەروەها دەریاچەی (خامزاد)و (دەریاچەی زرێبار) لەسەر تەختی چیا سەرکەشەکان.

## زمان و ئەدەب

## زمانی کوردی

گەلی کورد خاوەن زمانێکی نەتەوەیی تایبەت بەخۆیەتی کەئەویش زمانی کوردییە بەشێوەزارە جۆراوجۆرەکانیەوە، زمانێکی سەربەخۆیەو لەسەرخۆی وەستاوەو خاوەن رێزمان و دەستەواژەی تایبەت بەخۆیەتی، هەروەها پەرەسەندنی تایبەت بەخۆیی هەیە. هەروەها- شێوەزارێکی تورکی لەناوچوو نیە- یان شێوەزارێکی -لافارسی بچووك- وەك شوفێنیەکانی تورك و فارس وا دەڵێن.

ڕاستە زمانی کوردی سەر بەزمانە (هیندۆ-ئەوروپیەکان)ە، هەروەها سەر بە کۆمەڵەی[٢٣] زمانە ئێرانیەکانە بەلام، " زمانێکی تەواو سەربەخۆیە، خاوەن پەرەسەندنی ڕاستەقینەی کۆنی خۆیەتی، ئەم زمانە کۆنترە لەزمانی فارسی کۆن کە تابلۆ بەناوبانگەکەی دارای پێنوسراوە"[٢٤] بەپێی ووتەی پسپۆری بەریتانی لەشوێنەوارە کۆنەکاندا سێر سدنی سمیث کە هەروەها لەبارەی ڕای زانا پسپۆڕەکانەوە سەبارەت بە زمانی کوردیی دەڵێت:

-هەندێك لەزانا پسپۆڕەکان کە دەکرێت پشت بەڕاکانیان ببەسترێت، پێیان وایە زمانی کوردی لەزمانی فارسی جیانەبۆتەوە یان لەپاشماوەی ئەو نیە-.

مێجەر س . جی. ئەدمۆنس کە پسپۆڕە لەزمانی کوردیدا لەوتارێکیدا کە گۆڤاری ئاسیای ناوەڕاست لەژمارە یانزەیدا بلاویکردۆتەوە دەڵێت:-

---

[٢٣] - ب نیکیتین لەهەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە١٨ دا دەڵێت: " زانستی نوێ سەلماندویەتی زمانی کوردی بێگومان بە بنچینە ئێرانیە ئەمەش وەك پوچەلکردنەوەیەکی ڕاوبۆچونی ئەوانەی پێیان وایە بنچینەکەی کلدانیە".

٢٤ - بگەڕێرەوە بۆ کتێبی مێژووی کوردو کوردستانی نوسەری خوالێخۆش بوو ئەمین زەکی بەگ لا ٦١ چاپە عەرەبیە یەکەمەکە. قاهیرە- ١٩٣٦.

" ئێستا ئەوە روونە زمانی کوردی پێکنەهاتووە لەشێوەزارێکی فارسی پاشماوەو شێواو بەڵکو بریتیە لەزمانێکی ئاری پوخت خاوەن خەسڵەتی تایبەتی و پەرەسەندنی مێژینەیی خۆیەتی"[25]

بەوشێوەیە دەبینین زمانی کوردی وەك زمانی فارسی لەرووی بنچینەوە سەر بەکۆمەڵە ئێرانیەکانە لە زمانە هیندۆئەوروپیەکان، ئەوەش زانایانی زمان سەلماندویانە مامۆستا ب. نیکیتین[26] دەڵێت" زانایانی زمان بەتایبەتی- بوت- و دیجار- ئەو تیۆرەیان پوچەڵکردۆتەوە کە دەڵێت زمانی کوردی لەبنچینەدا کلدانیە و پەیوەندیەکەیان بە زمانی فارسی نویێ و زمانی زەندییەوە سەلماندووە کە دایکی زمانی فارسیە".

بەڵام زانای سۆڤیەتی ن. مار[27] بۆچونێکی دژ بەمەی هەیە بەوەی کوردەکان گەلێکی رەسەنن نیشتەجێی چیاکانی ئاسیای بچووك بوون و زمانەکەی دروست بووەو پەرەی سەندووە لەبنچینە جافتیەکەیەوە کە نزیکە لەزمانی جۆرجی و خلدیەوە، تا ئەوەی بۆتە زمانێکی هیندۆئەوروپی لەزمانی ئێرانی و ئەرمەنی، تیۆرەکەی (مار)یش دەگونجێت لەگەڵ تیۆرەکەی مینۆرسکیدا[28] کە دەڵێت زمانی کوردی لەکاتی پەرەسەندنیدا کاریگەریووە بەزمانی میدیی، هەیشە پێوایە زمانی کوردی لقێکی جیابۆوەیە لە زمانی میدیی، میدییەکانیش بە بنچینەیەکی سەرەکی کوردەکان دادەنرێن[29].

رەنگە بەسودیش بێت ئەگەر لێرەدا ئاماژە بە رای (بول بندر)یش بکەین لەبارەی زمانی کوردیەوە کە دەڵێت:-

" زمانی کوردی زمانێکی قەشەنگ و دەنگێکی رێك و هەماهەنگی هەیە، سادەو راشکاوە، دەوڵەمەندە، هەمەجۆرەو فێربوونی ئاسانە بەناسکیەکەی دڵ و دەرونەکان

---

[25] - هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[26] -کتێبی -الاکراد- ی باستیل نیکیتین لا ١٨، چاپە عەرەبیە یەکەمەکە.

[27] -سەرچاوەی پێشوو لا ٢٢.

[28] -سەرچاوەی پێشوو لا ١٩،٢٢.

[29] -کتێبی -الاکراد و کردستان- ی دیرك کینین- چاپە ئینگلیزیەکەی- لندن ١٩٦٤ لا ٢.

داگیر دەکات، هەروەها پەندو ووتەی بەنرخی زۆری تێدا بەکاردەهێنرێت، کە بنچینەی هەموو وتوێژەکان و تەوەریانە، لەڕاستیدا ئەمە یەکێکە لەتایبەتمەندیەکانی زمانی کوردی، زمانی کوردی رەوانبێژیی و فەلسەفەی تێدایە، زمانێکی شعرییە، شعیر تێیدا هەموو لقەکان دەگرێتەوەو هەموو سروشت دەکاتە بابەتی خۆی و لەخۆیی دەگرێت"[٣٠].

لەواقیعدا زمانی کوردی ڕاستیەکی بەرپایەو وەك زمانێکی سەربەخۆ بوونی هەیە، بوونی و یەکێتیەکەی وەك زمانێك بۆ نەتەوەیەکی دیاریکراو لەرووی مێژووییەوە چەسپاوەو بەڵگەی زیندوو سەلماندنی مادیی پشتیوانی لێدەکەن، بوونی فرە شێوەزاریش کار ناکاتە سەر ڕاستی ئەم دەرئەنجامە.. ئەوەی منیش بزانم هیچ زمانێك نیە لەجیهاندا فرە شێوەزاری تێدا نەبێت، لەزمانی کوردیشدا شێوەزار هەیە گرنگترینیشیان سیانن ئەوانیش: شێوەزاری کرمانجی خۆرهەڵاتی و شێوەزاری کرمانجی خۆرئاوایی و —لوڕ—.

زمانی کوردی پێش ئیسلام ئەلفوبێیەکی تایبەت بەخۆی بەکاردەهێنا، دوای ئەوەی کوردەکان بوونە موسڵمان ئیدی پیتی عەرەبیان بەکارهێنا.. تا ئەمڕۆش ئەو کوردانەی کە لەژێر سایەی هەردوو وڵاتی ئێران و عێراقدان ئەلفوبێی عەرەبی بەکاردەهێنن، ئەمە لەکاتێکدا کوردەکانی سۆڤیەت ئەلفوبێی روسی بەکاردەهێنن، کوردەکانی تورکیاو سوریاش ئەلوفبێی لاتینی بەکاردەهێنن.. ئەوانەی پسپۆڕن لەزمانی کوردیدا هاوڕان لەسەر ئەوەی کە ئەم ئەلفوبێیە باشترو گونجاوترە بۆ ئەوەی زمانی کوردی پێ بنوسرێت. چونکە ئەلفوبێی عەرەبی ناتوانێت گوزارشت لەهەموو دەنگ و پیتە کوردییەکان بکات، شێوەزاری موکریان کە بنچینەی شێوەزارە ناوچەییەکانە کەوا کوردەکانی ناوچەکانی موکریان و سنەو سەقزو سلێمانی و هەولێرو کەرکوك قسەی پێدەکەن بەپوخترین شێوەزارە کوردیەکان دادەنرێت ئەمەش لەتێڕوانینی زانایانی زمانی کوردیی و پسپۆڕەکانیەوە، کە شێوەزارێکە زیاتر پەرەسەندووە بەتایبەتی

---

[٣٠] — پاپا پۆل بندر ئەم رایەی خۆیی لەکتێبە چاپکراوەکەیدا بڵاوکردۆتەوە کەلەساڵی ١٩٢٦دا لەپاریس چاپکراوە لەژێر ناونیشانی (الاجرومیة الكردیة) بگەڕێوە بۆ لا ٧٢ لەکتێبی دکتۆر بلە ج شێرکوە بەناونیشانی— القضية الكردية. چاپی دووەم بەغداد. چاپخانەی صلاح الدین— ١٩٦١ ئەم کتێبە یەکەم جار لەساڵی ١٩٣٠ لەقاهیرە بەچاپ گەیەنراوە.

لەناوچەی سلێمانی کەوا دەوڵەمەند بووە بە دارشتەو زاراوەی نوێ لەماوەی ئەم پەنجا ساڵەی رابردوودا هەر بەم شێوەزارە کتێب و چیرۆك و رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان لەعێراق و ئێران دەنوسرێن، ئەم شێوەزارە لە ووشەو زاراوەی دوو شێوەزارەکەی تر سودی وەرگرتووە، بەپێوانەکردنی زمانی کوردیی لەگەڵ ئاستی پەرەسەندنی ئابوریی و کۆمەلآیەتی و رۆشنبیری لەکوردستان دەبینین زمانێکی تاڕادەیەك گەشەکردوو پێشکەوتووە، کەمتر ووشەی عەرەبی و بیانیشی تێدایە ئەگەر بەراوورد کرا بەزمانی فارسی بۆ نمونە: لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەوا زمانی کوردی پێویستی بە چاودێریی تایبەت و بایەخپێدانی جدیی هەیە لەلایەن زمانەوانەکان و رۆشنبیرە کوردەکانەوە، سەرەڕای پێویستی پەرەپێدانی کۆمەڵگەی کوردستان لەرووەکانی ئابوریی و رامیاریی و کۆمەلآیەتی و رۆشنبیرییەوە هەتا پەرەبسەنێت و هەروەها زمانی کوردیش دەوڵەمەند بکات.

لەڕاستیدا ژمارەیەك لە رۆشنبیرە کوردەکان لەم چەند ساڵەی دواییدا بەتایبەتی هەر لەجەنگی جیهانی دووەمەوە، کۆششێکی بەبایەخان کردووەو بەجدی گرنگیان داوە بەزمانی کوردی و رێزمانەکەی و نوسینەوەی و دەوڵەمەندکردن و پەرەپێدانی.. لەمەشدا گۆڤاری گەلاوێژ[٢١] رۆڵی سەرپەرشتیاری یەکەمی بینیوە- کەوا گۆڤارێکی کوردیی رۆشنبیری کۆمەلآیەتی بوو خاوەنەکەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدی پارێزەر بوو کە لەم رووە خزمەتی دیارو ئاشکرای پێشکەش کردووەو هانی کەسانێکی زۆری دا

---

[٢١] – گەلاوێژ- گۆڤارێکی کوردی رۆشنبیری و کۆمەلآیەتی گشتی بوو خاوەن و سەرنوسەرە سەرەکیەکەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدی پارێزەر بوو بەرێوەبەری کارگێریەکەشی مامۆستا عەلائین سوجادی بوو گۆڤارەکە لەساڵی ١٩٣٩دا دەرچوو تا ساڵی ١٩٤٩ بەردەوام بوو لەدەرچوون تا کاتێك دەسەلآتدارانی حوکمی پادشایی دایان خست و خاوەنەکەشیان بۆ ماوەی دوو ساڵ دەستگیر کرد کە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بوو بەتۆمەتی (مارکسیەت)کە ئەوکات برەوی هەبوو. دەسەلآتداران زنجیرەیەك وتاریان وەك بەڵگە بەکارهێنا کە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد وەریگێڕابوو لەبارەی (خەباتی چین)ەوە کردیان بیانویەك بۆ داخستنی گۆڤارەکەو هەڵوەشاندنەوەی ئیمتیازەکەی. گۆڤارەکە بەرۆڵی خۆی بەشداری کرد لەکۆشش لەدژی فاشیزم و داگیرکەر لەبلآوکردنەوەی هۆشیاری دیموکراسی و نیشتمانی لەنێوان خوێنەوارانی کورددا وەك چۆن خزمەتی دیارو ئاشکرای پێشکەش کرد لەزیندوکردنەوەو پەرەدان بە ئەدەبی کوردی و زیندوکردنەوەی کلتوری نەتەوەی کوردیی.

بۆ کارو نوسین و، بەشداری کرد لە پەروەردەکردنی نەوەیەك لەنوسەران و شاعیرانی کورد.

هەروەها هەر لەسەردەمانێکی زووەوە زمانەوان و زانا تۆفیق وەهبی بەگ و پرۆفیسۆر-کەناتی کوردۆ-ی کوردی سۆڤیەتی خزمەت بە زمانی کوردی دەکەن ئەم دوو زانا کوردە خاوەن چەندین نوسراوی بەنرخن لەبارەی رێزمانی زمانی کوردییەوە.

## ئەدەبی کوردی

ئـەدەبی کـوردی هــەر لەچـەندین سـەدەی رابـردووەوە لەشـێوەی چـیرۆك و داسـتان و هۆنراوەکانـدا پەیـدابووە کـە لـەبارەی خۆشەویـستی و دڵـداریی و جـەنگ و ژیـانی پاڵەوانـەکان و فـەرمانڕەواکان و جـوانی سروشـت و خۆشەویـستی کوردەکانەوەیـە بـۆ نیشتمانەکەیان.

مامۆستا ب. نیکیتین[32] دەڵێت:

یەکەم شت کە مرۆڤ سەرسام دەکات لەکاتی لێکۆڵینەوەدا لە ئەدەبی کوردی، بریتیە لـە فرەیـی چـیرۆکە میللیـەکان لـەم وڵاتـەدا. فیلچیفـسکی دەڵێـت دەوڵەمەنـدی چـیرۆکە میللیەکان شتێك نیە جگە لەدەرئەنجامێکی سروشتی نەزانی گشتی سەبارەت بـە زمـانی دایك– واتە بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری لەنێوان خەڵکە گشتییەکەدا. مامۆسـتا لـویس ماسینیون لەپێشەکی کتێبەکەی نیکینتیندا ئاماژە دەکات – بە فراوانی ئـەدەبی میللـی لای کوردەکان. ئەم ئەدەبە کە پڕ لەئۆرگانیەتە ئەگەرچی پێشنگەیشتووە–.

بـەڵام نوسـەری ڕوسـی (ف. دیتتـل[33] ) سـەردانی کوردسـتانی کـردووە لەسـاڵی ١٨٤٠دا دەڵێت:– هەرگیز پێشبینیم نەدەکرد بەزمانی هۆزە کوردییەکان نمونەی ئەم ئەدەبیاتەو بەمشێوە زۆرە بوونی هەبێت–.

بـەناوبانگترین چـیرۆکی کلاسـیکیش لەئـەدەبی کوردیـدا بریتیـە لـە (مـەم و زیـن)[34] کـە شاعیری نەمری کورد ئەحمەدی خانی بەهۆنراوە دایڕشتوە هاوشێوەی چیرۆکی –رۆمیـۆ و جۆلیـت–ی دڵـداریی سـۆزدارییە. چـیرۆك و داسـتانی هـۆنراوەی تـر هەیـە کوردەکـان لەبۆنەکانی خۆشی و زەماوەند یان لە پرسە یان لەشەڕو جەنگاندا دەیڵێن، بەڵام ئەوەی

---

[32] – ب نیکیتین لا ٢٣٧ لەکتێبەکەیدا الاکراد چاپە عەرەبیە یەکەمەکە.

[33] –پێشەکی پرۆفیسۆر– کەناتی کوردێ– لا ٥ی کتێبی نوسەری ڕوسی م.ب رودنکۆ بەناونیـشانی –ئەحمـەدی خانی– (مەم و زین) کەلەساڵی ١٩٦٢دا لەمۆسکۆ بەچاپ گەیەنراوە.

[34] – چیرۆکی مـەم و زیـن وەرگێـڕاوە بـۆ زمانـە بیانیـەکان وەك زمـانی ڕوسـی و فەرەنـسی و عـەرەبی هەنـدێك لەبەشـەکانی کونـسوڵی ڕوسـیا لەئـەرزەڕۆم (ئەلکساندەر زابـا) چـاپی کـردووە لەسـاڵی ١٨٦٠دا لـەگۆڤاری Asiaatique Melange بەرگی سێیەم بەزمانی فەرەنسی.

جێگەی داخە بەشی هەرە زۆری لەناوچووەو نەنوسراوەتەوە یان نەپارێزراوە بۆ ئەم نەوەیەمان.

ئەدەبی کوردی سەرلەنوێ لەسەدەی نۆزدەهەمدا بوژایەوە، لەگەڵ دەستپێکردن و دەرکەوتنی نەتەوەی کوردیداو، لەگەڵ یەکەم سەرهەڵدانی شۆڕشی نیشتمانی کوردیدا، بەڵام هۆنراوە یان شیعر زاڵ بووە بەسەر هەموو بوارەکان لەئەدەبی کوردیدا.

بەڵام چیرۆکی درێژ ئەدەبی کوردی هێشتا بەهۆی نەبوونی یان کەمییەوە دەناڵێنێت: یەکەم چیرۆکی کوردی درێژیش بریتیە لە (شوانی کورد) کە نوسەری کوردی سۆڤیەتی(ئەرەبی شەمۆ) دایناوەو هەروەها وەرگێڕاوە بۆ فەرەنسی.

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدیش سێ چیرۆکی کوردی درێژی هەیە بەڵام چاپ نەکراون.

بەڵام چیرۆکی کورت ئەوا سەرلەنوێ لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا دەستی بەدەرکەوتنەوە کرد ئەمەش لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری گەلاوێژ- و هی تر، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدیش باشترین یەکەم چیرۆکنوسی کوردییە چیرۆکە کورتەکانی بڵاوکردەوە کە رووداوەکانی لەسەر زەوی کوردستان روویانداوەو لەناو دڵی کۆمەڵگەکەی و گوندەکەیدا کە وێنای کۆششی جوتیارەکان و کڵۆڵیەکانیانی کردووە، هەروەها کۆششی نیشتمانپەروەرە شۆڕشگێڕەکان. ئەو چیرۆکەی ناوبانگی پەیداکرد کە وەسفی پاڵەوانیەتیەکانی سۆڤیەتیەکان دەکات لەکاتی جەنگدا لەدژی نازیەکان کەبەناونیشانی (لەوڵاتی پاڵەوانەکاندا)یە بەڵام مامۆستا عەلائەدین سوجادی و موحەڕەم محەمەد ئەمین و مەم چیرۆکیان نوسیوە لەبارەی ژیانی کۆمەڵایەتی کوردەکان و باسکردنی ژیان و گوزەرانیان و خەباتیان لەپێناو ژیانێکی باشتردا. مامۆستا شاکر فەتاحیش لەچیرۆکەکانیدا زیاتر بایەخی بە لایەنە پەروەردەیی و ئەخلاقیەکان داوە گرنگی داوە بە ئاراستەکردنی لاوەکان ئاراستەکردنێکی نیشتمانی و ئەخلاقی رێکو ڕاست. دکتۆر رەحیمی قازیش چیرۆکێکی بەزمانی کوردی لەبارەی -پێشمەرگە-وە بڵاوکردۆتەوە رووداوەکانی لەسەر زەوی کوردستان- لەناوچەی مەهاباد- روویانداوە ئەمیش هەروەها لەچیرۆکە درێژە سەرکەوتووەکانە باس لە کۆششی جوتیارەکان و زەحمەتکێشە نیشتمانپەروەرە کوردەکان دەکات.

بـەلآم ئـەدەبی کـوردی بەشـێوەیەکی مەترسـیدار بەدەسـت کـەمیی چـیرۆکی درێـژەوە دەناڵێنێت، بەپێچەوانەی چیرۆکەوە ئەوا ئەدەبی کوردی دەوڵەمەندە بەشیعرو شـاعیران و لەنێو کوردەکاندا لەماوەی چەندین سەدەی ڕابردوودا چـەندین شـاعیر بەدەرکـەوتوون لەنمونەی:

ئەحمەدی خانی، مەلای جزیریی، عەلی حەریریی، مەولەوی، نالی و سالم و حـاجی قـادری کۆیی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی و مەولانا خالیدی شارەزووریی.

لەسـەدەی بیستەمیـشدا شـاعیرانی نمونـەی پیرەمێـردو گـۆران و بێکـەس و هـەژارو جگەرخوێن و کامەران و'دەیانی تر بەدیارکەوتوون.

هەروەك چۆن چەندین ئەدیبی کورد دەرکەوتوون بە بەرهەمەکانیان لەزمانی عـەرەبی و فارسیدا لەناویاندا چەند کەسێك بەنمونە باسدەکەم ئـەوانیش مـیری شـاعیران (ئەحمـەد شەوقی)و شاعیری عێراقی ناسراو (جمیل صدقی زەهاوی)و شاعیری گـەورەی ئێرانـی — ئەبولقاسمی لاهوتی— زانای زمانەوانی— کرد علی— کوردی سوریاو ئەوانی تریش.

\ئەدەبی کوردی خـاوەن تایبەتمەندییـەکی مرۆیـی و سـۆزدارییە، هـەروەها بـە وتنـەوەو پیاهەڵدانی بە خۆشەویستی و دڵداریی و خەباتە شۆرشگێرییەکانی گەلی کـورد و جـوانی سروشـت و خۆشەویـستی کـوردو کوردسـتان. تێیـدا ئاراسـتەی پێـشکەوتنخوازی و دیموکراسی دەرکەوتووە هەر لە سیەکانی سەدەی بیـستەمەوە لەسـەر دەسـتی ئەدیبـە میللیەکان ئیبراهیم ئەحمـەد، بێکـەس، ع.و. نـوری، گـۆران، و پاشـانیش جگـەرخوێن و دلزارو دڵدارو کامەران و ئەوانی تریش.

بۆ ئاشناکردنی خوێنەریش بەچەند ڕاستیەك لەبارەی ژیانی ئەدیبە کوردەکانـەوە، نـاوی هەندێکیان دەهێنین و پـۆزش دەهێنینـەوە بـۆ ئـەوانی تـر کەبـەهۆی کـەمی بوارەکـەوە نەمانتوانیوە ناویان بێنین.

ئەوەیش دەیەوێت قوڵبێتەوە یان بەشـێوەیەکی فـراوانتر لێکۆڵینـەوە لـەژیانی ئـەدیبانی کورد دا بکات ئەوا پێویستە بگەڕێتەوە بۆ کتێبەکـەی مامۆسـتا عەلائـەدین سـوجادیی— مێژووی ئەدەبی کوردی و دیوانەکانی شاعیرانی کوردو ژمارەکانی گۆڤاری گەلاوێژ.

## (هەندێك لە ئەدیبانی كورد هەڵدەبژێرین)[٢٥]

### ١- عەلی هەریری:

لەساڵی ١٠٠٩ز لە شارۆچكەی هەریر- قەزای شەقلاوە- هەولێر لەدایك بووە دیوانە شیعرێكی بەناوبانگی هەیە و شیعرەكانی جوانن و زیاتر بەلای شیعری وەسفی و دڵداریی و صۆفیگەریدا چووە.

### ٢- مەلای جەزیریی

ناوی شێخ ئەحمەدە لەبۆتان لەدایك بووە، چەندین شیعری هەیە لەبارەی عەشق و ئیلاهیات و تەصەوفەوە دیوانێكی ئارەزولێكراوی هەیە لای كوردەكان.

### ٣- فەقێ تەیران

ناوی مەحمودە لەساڵی ١٣٠٢ ز لەشارۆچكەی -كس- لەدایك بووە دوو ڕشتەی هۆنراوەیی گەورەی هەیە بەناوی- شێخ ستانی- و چیرۆكەكانە - برسیا- هەروەها هۆنراوەی- ئەسپی رەشی هەیە- هەروەك چۆن كتێبێكی هەیە بەناوی - م.ه لەبارەی تەصەوف و ئیلاهیاتەوە.

### ٤-ئەحمەدی خانی

شاعیری دیارو عاشق ئەحمەدی خانی لەهۆزی -خانیان- ە و خاوەنی دیوانی مەم و زین-ی بەناوبانگە كە هۆنراوەیەكی چیرۆكئامێزو بێهاوتایە، وەك -ئەلیازەو هۆمێرۆس وایە لەئەدەبی كوردیدا. كتێبی- ئەوبەهار-ی هەیە بەهەردوو زمانی عەرەبی و كوردیە زانای ئەكادیمی سۆڤیەتی ئای. أ. ئۆربیلی[٢٦] لەبارەیەوە دەڵێت:

" كاتێك باس لەوە دەكەین كە شاعیرو ئەدیب نوساوە بەگەلەوە و بەرهەمەكانی لەكانگای جەماوەرەوە هەڵقوڵاوە، بێ ئارەزوی خۆمان ناچار دەبین كە بەراوورد لەنێوان

---

[٢٥] - پێویست ئەوە باس بكەم من ئەو زانیاریانەم لەبارەی شاعیرە یەكەمینەكانەوە لە كتێبی (كێشەی كورد بە پێنوسی دكتۆر- بلە ج شیركوە)وەرگرتووە. بەلام ئەو زانیاریانەی كە هاتووە لەبارەی شاعیرە نوێكانەوە ئەوا پشتم بەستووە بە كتێبی -مێژووی ئەدەبی كوردی- مامۆستا عەلائەدین سوجادیی و سەرچاوەی تر.

[٢٦] -پێشەكی كەناتی كوردۆ-كوردیف- لا ٩ بۆ كتێبی (ئەحمەدی خانی- مەم و زین) وەرگێڕاوی روسی ئەم دیوانەیە ئەدیبی سۆڤیەتی م.ب رۆدنكۆ پێی هەستاوە و ساڵی ١٩٦٢ لەمۆسكۆ چاپكراوە.

سیَ گەورە شاعیردا بکەین لەخۆرهەلاَت ئەوانیش فیردەوسی ئێرانی و روستاولی جیۆرجی و ئەحمەدی خانی کوردییە".

ئەم شاعیرە گەورەیە ناوبانگێکی جوانی هەیە لەنێوان کوردەکاندا و دیوانەکەی –مەم و زین– بلاَوەو چەندین کەس لەبەری دەکەن و لەشەوانی درێژی زستاندا لەکۆڕو دانیشتنەکاندا دەیلێنەوە لەمبارەیەوە زانای سۆفیەتی ئۆربیلی دەلێت[37]" گەلان ئەحمەدی خانیان لەبیرکرد بەلاَم لەواقیعدا ئەحمەدی خانی حەقی خۆیی پێنەدراوە تەنها لەنێوان کوردەکاندا نەبێت کە هەرگیز لەیادیان نەکردووە. ئەو لەکوردستاندا بەناوبانگەو هەموو کوردەکان بەشاعیری میللی خۆیانی دەزانن و لەپێشەوەی شاعیرانی گەلی کوردەوەی دادەنێن".

## ٥- بابا تاهیری هەمەدانی

شاعیرێکی صۆفی ئیلاهیە خاوەن کۆمەلێك هۆنراوەی خۆشەویستی ناسکە بەلاَم لەوپەڕی داخران و قورسیدایە و بەشێوەزاری –گۆران– نوسراوەتەوە.

لەساڵی ١٠١١ز کۆچی دوایی کردووە و شیعرەکانی بە مەزنی خەیاڵ و جوانی ئیلهام و نمونەی (ناری) بۆ بوون و هەڵچوونی سۆزو هەروەها بە ناسکی و سادەیی شێوازەکەی ناسراوە لەوەسفکردنی ئازارو نەهامەتیەکاندا.

## ٦- عەلی تەرمۆکی

یەکێکە لە نەمرەکان لەئەدەبی کوردیدا و یەکەم کەس بووە کە ڕێزمانزانی وتەسازکردن (صرف و نحو)ی بۆ زمانی کوردی داناوە چەند نوسینێکی هەیە، لەسەدەی چوارەمی کۆچیدا ژیاوە. کتێبێك لە پەندەکانی کوردی کە هی دکتۆر بەدرخان و لوسی پۆل مارگریتەو بەزمانی فەرەنسی دەرچووە وەرگێڕانی هەندێك لە چیرۆکەکانی ئەم ئەدیبەی لەخۆ گرتووە.

## ٧- نالی

لەساڵی ١٨٠٠ ز لەدایك بووە ناوی مەلا خدرە زۆرترین شیعرەکانی لەجۆری خۆرئاوایی ناسکە. لەئستانە چەند شیعرێکی نوسیوە کەتێیدا وەسف و ستایشی کوردستان دەکان

[37] – هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ١٣.

گوزارشت لە نامەزرۆیی و تاسەکردن دەکات بۆ نیشتمان ئەو شیعری بەزمانەکانی کوردی و فارسی و تورکی دەهۆنیەوە.

### ٨- مەولەوی

ناوی عەبدولڕەحمانە و لەهۆزی (تاوگۆزی)یە– لەسەدەی نۆزدەهەمدا ژیاوە. شاعیرێکی داهێنەری مەزنی هەست ناسك بووە، هەروەها سۆفیەکی فرە دڵسۆزو هەستو شعورێکی ڕاستگۆیانەی هەبووە. شێوازێکی هەیە لەوپەڕی ئەفراندندایە لەشیعردا سەرەڕای ئەو هێزو توانایەی کە لەشیعرو سەروادا هەیبووە، هەروەها شێوازە نوێیەکانی داهێناوە لەشیعردا.

### ٩- حاجی قادری کۆیی

سەرکردەی شاعیرە نیشتمانپەروەرە کوردەکانە بەپێی گوزارشتی مێژوونوسی ئەمین زەکی بەگ حاجی شاعیرێکی نیشتمانیی و بە پەرۆش بووە، لەسەدەی نۆزدەییەمدا ژیاوەو هەر لەم سەدەیەدا کۆچی دوایی کردووە.

لەگەڵ بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردیدا ژیاوە لەسەرهەڵدانیەوە و بەئازارەوە روخانی میرنشینە کوردیەکانی بینیوە لەسەر دەستی عوسمانیەکاندا و توندکردنی تەوقی کۆیلایەتی لەگەردنی گەلەکەی، حاجی بە سەروەرییەکانی کوردەکاندا هەڵیداوەو بانگیکردون بۆ یەکگرتن و خۆرۆشنبیرکردن و چەکداربوون بە زانست و مەعریفەو چوونە ناو کۆشش و خەباتی شۆڕشگێڕییەوە بۆ رزگارکردنی نیشتمان.. شیعرەکانی بەوە ناسراون کە هۆگریی زۆریان پێوە دیارە بۆ کوردستان و خۆشەویستی قوڵی بۆ کوردەکان و گرنگیدانی بەزمانەکەی یەکێکی ترن لەخەسڵەتەکانی شیعرەکانی ئەم شاعیرە. حاجی قادری کۆیی شاعیرێکی جەماوەری بوو بەزمانێکی سادە هۆنراوەی دەهۆنیەوە، گوزارشتی لە هیواو هەستەکانی جەماوەر و خواستەکانیان دەکرد بەرەو پێشکەوتن و ئازادی .. عوسمانیەکان زۆربەی هەرە زۆری هۆنراوەکانیان سوتاند و ئەوەی کە ماوەتەوە زۆر خواست و ئارەزووی لەسەرە لەنێو کوردەکاندا.

### ١٠- پیرەمێرد[٣٨]

ناوی حاجی توفیقە لەمەزنترین شاعیرانی کوردستانە لەسەدەی بیستەمدا، هۆنراوەکانی بەهێز و تۆکمەیەو ئەفراندنی گوزارشت و لێکچوونی رەوانبێژیان تێدایە، شاعیرێکی دیارو خاوەن بەهرە بوو لەهەموو بوارەکانی شیعرو، داستان و سرودو جۆرەکانی رەوانبێژیدا، هەروەك چۆن شاعیرێکی داهێنەرو ئەفرێنەرەو بەهرەداربوو- بەدرێژایی ژیانی بەکاری رۆژنامەنوسیەوە خەریك بووە لەعێراقدا، رۆژنامەکانی ژین و ژیانەوەو ژیانی دەرکردووە.

### ١١- گۆران[٣٩]

ناوی عەبدوڵڵایە مامۆستای شیعری نوێیە لەزمانی کوردیدا، هەروەك چۆن شاعیری هەرە گەورەیە لەوەسفکردنی جوانی و دڵداریدا، لەم بوارانەدا داهێنانێکی جوانی کردووەو بۆتە یەکەم سوارچاکی ئەم بوارە، شاعیرێکی هەست ناسك بووە گوزارشتی سەرسامکەر و شێوازی جوانی هەبوو، وەسفەکانی جوان و پڕ لەرەوانبێژی بوون، لەبزوتنەوەی نیشتمانیدا کاری کردووە لەکۆتایی تەمەنیدا بەرەو ئاراستەی چەپ چوو گۆرانی بۆ جەژنەکانی کرێکاران و ئاشتی هۆنراوەی نوسیوەو پیایاندا هەڵیداوە هەروەها لەبزوتنەوەی پشتیوانانی ئاشتیدا کاری کردووە تابۆتە ئەندامی ئەنجومەنی ئاشتی جیهانی، لەساڵی ١٩٦١ مردووە.

### ١٢-ئیبراهیم ئەحمەد[٤٠]

---

[٣٨] -هەتا ئێستا دیوانەکەی بەتەواوی چاپ نەکراوە. چیرۆك و شیعرەکانی لەرۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکاندا بڵاوبونەتەوە. بەشێك لە (مەم و زین)ی بە شیعر وەرگێڕاوە بۆ سەر شێوەزاری سلێمانی، هەروەها داستانێکی لەبارەی دوانزە سوارە بەناوبانگەکەی مەریوانەوە نوسیوە.

[٣٩] - چەند دیوانێکی چاپکراوی هەیە بەلام هەموو شیعرەکانی لەخۆنەگرتووە گۆڤارو رۆژنامە کوردییەکان چەندین هۆنراوەیان بڵاوکردۆتەوە، هەروەك چۆن ژمارەیەك شیعری وەرگێڕاون بۆ زمانی عەرەبی و لەگۆڤارە عێراقیەکاندا بڵاوکراونەتەوە.

[٤٠] - هۆنراوەو وتارەکانی هەر لەساڵی ١٩٢٣وە لە (دیاری لاوان)دا بڵاوکراونەتەوە پاشانیش لە (گەلاوێژ)و گۆڤاریو رۆژنامە کوردییەکانی تردا وتارو چیرۆکەکانی لەگەلاوێژدا بڵاوکراونەتەوە بەلام وتارە سیاسیەکانی ئەوا

ئەدیبێکی کوردی ناسراوە بە باشترین نوسەرو چیرۆکنوسی کوردی دادەنرێت کە رکابەری نیە چەندین هۆنراوەی جوانی نوسیوە لەبوارەکانی نیشتمانپەروەری و خۆشەویستیدا بەلآم ئەم بەرهەمانەی کەمن سەرەرای بەها ئەدەبیەکەیان لەرووی پێشرەویان بەرەو ئاراستەی پێشکەوتنخوازی لەئەدەبی کوریدا. چیرۆکە کورتەکانی چاپکراون و لەگۆڤاری گەلاوێژدا بلآوبونەتەوە لە کاتی خۆیدا.. بەلآم چیرۆکە درێژەکانی هێشتا بلآونەبونەتەوە (نوسەر مەبەستی تا سالّی ١٩٧٠یە) خاوەن شێوازێکی ووردو دەربرین و گوزارشتی نایابە، هەروەها هەولّیداوە ووشەی کوردی بەکاربهێنێت مەگەر بەدەگمەن ووشەی بیانی بەکارهێنابێت.

### ١٣ فایەق بێکەس[41]

بێکەس شاعیری میللی شورشگێریی ناسراوە لەکوردستان. لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا ژیاوە. شیعرەکانی مۆرکێکی نەتەوەیی و ستایشکردنی کوردستانیان پێوە دیارە هەروەها بانگەشەکردن بۆ یەکخشتنی ریزەکان و کۆشش لەدژی داگیرکەران و خۆراگری و بەرەنگاربوونەوە..

بەشداری لەخەباتەکانی گەلی کوردماندا کردووە و رۆلّێکی دیاری گێراوە لەراپەرینی ٦ ئەیلولی ١٩٣٠ دژی پەیماننامەی هاوپەیمانی نێوان عێراق و بەریتانیا. چەندین جار دەستگیرکراوە.

### ١٤- عەلائەدین سوجادی:

نوسەرو چیرۆکنوسێکی کوردی ناسراوو ئەدیبێکی بەناوبانگە خاوەن چەندین چیرۆك و نوسینە بەشدارییەکی گەورەی لەبواری رۆژنامەگەری کوردیدا کردووە، بەرێوەبەری کارگێریی گەلاوێژ بووە بۆ ماوەی نزیکەی ٩ سالّ هەروەك چۆن خاوەنی گۆڤاری نزار

---

لەرۆژنامەکانی حزبی دیموکراسی کوردستانیدا. رزگاری. خەباتی کوردستان. خەبادا بلآوبونەتەوە کە خۆی سەرنوسەری بوو لە ١٩٥٩-١٩٦١ کومەلّێك لە چیرۆکە کورتەکانی لەکتێبێکدا لەسالّی ١٩٦٠دا بلآوکراونەتەوە.

[41] -گۆڤارو رۆژنامەو کتێبە کوردیەکان چیرۆکە جۆراوجۆرەکانیان بلآوکردۆتەوە، بەلآم دیوانەکەی لای هاورێی دلّسۆزی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بوو. لەسالّی ١٩٦١ دیوانەکەی دایە چاپخانەی صلاح الدین بۆ ئەوەی چاپی بکات لەژێر چاپدا بوو کاتێك کە پۆلیس هەلّیکوتایە سەر چاپخانەکەو دەست بەسەردا گرت و پاشان دواتر دیوانەکە گەرێنرایەوەو ئێستا لەرێدایە بۆ چاپ.

بووە کە گۆڤارێکی سیاسی هەفتانە بووە.. زۆربەباشی زمانی کوردی زانیوەو کاری پێکردووە، شێوازەکەی ناسك و ئاسانە بۆ تێگەیشتن، گوزارشتی باشە، خاوەنی چەندین نوسین و کتێبە، بەباشترین نوسەرانی هاوچەرخی کورد دادەنرێت زیاتر بایەخی بە ئەدەبی کوردی و مێژووەکەی داوەو لەو بوارەدا خەریك بووە شانبەشانی راپەرینی رۆشنبیری کوردیی رۆیشتووە هەر لەجەنگی جیهانی دووەمەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان.

**١٥- جگەرخوێن[٤٢]**

شاعیرێکی نیشتمانی پێشکەوتنخوازی کوردییە لەسوریا بەبالآی کوردستان و خەباتەکانی گەلی کوردیدا هەڵدەدات. هەروەك چۆن ستایشی کۆششەکانی گەلی سوریی دەکات و گۆرانی بۆ ئاشتی و بزوتنەوەکانی گەلانی رزگاریخواز دەڵێت و لەهۆنراوەکانیدا شەهیدانی کوردستانی شکۆدارکردووە.. شێوازی میللی و سادەو ئاسانە گوزارشتەکانی باشن و هۆنراوەکانی بەناوبانگن لەنێو کوردەکاندا لەژیانیدا چەندین جار روبەڕوی زیندانیکردن و ئاوارەیی بووەو تاڵی بێبەشبوونی لەخەبات چەشتووە.

**١٦- کامەران[٤٣]**

شاعیری نیشتمانپەروەری لاو – محمد ئەحمەد تەها– شاعیرێکی بەهرەدارەو بەزۆریی هۆنراوە لەسەر شێوازی نوێ دادەرێژێت، شێوازی باشە، گۆرانی بە جوانی کوردستان و خەباتەکانی و خەباتی گەلاندا دەڵێت، شیعری چەندین شاعیری جیهانی وەرگێڕاوە بۆ زمانی کوردی بەتایبەتی لەبارەی پاپلۆنیرۆداو لۆرکاو ئەرگۆن.. هۆنراوەیەکی جوانی هەیە لەوەسفکردنی خەباتی جەزائیرو خۆراگریی پاڵەوانەکەی (جەمیلە) کە بەناوبانگە

---

[٤٢] –چەند دیوانێکی شیعری چاکراوی هەیە بەلآم هەموو هۆنراوەکانی لەخۆناگرێت و دیوانی دووەمیشی (شۆڕشی ئازادی) ئاراستەی شیعری چەپی پێوە دیارە دوو کتێبی هەیە لەبارەی رێزمانی زمانی کوردییەوە و لەبەغدا چاپکراون.

[٤٣] – چەند نامیلکەیەکی چاپکراوی هەیە کە کۆمەڵێك لەهۆنراوەکانی و چوارینەکانی لەخۆگرتووە بەلآم هۆنراوە شۆڕشگێڕیەکانی تەنها بەشێکیان نەبێت چاپنەکراون جگە لەهۆنراوەکانیشی لەگەڵ مامۆستا جەمال شاڵی پارێزەردا بەشداری کردووە لە دەرکردنی گۆڤارە رۆشنبیرییەکەیدا (رۆژی نوێ) کە لەساڵی ١٩٦٠-١٩٦١) لەسلێمانی دەردەچوو ئەم گۆڤارە کە خزمەتێکی دیاری پێشکەشکردووە بەرۆشنبیریی کوردی و هۆشیاریی نیشتمانی حکومەتی ژەنراڵ عەبدلکەریم قاسم دایخست.

لەعێراقـدا، شـاعیرێکی پێـشکەوتنخوازی میللیـە هـەروەك چـۆن بـە باشـترین وتاربێـژ دادەنرێت و چاوەڕوانی ئایندەیەکی گەش و رۆشنی لێدەکرێت.
بێجگە لەمانەش کە باسمان کردن و ناومان هێنان دەیان شاعیرو ئەدیبی تری کورد هەن بەهۆی کەمی بوارەکەوە نەمانتوانیوە ناویان بێنین، بـەلأم دەکرێـت ئامـاژە بـە هەنـدێك لەناسـراوەکانیان بکـەین بەتایبـەتی: نـاری، شـێخ رەزای تاڵـەبانی، مـەولانا خالیـدی شارەزوری، مستەفا بەگ، ئەحمەد موختارجاف، ئەمین فەیزی بەگ، زێوەر،ع.و. نـوری، عوسمان سەبری، تاهیر بەگ، سالار سەعید، مەلا محمد جەلی زادە، دکتۆر نورالدین زازا، دلزار، عوسمان عەونی ئەحمەد کۆر، بێخود، صالح دیلان، عوسمـان عـوزێریی و دەیـانی تر.
لەیەکێتی شۆڤیەتیش چەندین ئەدیبی کورد هەیە کە بەشـداریان کـردووە لەخزمـەتکردن بەئەدەبی گەلی کوردیان و زمانەکەی.. لەنمونەی پرۆفیسۆر– قەناتی کوردۆ– کۆردیف– ئەرەب شەمۆ– جاسم جەلیل– و ئەوانی تر.

# سیفەت و خەسڵەتە نەتەوەییەکانی گەلی کورد

گەلی کورد وەك نەتەوەیەك خاوەن حاڵەتی دەروونی و هەستی نەتەوایەتی تایبەت بەخۆیەتی، هەروەها خاوەن خەسڵەتگەلێکی نەتەوەیی تایبەتە. توێژەران هاوڕان لەسەر ئەم بابەتە کە گەلی کورد ئازادی خۆشەوێت،بەوەفاو دڵسۆزە، حەزی لەنەجابەت و پیاوەتی و جوامێرییە سادەو راستگۆیە لەمامەڵەو پەیوەندییەکانیدا، بەئازایەتی و تورەیی ناسراوە زۆرێك لەخۆرهەلاتناسانی بیانی لەبارەی کوردەکان و سیفەتەکانیانەوە نوسیویانە لێرەدا هەندێکیان لێوەردەگرین:

مامۆستا باسیل نیکیتین لەکتێبەکەیدا– چەند تێبینیەك لەبارەی کوردەوە دەڵێت[٤]:

" بۆ خستنەڕوی پوختەیەك لەبارەی رەوشتی میللەتەکەوە پێویستە لەسەرمان باسی ئەوە بکەین کە لەشفرۆشی بەتەواوەتی لەناو کورددا بوونی نیە، هەربۆیەش بۆ دیاریکردنی یان ئاماژەدان بەو حاڵەتە ووشەی تورکی بۆ بەکاردەهێنن پیاوی کوردی ماڵی هەیە و زیاتریش یەك ژن دێنن، هاوسەرەکەی دەسەلاتێکی گەورەی هەیە لەژیانی ناخۆدا، بالاپۆش نیەو هاوسەرگیریش لەرێگەی خۆشەویستیەوە دەبێت، تاکی کوردی چالاکەو کاتێك کەوا کەسێك سەردانی کوردستان دەکات سەرسام دەبێت کە دەبینێت چ کۆششێك کراوە بۆ وەرگرتنی یان بەرهەمهێنانی سامان لەزەوی. تاکی کوردی ئازاو رەق و ساویلکەو بەخشندەیە بەسروشتی خۆی زیرەك و باشە. تاکی کوردی خاوەن نەجابەتەو دروشمی کەرامەت و جوامێریی و باش رەفتارییە، لەدژی هەر زۆرلێکردنێك هەڵدەچێت." مامۆستا ب . نیکیتین لە لا ١٠ لەکتێبەکەی (الاکراد) کە بەزمانی عەرەبیە دەڵێت: " کورد شانازی دەکات بە بنەچەو رەچەڵەکی خۆیەوە، دڵسۆزە بۆ سەرۆکەکەی، قوربانی بەخوێنی دەدات لەپێناو نەتەوەکەیدا، جەنگاوەرێکی ئازایەو حەزی لەجەنگەو جلی ورشەدار دەپۆشێت و حەزی پێدەکات. بەلام لەژیانی تایبەتیدا ئەوا باوکێکی خەمخۆرو مێردێکی دڵسۆزە و رێز لەژن و لەمناڵەکانی دەگرێت،

---

[٤] – مەسەلەی کوردی نوسەر بلە چ شیرکۆ لا ٧١ چاپی دووەمی عەرەبیەکەی بەغداد–١٩٦١ز. ئەو چاپەیە کە دەسەلاتدارانی قاسم پێش ئەوەی بلاوبێتەوە دەستیان بەسەردا گرت لەبازاڕدا کاتێك کەدەستیان بەسەر هەردوو چاپخانەی خەبات و صەلاحەدیندا گرت لەبەغداد دوای بەرپابوونی شۆڕشی کوردی ساڵی ١٩٦١ (مانگی ئەیلول).

لەکاتەکانی بەتاڵیدا تاکی کوردی حەزی لەگۆرانی و سرودی خۆشەوستی و جەنگییە.. دەمێك شێرگیرو دەمێکیش خۆویستە، بەلأم ئەو هەمیشە زۆر زیرەکە، بەحەماسەو زوو تورە دەبێت، سروشت و ئەوەی تێیدایە لەچیاو دۆڵ و ئاو مێرگەکانی خۆش دەوێت.
لەئینسکلۆپیدیای گەورە لە بەرگی (٢١)دا هاتووە[٤٥]
(هەستو سۆزی خێزانی لەنێوان کوردەکاندا زۆر گەشەسەندو بەهێزە ئەوان دڵسۆزن، دەرون پاکن، میواندۆستن و ژنەکانیان زیاتر ئازادیان هەیە لەژنانی تورك و بێ بالأپۆشی دێنە دەرەوە فرە ژنی لەناو کوردەکاندا نیە تەنها لەناو دەوڵەمەندەکانیاندا نەبێت، تاکی کوردی مۆسیقاو سەمای خۆش دەوێت خۆشەویستیەکی مەزن"
مسیۆ (هازی بندر) لەکتێبەکەیدا- گەشتێك بۆ ولأتی کوردان دەڵێت[٤٦]:
(بەکورتی کوردەکان پیاوانی جوان و بەهێزو زیرەکن دوای ئەوەی بەشارستانیەت رۆشنبیر دەبن ئەوا بالأو باشتر دەبن...)
مستەر ئی. بی. سۆن لەکتێبەکەیدا- دوو ساڵ لەکوردستان دەڵێت[٤٧]:
( لای کورد دڵسۆزییەکی هەمیشەیی و رێز هەیە بۆ ووشە و خزمدۆستە، هەروەها مامەڵەی نایابە لەگەڵ ژندا و زەوق و هەستێکی ناسکی هەیە شیعری خۆشدەوێت و ئامادەیە بۆ قوربانیی و شانازیەکی جوان دەکات بە نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەریەوە: ئەمە نمونەی کوردە).
لەمستەر- ئی. بی سۆنەوە نیکیتین ئەمە وەردەگرێت[٤٨]

[٤٥] - سەرچاوەی پێشوو لا ٧٢ چاپی دووەمی عەرەبیەکەی.

[٤٦] - زار مسیۆ (پۆل بندر) کوردستان ساڵی ١٨٨٧ هەروەها هەر لەمبارەیەوە نوسیویەتی و دەڵێت" کوردەکان خاوەنی ئابروو کەرامەتن بەتەواوەتی پابەند دەبن بە بەڵێنێکیانەوە کە دەیدەن، ئەگەر بەڵێنیان پێدلیت کە بەسەلامەتی دەتگەیەننە شوێنێك ئەوا بێ دوو دڵی لەوە دڵنیابە.

[٤٧] - سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٧٢.

[٤٨] - ب. نیکیتین سەرچاوەی پێشوولا ٦٣- سۆن مەبەستی لەو کوردستانەیە کەپێش جەنگی جیهانی یەکەم بینیویەتی و پێش ئەو پێشکەوتنەی کە لەماوەی پەنجا ساڵی رابردودا رویداوە لەلایەنەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و پیشەسازی و تەندروستیەوە.

ئەگەر بمانەوێت دادپەروەربین لەبڕیاردان بەسەر کوردەکاندا ئەوا دەبێت بەراوورد بکەین لەنێوان کوردستان و ئەوروپادا هەر لە ٦٠٠ ساڵەوە هەتا ئەمڕۆ ئەگەر بەراووردمان کرد لەنێوان ئەورووپیەك و کوردێکدا ئەوا بڕواناکەم تای تەرازووی ئەمی دواینیان قورستر بێت، ئێمە دەبینین لەنێو هەزار کورد دا- سەر بەهەر چین و دەستەیەك بن- کەسانی تاوانبارو کەمڕەوشت زۆر کەمترن لەوەی کە دەیبینینەوە لەناو هەمان ئەم ڕێژەیەدا لەناو ئەورووپیەکاندا[٤٩] ئایا ئەوەی لەم ووتەیەدایە وەڵامێکی بەس نیە بۆ هەموو ئەوانەی کە هەوڵیانداوە وا وێنای کوردەکان بکەن کە ڕێگرو دڕندەن؟

بەڵام پسپۆڕیی سۆڤیەتی لەکاروباری کوردەکاندا مامۆستا ئاکۆبۆف لەئەتروحەکەیدا کەبەناونیشانی - دەربارەی مەسەلەی لێکۆڵینەوەی نەتەوەیی کوردەکانی ئێران دەڵێت[٥٠]:

(تایبەتمەندیە تایبەتیەکان لەپێکهاتەی لای دەروونی تاکی کوردیدا ئەوەیە هەست بەخۆیی و شانازیکردنی نەتەوەیی تێدایە تاکی کوردی ئازادی خۆشدەوێت و نەتەوەکەی خۆی خۆشدەوێت و هەمیشە سازە بۆ خەبات و تێکۆشان لەپێناو ئازادی خۆیی و سەربەخۆییدا، لەسیفەتەکانی یەکگرتوویی و هەستکردن بەدەربازکردنی هاوبەرامبەر و

---

[٤٩] - E.B.soane ساڵی ١٩٠٩سەردانی کوردستانی کردووە بەنهێنی و خۆیی پەنهان کردووەو وای داناوە کە فارسە بەڵام هەندێك لەکوردەکانی جاف ناسیویانەتەوەو ڕێزیان لێگرتووە. کتێبەکەی لەساڵی ١٩١٢دا بڵاوکردۆتەوە بەزمانی ئینگلیزی لە لەندەن تێیدا تێبینیەکانی خۆی خستۆتەڕوو سەبارەت بەوە کە لەو گەشتەیدا بینیویەتی بەناوی(Through Mosopotamia and Kurdistan in disguise)

[٥٠] -بگەڕێرەوە بۆ ئەتروحەکەی دکتۆر سەید عەزیز سەید عەبدوڵلای شەمزینی کە بڕوانامەی دکتۆرای پێوەرگرتووە لەئەکادیمیای زانستە سۆڤیەتیەکان لە لینینگراد کەبەناونیشانی (بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد)ە کە -خەبات- چەند بەشێکی لێ بڵاوکردۆتەوە.

دکتۆر شەمزینی تێکۆشەرێکی کوردی ناسراوە سەر بەخێزانی نەهرییە کە بەتێکۆشانی نیشتمانیی ناسراوە کە جەمسەرەکەی شێخ عوبەیدڵلای نەهری بوو سەرکردەی شۆڕشی-١٨٨١- بەڵام شێخ عەبدولقادر باپیری دکتۆر شەمزینی و شێخ محەمەد، مامی.. لەشۆڕشی ١٩٢٥کوردیدا لەتورکیا لەسێدارەدران شەمزینی ئەندامێکی دیاربوو لەحزبی هیوادا پەیوەندی کردووە بەشۆڕشی بارزانەوە لەساڵی ١٩٤٥دا پاشان بەکۆماری کوردستانی دیموکراسیەوە کە نارنویوتی بۆ تەواوکردنی خوێندنە سەربازییەکەی لەباکۆ و تاساڵی ١٩٥٨ لەیەکێتی سۆڤیەت ماوەتەوە کە خوێندنەکەیی تەواوکردووە گەڕایەوە بۆ عێراق.

خۆشویستنی دیموکراسی کە بەشێوەیەکی مێژوویی لای خۆی دروست بووە هەروەها ئازایەتی و کارکردن و لێبوردنی ئایینی و پاکوخاوێنی رەفتارو ژیانی ناوماڵی و روخۆشی فیتریی و گەشەبین بەخێرو باشە.

نوسەری روسی- بنزنکرە- لەکتێبەکەیدا- یاداشتەکان لەبارەی کوردستانەوە- لەبارەی کەسی کوردییەوە دەڵێت[٥١]:

" کەسی کوردی بەسروشتی خۆی رەفتار باشە، بە روخۆشی و رەفتاری چاکی و خۆش مەشرەبی دەناسرێتەوە، سادەیە لەگفتوگۆکانیدا دوورە لەزۆرلەخۆکردن تا ئەوپەری بەخشندەو میهرەبانە لەگەڵ میوانەکانیدا."

بەڵام -ریچ-ی بەریتانی کە لەساڵی ١٨٢٠دا سەردانی کوردستانی کردووە دەڵێت[٥٢]: " کوردەکان میللەتێکی بەسۆزو میهرەبانن و زۆر کۆمەڵایەتین، خۆبەزلزانی پووچ ناناسن و بێ مانایە لایان هەروەك چۆن ئیرەیی بەیەك نابەن، نەمبیستووە لەکوردێك پاشەملە زەمی دوژمنێکی بکات ئیتر رادەی دوژمنایەتی نێوانیان هەرچەندە بووبێت، تاکی کورد چەکەکەی خۆشدەوێت و شارەزایەتی".

خۆرهەڵاتناس - هارتمان- لەکتێبەکەیدا- پێنج وتار لەبارەی ئیسلامەوە لەبارەی کوردەوە دەڵێت[٥٣]" لەروخساری دلاوەرییانەی تاکێکی کوردیدا ئاشتی و هەستی قوڵ و ناسك حەشاردراوە. گەواهییە زۆرەکانیش ئەوە دەسەلمێنن کە سروشت عەقڵێکی سروشتی و توانای زوو دەرککردن و تێگەیشتن و، بڕیاری دادپەروەرانەی بەخشیوەتە مرۆڤی کورد".

---

[٥١] - سەرچاوەی پێشوو.

[٥٢] - بگەڕێرەوە بۆ مەسەلەی کورد بەپێنوسی بلە چ شێرکۆ لا ٧٦ چاپی دووەم. خێزانی خوالێخۆش بوو (Claudius james Rich) لەساڵی ١٨٢٠ دا کتێبەکەی بلاوکردۆتەوە کەلەبارەی سەردانەکەیەوەیە بۆ کوردستان.

ساڵی ١٨٣٦ کتێبەکە لەژێر ناونیشانی (Narrative of a Residence in Kurdistan)لە لەندەن بلاوکرایەوە.

[٥٣] - بگەڕێرەوە بۆ مەسەلەی کوردی لاپەرە ٧٦ چاپی دووەمی عەرەبیەکە کەلەکتێبی ( Funf vortrag uber den islam) وەرگرتووە.

مژدەدەر– وکرام– دەڵێت:

"کوردەکان گەلێکی بەهێزو بەهرەدارن و مامەڵەیان باشە لەگەڵ بەرامبەردا"[54]

بەڵام (رش)– کە ئامـاژەی بـەزۆرێك لەفەزیلەتـە کۆمەڵایەتیـەکانی کـورد کـردووە ئـەوا توێژینەوەکەی ئەمەی خوارەوە لەخۆدەگرێت لەڕای نوسەری ئەرمەنی–ئەبوفیان–[55]:

" دەتوانین بەکوردەکان بڵێین – سوارچاکانی (جەنگاوەرانی) خۆرهەڵات– بەهەموو ئەو ئامارژانەی کە ئەم ووشەیە لەخۆیی دەگرێت ئەگەر لەژیانێکی زیاتر شارستانیدا بژیبانایە. ئەویش لەبەرئەوەی کە سیفەتە هاوبەشەکانی ئەم گەلە بریتین لە: ئامادەیی هەمیشەیی بۆ جەنگان، دامەزراوەیی و فەرمانبەرداریی تەواویان بـۆ فـەرمانڕەواکانیان، بـەوەفاییان بۆ پەیمان و باش میواندارییان.. حـەزیان لـە سوارچـاکیە و ئـەو پـەڕی ڕێزیـان هەیـە بـۆ ژنان".

مامۆستا ب. نیکیتین لەبارەی ئەم ووتانەوە دەڵێت[56]:

" من دڵنیام ئەم خەسڵەتانەی کە بەشێوەیەکی گشتی داویانەتە پاڵ کوردەکان خەریکە تەواو هاوڕێکبێت لەگەڵ زۆربەی هـەر زۆری ڕای ئـەو گەشـتیارانەی کـە ماوەیـەکی درێـژ لەگەڵ کوردەکاندا ژیاون هەروەها دەڵێت:–سەرەڕای سروشتی جەنگاوەریان کوردەکـان حەزێکی زۆریان لەئازادییە و پابەندبونێکی پاڵەوانانەیان هەیە بە کەرامەتیانەوە.–

هـەروەها زۆرێکـی تـر لەوانـەی بـەئاگاو شـارەزان ئامارژەیـان بـە خەسـڵەتە باشـەکانی کوردەکـان داوە نمونـەی زانـای گـەورەی سـۆڤیەتی و هـاوڕێی دڵسۆزی گـەلی کوردمـان خوالێخۆشبوو – ئۆربلی– و خۆرهەڵاتناسی سۆڤیەتی فیلجیفسکی و شارەزا لـەکاروباری بزوتنەوەی نیشتمانی کوردیدا پرۆفیسۆر–برنتس– لەئـەڵمانیای دیموکراسـی و دکتـۆری لوبنانی–ئەدیب معوض– و باوکی بەڕێز– پاپا بیرابوای فەرەنسی و لوسی پول مارگریت و دەیانی تر.

---

[54] –سەرچاوەی پێشوو لا ٧٥ چاپی دووەمە عەرەبیەکە.

[55] – (الاکراد)ی باسیل نیکیتین لا ٦٧ چاپە یەکەمە عەرەبیەکە.

[56] –سەرچاوەی پێشوو لا ٦٨.

## بەشی دووەم

# بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد

*سەرهەڵدانی بزوتنەوەکە
*شێوازی بزوتنەوەکە
*سروشتی بزوتنەوەکە
* پەرەسەندنەکانی
*ئامانجەکانی

# سەرهەڵدانی نەتەوەی کوردی و بزوتنەوە رزگاریخوازەکەی

سەدەی شانزەیەمی زایینی ململانێیەکی ترسناکی بەخۆوە بینی لەنێوان هەردوو دەوڵەتە ئیسلامیەکەدا (ئێرانی– شیعە)و (تورکی– سوننە) لەپێناو سەروەری و زاڵبوون بەسەر ولآتانی ئیسلامیدا.. و خۆرهەلآتی ناوەڕاست بەتایبەتی، تێیدا چەك و شێوازەکانی فێڵکردن و چەواشەکردن و لەخشتەبردن و فریودان و هاندان بەکارهێنرا، ئەمەش بووە مایەی نەهامەتی و وێرانکاریی و کوشتن و تێکدان و کاولبوون بۆ گەلانی خۆرهەلآتی ئیسلامی لەفارس و کوردو تورك و عەرەب، لەبەرئەوەی کوردستانیش ولآتی جیاکەرەوە بوو لەنێوان هەردوو دەوڵەتەکەدا ئەوا بووە گۆڕەپانێکی سەرەکی بۆی و گەلەکەی بەهۆی ئەمەوە پشکی شێری بەرکەوت لەوێرانکاریی و نەهامەتیەکانی ئەو جەنگە فەوتێنەرە، بەتایبەتی ئەو کاتە کوردستان پەرت پەرت بوو بوو لەنێوان چەند میرنشینێکی دەرەبەگایەتیدا کە هیچ کامێکیان بەتەنها نەیاندەتوانی بەرەنگاریی داگیرکەران ببنەوە یان لەسنورێکدا ڕایانبگرن.

سستمی دەرەبەگایەتی باویش لەوکاتەدا لەکوردستان، ئاستەنگی دەخستە بەردەم یەکگرتنی گەلی کوردی و یەکخستنەوەی میرنشینەکان لەسایەی یەك دەوڵەتدا کە بتوانێت بەرگریی لەنیشتمان بکات و ڕووبەڕووی هێرشە بیانیەکان ببێتەوە یان ولآت دووربخاتەوە لەمەترسی ئەو جەنگەی کە نە وشتری ئەمی تێدایەو نە ماوشتر، هەروەك چۆن هەستی نەتەوەیی کوردیی[٥٧] بەتێگەیشتن و چەمکە نوێیەکەی هێشتا بوونی نەبوو

---

[٥٧] – هەستی نەتەوەیی: بریتیە لەهەستکردنی تاك بەنێنتیما بۆ نەتەوەکەی، پڕیشبێت لەخۆشەویستی نیشتمان و، گەل و شانازیکردن بە باوباپیرانیەوەو سووربوون و پێداگریی لەسەر بەرژەوەندیەکانی، هەروەها کار بکات بۆ رزگارکردنی نیشتمان لەدەسەلآتی بیانی و بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکانی بەجیاوازی دەستەو چینەکان کە تەبەنی نەتەوایەتی دەکەن و پێشڕەوی دەکەن دەگوڕێت هەستی نەتەوایەتیش لەنەتەوەدا رەنگ دەداتەوە لەکات و دوای دروستبوونی و لەبۆتەی تایبەت بەخۆیدا رەنگ دەگرێت.

نەتەوەش (Nation) بەچەمکە نوێیەکەی واتە:

کۆمەڵێك لەخەڵك بەشێوەیەکی مێژوویی لەسەر یەك خاکی هاوبەش دروست بوون بەیەك زمان قسە دەکەن و ژیانێکی ئابوریی هاوبەش دەژین هەست و دەرونێکی هاوبەش کۆیان دەکاتەوە بە هەستی نەتەوەیی یەکگرتوو سیفەت و خەسڵەتی نەتەوەیی گشتی هاوبەش گوزارشت لەبوونی خۆی دەکەن. نەتەوەش ناتوانێت دروست بێت

تا ڕۆڵەو دەستەو تاقمە جۆراوجۆرەکانی گەلی کورد و هێزو کۆششەکانیان هەماهەنگ و یەکبخات بۆ بەرگریکردن لەنیشتمان.

بەڵکو هەستی ئاینی و مەزهەبی زاڵبوو هەر ئەمەش وایکردبوو کە فەرمانڕەوا تورك و فارسەکان لەسودی خۆیان بەکاری بهێنن و کوردەکانی پێڕابکێشن بۆ لای خۆیان، بەمەش کوردەکان دابەشبوون بۆ دوو بەش یەکێکیان سەر بە دەوڵەتی صەفەویی- شیعە- بوو بەشەکەی تریشیان سەر بەدەوڵەتی عوسمانی سوننی بوو لەمەوە تێدەگەین کە نەتەوەی کوردیی[58] بەچەمکە نوێیەکەی لەوکاتەدا چۆڕپەست و گەلاڵە

---

ئەگەر بەربەستە دەرەبەگایەتیەکان (بەربەستە ئابوریی و سیاسیەکان و هی تریش) لا نەبرێن کە ئاستەنگن لەبەردەم یەکخستنی هۆزەکان و کۆمەڵە جۆراوجۆرەکان کە لەسەرخاکێکی هاوبەش دەژین لەبۆتەی یەك نەتەوەدا. سەرهەڵدانی نەتەوەش لەئەوروپادا هاوکات بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی سەرمایەداریدا.
یاسای کۆمەڵایەتی نەتەوە دەبێت بە قۆناغەکانی پێگەیشتن و کامڵبووندا بڕوات دوای سەرهەڵدانی بەشێوەیەکی بەرایی و ئەوەش لەرێگەی ڕزگاربوونی لەدەسەلاتی بیانی و چەوساندنەوەی نەتەوەیی و بەدەستهێنانی مافی خۆحوکمکردن و پاشانیش تەواوکردنی پرنسیپەکانی پەرەسەندنی بەئازادی.
[58] -نەتەوایەتی: بریتیە لەو پەیوەستەگیە ئۆرگانییە کە تاك بەنەتەوە دەبەستێتەوەو گوزارشت لەخۆی دەکات لەهەستکردن بەئینتیما بۆ نەتەوەو خۆشەویستی نیشتمان و پەیوەستبوون بە بەرژەوەندییەکانی گەل و شکۆمەندی نیشتمان و پابەندبوون بەنەریتەکانیەوەو ڕێزگرتن لەپێشینەکانی و کلتورەکەی و ڕۆشنبیریەکەی و کۆششکردن بۆ ڕزگارکردنی نیشتمان لەدەسەلاتی بیانیی.
نەتەوایەتی وایلێهاتووە بزوتنەوەیەك دوای ئەوەی بیرۆکەکانی ڕۆدەچێتە ناو ریزەکانی گەلەوە یان هەندێك لەدەستەو تاقمەکانی کۆمەڵگەوەو بەوشێوەیە بزوتنەوەی نەتەوایەتی گەشەدەکات و پێدەگات. کە ئامانجی ڕزگارکردنی نیشتمان و گەشەپێدانی ڕۆشنبیری و زمان و ئەدەب و بەدەستهێنانی حوکمی نیشتمانیە، سروشتی کۆمەلایەتی نەتەوەییش بەجیاوازی چینەکان یان تاقمە کۆمەلایەتیەکان دەگۆڕێت کە تەبەنی و پێشەوایەتی دەکەن، ئەگەر بزوتنەوەی دەستە بالاکانی کۆمەلگە (موڵکدارو سەرمایەدارەکان) ئەوا سروشتێکی کۆن و ئیستیغلالانەی دەبێت و خاوەن تێڕوانینێکی تەسکبینانەی داخرلو دەبێت بەسەر خۆیدا. بەلام ئەگەر بزوتنەوەی جەماوەری میللی یان دەستە پێشکەوتنخواز یان تاقمە پێشکەوتنخوازەکان یان زەحمەتکێشەکان بوو ئەوا دەبێتە بزوتنەوەیەکی پێشکەوتنخوازی خاوەن سروشتێکی میللی مرۆیی تێدەکۆشێت بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانی گەل و نیشتمان و هەوڵی ڕزگاربوون دەدات لە وەبەرهێنانی بیانی و ئیستیغلالکردنی ناوخۆیی. سەرکەوتنی سۆشیالیزم و بلاوبوونەوەی بیرۆکە پێشکەوتنخوازیەکان لەجیهاندا هەروەها کاری کردۆتە سەر بزوتنەوە نیشتمانیەکان لەرووی گۆڕینی سروشت و جەوهەرو ناوەڕۆکەکەی بەرەو باشتر. بەتایبەتی کە

نەبوو بوو هەر بۆیەش بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی کوردی نەبوو تێبکۆشێت لەپێناو ئامانجە نەتەوەییە تایبەتیەکانیدا ئەمەش وایکرد کاری تەماحخوازان ئاسان بکات لەوەی کوردستان ملکەچ پێ بکەن و دەسەڵاتی بیانی بەسەر میرنشینە کوردیەکاندا بسەپێنن بەتایبەتی کە ئەم میرنشینانە لەوکاتەدا لاواز بوون و نەیاندەتوانی بەتەنها بەرگریی لەقەوارەی خۆیان بکەن ئەمەش وایلێدەکردن کە لەیەك لەو دوو لایەنە بەهێزە نزیك ببنەوە بەهیوای پاراستنی جۆرێك لەسەربەخۆیان یان لەژێر کاریگەری هەستی ئایینی مەزهەبیدا.

سوڵتان سەلیمی عوسمانی مومارەسەی سیاسەتێکی فریودەرانەی سەرکەتووی کرد بۆ ئەوەی کوردەکان بۆ ناو ریزی خۆی ڕابکێشێت، ئەویش بەسودوەرگرتن لەهەستی ئایینی و لە کۆششی زانای ئایینی مەلا ئیدریس کە ناردی بۆ ئەوەی بەناو کوردەکاندا بگەڕێت و پەیوەندی بەفەرمانڕەواو پیاوەکانیانەوە بکات و تێیاندا هەستی مەزهەبی ئایینی ببزوێنێت و، داوایان لێبکات بێنە ژێر سایەی خەلیفەی عوسمانیەوە کە دانی بەسەربەخۆیی ناوخۆیی میرنشینە کوردییەکاندا نابوو بەپێی فەرمانی سوڵتانی کە لە ناوەڕاستەکانی مانگی شەوالی پیرۆزی ساڵی ٩٢١ کۆچی بەرامبەر بە سەرەتاکانی مانگی نۆڤەمبەری ١٥١٥ زایینی. بەوشێوەیە میرنشینە کوردییە سونیەکان بەشێوەیەکی فەرمی ملکەچی سوڵتانی عوسمانی کران. ئەم ملکەچپێکردنە فەرمییە کە سەرەتایەك بوو بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی عوسمانی زۆردارانە بەسەر کوردستاندا هێندەی نەبرد عوسمانیەکان هەوڵیاندا بۆ ئەوەی بیکەنە ملکەچکردنێکی ڕاستەقینەی تەواوەتی، ئەویش بەلەناوبردنی هەموو روخسارەکانی سەربەخۆیی میرنشینە کوردییەکان لەناوبردنێکی رەهاو سەپاندنی ئەو مەرکەزیەتەی کە مانای بەتورککردنی کارگێڕییەکان و دەزگا فەرمانڕەواکانی کوردستانی دەگەیاند بەشێوەیەکی کردارەکی- بەدامەزراندنی والی و فەرمانڕەوا تورکەکان لەجێی میرو فەرمانڕەوا کوردەکان و ناردنی هێزە سەربازییە تورکەکان بۆ کوردستان دوای زاڵبوون بەسەر چەکدارە کوردییەکان و

---

بزوتنەوە نەتەوەییەکانی نەتەوە زوڵملێکراوەکان لەخۆیدا لایەنێکی پێشکەوتنخوازی و تایبەتمەندیەکی شۆڕشگێڕیی هەیە دژ بە داگیرکەرو ئیستیغلالکردنی بیانی.

سەپاندنی سوغرەو چەوساندنەوەی هاولآتیانی کورد و قورسکردنی باری سەرشانیان بەباج و ناچارکردنیان بۆ ئەوەی ببنە سەرباز لەسوپای سولتاندا و جەنگان لەپێناویدا.

ئەم ملکەچپێکردنە زۆرەملێیانە کە یەکەمجار بەفێلکردن و دووەمجاریش بە بەکارهێنانی هێز سەرەڕای بەرگریکردنی کوردەکان لێی بەهەموو ئامرازەکان بووە هۆی دروستبوونی یەکێتییەکی زۆرەملێیانە لەنێوان کوردو تورکدا یەکێتییەك کە لەسەر خستنەسەرو پێوەلکاندنی زۆرەملێیانە بەرپابوو بوو(لەژێر عەبایەکی ئاینیدا) کەتێیدا مافەکانی گەلی کورد زەوتکراو کردییە گەلێکی بێبەش لەهەموو مافە سەروەرییە نیشتمانیەکانی، ئەم یەکێتیە زۆرەملێیە کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەری بەرپابوو بوو بەنسبەت هەموو گەلەکانەوە کەلەژێر فەرمانڕەوایەتیدا بوون وەك عەرەب و کوردو ئەرمەن و بولگارو یۆنان و ئەلبان و ئەوانی تریش بەهەمان شێوە بوو.

نمونەی ئەم یەکێتیە ناچاریەش پێچەوانەی یەکگرتن بوو لەنێوان نەتەوەکاندا لەسەر بنچینەو بنەمای ئاین یان مەزهەب لەگەڵ دەستگرتن بەحوکمکردنی ناوخۆییەوە وەك ئەوەی ڕێکەوتنی لەسەر کرابوو کاتێك کەوا کوردەکان ڕازی بوون لایەنگری خۆیان بۆ خەلیفە بەشێوەیەکی فەرمی ڕابگەیەنن.

ئەوەش دژی یەکگرتنی ئارەزوومەندانەیە لەنێوان نەتەوەکاندا کە پێکەوە دەژین لەژێر سایەی یەك دەوڵەتدا، چونکە یەکگرتنی ئارەزومەندانە پێویستە لەسەر ئیرادەی ئازادی هەموو لایەنەکان بەرپابێت کە دروستیان کردوە بە مومارەسەکردنی ئازاد بۆ مافەکانی چارەی خۆنوسین بەشێوەی یەکگرتن گوزارشتی لێبکرێت. هەروەك یەکگرتنی ئارەزوومەندانە دەخوازێت ڕێز لەمافەکانی هەموو نەتەوەکان و یەکسانی نێوانیان بگیرێت گەورەو بچووکیان.

لەپرۆسەی ملکەچپێکردنی درێژو پڕ لە تیرۆر و چەوساندنەوەو زوڵم و ستەم کە بەهۆیەوە کوردەکان ناڵاندیان بەهۆی هێرشکردنی تورکی بۆ سەر میرنشینەکانیان و دوژمنکاریی چەکدارانە بۆ سەر وڵاتەکەیان و لە قەتڵوعامکردن و هێرشەکانەوە کە عوسمانیەکان پێی هەڵدەستان و لە پرۆسەی داگیرکاری فراوانخوازییەوە لەهەموو ئەمانەوە کێشەی کوردی سەریهەڵدا.

ئەوەش هەر لە چاخی نۆزەدەهەمەوە کە دەوڵەتی عوسمانی ئەم پرۆسەیەی تەواوکرد بەهێزی چەك و بەسەپاندنی مەرکەزیەتی تورکی خنکێنەر بەسەر هەموو ناوچەکانی کوردستاندا، لێرەوە نەتەوەی کوردیی پەیدابوو دەستی بەدروستبوون کرد بەشێوە کۆرپەلەیەکەیی و لەبۆتە تایبەتیەکەیدا، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کێشەی کورد لەوکاتەوە پەیدا بوو کە میرنشینە کوردییەکان لایەنگری خۆیان بۆ سوڵتان ڕاگەیاند، بەڵکو لەوکاتەوە پەیدابوو کە ئەم پرۆسە ترسناکە تەواوکرا کە لە سێ سەدەو نیوەوەو لەماوەی ١٥١٥–١٨٤٢و ئەنجام دراو دوای دروستبوونی نەتەوەی کوردی بەشێوەی کۆرپەلەیی لەمناڵدانی کۆمەڵگەی کوردستاندا چونکە کێشەی کورد بریتیە لە:

<u>کێشەی نیشتمانی گەلی کورد</u>: کێشەی بەکۆیلەکردنی و چەوساندنەوەی و داگیرکردنی وڵاتەکەی کوردستان و زەوتکردنی مافە نەتەوەییەکانی لەلایەك و، پاشانیش کۆشش و خەباتی گەلی کوردی لەدژی بەکۆیلەکردن و داگیرکاریی بیانیی و دژی چەوساندنەوەی نەتەوەیی و یەکێتی زۆرەملێیانە، لەپێناو ڕزگارکردنی نیشتمانی و گێڕانەوەی مافە زەوتکراوەکانی و مومارەسەکردنی مافە نەتەوەییەکانی لەلایەکی ترەوە.

بۆیە نەدەبوو کێشەی کورد بوونی هەبوایە پێش ئەو یەکپێگرتنە زۆرەملێیانەی کە بەکۆیلەکردن و داگیرکردنی کوردستانی بەرجەستەکردو گەلەکەی چەوساندەوە کە بێبەشکراوە لەهەموو مافەکانی و گۆڕا بۆ گەلێکی ژێردەستەو حوکمکراو وە پێش چۆرپەستبوونی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردیی– بەچەمکە نوێیەکەی نەتەوایەتی– کە لەهەستی نەتەوەییەوە سەرچاوەی گرتوو گەلاڵەبوو– هەروەها لەچوونە ناوەوەی بیرۆکەکانی بۆ ناو کوردەکانەوەو لەو پەرەسەندنانەیەوە کە دژیەکە توندەکان هاوەڵێتیان کرد لەنێوان پێویستیەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵگەی کوردی و دەسەڵاتی بیانیی کە سەرهەڵدانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد ئاستەنگی بۆ دروستکردو بەری پێگرت.

## سەرهەڵدانی نەتەوەی کوردیی و بزوتنەوەی رزگاریخوازیی

ئـەم پرۆسـەیە کۆمەڵایەتیـە- پرۆسـەی دروسـتبوونی نەتـەوەی کـوردی و گەشـەکردنی بزوتنـەوەی رزگاریخوازییەکـەی- لەئـەنجامی کـارلێکی کۆمـەڵێك لـە فاکتـەرە ئـابوری و سیاسی و سەربازیی و فیکریەکانەوە پەیدابووە لەگـەڵ رەگـەزە یەکـەمیی و(بنـچینەیی) بەراییەکانی[٥٩] نەتەوەی کوریـدا کـە ئەمانـە وەك مادەیـەکی خـاو وابـوون لـەم پرۆسـەیە کۆمەڵایەتیە گرنگەدا.. گرنگترین ئەم فاکتەرانەش بریتیە لە:

یەکەم: داگیرکـردن و بەکۆیلـەکردنی کوردسـتان و شـوێنەوارو دەرئەنجامـەکانیان، دوای هێرشـە سـەربازیەکان و لـەناوبردنی میرنـشینە کوردییـەکان و هـەموو روخـسارەکانی فەرمانڕوایی کوردی تێیداو، ملکەچپێکردنی گـەلی کـوردی بـەهێزی ئـاگرو ئاسـن بـۆ ژێـر دەسـەڵاتی بەروخـسارو عوسمانیـەکان و تورکـەکان بەجەوهـەر و سـەپاندنی سـستمی مەرکەزیەت و ئەوەی دەیخوازێت و هاوڕێیەتی دەکات لەباج و سـەرانەو بەسـەربازگرتن و سـوغرەکاری و نـاردنی هێـزە تورکیـەکان و فەرمانبـەرە تورکـەکان بـۆ ناوچـە جۆراوجۆرەکـانی کوردسـتان کـە ئەمـەش بـەرۆڵی خـۆی بـووە هـۆی خـستنەوەی پەرچەکرداری ئەمە کە بریتیە لە:

دووەم: بـەرگریی ئاشـتیانە و چـەکدارانە دژ بـە داگیرکـەرە عوسمانیـەکان و رودانـی راپەڕینی کوردیی چەکدارانە بۆ بەرگریکردن لە سەربەخۆیی خودیی و ئەوەی کە لەمەوە گەلاڵە دەبێت لەدژایەتی داگیرکەرە تورکەکان و لە هەستی هـەڵهاتن لێیـان و پاشـانیش

[٥٩] - دروستبوونی هۆزەکان و کۆمەڵە مرۆییەکانی نەتەوەیـەك بەچـەمکە نوێیەکـەی پرۆسـەیەکی کۆمەڵایـەتی- مێژوییـە لـە قۆنـاغێکی مێـژویی دیـاریکراودا رویـداوە. بۆ نمونـە نەتـەوە فەرەنـسیەکانیان ئەڵمانیـەکان یـان ئیتالیەکان یان تورکیەکان هەر لەسـەدان یـان هـەزاران سـاڵەوە وەك ئێـستا نـەبوون. بـەڵام نەتـەوەکان ریشەو بنچینەیان لەمێژوودا هەیە پێش ئەوەی وەك نەتەوەیەکی نوێ دروست ببێت رەگەزەگەلێکی بـەراییان هەیـە کـە وەك مادەی خاو وایە بۆ پرۆسەی دروسـتبوونی نەتـەوە. نەتـەوەی کوردیش بەهـەمان ئـەم شـێوەیە کـە پـێش دروستبوونی - بەچەمك و تێگەیشتنی نوێ بۆ نەتەوە-، رەگەزگەلێکی بەرایی هەبووە وەك زەوی کوردستان و زمانی کوردی و هەندێك لەنەریت و سیفەتە هاوبەشـەکان هـەروەك چۆن بنەچـەی هەنـدێك لـەهۆزەکانی یـەکێك بووە. بەحوکمی دابەشبوونی کاریش- بەهۆی رەوشە جوگرافی و کەشییە جیاوازەکانـەوە- جۆرێـك لـەئاڵوگۆڕ و لەئاستێکی سنورداردا هەبووە لەنێوان بەشە جیاوازەکانی کوردستاندا.

هەستکردن بەکوردبوون و بەرگریکردن لەمافەکانی کوردەکان، ئەم راپەرینە شۆڕشگێڕییە چەکدارانەیە وەك تاوزەی گەرمی وابوون کە بەشداریان کرد لە تواندنەوەی رەگەزە بەراییەکانی نەتەوە لەبۆتەی نەتەوەی کوردیدا و لەگەلاّلەبوونی هەستی کوردیی نیشتمانپەروەرانە بەتایبەتی کە ئەم راپەرینە چەکدارییە شتانێك هاوەلێتیان دەکرد:

سێیەم: پەرەسەندنە کۆمەلاّیەتیە – ئابورییەکان لەکۆمەلگەی کوردستاندا لەکاتی قۆناغەکانی ئەم دواییەی پرۆسەی ملکەچپێکردنی درێژ... ئەم پەرەسەندنانەش لەگەلّ دەسەلاّتی بیانیی تورکیدا پێکیاندا کێشا کە بەربەستی بۆ دروست کردبوو وە دژایەتی کردو ئاستەنگێکی گەورە بوو لەبەردەم رێڕەوە ئاساییەکەیدا.

ئەم پرۆسەی ملکەچپێکردن و داگیرکاریە تورکیە بۆ کوردستان لەنیوەی یەکەمی سەدەی نوزدەهەمدا بەشێوەیەکی کۆتایی ئەنجامدراو تەواو بوو چالاکییە سەربازیی و کارگێڕیی و فیکرییەکانی چالاك و بەهێزو توندبوون هەر لەسەرەتای سەدەی نوزدەهەمەوە کەوا کۆمەلگەی کوردستان لەو کاتەدا لەهەناویدا کۆرپەلەی پەرەسەندنێکی سەرمایەداری بازرگانی هەلگرتبوو کە چالاك بوو وە بازرگانی فراوان بوو وە چینێك لە بازرگان و کاسبکارانی دەولّەمەند واتە چینی ناوەڕاست دەرکەوتن، پاشانیش سستمی دەرەبەگایەتی لە روخان و هەلّوەشانەوەدا بوو، کە سەرمایەداری گەشەسەندوو لەناو پەیوەندییە دەربەگایەتیەکاندا کێشای بە لولپێچە دەرەبەگایەتیەکەیدا ئەو لولپێچەی ئەو گرێوگۆلاّنەی دروست کردبوو کە بووبوونە بەربەست لەبەردەم گەشەکردن و دەرکەوتنی کۆرپەلەی سەرمایەداریی نوێدا لەمێژووی ئەم ماوەیەدا. مامۆستا ب. نیکیتین نوسیویەتی:–[٦٠]

ولاّتی کوردستان جۆرێك لەسستمی سەرمایەداری بەخۆوە بینیوە، چونکە ناوەندێکی گرنگ بوو لەئاروخەدانی بەغداو قوستەنتینەو سوریا بەولاّخ هەروەك چۆن خوری و هەنگوین و کەتیرەی هەناردە دەکرد، هەندێك لە مادەی بۆیاخکردنیش، لەبەرامبەردا کوردستان چەك و چنراوی لۆکە و ئاوریشم و شەکرو هەندێك لەجۆرەکانی بەکاربردنی

[٦٠] – ب. نیکیتین– لەکتێبەکەیدا– الاکراد– لا ٤٦–٤٧– چاپە عەرەبیە یەکەمەکە.

تری دەهێنایە ناوەوە دەکرێت بخەملێنرێت کە هەناردەکانی کوردستان زیاتربوون لەو شتانەی دەیهێنانە ناوەوە ئەمەش وای کردبوو کە چەند بڕێك لەپارە لای کوردی شارەکان کۆببێتەوە، تەنها قوستەنتینیە لەکوردستانەوە نزیکەی ملیۆن و نیوێك سەر مەڕو مانگای هاوردە دەکرد گومانیشی تێدا نیە ئەو بڕکە ئاژەڵانەی کە هەناردە دەکران زۆر زیاتر بوون لەم ژمارەیە.

هەروەها کوردستان زیاتر لە ۲۵۰,۰۰۰ لیرەی ئیستەرلینی لە مازوو و بڕێکی گەورە لە خوری و بەتایبەتی خوری بزنی – الانگورا–ی هەناردە دەکرد ئەلە پیشەسازی پاڵتوو شاڵدا بەکاردەهێنرێت. هەروەها وا دەخەملێنرێت کوردستانی تورکیا ساڵانە لەناوەڕاستەکانی سەدەی نوزدەهەمدا شمەکی بە بەهای– ۷۰۰,۰۰۰ حەوت سەد هەزار جونەی ئیستەرلینی هەناردە کردبێت.. خەڵکی کوردستانیش بەنهێنی و بەدور لەچاوی حکومەتی تورکی سودیان لە ئاسن و قوڕقوشم وەردەگرت و لەم کانزایانە هەندێك لەکەرەستەکانیان پێدادەڕشت و ئەوی دیکەیان دەفرۆشت..

مامۆستا ب. نیکیتین بەردەوام دەبێت و دەڵێت[61] – لەکۆی ئەم زانیاریانە لەبارەی ژیانی ئابوریەوە لەکوردستان – فیلچیفسکی – دەگاتە ئەو دەرئەنجامە کە بازرگانی لە سەدەی نوزدەهەمدا بەشێوەیەك لەکوردستان چالاك بوو کە بەس بێت بەتایبەتی لەبواری بازرگانی ناوچەییدا پێش درێژبوونەوەی یان هاتنی قەڵەمڕەوی داگیرکاریی:

<u>چوارەم</u>: ئەوەی بەرهەمهات لەیەکخستنی میرنشینە کوردییەکان و ناوچە جیاوازەکان لەژێر سایەی یەك دەوڵەتی خاوەن یەك ڕژێم و سستمدا، لەیەکخستنی نەریتەکان و یاساکان و هاوشێوەیی لە دابەکانداو لەزیادبوونی تێکەڵاویی و ئاوێتەبوون لەنێوان کوردەکاندا و زیادبوونی مامەڵەی بازرگانی و ژنخوازیی و پەیوەندی دروستبوون لەنێوانیاندا لەزاڵبوون بەسەر بەربەست و ئاستەنگەکاندا بۆ یەکبوون و یەکخستن.

<u>پێنجەم</u>: دەرکەوتنی بزوتنەوەی نەتەوەیی تورکیی بەتوندی و بەشێوەیەکی ڕەگەزپەرستی و سەرهەڵدانی بزوتنەوە نیشتمانیەکان لەئەرمینیاو وڵاتانی عەرەبی و

---

[61] – سەرچاوەی پێشوو لا ٤٧.

بولگارياو يۆنان و ئەلبانياو صربياو كاريگەری و ڕەنگدانەوەی هەموو ئەم بزوتنەوانە لەناو فێرخوازان و قەڵەمڕەوان و پياوانی ئايينی كورد داو كاريگەربوونيان پێيان.
مامۆستا ئەرشاك سافراستيان لە لاپەڕە ٤٩-٥٠ ی كتێبەكە چاپكراوەكەيدا - الاكراد و كردستان - kurds and Kurdistan لەم بارەيەوە دەڵێت:
-سەركەوتنی جەنگی سەربەخۆيی يۆنانی - ١٨٢٨ - و بەزين و شكستخواردنی تەواوەتی ئيمپراتۆريەتی عوسمانی لەجەنگی ڕوسی - توركيدا لەساڵی ١٨٢٨-١٨٢٩ ز و پەيماننامەی بونكيار ئايسكلسی دواتر لە ١٨٣٣- كە بەشێوەيەكی كرداريی توركيای خستە ژێر ئينتيدابی ڕوسياوەو ئەو چوونەپێشە سەركەوتوەی كە ئيبراهيم پاشا پێی هەستا لەئاسياوە هەتا دەروازەكانی قوستەنتينيە بەسەركردايەتيكردنی سوپای ميصريی هەموو ئەمانە سەرلەنوێ لەدڵی هەندێك لەسەركردەكانی كورددا ئارەزويەكی توندی تاودا بۆ سەربەخۆيی تەواوەتی. ئەگەر يۆنانيەكان و ميصريەكان كە پێشتر ڕەعيەتی بابلوعالی بوون- توانيبێتيان سوپای توركی ببەزێنن و شكستی پێ بێنن و بەمەش سەربەخۆيی خۆيان بەدیبهێنن، كەواتە بۆچی كوردەكان مافی ئەوەيان نەبێت كە بەشێوازی تايبەتی خۆيان خۆبەڕێوەبەرن.

لەژێر ڕۆشنايی ئەوەی پێشوودا دەتوانين تێبينی ئەو ڕاستيە بكەين كە نەتەوەی كورديی- بەشێوە سەرەتاييەكەی- و بزوتنەوەی ڕزگاريخوازی نەتەوەيی گەلی كوردی - لەقۆناغی سەرەتايی و گەشەكردندا- لەنيوەی يەكەمی سەدەی نۆزدەهەمدا دەركەوتوون، پاشان وردە وردە ڕوخسارەكانی دەركەوتوو ڕونبۆوە بەشێوەيەك كە هەستی نەتەوەيی لێيەوە ڕەنگيدايەوەو لەنێو فێرخوازان و قەڵەمڕەوانی كوريداو نيشتمانپەروەران لە بازرگانەكان و خاوەن مانيفكتوراتەكان و هەناردەكارەكان و هێنەركارەكاندا بلاَبۆوە[٦٢] ئەوانەی كە دەسەلاَتی توركی تەگەرەی خستبۆوە بەردەم

---

[٦٢] - مامۆستا ئارشاك سافراستيان لە لاپەڕە ٤٩ لەكتێبەكەيدا kurds and Kurdistan لەبارەی زيانگەياندنی قەڵەمڕەوان و سەرۆكانی هۆزە كورديیەكان بەمەكەزيەتی توركيی كە سوڵتان پێی هەستا لەساڵی ١٨٢٦ دەڵێت : " ئەم چاكسازيانە كە بابولعالی پێی هەستا وەك لێدانی زەنگی مردن وابوو بۆ دەرەبەگايەتی" كورديش.

کارەکانیان و بەرژەوەندیەکانیانی روبەڕوی زیان و لەناوچوون کردبۆوە هەر بۆیە خەبات و تێکۆشانی کوردی لەدژی عوسمانیە داگیرکەرەکان و دەسەلأتیان مۆرکێکی نەتەوەیی وەرگرتبوو نەك لەبەرئەوەی کە دژ بە زەوتکەرانی بیانی و بەرگریکردن بێت لەجۆرێك لە سەربەخۆیی نەتەوەیی بەڵکو لەبەرئەوە بوو کە هەروەها ناوەرۆکێکی کۆمەلأیەتیشی هەبوو.

شرۆڤەی زانستیش بۆ ئەمە ئەوەیە کە بەتەنیشت پرۆسەکانی ملکەچپێکردن و دەسەلأتی بیانی و شوێنەوارەکانیەوەو ئەوەی لێیەوە سەرهەڵدەدات و دروست دەبێت لەکارلێکەکان و سلبیتەکان و روداوەکان، گۆڕانێك لەسستمی کۆمەلأیەتی کوردستانیدا روویدا کەئەویش دەرکەوتنی ناوەرۆکی بورژوازیی – کۆرپەلەی سەرمایەداریی– بوو لەکۆمەڵگەی کوردستاندا– ئەویش بەهۆ و کاریگەریی کێشکردنی خۆرهەلأت بوو– لەناویشیدا کوردستان– بۆ ناو چەرخی ئابوریی سەرمایەداریی جیهانی و زیادبوونی بازرگانی و رۆیشتنی کاروانە بازرگانیەکان بەناو کوردستاندا– کە ناوەندێکی بازرگانی پێکدەهێنێت لەخۆرهەلأتدا بەتایبەتی دوای زیادبوونی قەڵەمڕەویی و بازرگانی ولأتانی ئەوروپیی لەخۆرهەلأت و دەرکەوتنی پرۆسە بازرگانیە کوردیەکان لە کڕین و فرۆشتن و هەناردەکردن و هێنانەناوەوەو سەرهەڵدانی مانیفکتوراتەکان بۆ دورستکردنی صابون و پاکژەکەرەوەکان و پێلأو پێستەچیەتی و کەتیرەکان و جلوبەرگ و هی تر و گەشەکردنی بەرهەمهێنانی شمەکی و بلأوبونەوەی پارەو کۆبونەوەی سامان لای بازرگانە کوردەکان و خاوەن مەڕومالأتەکان و خاوەن موڵکە گەورەکان و پاشانیش گۆڕانی خاوەن موڵکە کوردەکان و سەرۆك هۆزەکان– بەتایبەتی خاوەن مەڕومالأتەکان– بۆ خاوەن موڵك و بازرگانیش لەیەککاتداو، بوونی هەندێك لەهۆزە کۆچەریەکان بۆ نیشتەجێ بوو لەگوندەکانداو سەرقاڵبوونیان بەکشتوکاڵەوە لەگەڵ داگیرکردنی زەویەکان لەلایەن سەرۆکەکانەوە واتە ( بەگوزارشتی فیلجیفسکی):– ئەگەرچی سەرۆك هۆزی کوردی کۆچەر لەکۆمەڵگەیەکی دەرەبەگایەتیدا لەدایك بووە– بەلأم نمایشی چینێکی نوێ دەکات کە چینی دەرەبەگ نیە[١٢]. فیلجیفسکی و ئاکۆبۆف

---

[١٢] – بگەڕێرەوە بۆ س . ع. شەمزینی لەکتێبەکەیدا (بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کوردی).

و شـەمزینی ئـەم راسـتیانەیان رونکردۆتـەوەو بەشـێوەیەکی درێـژ لەنوسـینەکانیاندا خستویانەتەڕوو، هەرسێکیانیش جەختیان کردۆتـەوە لـەو ڕاستیەی کـە گەشـەکردن و بەرەوپێشـچوونی بەرهـەمهێنانی شمـەکی بازرگـانی و زیـادبوونی پرۆسـە بازرگانیـەکان لەکوردستان بووە هۆی خێرا کلۆرکردنی سستمی دەرەبەگایـەتی وەك رێگەخۆشـکردنێك بۆ روخانی و لەدەرکەوتنی نـاوەرۆکی بـوژوازیی لـەناو پەیوەندییـە دەرەبەگایەتیەکانـدا ئەگەرچی – بەشێوەیەکی کۆرپەلـەییش بێـت– بەتایبـەتی دوای سـەرقاڵبوونی سـەرۆك هۆزەکان بـەبازرگانی و بـەخاوەنبوونی برِکـە مەڕوماڵاتـەکان و بازرگـانیکردن پێیانـەوەو بـەرێوەبردنی کێڵگـەکان لەلایـەن خاوەنەکانیانـەوە– یـان هەنـدێکی – بـەکارهێنانی داهاتەکەی بەشێوەیەکی سەرمایەداریی بەڵام مامۆستا نیکیـتین لـەبارەی پـەرەسـەندنی ئابووریانەی کوردستانەوە دەڵێت[٦٤]: هێشتا سەرەتای سـەدەی نۆزەدەیـەم نـەهاتبوو کـە دەربەگایـەتی لەکوردسـتان گەیـشتبۆوە ئەنجامـە دوایهاتوەکـەی و کۆمەڵگـەی کـوردی پەرتکرد– هەروەك پارێزگاریی لەکوردستان کـرد وەك یـەکێکی پتـەو یـەکگرتوو لـەدژی ئەم هێرشە دەشتەکیانە بـەڵام گۆڕا بـۆ بەربەسـتێکی گـەورە لەپەردسـەندنی ئـابوریی ناوچەکەدا.

فیلجیفسکی وایدادەنێت کە دەرەبەگایەتی لەسەدەی نوزدەهەمدا وایلێهات دواکەوت لـە پەرەسەندنی توانستە ئابورییەکان کەلەسایەی ئەودا گەشەی کـرد بەهەمانـشێوە هـۆزی کوردیش بەدەسـت پەرەسـەندنە جۆراوجۆرەکانـەوە دەینالاّنـدو رۆڵـی دەرەبەگـەکانیش بەکاریگەری فاکتەری ئـابوریی دەگـۆڕا بـۆ رۆڵـی سـەمایەدارێك هـەروەها فیلجیفـسکیش وایدەبینێت کە شۆڕشە کوردییەکان لەسەدەی نوزدەهەمـدا دژ بـە دەرەبەگایـەتی بـوون بەمەش قۆناغێکی نوێ لە پەرەسەندنی ئەم گەلەدا تۆمارکرا.

لەلێکۆڵینەوە زانستیەکەیدا دکتـۆر سـەید شـەمزینی لەخۆرهەڵاتناسـی سـۆڤیتی (او. ل. فلجیفسکی)ەوە بەشێك وەردەگرێت لەوەی کە لە (ئەنتوگرافی سۆڤیەتی)دا بڵاویکـردەوە ژمـارە ٥–٦ سـاڵی ١٩٣٦ لا ١٥٢ بـەزمانی روسـی لـەبارەی ئـەم بابەتـەوە ئەمـەی خوارەوەی گواستۆتەوە:

---

[٦٤] – نیکیتین لەکتێبەکەیدا الاکراد لا ١٣٨ لە چاپە عەرەبیەکەی.

" لەسەرەتای سەدەی نوزدەهەوەو شانبەشانی ئالۆزبوون و روخانی خێرای سستمی دەرەبەگایەتی لەکوردستان و، هەڵقولان و جێگیربوونی بونیادی سستمی سەرمایەداری کوردستان و شانۆی قەیرانی سیاسی توند ئەو شانۆیەی کە لەسەری بەرژەوەندیەکانی سەرمایەداری کوردی لەدایك بوو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی سستمی دەرەبەگایەتی رەوش خراپ و ئالۆزدا پێکیاناداو چارەنوسی دوایهاتووی سستمی دەرەبەگایەتی بوویە جێگەی وتوێژو کێشەی هەنوکەیی و رۆژ" بەلام دەسەلاتی بیانی و دەستوەردانی داگیرکەران لەکاروباری خۆرهەلاتدا بوونە ئاستەنگ لەبەردەم کاملبوونی ئەم پەرەسەندنە گرنگەدا.. رێگەیان گرت لەوەی کۆمەڵگەی کوردستان ئەو هەنگاوە بهاوێت و ئەو گۆڕانە ریشەییە تەواو بکات کە ئەگەر بکرایە ئەوا سیماو روخساری کوردستان لەهەموو روەکانی ئابوریی و سیاسی و کۆمەلایەتی و رۆشنبیریەوە دەگۆڕا گۆڕانێکی تەواوەتی و لەوەش زیاتر ئەوا دەسەلاتی بیانی لە ناو کینەی هێرشە سەرکوتکەرانی و ملکەچپێکردنەکانیدا هەولیدا کۆرپەلەی تازە گەشەسەندوی سەرمایەداریی لەمنالدانی کۆمەڵگەی کوردستاندا لەناوبەرێت واتە دەسەلاتی داگیرکەری بیانی بووە کۆسپێك لەبەردەم پەرەسەندنی کۆمەلایەتیدا لەکوردستان و لەگەڵ هێزە تازەگەسەندوەکانی ناویدا پێکیانادا.

## رێبازی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیی مێژوویی

لەم پێکدادانە توندەوە لەنێوان هێزە تازە گەشەکردوەکان لەکۆمەڵگەی کوردستان و هێزەکانی دەسەلاتی عوسمانیدا کەئاستەنگ بوون لەبەردەم گەشەکردنیدا و، لەنێوان ململانێی توند دا لەنێوان حکومەتی عوسمانی کە دەیویست تەوقی کۆیلەیەتی توندبکات و کۆتوپێوەند بکات گەردن و دەستەکانی گەلی کوردیەوە بەهێزی ئاگرو ئاسن و لەنێوان هێزە کوردییەکاندا کە ئازادیان دەویست و کۆیلایەتیان رەتدەکردەوە، یەکەمین پزیسکەکانی شۆڕشی نیشتمانی کوردیی هەلگیرسان هەر لەکۆتایەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە، بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردی تاویسەند کە ئامانجی رزگاربوونی نیشتمانی بوو، پاشانیش رێگەخۆشکردن بۆ رودانی پەرەسەندنی

کۆمەڵایەتی– سەرمایەداریی لەوکاتەدا– ئەم بزوتنەوە رزگاریخوازییە کوردییە کەلەدایك بوو شۆڕشیش بووە جمکی، بەشێوەیەك کە شۆڕش بووە بەرنامەو رێباز بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی، بەحوکمی رەوشەکان و بارودۆخە کوردستانیە تایبەتیەکان، بەحوکمی رەوشە تیرۆریستیە خنکێنەرەکان کە زەوتکەران خولقاندبویان وایکردبوو کە بوارێك نەمابۆوە بۆ تێکۆشانی ئاشتیانە یان شەرعیانە بتوانێت سادەترین مافە نیشتمانیەکان بەدیبهێنێت ئەمە وێڕای پێویستی بوونی شۆڕش وەك بەرگرییەك لەرێبازو رۆحەکان و ماڵومولکەکان کە هێرشەکان و دەستدرێژیە چەکداریەکان ڕووبەرووی نەمانی کردنەوەو هەرئەوەش بووە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕش وەك بەرگرییەك لەدژی لەزۆربەی کاتەکاندا حەتمیەتی هەڵگیرسانی شۆڕشی چەکداریی وەك رێگەو رێبازێکی مێژوویی بۆ بزوتنەوەی رزگاریخوزای نەتەوەیی گەلی کورد. نیشتمانپەروەرە کوردەکانیش هیچ کات سەرپشك نەبوون لەهەڵبژاردنی ئەم رێبازە مێژووییەدا بەڵکو رەوشە بابەتی و مادییەکان و رەوشە تایبەتیەکان بوون کە شۆڕشی چەکداریان کردە رێبازێك بۆ بزوتنەوەی رزگاریخوازیی کوردی.

***کەواتە بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کوردی:***
بزوتنەوەیەکی مێژوویی بابەتیە، لەنێوجەرگەی کۆمەڵگەی کوردستانەوە هەڵقوڵاوە، وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ پێویستیەکانی پەرەسەندنی و پێشکەوتنی، بزوتنەوەیەکی رزگاریخوازیشە چونکە ئامانجی رزگارکردنی نیشتمانییە لەدەسەڵاتی داگیرکەران و زەوتکەران و بەدیهێنانی هیوا نەتەوەییە رەواکان: مافی چارەی خۆنوسین. هەروەها بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕییە چونکە دژ بە داگیرکەرو هێزە کۆنەپەرستەکانە کە بوونەتە ئاستەنگ لەبەردەم پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیداو تێدەکۆشێت بۆ ئەنجامدانی گۆڕانێکی ریشەیی لەکۆمەڵگەداو پاڵدانی بۆ پێشەوە بەم مانایەش هەروەها بزوتنەوەیەکی پێشکەوتنخوازیشە.

دەربارەی سەرهەڵدانی ئەم بزوتنەوە رزگاریخوازییە نەتەوەییەی گەلی کوردی و ناوەڕۆکەکەی دکتۆر سەید عەزیز شەمزینی لەئەتروحەکەیدا نوسیویەتی:

***" تێکۆشانی گەلی کوردی لەپێناو بەدەستهێنانەوەی ئازادی و سەربەخۆییەکەی هەر لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستپێدەکات و تا ئەمڕۆمان بەردەوام دەبێت، بەپێی رەوش و قۆناغە مێژوییە جۆراوجۆرەکان شێوەو شێوازی گۆڕیوە وە هەر لەوکاتەوە کێشەی کوردی سەریهەڵدا".***

ئەمەش هیچ شتێك لەو ڕاستیە ناگۆڕێت، بزوتنەوەی رزگاریخوازیی کوردیی لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەلایەن میرە کوردەکان یان خاوەن موڵکەکان یان پیاوانی ئایینی کوردەوە سەرکردایەتی کرابێت[٦٥] .

---

[٦٥] – لەمڕووەوە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد بێهاوتا نیە لەمێژوودا. بەڵکو چەندین جار رویداوە بزوتنەوەی نیشتمانیی لەسەرەتایدا یان لەقۆناغێکیدا لەژێر سەرکردایەتی میرەکاندا بووە (وەك ئەوەی لەپۆلەندلو بولگاریاو هەندێك لەوڵاتانی عەرەبیدا هەیە، بۆ نمونە) یان بەسەرکردایەتی پاشایەکی دەرەبەگ خۆی بووە ( وەك ئەوەی لەئەفغانستان هەیە کە شا ئەمانوڵلا سەرکردایەتی بزوتنەوەی نیشتمانییە رزگاریخوازییەکەی وڵاتەکەیی کرد) هەتا لەم سەردەم و رۆژگارەشماندا دەبینین کە میر سیهانۆك سەرکردایەتی بزوتنەوە رزگاریخوازیەکەی گەلەکەی دەکات لەکەمبۆدیا هەروەها دەبینین کە میر سۆفانافونك سەرکردایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازیی

ئەمانیش هەروەها بێبەش نەبوون لەزیانپێگەیاندن و دوژمنکاریی تورکی راستەوخۆ – زۆربەی جاریش– ئەوەش کاتێك بوو کە هەڕەشەی لەناوبردنی میرنشینەکان و دەسەلات و قەڵەمڕەویی و ماڵومولکەکانی لێکردن هەروەها چەوساندنەوەی نەتەوەییش گرتنیەوە ئەمەش بووە هۆکارێك لەبەئاگاهێنانەوەی هەستی نەتەوەیی لەدڵ ودەرونیاندا مامۆستا ئارشاك سافراستیان لەکتێبەکەیدا (الاکراد و کردستان)[66] لەبارەی هەڕەشەکانی ئەو چاکسازیانەوە دەدوێت کە سوڵتان ویستی بیخاتە ناو کارگێڕییەوەو سەپاندنی مەرکەزیەت بەسەر ناوچەکانی کوردستاندا. هەروەك چۆن ئاماژە دەکات بۆ – ئارەزووی کوردەکان کە باج نەدەنە رۆمە بەزیوەکان و ئارەزووبونیان بۆ ئەوەی خۆیان فەرمانڕەوایی ناوچەکانیان بکەن بەپێی حەز و ویستی خۆیان.

گرنگتریش لەمە ئەوەیە کە ناوەرۆکی سەرمایەداریی لەناو پەیوەندییە دەرەبەگایەتیەکاندا پێگەیشتبوو کاتێك گەشەکردن و پەرەسەندنی بۆ تەواوکردنی گەشەکردنی لەگەڵ دەسەلاتی تورکی عوسمانیی کە بووبوو کۆسپ ولەمپەر پێکیاندا کێشا. کۆمەڵگەی کوردستانی تایبەتمەندی خۆیی هەبوو کە هەروەها سەرمایەداریی لەناو چینە بەرزەکانیشەوە هاتە ناویەوە. خۆرهەلاتناسی سۆڤیەتی (خ. ئا .کۆبۆف)[67] لەکتێبەکەیدا – (لێکۆڵینەوەی نەتەوەیی لەکوردەکانی ئێران) – لەبارەی ئەم تایبەتمەندییەوە دەڵێت:

" کۆمەڵگەی کوردستانی خەسڵەت و تایبەتمەندیی خۆیی هەیە. ئەویش ئەوەیە کە سەرمایەداریی و شێوازەکانی قازانج و وەبەرهێنان رێگەیەکیان گرتەبەرو چووە ناو

---

میللی دەکات لەولاتەکەیدا لانوس، هەروەك دەبینین میرە عەرەبەکان لەعەممان پێشەوایەتی بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕیی دەکەن لەدژی داگیرکەری بەریتانی، چەند دەستەیەکیش لە خاوەن مولکەکان و سەرۆك هۆزەکان و پیاوانی ئایینی کوردیش تا ئەم رۆژگارەی ئەمڕۆشمان ماونەتەوەو لەگەڵ بزوتنەوەی رزگاریخوازیی کوردیدا خەبات دەکەن ئەگەرچی گرنگی و کاریگەریی و رۆڵیان تارادەیەکی زۆر کەمبۆتەوە.

[66] – سەیری لاپەڕە ٤٩–٥٠ بکە لەکتێبی سافراستیان kurds and Kurdistan چاپە ئینگلیزیەکەی.

[67] – ئەتروحەکەی دکتۆر شەمزینی کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد دکتۆر برگە باسکراوەکانی لە لاپەڕە ٢٨ی کتێبەکەی ئاکۆبوفەوە وەرگرتووە کە بەزمانی روسییە.

چـینی سـەرەوەی کۆمەڵگـەی کوردسـتانی و، لەسـەرەوە سـستمی دەرەبەگایـەتی دارماندا".

*هەروەها سەید عەزیز شەمزینی لەئەتروحەکەیدا لەبارەی ئەم ڕاستیەوە ئەویش دەڵێت:*

" ئـەم بەشـە لـە دەرەبەگـە کوردەکـان و پیـاوانی ئـایینی کـە گـۆڕان بـۆ سـەرمایەدارە کوردەکـان تێیانـدا هەسـتی نەتـەوەیی بەئاگاهاتـەوە بـەهۆی ڕق لێبوونـەوەی توندیان لەداگیرکـەرو کاریگەرییـە خراپـەکانی و، خۆشەویـستیان بـۆ نیـشتمان و گەلەکـەیان و دەرککردنیـان بـە ئـەرکی خۆیـان لەبەرامبـەر گەلەکـەیان و نیـشتمانەکەیاندا، بۆیـە ئامانجێکیـان بـۆ خۆیـان دانـا وەك خزمـەتێك بـۆ گەلەکـەیان و بەشـداریکردنی چـالاکانە لەتێکۆشانی ڕزگاریخوازی گەلی کوردی ڕاپەڕیودا لەژێر دروشمی سـەربەخۆیی نەتـەوەیی و ڕزگارکردنی کوردستان لەزەوتکەرانی بیانی".

بەوەشێوەیە دەبینین کە ئەم دەستەیە لەکۆمەڵگەی کوردستانی نیشتمانیی کە ڕۆڵێکی دیاریان بینی لەبزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کـوردی لەسـەدەی نۆزەهەمـدا لەواقیعـدا خـۆی لەدەستەیەکی کۆمەڵایەتی عەشایەریدا دەبینیـەوە بـەڵام –کۆرپەلـەی سـەرمایەداریی – لەژێر باڵەکانیدا هەڵگرتبوو، ئەمەو سەرەڕای ئەوەیش کەلەگـەڵ تێکـڕای ڕۆڵـەکانی گـەلی کوردیدا ڕووبەڕووی چەوساندنەوەی نەتەوەیی و ستەمی بیانی بووبۆوە ئەمەش پاڵنەرێکی تربوو بۆ ئەوەی بیخاتە ناو گۆڕەپانی خەبات لەدژی زەوتکـەرانی بیـانی، بەتایبـەتی کـە هەوڵەکانی سەپاندنی مەرکەزیـەت هەڕەشـەی لەسـەر بەرژەوەندیـەکانیان و لـەناوبردنی میرنشینەکانیان دروست کردبوو.

مامۆستا دیرك کنین لەکتێبەکەیدا – الاکراد و کردستان– دەڵێت[٦٨]:

" لەسـاڵی ١٨٢٦ز دا سـوڵتان مـەحمودی دووەم دەسـتیکرد بـەفراوانکردنی ئیـدارەی مەرکـەزیی تـورکی لەکوردسـتاندا وەك بەشـێك لەچاکـسازیی لـەناو ئیمپرتۆریەتـە هەڵوەشاوەکەیدا... میرە کوردەکانیش هەستان و چارەکە سەدەیەك لەزەمەنی وویـست هەتا لەمیرنشینەکانیان داماڵێنران" بەڵام سروشتی کۆمەڵایەتی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی بـەڕۆڵی خـۆی پـەرەی سـەند – هـەتا بـەم ڕۆژە گەیـشت– بزوتنەوەیـەکی جـەماوەریی

---

[٦٨] – ل ٢٣ لەچاپە ئینگلیزیەکەی کتێبی: The kurds and Kurdistan by derk kinnane

میللی– تێدەکۆشێت لەپێناو چاکسازییە کۆمەلأیەتی و ئابوریی و سیاسیەکاندا پێکەوە کە دواتر بەدرێـژیی باسیان لێوە دەکەین کە سروشتی کۆمەلأیەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد لە–ناوەرۆکە بوژوازیەکەی– وە لەسەدەی نوزدەهەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا پەرەیسەند بۆ بزوتنەوەیەکی خاوەن ناوەرۆکی جوتیاریی و جەماوەریی هەر لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە بەشێوەیەکی تایبەتی لەبەر چەند هۆکارێکی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی کەدواتر لەچوارچێوەی باسەکەدا باسی لێوەدەکرێت. بمشێوەیە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیی وەك –بزوتنەوەیەکی بوژوازیی– نەمایەوە بەڵکو بووە بزوتنەوەیەکی جەماوەریی کە بورژوازیەت پێشەنگی ناکات بەڵکو پێشەنگەکەی شۆرشگێریی دیموکراسییە.

لەبواری تێبینی و خەملأندنی پەرەسەندنی ووردە ووردەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردیدا دەتوانین بڵێین کە ئەگەر رەچاوی ووردیی زانستیمان کرد بەوەی کە بزوتنەوە چەکدارییەکان و راپەرینە نیشتمانیە شۆرشگێریەکان کە لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزەدەهەمدا رویاندا لەجەوهەردا:

بزوتنەوەی رزگاریخوازی بوون دژی دەسەلأتی بیانی و بەیەکەوەلکاندنی زۆرەملێیی و ملکەچپێکردنی ناچاریی کوردستان بەدەوڵەتی عوسمانیەوە، سەرەرای توێکڵە عەشایەریی یان ئایینی یان هەرێمیەکەی و هەموویان تا شۆرشی بەدرخان پاشا– وەك سەرەتایەکی رێخۆشکەر بوون– بۆ بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد کە شۆرشی کردە پەیرەو رێبازێك بۆ خۆی.

لەبارەی هەڵسەنگاندنی ئەم بزوتنەوە کوردیانەوە پرۆفیسۆر فیلچیفسکی سۆڤیەتی دەربارەی بزوتنەوەکان کە رویاندا لەناوچەکانی بایەزید، وان، خوی، نەخجەوان، و ناوچەکانی تر بەهاوبەشی کوردە کۆچەرەکان تێیدا لەچارەیەکی یەکەمی سەدەی نۆزەدەهەمدا دەڵێت: ( مەسەلەکە تەنها گۆڵمەزی هەندێك سەرکردە نەبوو بەڵکو شۆرشێکی جەماوەری راست و دروست بوو، جەماوەری کوردی لەژێر فەرمانرەوایی

تورکەکانـــدا درێـــوترین جۆرەکـــانی زوڵمـــی دەچەشـــت بەدەســـتی فـــەرمانڕەوا زاڵمەکانیەوە)[٦٩].

هەروەها لەدرێژەی لێدوانەکانیدا لەسەر بزوتنەوە کوردیەکان کە رویاندا لەکاتی جـەنگی روسیدا تورکیدا ١٨٢٨-١٨٢٩ دەڵێت[٧٠]:

" شـۆڕش وڵاتەکـەیانی گرتـەوە ( واتـە وڵاتـی کوردەکـان- کۆچـەریی) لەوکاتـەدا کـە ئاراستەبوو دژ بەدەرەبەگـە تورکـەکان و کوردەکـان وەك یـەك، ئـەو دەرەبەگانـەی کـە بەستەمکاریی و چەواشەکارییەکانیان زیانیان بەئابوری کۆچـەرە هـەژارەکان گەیانـدبوو، فاکتـــەری ئـــابوریش بەتـــەنها هۆکـــاری شـــۆڕش نـــەبوو، بـــەڵکو هـــەروەها بیروبـــاوەڕی نیـشتمانیش کـاری زۆری تێـدا کردبـوو، ئـەم بیروبـاوەڕەش یەکـەمجار لـەناو ژینگـەی دەستەبژێردا[٧١] پەیدابوو لای سەرکردەکان و لەچواردەوریاندا هەتا گەیشتە جەماوەر".

کەواتــە بزوتنـــەوەی نەتـــەوەیی کـــوردی بزوتنەوەیـــەکی نەتـــەوەیی نـــاوەڕۆك بـــوژوازیی رزگاریخوازی بوو لەقۆناغی یەکەمیـدا پاشـان پەرەیـسەند بـۆ بزوتنەوەیـەکی نەتـەوەیی بـوژوازیی دژ بـەئیمپریالیزم و دەسـەڵاتی بیـانیی و لـەقۆناغی نوێـشیدا پەرەیـسەند بـۆ شۆڕشێکی نیشتمانی نوێ واتە شۆڕشێکی دیموکراسی میللی.

ئەم شۆڕشە شورشێکی نیشتمانیە بەو مانایەی کە تێدەکۆشێت بۆ رزگارکردنی نیشتمان لەدەسەڵاتی ئیمپریالیزم و چینە قۆرخکەرو فریـودەرە بیانیـەکان وەك دەرەبەگایـەتی و بورژوازیـەتی کـۆمبرادۆری و پاشـانیش بـەدیهاتنی جۆرێـك لـە فـەرمانڕەوایی نیـشتمانی بەمومارەسەکردنی ماف چارەی خۆنوسین دوای بەدەستهێنانی.

شۆڕشـێکی دیموکراسیـشە چـونکە هـەر لەسـەرهەڵدانیەوە تێدەکۆشـێت بـۆ لابردنـی کۆسپەکان کە رێگرن لەبەردەم پێگەیشتنی پەرەسەندنی سەرمایەداری و هاوچـەرخیداو کۆتایهێنان بە سستمی دەربەگایەتی کۆنخوازیی.

---

[٦٩] - لا ١٩٤ لەکتێبی- الاکراد- (ب. نیکیتین).

[٧٠] -لا ١٩٤-١٩٥ سەرچاوەی پێشوو

[٧١] - پێـشتر باسمـان لـەهۆکارەکانی بڵاوبونـەوەی بیروبـاوەڕی نیـشتمانی کـرد لـە ژینگـەی دەسـتەبژێرو سەرکردەکان و چواردەوریاندا لەناویشیاندا هۆکارە مادیی و مێژوییەکان.

زاڵبوون بەسەر دەرەبەگایەتی و پاشماوەکانی چاخەکانی ناوەڕاست و رزگارکردنی ژن لەکۆتە کۆنەپەرستیەکان و پێدانی مافی خۆبەڕێوەبردن بەگەل لەرێگەی نوێنەرایەتیەکی هەڵبژێراوە لەلایەن خۆیەوە واتە پێدانی مافەکان و ئازادییە دیموکراسیەکان بەگەل بریتیە لەناوەڕۆکی دیموکراسی شۆڕشی نیشتمانی بەگشتی لەناویشدا شۆڕشی نیشتمانی کوردیی بەڵام دیموکراسیەتی شۆڕش لەم سەردەمەماندا دیموکراسیەتێکی بوژوازیی کلاسیکی نیە، بەڵکو دیموکراسیەتێکی نوێیە، دیموکراسیەتێکی میللی.

ووتمان بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردی بەشێوە کۆرپەلەییەکەی لەکاتی راپەڕینە نەتەوەییەکاندا دەستپێکرد کەلەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە لەکوردستان رویانداو لەکاتێکیشدا کە کۆمەڵگەی دەربەگیی کوردستانی دەگۆڕا بۆ کۆمەڵگەیەکی نیمچە دەربەگایەتی و بازرگانی و سەرمایەداریی بازرگانیی لەکوردستان گەشەی دەکردو هەندێك لە سەرۆك هۆزەکان گۆڕان بۆ بازرگان و خاوەن موڵك لەیەککاتداو بەکێشکردنی کوردستان بۆ بازنەو چەرخەی سستمی سەرمایەداریی جیهانی و گەشەکردنی مانیفکتوراتەکان و بلاَبونەوەی بەرهەمی شمەکی لەکوردستاندا.

## پەرەسەندنەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردی لەشۆڕشی بەدرخاندا

بەلاّم ئەو شۆڕشەی ناسراوە بە شۆڕشی بەدرخان پاشا، میری دورگەی بۆتان. ئەوا خاوەن چەند سیماو روخسارێکی نەتەوەیی روون و ئاشکرابوو لەرووی داخوازیەکانیەوە بۆ رزگارکردنی کوردستان لەدەسەلاّتی (بیانیی عوسمانیی) و هەوڵدانی بۆ بەرپاکردنی پیشەسازیە جەنگییە تایبەتیەکان و هاندانی پیشەسازیە پیشەییەکان و مانیفکتوریەتی و ناردنی نێردەی زانستی بۆ ئەوروپاو پەیوەندیکردنی بە ئیبراهیم پاشای میصریەوە بۆ یەکخستنی کۆششەکان دژی زەوتکەرە تورکە عوسمانیەکان و لەرووی هەمەگیریی بزوتنەوەکەیەوە بۆ چەند ناوچەیەکی فراوان لەکوردستان کەلەکوردستانەوە درێژبۆوە بۆ دیاربەکر–ئامەد–.

ئەگەر لێکترازان و جیابوونەوەی ناوخۆیی و خیانەت و دەستێوەردانی ئەنگلۆ–فەرەنسی نەبوایە لەدژی کوردەکان بەبەڵگەی بەرگریکردن لەمەسیحیەت[72] ئەگەر بەدرخانیش بیتوانیایە هێزەکانی گەل و هێزە چەکدارەکانی بەشێوەیەکی باشتر رێکبخات، ئەوا

---

[72] – مێژونوسان لەسەر ئەوە کۆکن کە پەیوەندیەکان لەنێوان کوردە موسڵمانەکان و برا مەسیحیە کوردستانیەکانیاندا و لەنێوان تایفە مەسیحیە غەیرە کوردەکاندا بەدرێژایی رۆژگار پەیوەندی خۆشەویستی و برایەتی و هاریکاریی بووە. دەبێت کوردەکان شانازی بکەن کە ئەم پەیوەندییانە باشن و بەرەو باشتریش پەرەدەسەنێت هەتا رۆژگاری ئەمرۆمان. سەرەڕای هەوڵە داگیرکارییە بەریتانیەکان و هەوڵەکانی دوژمنان ئەوا ئەم پەیوەندیانە بەخۆشەویستی و برایەتی ماوەتەوە. لەمێژووی ئەم پەیوەندیە درێژانەشدا تەنها یەك رودلو هەیە کە لەباریی و دروستی ئەم برایەتیە مێژوییەی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو شێواندبێت، ئەوەش ئەو قەسابخانە تاوانکارییە بوو کە سمکۆ (سمایل خانی شکاك) ئەنجامیدا دژ بە برا ئاشوریەکانمان ئەم پرۆسە غەدرکاریە کوردە پێشکەوتنخوازەکان ئیدانەی دەکەن و مێژوی کوردیی پڕ لە خۆشەویستی و دۆستایەتی لەبەرامبەر برا ئاشوریەکاندا بێزراوی دەکات.

چەندین جار خوێنی کوردەکان و ئاشوریەکان لەسەر کوشتارگەی ئازادی نیشتمانە هاوبەشەکەیان رژاوە، ئاشوریەکان و برا مەسیحیەکانی تریش چەندین شەهیدی سەرفرازیان بەخشیوە نمونەی هورمز ملك چکۆو چەندانی تر. لیژنەی لێکۆڵینەوەی سەر بە کۆمەڵەی گەلان لەساڵی ١٩٢٥ دا ئەوەی باسکردووە پەیوەندی لەنێوان گەلی کوردی و مەسیحیەکان باشترین جۆرەکانی پەیوەندی بووە لەنێوان موسڵمانان و مەسیحیەکاندا.

سەرکەوتنی بەدەست دەهێناو هیواو ئاواتی گەلی کوردیش بەدیدەهات لەفەرمانڕەوایی کردنی نیشتمانی.

لەبارەی هەڵسەنگاندنی بەدرخان پاشاوە مامۆستا (دیرك کینین– نوسیویەتی و دەڵێت[٧٣]: " لە ١٨٤٣ز، وە ئەمیر بەدرخان میری جەزیرەی ئیبن عومەر لەناوچەی بۆتان، هەستا بەهەوڵێك بۆ بەدەستهێنانی ئازادی و دەرهێنانی لەچنگی دەسەڵاتی عوسمانیەکان. ئەوەش یەکەم راپەڕین بوو کە توانرا ناوببرێت بەنیشتمانپەروەری بەچەمکە نوێیەکەی.

بەدرخان پلانی دارِشت بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کوردیی کەدرێژدەبۆوە بەناو ئەو یەکێتیانەدا کە سەرۆکایەتی دەکردن، بەدرخان بۆ ماوەی ٤ ساڵ بەرەنگاریی سوپای عوسمانی بۆوەو مژدەدەرە ئەمریکیەکان باسیان لەوە کردووە کە حکومەتەکەی بەدرخان حوکمێکی دادپەروەرانەی یاسایی چەسپاندوە بۆ یاساو زاڵبوونی تەواوەتی و سستمی دارایی".

بەپێچەوانەی پروپاگەندە داگیرکەریەکانیشەوە رژێمی بەدرخان پاشا یەکسانی تەواوەتی لەنێوان کوردە موسڵمانەکان و برا مەسیحیەکانیدا دەستەبەرکردبوو. هەروەك چۆن ئاسایش و سستم و رژێمێکی دادپەروەریی بۆ کارگێڕیی و کۆکردنەوەی باجەکان سەپاندبوو، لەواقیعیشدا ئەوە داگیرکەری بەریتانی بوو کە هەوڵیدا ناکۆکی دروست بکات لەنێوان کوردەکان و برا مەسیحیەکانیاندا کە دانیشتووی کوردستان بوون هەر لە١٨٢٩وەو کاتێك کە نێردە مژدەدەرە داگیرکەریەکان دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی ژەهرەکانیان لەژێر روکارێکی ئاینیدا لەدوای ماوەیەکیش داگیرکەری بەریتانی یەکێك لەبەکرێگیراوەکانی کە ناوی (کرانت)بوو نارد بۆ کوردستان و ناوچەی هەکاریی و بۆ ناو برا نەستوریەکان بەتایبەتی ئەم بەکرێگیراوە لەگوندی (تکومە) نیشتەجێ بوو لەوێ قەڵایەکی سەربازیی دروستکردو دەستی کرد بە چاندنی تۆی دوبەرەکیی و دوژمنکاریی لەنێوان کوردە موسڵمانەکان و برا نەستورییەکانیاندا. بەپروپاگەندەکانی ئەم بەکرێگراوەش شەمعون هەڵخەڵەتاو بەهۆی ئەمەوە چەند روبەڕوبونەوەیەکی خوێناوی

---

[٧٣] – (الاكراد وكردستان) ی مامۆستا دیرك کینین لا ٢٣ لەچاپە ئینگلیزیە یەکەمەکە لەندەن ١٩٦٤.

لەنێوان ئاشوریەکان و هەندێك هۆزی سەر بە بەدرخاندا روویانداو ئەمەش ئەوەی خواست کە بەدرخان بێتە ناو مەسەلەکەوە. بالیۆزی ئەوکاتەی بەریتانیاش لەئەستانە بەرێز- ستراتفۆرد رید کلیف- ئەوەی قۆستەوەو لای بابولعالی مەسەلەکەی وروژاندو فشاری خستە سەر حکومەتی تورکی بۆ ناردنی سوپا تا شۆڕشەکەی بەدرخان پاشا سەرکوت بکات بەوشێوەیە داگیرکەری بەریتانی و هەر لەوکاتەوە دوژمنایەتی خۆی بۆ بزوتنەوەی کوردی و هیواو ئاواتەکانی گەلی کوردی خستەڕوو مامۆستا باسیل نیکیتین لەبارەی بابەتی پەیوەندی لەنێوان کوردەکان و مەسیحیەکان لەوکاتەدا نوسیویەتی و دەڵێت ( هەرچۆنێك بووبێت ئەوا زۆرێك لە بەڵگەنامە ئەرمەنیەکان ئەو ڕاستیە نیشان دەدەن کە بەدرخان پاشا مومارەسەی سیاسەتێکی ئایینی نمونەیی دەکرد و خۆی بە سەرکردەی رۆحی ئەو ناوچەیە دەزانی کە لە ژێر دەسەلاتی تورکیی رزگارکرابوو).

شۆڕشی بەدرخانیش لەناوچەیەکی دیاریکراوی کوردستاندا نەمابۆوە بەڵکو چەندین ناوچەی جیاوازی کوردستانی یەکخست کەلەبۆتانەوە درێژدەبۆوە هەتا موکریان.

چەندین کەسایەتی کوردی و سەرۆك هۆزەکان و دەسەلاتدارە کوردەکان هاتنە ژێر سایەی فەرمانڕەوایەتی بەدرخانی کوردی نیشتمانپەوەرەوە.

شۆڕشەکە لەسەرەتایەوە چەندین سەرکەوتنی دیارو ئاشکرای بەدەست هێنا کەپێی چەندین ناوچەی فراوانی لەکوردستان رزگارکرد پاشان خیانەتی ناوخۆیی رۆڵێکی بەدو خراپی گێڕا لەشکستپێهێنانیداو پاش شۆڕشی بەدرخانیش بزوتنەوەو راپەڕینی چەکدارانە روویاندا کە بەهۆیانەوە هەست بەپێویستی رێکخستنی هێزەکانی شۆڕش و خۆئامادەکردن بۆی و گشتاندنی کرا نەك لەناوچەیەکی دیاریکراوی کوردستاندا بهێڵرێتەوە، هەروەها پلاندانان بۆی پێش سەرهەڵدانی و دۆزینەوەی پەیوەندی برایانە لەگەڵ برا مەسیحیەکاندا لەئەرمەن و ئاشوریەکان و کلدانەکان بەتایبەتی ئەوانەیان کە نیشتەجێی کوردستانن.

# لەکاتی شۆڕشی شەمزیناندا

لەسـاڵی ١٨٨١ز بەشـێوەیەکی کرداریـی شۆڕشـی نیـشتمانیی کـوردی لـە شـەمزینان هەڵگیرسا[٧٤] دوای ئـەوەی کـە سـەرکردەکەی خوالێخۆشـبوو شـێخ عوبەیـدوڵڵای نـەهری هەستا بەگرێـدانی کۆنگرەیـەکی عەشـایەریی کـوردیی لەگونـدی (نـەهری) لـە تـەمموزی ساڵی ١٨٨٠ تێیدا بڕیاری دامەزراندنی- کۆمەڵەی هۆزە کوردەکـان درا- پـێش ئـەوەش شـێخ عوبەیـدوڵڵا چـەندین پەیوەنـدی لەگـەڵ سـەرکردە کوردییـەکان ئەنجامـداو پەیوەندیەکی باشی بەرپاکرد لەگەڵ ئەرمەن و ئاشـوریەکان و بـرا مەسـیحیەکانی تـرداو پەیوەندیکردنی بەولاَتانی بیانیەوە- ئینگلتەراو ڕوسیا- بۆ باسکردنی مەسەلەی کـوردو بەدەستهێنانی دۆستایەتی و سۆزیان. دوای ئەوە شۆڕش هەڵگیرساو لەسەرەتایدا چـەند سـەرکەوتنێکی گرنگـی بەدەسـتهێنا، بـەلاَم سـەرۆکەکەی هـەڵفریوێنرا بەتایبـەتی دوای ئەوەی کە ڕوسیای قەیسەریی و بەریتانیا لەدژی شۆڕشی کوردیی دەستوەردانیان کـردو دوای ئـەوەی کـە هـەروەها تورکیـاو ئێـرانیش کۆشـشە هاوبەشـەکانیان دژ بەشـۆڕش یەکخست، ڕازی بوو بڕوات بۆ ئەستەنبوڵ بـۆ دانوسـتان لەگـەڵ حکومـەتی عوسمانیـدا، بەلاَم لەبری ئەوەی دانوستانی لەگەڵدا بکرێت خرایە زیندانەوە.

دوای دەسـتگیرکردنی سەرۆکەکەشـی شۆڕشـەکە نـەیتوانی خـۆی ڕابگرێـت چـونکە بزوتنەوەیـەکی جـەماوەریی نـەبوو لـەڕووی سـەرکردایەتی و پێکهاتـەی دەزگاکانیـەوە، هەروەها بنکەیەکی جەماوەریی هۆشیارو ڕێکخراوی نەبوو، بەڵکو مـۆرکێکی هۆزایـەتی و عەشـایەریی و تـاکڕەو زاڵ و دیـاربوو پێیـەوە هـەروەها لەبەرئـەوەی- کۆمەڵـەکان- و بزوتنـەوە عەشـاریەکان لەمێـژوودا بـەپێی سروشـتی جەمـسەرە چـینایەتیە

[٧٤] – ئەم کتێبە بە شتێك لەووردیی باس لەشۆڕشی شەمزینان دەکات بۆیە لێرەدا بە تـەنها پۆختەیەك واز دەهێنم.

کۆمەڵایەتیەکانیان– نەتوانابوون لە سەرکردایەتیکردنی شۆڕش بەرەو سەرکەوتن، یان بەردەوامی پێدانی بۆ ماوەیەکی درێژ، هەروەها لەبەر باڵادەستی سەربازیی تورکی– ئێرانی و پشتیوانی ئینگلیزی و قەیسەریی بۆیان زۆرێک لەهۆزەکانیان ترسان کە سروشتێکی ڕاڕایان هەبوو، هەروەها سیفەتی بەردەوامیان تێدا نەبوو بۆ ئەنجامدانی کاری قورس و گران. بەڵام هەموو ئەمانە ناتوانێت سروشتی نەتەوەیی شۆڕش بسڕنەوە کە ب . نیکیتین لەبارەیەوە دەڵێت[٧٥]:–

" ڕاپەڕینە گشتیەکەی ئەم دواییە لەسەدەی نۆزدەهەمدا، ئەوەیە کە ١٨٧٨– ١٨٨١ز ، رویدا بەسەرکردایەتی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری کە هێرشی کردە سەر ئێران و هەندێك سەرکەوتنی بەدەستهێنا، وە لەژێر فشاری بەریتانی– روسیدا و هاریکاریی تورکی – ئێرانی هاوبەشدا، هەوڵەکانی شێخ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی کۆتاییان هات".

سەرەڕای شکستخواردنی ڕاپەڕینە چەکدارییە بەراییەکانی شۆڕشی نیشتمانی کەلەماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا رویاندا، لەبەدیهێنانی ئامانجە نیشتمانیە گەورەکاندا، بەڵام ئەرکێکی ترسناکیان بەدیهێنا، ئەویش چۆڕپەستبوون و گەڵاڵەبوونی نەتەوەی کوردی و بزوتنەوە رزگاریخوازییەکەیە لەقاڵبە نەتەوەییەکەیداو بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی و هەستی نەتەوەیی لەکوردستانداو هەڵماڵینی دەمامك لەسەر روخساری مرومۆچی فەرمانڕەوا عوسمانیە ستەمکارەکانی دژ بە گەلی کورد پاشانیش رێنوێنی کردنی گەلی کوردی بۆ پێویستی رێکخستنی هێزەکانی و یەکخستنی ڕیزەکانی و ئامادەباشی تەواوەتی و خۆسازاندن بۆ شۆڕش پێش دەستپێکردنی، لەوانەش هەروەها خستنەڕوی ئەوەی کە پێویستە خەباتێکی نیشتمانی بەسەر پشتێنەی کوردستاندا ئەنجام بدرێت، واتە بەزاندنی ئەو پشتێنە هەرێمیەی کە سەپێنراوە بەسەر ئازادیدا لەسەرەتاکەیەوە.

---

[٧٥] – دیرك کینین لەکتێبەکەیدا الاکراد وکردستان لا ٢٤ چاپە ئینگلیزیە یەکەمەکە لەندەن ١٩٦٤.

لەنەوەدەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا چەندین هەوڵی کوردیانە درا بۆ بەدەستهێنان[٧٦] و دۆستایەتی و پشتیوانی ڕوسیی، دیارترینیان پێشوازیکردنی قەیسەر نیکۆلای دووەم بوو لەوەفدێکی کوردیی کە جەعفەر ئاغای شکاك و چەند سەرکردەیەکی تری کوردیی لەخۆگرتبوو، بەڵام ئەم هەوڵە کوردییانە لەبەردەم هەڵپەکان و پرۆژەکانی روسیای قەیسەریدا لەناچوون.

[٧٦] – بگەڕێرەوە بۆ ئەو توێژینەوەیەی کە پرۆفیسۆر ب. برینیتس مامۆستا لەزانکۆی– مارتین بۆسەر– شاری هاله لەئەڵمانیای دیموکراسی نوسیویەتی و گۆڤاری زانستی زانکۆ لەژمارە ٩/١٠ی ساڵی سیانزەهەمیدا– ساڵی ١٩٦٤ بڵاویکردبۆوە لەژێر ناونیشانی:
(دەربارەی هەندێك مەسەلەی مێژوویی بزوتنەوەی نیشتمانی کوردیی) ئەم توێژینەوەش برای بەڕێزم (دارا ئەنیب) لەئەڵمانیەوە بۆی وەرگێڕامە سەر زمانی عەرەبی.

## تێکۆشانی فیکریی نەتەوەیی و
## خەباتی هاوبەش لە پێناو دەستوردا

دوای دامرکاندنـــەوەی شۆڕشـــی نیـشتمانی کـوردیی لەشـەمزینان، رێگـا خۆشـبوو بـۆ دەرکـــەوتنی کۆمەڵـــەکان و رۆژنامەگـــەریی کـــوردیی تـــازە گەشەســـەندو، قۆنـــاغی بلاوکردنـــەوەی هۆشـــیاریی لەرێگـــەی رۆژنامـــەو ئەدەبـــەوە، قۆنـــاغی پەیوەندییـــەکان و نامەگۆڕینەوە لەنێوان نیشتمانپەروەر کوردەکانـدا بەمەبەسـتی رێکخـستنی ریزکانیـان، وەك بەرایی و رێگەخۆشکردنێك بـۆ رێکخـستنی هێـزە نیـشتمانییە کوردیـەکان، گومـانی تێدا نیـە کـە بزوتنـەوەی نیـشتمانی کـوردیی پەرەیـسەندبوو بەکاریگـەری بلاوبونـەوەی بیرۆکـــە نەتەوەییـــەکان و هەســـتی نیـــشتمانی و هاتنـــەناوەوەی دروشمـــەکانیان و مەبەستەکانیان بۆ نێو ناوەندەکانی پیاوانی کـوردیی لـەمیرەکان و خـاوەن موڵکـەکان و نیـشتمانپەروەرەکان و پیـاوانی ئـایینی و شـێخەکانی تایفـە مەزهەبیـەکان، ئـەم ئەرکـە دەستەیەکی کوردیی دیـسپلین و رێکخـراو پێـی هەسـتان کەلـە ئەسـتانە یـان لەئـەورووپا خوێندبویان هـەروەها هەنـدێك لـە ئەدیبـە کوردەکـان و لەپێشیـشیانەوە خوالێخۆشـبوو (حاجی قادری کۆیی) ١٨١٧–١٨٩٤ شاعیرو سوارچاك بـوو لـەم گۆڕەپانـە نیـشتمانیەدا کە بە هۆنراوەکانی و بەیتە نیشتمانیەکانی گوزارشتی لە هەستە نەتەوەییـە کوردیـەکان دەکرد کە لەنێو دڵ و دەروونە هۆشیارو بەئاگاکاندا خەریك بوو بڵێسەی دەسەند.

بزوتنەوەی کوردیی هەروەها کاریگەر بوو بە بزوتنەوە نیـشتمانیەکانی گەلـە ئەرمـەنی و بولگـاریی و عەرەبیـەکان و ئـەو گـەلانی تـریش کەلـەژێر نێڵـەی عوسمانیەکانـدا کەنفتـە بووبوون.

هـەروەها لەوکاتـەدا قـاهیرەش ناوەنـدێکی فیکـری و رۆشـنبیری بـوو بـۆ بزوتنـەوەی نیـشتمانی و بزوتنـەوەی چاکـسازیی و بـیروڕا ئازادەکـان کـە مامۆسـتا نـەمرەکانی وەك جەماڵەدینی ئەفغانی و محمد عەبدەو ئەوانی تر لەبیرمەنـدە ئازادیخوازکـان رایانگەیانـد.
هەنـــدێك لەنیـــشتمانپەروەرە کوردەکـــانیش کـــە لـــەوێ بـــوون کاریگـــەربوون بـــەم نیـــشتمانپەروەریەتیەی کەلـــەقاهیرەو سەرچـــاوەی گرتـــووە، بۆیـــە یـــەکێکیان کـــە خوالێخۆشبوو (مەدحەت بەدرخان)بوو هەستا بەدەرکردنی رۆژنامەی کوردستان لەساڵی

١٨٩٥ بەمەبەستی ناساندنی مەسەلەی کورد بەخەڵك و بانگەشەکردن بۆی ڕۆژنامەکەش ڕۆڵێکی باشی بینی لەبەئاگاهێنانەوەی هەستی نەتەوەیی و چۆڕبەستکردنی و بانگەشەکردن بۆ یەکگرتن لەنێوان سەرکردە کوردەکان و پیاوانی ئایینی و ئەوانەش کەلەدەوربەریانن.

هەروەها نیشتمانپەروەر کوردەکان کاریگەربوون بە چاکسازە تورکەکان کەلەپێناو دەستورو بەمەدەنیەتکردنی دەوڵەتی عوسمانیدا تێدەکۆشان و، لەژێر کاریگەری بانگەشەکردنی نەتەوەیی لەوکاتەدا لەخۆرهەلات بۆ دەستور و مافەکانی گەل و پەرلەمان، هەروەها بەکاریگەری شۆڕشی ١٩٠٥ی ڕوسی نیشتمانپەروەرە کوردە هۆشیارەکان بەرەو هاریکاریکردن چوون لەگەڵ چاکسازە تورکەکان و دەستورییە ئێرانیەکان دژ بە زوڵم و ستەمکاریی و بەهیوای بەدەستهێنانی مافە دەستورییەکانیان و جۆرێك لە لامەرکەزییەت بۆ کوردستان.

لەبارەی پێگەیشتنی شۆڕشی (١٩٠٥)ز ڕوسی بەکوردەکان و کاریگەربوونیان پێی (جیرکۆف) کونسولی گشتی روسی لەشاری خوی نوسویەتی :-

" لەکاتی گەشتەکانی بازرگانە کوردەکاندا و یاریدەدەرەکانیان لەخوێنەوارە کوردەکان[77] بۆ (نزنی نوفکۆرد) بۆ ئامادەبوون لە پێشانگای ماکاریۆف، لەوێ چاویان بە دیموکراسیەکان و سەربازە ڕوسەکان دەکەوت و ئەوان لە گرنگترین ڕوداوەکانی شۆڕشی ١٩٠٥ ز ئاگاداریان دەکردنەوە).

بەکرداریش نیشتمانپەروەرە کوردەکان بەشداریان کرد- لەقۆناغی تێکۆشانی هاوبەشدا ئەمەش لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە لەگەڵ برا نیشتمانپەروەرو چاکسازە تورك و ئێرانیەکاندا بەشدارییەکی چالاك لەکارکردن لەپێناو دەستور و لەشۆڕش لەپێناویدا، هەروەك چۆن بەجدی و بەشەوقەوە بەشداریان کرد لە هەردوو بزوتنەوە چاکسازییە ئێرانی و تورکیەکەدا.

---

[77] - بگەڕێرەوە بۆ ئەتروحەکەی دکتۆر سەید عەزیز شەمزینی بەناونیشانی ( بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد) کە ئەم برگانەی تێیدا وەرگرتووە لە (پەخشنامەی زانیارەکان لەبارەی وڵاتانی هاوسێوە سەرکردایەتی ناوچەی قەفقاسی سەربازیی ژمارە ٤٠/ تفلیس ساڵی ١٩١٢ لا ١٦ بەزمانی ڕوسی.

کاتێکیش شۆڕشی ئێرانی لەساڵی ١٩٠٥ لەپێناو دەستوری هاوبەشدا رویدا کوردەکان و بەتایبەتیش هۆزی گەورەی کەلهوڕی کوردی بەشداری کردو بەهێزی چەك پشتیوانی لەشۆڕش کردو بەرەنگاری سوپای روسی بۆوە کە هاتە ناوەوە بۆ لەناوبردنی شۆڕش و بەمەش قوربانیەکی زۆریدا هەروەك چۆن بەشێکی گەورە لەکوردەکان پەیوەندیان کرد بەشۆڕشگێڕە دەستورییە ئێرانیەکانەوە کاتێك کە سوپای قەیسەریی کشا بەرەو ئازەربایجان بۆ تێکشکاندنی بزوتنەوەی شۆڕشەکە، وەك ئەوەی کە پرۆفیسۆر ب- برنتیسی ئەڵمانی دەڵێت و لەپێشەکی کتێبەکەی دکتۆر رەحیم قازی کە بەناونیشانی "پێشمەرگە"یە ئەم پێشەکیە هاتووە کە سەید حەسەن قزڵجی نوسیویەتی و تێیدا هاتووە:

میرزا فەتاحی مامی دکتۆر رەحیم قازی چەندین ساڵی لەزیندانەکانی تاراندا بەسەربرد بەهۆی بەشداریکردنیەوە لەشۆڕشی ئێرانیدا لەپێناو دەستور ، ئەم شۆڕشە لەئێراندا بە (کودەتای مەشروتیەت)ناسراوە هەروەها بەڵگەیە لەسەر بەشداریکردنی خەڵکی ناوچەی موکریان لەبزوتنەوەی  چاکسازیی و دەستوریدا.

هەروەها کوردەکان ئارەزویان کرد هاریکاریی بکەن لەگەڵ (لاوانی تورك)و سەرکردەکانی تێکۆشان لەپێناو دەستوردا هەروەك چۆن بەشداریان کرد لەو بزوتنەوەیەدا کە بووە هۆی کودەتای عوسمانی و، چالاکانە بەشداریان کرد لەژیانی دەستوریداو دەستیان کرد بە رێکخستنی هێزەکانیان لەناو کۆمەڵەو رێکخراوە کۆمەلأیەتی و سیاسی و رۆشنبیریەکاندا، بەوشێوەیە رێگەی خەبات و تێکۆشانی دەستوریان گرتەبەر. لەساڵی ١٩٠٨ ز، کۆمەڵەی (تەعالی و تەرەقی) کوردی دروست بوو کە سەرۆك خێزانە کوردییە بەناوبانگەکانی لەخۆگرت نمونەی شەهید شێخ عەبدولقادری شەمزینی و ئەمین عەلی بەدرخانی و ئەلد ئاماد ئەحمەد زولکیفل پاشا و ژەنراڵ شەریف پاشاو چەندین ئەفسەری تری رۆشنبیری کوردو خوێندکارانی زانکۆ و رۆژنامەی کوردستان دەستی کردەوە بەدەرچوون دوای راگەیاندنی دەستوری عوسمانی لەشاری ئەستەنبوڵ، پاشان قوتابیە کوردەکان لەساڵی ١٩١٠ کۆمەڵەی (هێڤی)یان دروستکرد ئەویش دوای ساڵێك لە داخستنی کۆمەڵەی "بلأوکردنەوەی مەعاریفی

کوردی" و داخستنی قوتابخانەی کوردی لە- جمبرلی تاش- کۆمەڵەی هێڤی گۆڤاری (ڕۆژی کورد-ی دەرکرد کە ڕۆشنبیرە کوردەکان دەیانوسی بەوشێوەیە دەبینین کە بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی لەدەیەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا چووە قۆناغێکی نوێی ترەوە کە قۆناغی بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی پێشکەوتنخوازیە بەشێوازی هاوچەرخانە لەرێگەی ڕۆژنامەو بڵاوکردنەوەو ئەدەبیاتەوە، پاشان ڕێکخستنی حزبی ، قۆناغی تێکۆشانی هاوبەش لەگەڵ تورکەکان و ئێرانیەکاندا لەپێناو دەستوردا لەدژی زوڵم و ستەمکاریی و لەپێناو لامەرکەزیەت بۆ گەلە کەوتوو کەنفتەکانی ژێر نێڵەی عوسمانی، هەربۆیە بزوتنەوەکە بووە بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی هاوچەرخ، باندیت[78]جەواهر لال نەهرۆ دەڵێت کوردەکان هەستان بە " بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی دوای شۆڕشی تورکی ساڵی ١٩٠٨ ز، هەروەك چۆن نوێنەرانی کورد لەکۆنگرەی ئاشتەوایی لەفرسای داوایان کرد سەربەخۆییان پێبدرێت".

بەڵام لاوە تورکەکان تێربوون بە بیرۆکەی تۆرانیی " کە بیرۆکە گەلێکی رەگەزپەرستی فراوانخوازیی دەمارگیرە دەیەوێت نەتەوە ناتورکەکان لەبۆتەی ئیمپراتۆریەتی تۆرانیدا بتوێنێتەوەو خەون بەئیمپراتۆریەتێکەوە دەبینێت کە فراوانترە لەدەوڵەتی عوسمانی" بۆیە و بەپێی سروشتە چینایەتیەکەیان ( لەرووی نوێنەرایەتیان بۆ بورژوازیەتی نەتەوەیەکی سەردار) ممارەسەی سیاسەتێکی دوژمنکارانەیان کرد دژ بەو نەتەوانەی کە ژێردەستەی حوکمی عوسمانی بوون ، وەك عەرەب و کوردو ئەرمەن و ئەوانی تر ئەمەش بووە هۆی دورکەوتنەوە لەنێوان نیشتمانپەروەرانی ئەم نەتەوانەو بزوتنەوەی بورژوازی تورکی کە -لاوە تورکەکان- نوێنەرایەتیان دەکرد، پاشانیش ئەمە بووە هۆی پچڕانی پەیوەندی و هاوکاریی و خەباتی هاوبەشی نێوانیان.

وەك پەرچەکردارێکیش بۆ بزوتنەوەی تۆرانیی بزوتنەوە نەتەوەییەکانی گەلانی چەوساوەی ناو دەوڵەتی عوسمانی ئەمانیش توندبوون لەناویشاندا بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردی هەربۆیە گەڕایەوە ناوەوەی خۆی و چالاکیەکانی چڕکردەوە لەناو لولپێچە نەتەوەییە تایبەتیەکەیداو هەڵکردنی دروشمە تایبەتیەکانی.

---

[78] - لمحات عن تاريخ العالم.. جەواهر لال نەهرۆ لا ٢٥٩- چاپە عەرەبیە یەکەمەکە.

شاعیری ناودار -ئەبو قاسمی لاهوتیی-[79] لەوتارێکدا کە گۆڤاری (خۆرهەلاتی نوێ) سۆڤیەتی بۆی بلاوکردۆتەوە لەساڵی ١٩٢٣دا بەناونیشانی " کردستان والاکراد" دەڵێت:
" سیاسەتی شۆڤینیزمانەی (پان ترکیزم) لای لاوانی تورك- زون ترك- فیکریی نەتەوەیی توندڕەوی دروستکرد، هەروەها بزوتنەوەی لاوانی کورد هەروەك چۆن کاریگەریی نەتەوەیی پێچەوانەی لای عەرەب و ئەرنائوت و گەلەکانی تر دروستکرد لەگەلانی ئیمپراتۆریەتی تورکیی". کاتێکیش کوردەکان بێهیوابوون لەسودو کەڵکی هاریکاریی لەگەڵ لاوانی تورکی شۆفینیداو ڕێگەی ئاشتیانە بۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان بەڕویاندا داخراو ئەڵقەی خەباتی هاوبەش لەگەڵیاندا پچڕا، ڕویان لە تێکۆشان کرد بۆ بەهێزکردنی کۆمەڵەکانیان و پتەوکردنی یەکێتی ڕیزەکانیان، هەروەها پەیوەندیە دەرەکیەکان بەمەبەستی بەدەستهێنانی سۆزو کۆمەك بۆ ڕزگاربوون لەچەوساندنەوەی نەتەوەیی و ستەمە کۆمەلایەتیەکان بۆ ئەمەش میر عەبدولرەزاق بەدرخان و ئەوانی تر لەپیاوانی کوردیی هەوڵیاندا لەنیازو نیەتی روسەکان تێبگەن و بتوانن یارمەتی ئەوان بەدەست بێنن وەك نیکیتین دەڵێت. لەکۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا ڕاپەڕینێکی کوردیی چەکدارانە رویدا لەبەتلیس و هەندێك لەشوێنەکانی تری کوردستان. بەلام ئەو جەنگەی تورکیا چووبووە ناویەوە لەژێر دروشمێکی فریودەرانەدا کە جیهادە بزوتنەوەی نیشتمانی کوردیی خستە ناو هەلوێستێکی زۆر تەنگەلانەوە بەهۆی زلکردنی بانگەشەی ئایینی بەناوی بەرگریکردن لەئیسلام و خەلافەتی ئیسلامیی، کە پیاوانی سادەو ساویلکەو چەندین کەسیان لەپیاوانی ئایینی بەم دروشمە هەڵخەڵەتاند، لەگەڵ ئەوەشدا نیشتمانپەروەرە کوردو هۆشیارەکان دەرکیان بە حەقیقەتی ئەم بانگەشە چەواشەکارانە کردو هەندێکیان پەیوەندیان کرد بەڕوسەکانەوەو داوای یارمەتیان لێکردن بۆ ڕزگارکردنی کوردستان لەچنگی تورك لەبەرامبەر پشتیوانیکردن لەروس لەجەنگەکەدا.

ب. نیکیتین[80]- کونسوڵی گشتی پێشوی روسی لە ئۆرمیە دەڵێت:

---

[79] - وتاری -کردستان والاکراد_ بەپێنوسی ئەبو قاسمی لاهوتیی لەگۆڤاری- خۆرهەلاتی نوێ ی سۆڤیەتیدا چاپە روسیەکەی ژمارە چوار لا ٦٥ ساڵی ١٩٢٣ بگەڕێرەوە بۆ ئەتروحەکەی دکتۆر شەمزینی.

" کمیل بەگ لەبۆتان کە لەخێزانی بەدرخانە، بەجدی لەساڵی ١٩١٦دا لەتفلیس گرنگیدا بە باسکردن و خستنەڕوی کێشەی کورد لەبەردەم نیکۆلاً، جێگری پاشا لەقەفقاس و سەرۆکی هێزەکانی روسیا کە ئەوکات لەسەر سنوری تورکی سەنگەریان بەستبوو، وا دیارە لەو مێژووەدا روسیا سیاسەتێکی روونی سەبارەت بەکوردەکان تەبەنی نەکردبوو.
هەروەها مامۆستا نیکتین بەردەوام دەبێت و دەڵێت:
" لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩١٧دا لە ناوەندە کونسوڵیەکەم لەئورمیە پێشوازیم لەنوێنەرێك کرد لەلایەن کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستانەوە نێرابوو، نامەیەکی پێدام لەلایەن بەرێز تەهاوە بوو تێیدا داوای ئەوەی دەکرد چاویان بە بەرپرسە سەربازییە روسەکان بکەوێت بەمەبەستی رێکەوتن لەسەر کارێکی هاوبەش دژی تورکەکان کە بتوانرێت کوردستان رزگار بکرێت".
بەڵام هۆکاری نارازی بوونی قەیسەریەت لەیارمەتیدانی کوردەکان تەنها ئەوە نەبوو کە مامۆستا نیکیتین باسی کردووە، بەڵکو هۆکارە سەرەکیەکە بوونی رێکەوتنێکی نهێنی بوو لەنێوان روسیاو بەریتانیا و فەرەنسادا، ئەوەی کە بەلشەفیەکان دواترو پاش سەرکەوتنیان ئاشکرایان کردو دڕیان، بەپێی ئەو رێکەوتنە کوردستان لەنێوان ئەو وڵاتانەدا دابەش دەکرا بەوەی کە بەشە مەرکەزیەکەی بدرێتە روسیای قەیسەریی و کوردستانی باشور- کوردستانی ئێستای عێراقیش بدرێتە فەرەنساو کوردستانی ئێرانیش- لەئەردەلانەوە- بدرێتە بەریتانیا.
بەرژەوەندی قەیسەریەت و ئەم رەوشە یەکینەدەگرتەوە لەگەڵ بەرژەوەندی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا کە دەیویست کوردستان رزگار بکات ئەم رزگارکردنە کەدژ بە رێکەوتنامە نهێنیە داگیرکاریەکەو بەرژەوەندیە سەرەکیەکانی ئەو داگیرکەرانە بوو.
بەڵام جەنگی جیهانی یەکەم کۆتایی پێهات بەپێچەوانەی ئەوەوە کە وڵاتە داگیرکەرەکان ویستیان بوو، قەیسەریەت روخاو لەسەر داروپەردوەکەی یەکێتی سۆڤیەت دروست بوو بەسەرۆکایەتی ف. أ. لینین کە رێکەوتنامە داگیرکەریەکانی دڕاندو

---

[٨٠] - ب. نیکیتین لەکتێبەکەیدا- کوردەکان- الاکراد- لا ٢٠٠ چاپە عەرەبیە یەکەمەکە.

دوژمنایەتی توندی خۆیی راگەیاند بۆ داگیرکەرو پێوەلکاندنەکان و روسیا دەستبەرداری هەموو ئیمتیازاتەکانی روسیای قەیسەری بوو، داوای لەگەلانی خۆرهەلآت کرد تێبکۆشن لەدژی داگیرکەرو لەپێناو مافە نیشتمانیەکانیان و سەربەخۆیداو رایگەیاند کە دەولەتی سۆڤیەت پشتیوانی لەمافی گەلان دەکات بچووکیان و گەورەیان بۆ بریاردان لەسەر چارەنوسی خۆیان.

بەو شێوەیە شۆرشی ئۆکتۆبەر لەهەموو لاکانی روسیادا کلپەی سەندو دراوسێکانی رۆشنکردەوە نەتەوە زولملێکراوەکانی خۆرهەلآتیش چوونە ناو گۆرەپانی خەبات و تێکۆشانی نیشتمانیەوە لەناویشیاندا نەتەوەی کوردی.

لەئەوروپاش بزوتنەوە کرێکاریی و شۆرشگێرییەکانیش مەزن بوون، هەروەك چۆن — لەگەلّ هیواکانی گەلان و لەناویشیاندا گەلی کورد— بزوتنەوە نیشتمانیە رزگاریخوازیەکانی لەخۆرهەلآت هانداو گەلانی خۆرهەلآتیش— لەناویشیاندا گەلی کوردی— بەئاگاهاتنەوەو داوایان لە هاوپەیمانە سەرکەوتوەکان دەکرد بەلێنەکان و پەیمانەکانیان کە پێیاندابوون جێبەجێیان بکەن، بەتایبەتی ئەوەی لەکاتی جەنگدا رایانگەیاندبوو تێیدا جەختیان لەوە کردبۆوە رێز لە مافی گەلانی خۆرهەلآتی دەگرن لەمافی چارەی خۆنوسین و سەربەخۆیی نیشتمانیدا.

## هیوا بە هاوپەیمانان؛ بەلام بێئكام بوو

بزوتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی كوردی لەدوای جەنگ –لەناو رێكخراو و حزبەكان و تەكەتولە نوێكاندا– رێكخرا كە لەسەر داروپەردوی حزبەكان و كۆمەڵە كوردییە كۆنەكان دروستبوو نیشتمانپەروەرە كوردەكان لە سەرۆك هۆزەكان و فەرمانڕەوا و پیاوانی ئایینی نیشتمانپەروەرو ئەفسەران و رۆشنبیران دەستیان كرد بە داواكردنی مافەكانی گەلی كوردی و داوای سەربەخۆیی بۆ كوردستان لەژێر سەرپەرشتی بەریتانیادا– لەسەرەتاوە– پاشان سەربەخۆیی تەواوەتی دوای ئەوەی تێگەیشتن لە ڕاستی نیازە دوژمنكاریەكانی داگیركەری بەریتانی.

نیشتمانپەروەرە كوردەكان وەفدێكیان بەسەرۆكایەتی ژەنرال شەریف پاشا نارد بۆ كۆنگرەی ئاشتەوایی لەپاریس، ئەم وەفدە كوردیە هێزە نیشتمانیەكانی ناو كوردستانی عوسمانی پشتیوانیان لێدەكرد، وەفدەكە كۆششێكی زۆریان كرد بۆ رونكردنەوەی دادپەروەریی داخوازییە كوردیەكان و خستنەڕووی ڕاستی كێشەی كورد ئەوەش بووە هۆی سەركەوتنی لە خستنە ناوی مادەكانی ٦٢،٦٣،٦٤ بۆ ناو پەیماننامەی سیڤەر[٨١] تێیدا هاتبوو كە جۆرێك لەخودموختاری بدرێتە گەلی كورد شیاوی ئەوەبێت بگۆڕێت بۆ سەربەخۆیی تەواو لەگەڵ ڕێگەدان بە دانیشتوانی كوردستانی باشور– عێراقی ئەمڕۆ– بۆ ئەوەی بێنە پاڵ ئەم دەوڵەتە كوردییە ئەگەر خۆیان ئارەزویان كرد، لەناوچەی سولەیمانیش ئیداریەكی كوردی دروست بوو بەسەرۆكایەتی خوالێخۆشبوو شێخ مەحمود بەرزنجی لەژێر سەرپەرشتی بەریتانیداو سیاسەتی ئەوكاتەی بەریتانیاش بەئاراستەی دروستبوونی چەند ولایەتێكی كوردیی بوو لەژێر سەرپەرشتی خۆیدا لەناوچەكانی سولەیمانی و جەزیرەو شوێنەكانی تری كوردستان[٨٢].

---

[٨١] – دواتر باس لەم بەندە دەكەم.

[٨٢] – باس لەسیاسەتی داگیركاری بەریتانی دەكەم لەبابەتێكی تردا كە دەبینین سیاسەتی بەریتانی لەدوای جەنگ راستەوخۆ دامەزراندنی چەند دەوڵەتۆچكەیەكی كوردی بوو لەژێر سەرپەشتی بەریتانیدا ئەمەش وەك تەكتیكێكی كاتیی.

بەلآم رێکخراوە کوردیەکان لەتورکیادا چالاکیەکانی کورتکردەوە لەکوردستانی مەرکەزیداو چالاکیەکانیان خۆی لەپەیوەندیکردندا دەبینەوە بەهاوپەیمانانەوەو داواکردنی یارمەتی لێیان و ، بەوتەکانی هاوپەیمانانیش فریودران[٨٣] داوای لێکردن دان بەخۆیاندا بگرن و ئارام بن ئەوەش هەلێکی لەدەستدان کە دەکرا سودی لێوەربگیرایە بۆ دامەزراندنی حوکمێکی کوردی، لەگەڵ ئەوەشدا کۆششەکانی ئەم رێکخراوە کوردیانە بەرهەمداربوون و کێشەی کوردیان خستە سەر شانۆی نێودەوڵەتی و لەپەیماننامەی سیڤەردا کە گرنگ و بایەخدارەو وەك مامۆستا ب- نیکیتین[٨٤]- سەرەڕای- ئەوەی کە پەیماننامەی سیڤەر وەك مرەکەبی سەر کاغەز مایەوە، گومانی تێدا نیە ئەوە قۆناغێکی ترسناك بوو لە پەرەسەندنی کێشە یان مەسەلەی کوریدا. بۆ یەکەم جار لەمێژوودا بەڵگەنامەیەکی سیاسی نێودەوڵەتی باس لە مەسەلەی سەربەخۆیی ناوچەیی دەکات بۆ ناوچە تورکیە-عەجەمیەکان دەکات کەوا کوردەکانی تێدا نیشتەجێن لەم بەروارەوە بەنێودەوڵەتی بوونی کێشەی کوردیی بووە مەسەلەیەکی حەتمی".

لەواقیعدا لەماوەی دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوەو لەکاتی جەنگیشدا بزوتنەوەی نیشتمانی کوردیی بەرەو ئەوەچوو سۆزو دۆستایەتی هاوپەیمانان بەدەست بێنێت و پشت بە بەڵێنەکانیان ببەستێت بەهیوای بەدیهاتنی ئامانجەکانی گەلی کوردی و، سەرکردەکانی بە بەڵێن و ووتەکانی بەریتانیا هەڵخەڵەتان.

بەلآم رێکخراوە کوردیەکان دەستەوسان و نەتوانابوون لەبەئەنجام گەیاندنی ئەرکە نیشتمانیە ترسناکەکەیان سەرەڕای سەرۆکایەتیکردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی

---

[٨٣] - بەیاننامەکانی هاوپەیمانان و بەتایبەتی ئەو بەیاننامە هاوبەشی کە لەلایەن بەریتانیاو فەرەنساوە دەرچوو لەساڵی ١٩١٨ لەبارەی مافی نەتەوە غەیرە تورکەکان بۆ رزگاربوون و سەربەخۆیی نیشتمانی و چواردە بەندەکەی ویلسنی سەرۆکی ئەمریکا کە تێیاندا جەخت کرابۆوە لەسەر مافی گەلان بۆ سەربەخۆبوونیان لەبەیاننامە کاریگەرەکان بوون. هەروەك چۆن ووتەکانی سەرۆکی فەرەنسی لەوکاتەدا مسیۆ کلیمانسۆ کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو کە ووتی- حکومەتی تورکیا ناتوانێت و لێهاتوو نیە لەبەرێوەبردنی نەتەوەکانی تردا بۆیە متمانەی پێناکرێت و نابێت نەتەوەیەك بگەڕێنرێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی تورکەکان کەبەدەست زوڵم و ستەمی ئەوانەوە ناڵاندویەتی.

[٨٤] - ب. نیکیتین لەکتێبەکەیدا -کوردەکان- چاپە عەرەبیە یەکەمەکە لا ٢٠٢.

نیـشتمانیش، ئـەوەش بـەهۆی سروشـتی پێکهاتـەو سـەرۆکایەتیکردنیەوە لەلایـەك و نەبوونی بەرەیەکی یەکگرتوو کەهەموویان لەخۆبگرێت و پێشەوایەتیان بکـات، ئـەوەش بەهۆی ئەوەی کە نەگۆڕابوو یان بـەلانی کەمـەوە یـەکێکیان بـۆ حزبێکـی پێشەنگی کـە توانای لەخۆگرتنی هەبێت و سەرکردایەتی هێزەکانی گەلی کوردی بکات بۆ تێکۆشان بـۆ بەدیهاتنی ئامانجەکانی کوردو کوردستان.

نـەبوونی نمونـەی ئـەم حزبـە پێـشەنگیە و پاشـانیش نـەبوونی سـەرکردایەتیەکی شۆڕشگێڕیی ئەزموندیدە بتوانێت سەرکردایەتی شـۆڕش و بزوتنـەوەی نیـشتمانی بکـات بەدڵنیاییـەوە بـووە هـۆی لەکیسچوونی هـەلێکی بـەنرخ لەگـەلی کـورد هـەروەك چـۆن لێکجیـایی ئـەم کۆمەڵـە حزبـە کوردیانـە و بـوونی چـەندین سـەرکردە بـۆ بزوتنـەوەی نیشتمانی کوردی بووە هۆی کارئاسانی بۆ داگیرکەران و زەوتکەران و داروودەستەکانیان کە بتوانن پلانگێڕیەکانیان لـەدژی گـەلی کـوردی جێبـەجێ بکـەن و ئەمـەش بـووە هـۆی بەکۆیلەکردنی کوردستان و بێبەشکردنی گەلی کوردی لەهەموو مافەکانی و هەتا ئـەوەش کە لەپەیماننامەی سیڤەردا هاتبوو کە دواتر رێکەوتننامەی لۆزان هەڵیوەشاندەوە.

حزب و کۆمەڵـە نیـشتمانیە کوردیـەکان ڕاستـەوخۆ لـەدوای جـەنگی جیهـانی یەکەمـەوە دروسـتبوون سـەرەڕای جیـاوازی و ناکۆکیـەکانی نێوانیـان لـەرووی رێکخـستن و سـەرکردایەتیەوە لاوازبـوون وەك ئەوانـەی پێـشتری تـەنها کـورت بووبوونـەوە لـەناو دەستیەکی بالای کۆمەڵگەی کوردستانیدا– لەرووی سەرکردایەتیەوە–هـەروەها لەچـەند ناوەندو دەستیەکی چینەکانی ناوەڕاستدا بەتایبەتی ئەفسەران و مامۆستایان– لەئاستە بنکەییەکانـدا– واتـە چ لەئاسـتەکانی خـوارەوەو چ لەئاسـتی سـەرکردایەتیدا بنکەیـەکی فراوانـی جـەماوەریی نـەبوو، ئامانجـەکانیش بەتـەنها سیاسـی بـوون و پـەیڕەوێکی چاکسازیی کۆمەلآیەتی روونی نەبوو هەروەها سەرکردایەتیەکی شۆڕشـگێڕیی وشیاریش کـە بتوانێـت بـچێتە نـاو جـەنگ و ململانـێ سیاسـی و سـەربازیەکانەوەو سـەرۆکایەتی هێزەکانی گەلی کوردی بکات، هەروەك چۆن مۆرکی هۆزگەرایی یان خێزانی یان هـەرێمی بەزۆریەیەوە دیاربوو، ئەمەش وایکرد ئاسانبێت بە بەڵێنەکانی داگیرکـەران فریوبخـوات و هەلێکی بەنرخی لەکیس چوو کە رەخسابوو بۆ گـەلی کـورد لـەکاتی کۆتایهـاتنی جـەنگی

جیهانی یەکەمدا بەتایبەتی کاتی ئیمزاکردنی پەیماننامەی سیڤەر، هەروەك چۆن ئەم کەموکورتیە دیارانە لەحزب و کۆمەڵە نیشتمانیە کوردیەکاندا بۆشاییەکی دروست کرد لەنێوان ئەو زۆرینەی گەلی کوردی و چەندین دەستەو گروپی کۆمەڵایەتیدا ئەمەش کاری کەمالیستەکانی ئاسانکرد لەفیچڵکردن لەگەلی کورد و ڕاکێشانی بۆ ژێر سایەی خۆیان و ئارامکردنەوەی کوردەکان و چەواشەکردنیان لەماوەی نێوان ساڵەکانی ١٩١٩-١٩٢٣.

بزوتنەوەی نیشتمانی کوردیش دابەشبوو و لێکجیابوون لەکوردستان، سەرکردایەتی شێخ مەحمود لەکوردستانی عێراق جیابوو لەبزوتنەوەی کوردی لەکوردستانی ناوەندیی و جیاوازبوو لێی لەکۆمەڵێك لەمەسەلەدا گرنگترینیان هەڵوێست لەکەمالیستەکان کە شێخ مەحمودیان بۆ ماوەیەك فریودا لەژێر کاریگەری چەند لایەنێکدا کە سەر بەتورکیابوون، بەڵام لەکوردستانی ئێرانیدا ئەوا بزوتنەوەی سمکۆ کە دژ بەدەسەڵاتی حکومی بوو کەوتە ناو کۆمەڵێك هەڵەی دزێوەوە بەتایبەتی ئەو پرۆسەی لەناوبردنەی کە پێی هەستا دژی کۆمەڵێك لە برا ئاشوریەکانمان ئەوانەی بە بەردەوامی برای کورد بوون و هاونیشتمانی بوون لەگەڵیاندا، ئەم پرۆسەیە مایەی نیگەرانیەو شایستەی ئەوەیە ڕاشکاوانە سەرکۆنە بکرێت و ڕەتبکرێتەوە.

# گەڕانەوە بۆ خەباتی چەکداریی

جیاجیایی کەموکوڕیەکی ترسناکی تربوو لەبزوتنەوەی نیشتمانی کوردیداو لەگرنگترین هۆکارەکانی شکستی بوو لەبەدیهێنانی ئامانجە نیشتمانیەکانی و هەروەها لەسود وەرگرتن لەپەیماننامەی سیڤەر، هەروەك چۆن ئەوە یارمەتی بەریتانیایدا لەهەستان بەمانۆڕەکانی و بەجێگەیاندنی پلانگێڕییە داگیرکاریەکانی، دوای ئەوەی بۆ بەریتانیا لوا شۆڕشی عێراقی دامرکێنێتەوە– ساڵی ١٩٢٠ز– و حکومەتێکی لایەنگری خۆیی لەبەغداد سەپاندو ناچاریکرد پەیماننامەیەك ئیمزا بکات عێراق دەبەستێتەوە بە چەرخەی بەریتانیاوەو دوای ئەوەی داگیرکەران بێهیوابوون لەئیستیغلالکردنی حکومەتەکەی شێخ مەحمود کە بە لێدوانێکی فەرمیی هاوبەش پاڵپشت بوو[٨٥]– لەلایەن هەردوو حکومەتی بەریتانیاو عێراقەوە لەساڵی ١٩٢٢ ز ئەم لێدوانە دانی ناوە بەمافەکانی کوردەکاندا لەدامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیدا بۆیان، دوای ئەوەی بزوتنەوەی کەمالیزم بەهێزبوو و پەیوەندیەکانی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا توندوتۆڵکرد– ئەمەش داگیرکەرانی ترساند– کاتێکیش بەئاشکرا دەرکەوت کە پەیماننامەی لۆزان[٨٦]– ئیمزا دەکرێت و پاشانیش مەسەلەی موصڵ ڕەوانەی کۆمەڵەی وڵاتان دەکرێت کە لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەراندایە، دوای هەموو ئەوانە بەریتانیا بەشێوەیەکی کۆتایی کەوتە بەرهەڵستکاریی لەدژی کوردەکان شێوەی کۆتایی پلانەکەیی خستەکار کە دژ بە گەلی کورد بوو ئەویش ئەوە بوو بەزەبری ئاگرو ئاسن کوردستان بلکێنێت بەعێراقەوە هەروەها بەرهەڵستیکردنی پێکهێنانی هەر حکومەتێکی کوردیی ئەویش بۆ گرەنتیکردنی بەرژەوەندییە داگیرکەرانەکەی و پەیوەندی باشی لەگەڵ وڵاتانی عێراق و ئێران و تورکیادا، هەر بۆیە بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی ناچاربوو بەرگری ئەم سیاسەتە بکات و بەزەبری چەك

---

[٨٥] – دەقی ئەم لێدوانە لە جێگەیەکی تری ئەم کتێبەدا بلاۆکراوەتەوە حکومەتی پاشایەتی مەلیك مەحمود لەساڵی ١٩٢٢ز دا لەسلێمانی دامەزرا کە ئەو پاشا بوو شێخ عەبدولقادری برایشی سەرۆك وەزیران بوو.

[٨٦] –پەیماننامەی لۆزان–٢٤ ی تەموزی ١٩٢٣ پەیماننامەی سیڤەری ئابی ١٩٢٠ی هەڵوەشاندەوە بەدڵنیایەوە لەگەڵیشیدا ئەو بەندانەی کە پەیوەستن بەمافە نەتەوەییەکانی کوردەوە و بەوەش وڵاتانی هاوپەیمان خیانەتیان کرد لەگەلی کورد خیانەتێکی فەرمیی و پەیماننامەکانی پێشتویان خستە ژێر پێیانەوە وەك هەڵوێستی داگیرکەران لەبەرامبەر نەتەوە بچوکەکاندا.

روبەڕوی هەڵوێستی دوژمنکاریی چەکدارانەی بەریتانیا بێتەوە بەهۆی ئەمەش چەند جەنگێکی چەکدارانە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٢٣و ١٩٢٤ لەکوردستانی باشور رویدا بەتایبەتی لەناوچەکانی سلێمانی و کەرکوك کە بەداگیرکردنی پایتەختی کوردستان – سلێمانی– کۆتایی هات لەلایەن هێزەکانی بەریتانیاوە و چوونی هێزە کوردیەکان بۆ بەردەوامیدان بەجەنگ بەشێوەی –جەنگی عەشایەریی– بەسەرکردایەتی–شێخ مەحمودی بەرزنجی– ئەم جەنگە کە بۆ چەندین ساڵ بەردەوام بوو– ئەمە لەکاتێکدا بوو سیاسەتی بەریتانی لە ناکۆکیدا بوو لەگەڵ نیشتمانپەروەرە عەرەبەکاندا لەعێراق و توندبوونەوەی ئۆپۆزسیۆن لەدژی پەیماننامەی کۆیلایەتی– پەیماننامەی بەریتانی– عێراقی ساڵی ١٩٢٢–و لەکاتی گەڕانەوەی هێزێکی تورکی بەسەرکردایەتی ئۆزدەمیر پاشا بۆ ناوچەی رەواندوز– کوردستانی عێراق– بۆ چەسپاندنی حوکمی تورکی تێیداو دوای ئەو شکستەی کە هێزەکانی بەریتانیا لەناوچەی دەربەندی پشدەر چێژتی، دەڵێم سیاسەتی بەریتانی لەوکاتەدا بەرەو دانان دەچوو بەمافە نەتەوەییەکانی کورد دا– ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیش بێت– ئەویش بۆ سود وەرگرتن لە شێخ مەحمود بۆ گێڕانەوەی سەقامگیریی بۆ ناوچە کوردیەکان و دەرکردنی ئۆزدەمیر پاشا لەکوردستانی عێراقدا، بۆیە بەریتانیا ڕازی بوو لەسەر ئەوەی کە بیگێڕێتەوە و حکومەتی کوردیی ڕابگەیەنێت و شێخ مەحمود بکات بەپاشای لەساڵی ١٩٢٢ز دا.

بەڵام لەتورکیا بەریتانیا مومارەسەی سیاسەتی ئارامکردنەوەی کوردەکانی پیادە کرد یەکەمجارو پاشانیش سیاسەتی هاندانی کوردەکان بۆ ئەوەی یارمەتی خەلیفە بدەن و دورکەونەوە لەکاری شۆڕشگێڕیی نیشتمانیی کوردیی واتە سیاسەتی ئستیغلالکردنی نەتەوەیی کوردیی بۆ بەرژەوەندی خۆی. بەڵام کەمالیەکان هەوڵیاندا کوردەکان هەڵخەڵەتێنن و چەواشەیان بکەن بەناوی خەباتی هاوبەشەوە لەدژی داگیرکەران و دوژمنان و پاشانیش بەناوی چاکسازیە کۆمەڵایەتیە هاوچەرخەکانەوە، دوای سەرکەوتنیشیان بەسەر یۆناندا و دەسەڵاتگرتنە دەست لەهەموو تورکیادا نکوڵیان لەبەڵێن و پەیمانەکانیان کرد و دەستیان کرد بەجێبەجێکردنی سیاسەتی بەتورککردنی تۆرانیی، ئەو تورکیایەی کەوا سەرکردە کەمالیەکانی هاواریان دەکرد بەوەی نیشتمانی

تورکەکان و کوردەکانە، بووە تۆرانیی و بێجگە لەتورکەکان کەسێکی تری تێدا نیە تەنها وەك کۆیلە نەبێت ئەمەش بەپێی ووتەی وەزیری تورکی بەرێز مەحمود ئەسعەد[٨٧].

بۆیە کوردەکان ناچاربوون دەستبدەنە خەباتی چەکداریی بۆ بەرگریکردن لە قەوارەی خۆیان و بوونیان و بەرگریکردن لە پرۆسەکانی کۆچپێکردنی بەکۆمەڵی کوردەکان و بەتورك کردنی کوردستان بۆیە شۆڕشی ١٩٢٥ لەدیاربەکرو دەوروبەری هەڵگیرسا، ئەم شۆڕشە کەمالیەکان لەدەریایەك خوێندا نوقمیان کردو بەوپەڕی درندایەتیەوە سەرکوتیان کرد ئەگەرچی تائێستاش وەك نەهرۆ ووتی[٨٨].

" چۆن دەکرێت بۆ هەتاهەتایە شۆڕشی نەتەوەیەك دابمرکێنرێتەوە کە پێداگرین لەسەر بەدەستهێنانی ئازادی و ئامادەبن لەو پێناوەدا قوربانی بدەن" بەپێی گوزارشتی باندێت جەواهیر لال نەهرۆ[٨٩] لەکتێبەکەیدا (چەند سەرنجێك لەمێژووی جیهان) سەرسامی خۆیی دەربڕیوە لەوەی کە نەتەوەی تورکی لەبزوتنەوەیەکەوە کە داوای ئازادی دەکرد گۆڕا بۆ بزوتنەوەیەك ئەو کوردانەی دەهارێت کە داوای هەمان ئازادی دەکەن و، ئەو

[٨٧] – وەزیری دادی تورکی بەرێز مەحمود ئەسعەد لەوتارەکەیدا ساڵی ١٩٣٠ ز کەبلاْوبۆتەوە لەژمارە ١٦٦٥ی رۆژنامەی (میللیەت)ی تورکی کەلە ١٩ سێپتەمبەری ١٩٣٠دا دەرچووە چەند برگەیەکی تێدایە لەوتاری ئەم وەزیرە تورکیە کەهەمان ئەو مانایە دەگرێتەوە لەکتێبی(Les Kurdes Etledroit)ی نوسەرە بەرێزەکەی ل. رامبۆ ( L. Rambout) لا ٣١ چاپە فەرەنسیەکەی.

[٨٨] – جەواهر لال نەهرۆ سەرکردەی هیندی ناسراو و سەرۆك وەزیرانی تا ساڵی (١٩٦٤) لەکتێبەکەیدا چەند سەرنجێك لەمێژووی جیهان لە لاپەرە ١٥١٢ی چاپە فارسیەکەیدا ئەمە هاتووە: " بەوشێوەیە تورکەکان کە پێشتر لەپێناو ئازادیاندا جەنگابوون ئەو کوردانەیان لەناوبرد کە داوای هەمان ئازادیان دەکرد بۆ خۆیان، لەلاپەرە ٢٦٠ی چاپە عەرەبیەکەی هەمان ئەو کتێبەدا نەهرۆ لەبارەی هەڵوێستی کەمالیستەکانەوە لەشۆڕشی کوردیی دەڵێت: " چەند نامۆیە نەتەوەیەك لەبەرگریکردن لەنیشتمانەوە گۆڕا بۆ هێرشکردنێك بۆ داماڵین و زەوتکردنی ئازادی کەسانی تر. لەساڵی ١٩٢٩دا کوردەکان جارێکی تر شۆڕشیان کردەوە بەلاْم شۆڕشەکەیان بۆ ماوەیەك سەرکوتکرا، بەلاْم چۆن دەبێت بۆ هەمیشەی شۆڕشی گەلێك دابمرکێنرێتەوە کە لەپێناو ئازادیدا تێدەکۆشن و ئامادەن لەو پێناوەدا قوربانی بدەن.

[٨٩] – نەهرۆ– چەند سەرنجێك لەمێژووی جیهان لا ٢٦٠ چاپە عەرەبیە دووەمەکەو لەهەمان لاپەرەشدا هاتووە : " دوای ئەوە کەمال پاشا بێ بەزەییانە کەوتە گیانی کوردەکان و دانانی دادگای تایبەت بۆ دادگایکردنیان و هەردوو سەرکردەی کوردی شێخ سەعیدو دکتۆر فوئاد و چەندانی تر لەسێدارە دران و بەئاواتی سەربەخۆیی کوردستانەوە سەریان نایەوە".

سەرکردانەیان لەسێدارە دەدا " مردن و لەسەر لێوەکانیان هاواری سەربەخۆی کوردستان دەوترایەوە" بەلآم خوێنی شەهیدانی کوردستان بەفیڕۆ نەچووە، بەڵکو ڕێگەی خەبات و کۆششی بۆ تێکۆشەران روناک کردەوە، ڕێگەی خەباتی ڕێکخراو و شۆڕشی نیشتمانی دیراسەکراو و یەکخستنی هەموو هێزە باشەکان و کۆمەڵەو تەکەتولە کوردیەکان لەکوردستانی عێراق کەوا کەوتبووە ژێر نێڵەی تورانیە کەمالیەکانەوە– دەستیان بەدانوستان کرد لەنێوان خۆیاندا بۆ یەکخستنی هێزەکانیان، دکتۆر بلە ج شێرکۆ لەکتێبەکەیدا– کێشەی کورد– دەڵێت: " ئەو نیشتمانپەروەرە کوردانە کاتێك بینیان چی هاتووە بەسەر نیشتمانە خۆشەویستەکەیاندا لەنەهامەتی و مەینەت لەدوای شۆڕشی ١٩٢٥ەوە بەهۆی ئەو ڕێوشوێنە توندانەو شێوازە مەگۆلیە رەقەوە کە تورکەکان گرتوبویانەبەر خۆیان ئامادەکرد بۆ بەستنی کۆنگرەیەکی کوردی لەساڵی ١٩٢٦ کە هەموو رەگەزە کوردییە سەرەکیەکان لەخۆبگرێت لەنوێنەرانی کۆمەڵەکان و سەرۆك هۆزەکان و پیاوماقولآنی ولآت و ناوەندەکان بۆ وەرگرتنی بڕیارە سەرەکیە چالاکەکان بۆ سەرلەنویێ خەباتکردنەوە لەدژی تورکەکان بۆ رزگارکردنی کوردستان لەژێر چنگیان، پێش ئەوەی بتوانن بەتەواوەتی هۆزە دلگەرم و شۆڕشگێڕەکان پەرتوبلآوبکەن و ئەوەی ماوەتەوە لە نیشتمانپەروەرەکان لەناویان بەرن ئەوانەی کەوا لەچیاکاندا پەنایانگرتبوو. ئەو هاولآتیانەش سەرکەوتووبوون لەبەستنی ئەو کۆنگرە گەورەیەدا لەساڵی ١٩٢٧ لەناو سنوری تورکی واتە لەولآتی کوردان کە دەکەوێتە ژێر داگیرکەری تورکی و دانیشتنەکانی ئەو کۆنگرەیە ماوەی مانگ و نیوێکیان خایاند کە تێیدا چەندین بڕیاری زۆر گرنگ دران کە ئەمانەی خوارەوە بوون:

١– هەڵوەشاندنەوەی هەموو کۆمەڵەکان کە هەبوون ئەویش وەك ڕێگەخۆشکردنێك بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی کوردی گەورە هەموو ئەندامانی کۆمەڵە کۆنەکان و ئەندامە نوێیەکانیشی لەخۆبگرێت.

٢– بەردەوامیدان بەشۆڕش و خەبات لەدژی تورکەکان تا ئەو کاتەی دوا سەربازی تورکی زەوی پاکی کوردستان بەجێدەهێڵێت.

٣– رەچاوکردنی ئەمەی خوارەوە پێش دەستپێکردن بەشۆڕشی گشتی:

أ–پێویسته سەرکردەیەکی گشتی بۆ هەموو هێزە نیشتمانیە کوردیەکان دابنرێت.
ب–رێکخستنی هەموو هێزە شۆڕشگێڕیەکان لەسەر شێوازی سەربازیی و جەنگیی و چەکدارکردنی بەنوێترین جۆرەکانی کەلوپەلی جەنگ و شەڕ.
ج–دامەزراندنی ناوەندێکی گشتی بۆ شۆڕش و سەرکردایەتی باڵای هێزە نیشتمانیە کوردەکان لەچیایەك لەچیا سەربڵندەکانی کوردستان.
کۆنگرەکەش حزبێکی لێکەوتەوە–خۆیبوون– کە لەئەنجامی یەککبوونی کۆمەڵە کوردییە کۆنەکانەوە پەیدابوو، ئەم پارتە سەرکەوتووبوو لەدامەزراندنی سەدان لق لەناوخۆی نیشتمان و دەرەوەیدا هەتا لەئەورووپاو ئەمریکا. دوای دامەزرانی خۆیبوون، سەرکردایەتی سەربازیی شۆڕشی کوردی بەسەرۆکایەتی ژەنراڵ ئیحسان نوری پاشا دەستیکرد بە رێکخستنی کەرت و لقەکانی پشتیوانە یان لایەنگرە کوردیەکاندا، پاشان لە ساڵی ١٩٢٧دا سەرلەنوێ شۆڕشی کوردی هەڵگیرسایەوەو تا ساڵی ١٩٣١ز بەردەوام بوو.
بەڵام خۆیبوون لەگەڵ ئەوپەڕی داخدا ئەمیش لەسەر شێوازی حزبە کۆنەکان بوو، هەڵگری خەوشەکانی هەموو ئەو حزبانە بوو لەرووی سروشتی پێکهاتن و سەرکردەکان و ئامانجەکانەوە هەروەها خاوەن بنکەیەکی جەماوەری پتەو و سەرکردایەتیەکی شۆڕشگێڕیی ئەزموندیدە نەبوو لەخەبات و پەیڕەوێکی چاکسازی کۆمەڵایەتی ئابوری و مۆرکێکی هۆزایەتی و ئەرستۆکراتیشی پێوە بوو.
ئەم شۆڕشە نیشتمانیە چیای ئاکرێی کردبووە بارەگای سەرکردایەتی خۆی و بەناوی چیاکەوە ناسرا– شۆڕشی ئاکرێ– شکستی هێنا لەبەدیهێنانی ئامانجە ڕەواکانیداو بەهەڵهاتنی سەرکردەکەی ژەنراڵ ئیحسان نوری پاشا بۆ تاران کۆتایی پێهات و تارۆژگاری ئەمڕۆشمان وەك پەنابەرێکی سیاسی لەوێ دەژی.
کەموکوڕییە ناوخۆییەکان– خودیەکان– لەبزوتنەوەی نیشتمانی کوردیدا و نەبوونی حزبێکی پێشڕەوی شۆڕشگێڕیی کە پێشەوایەتی بکات و بێبەشبوونی شۆڕش لە یارمەتیە دەرەکیەکان و بەڵکو بە پێچەوانەوە وڵاتانی بیانی و بەتایبەتی داگیرکاریەکان لەدژی شۆڕش دەستورەدانیان کردو باڵادەستی حکومەتی تورکی لەڕوی سەربازی و

ئابوورییەوە هەموو ئەمانە لەفاکتەرە سەرەکییەکانی شکستخواردنی بوون.
بەلاّم لەکوردستانی عێراق ئەوا بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی هەر لە١٩٢٣ەوە ناچار بوو چەك هەڵبگرێت و بەرگری بکات لەقەوارەو بوونی حکومەتە نیشتمانیەکەی کە لەژێر سەرکردایەتی مەلیك شێخ مەحمودی حەفید دا دامەزرا. شۆڕشی کوردی هەڵگیرسا وەك پەرچەکردارێك و بەرهەڵستیەك بۆ دوژمنکاری چەکدارانەی بەریتانیا، ئەم دوژمنکارییەی کە ئامانجی لەناوبردنی حکومەتەکەی شێخ مەحمود بوو.. هەروەها داگیرکردنی پایتەختەکەی سلێمانی.. بەتەنیشت ئەم خەباتە چەکداریەشەوەو پێش یان دوای داگیرکردنی سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەوە خەباتی فیکری و ئەدەبی نیشتمانی لەنێوان خوێنەواران و خەڵکی شاردا چالاك بوو، حکومەتەکەی شێخ مەحمود رۆژنامەیەکی کوردی دەرکردو چەند چاپکراوێکی تری دەرکرد کە پڕبوون لەهەوڵی حوکمی نیشتمانی و ئەدەبیاتی نەتەوەیی شۆڕشگێڕی و لەم ماوەدا لەنێو کوردەکاندا چەند رەگەزێك بەدەرکەوتن شۆڕشی ئۆکتۆبەرو حکومەتی سۆڤیەتیان بلاّودەکردەوە، کە بە بەلشەفیەکان ناسران ئەوەش بیّ ئەوەی لەڕاستیدا بەلشەڤ بن و لەمارکسیزم و لینینزم و بیروبۆچونی کۆمۆنیستی تێبگەن، بەڵکو دەستەیەك بوون زۆربەیان لەو خێزانە کوردیانە بوون کە بەلشەفیەکان ئازادی کردبوون. هەروەك چۆن لەناویاندا خوێنەوارێك هەبوو ئەویش خوالێخۆشبوو – جەمال عیرفان– بوو کە بەدەست کیسەی داگیرکەری بەریتانی و کۆنەپەرستە کوردەکان لەشاری سلێمانی تیرۆرکرا. ئەو بەلشەفیە کوردانەش– بانگەشەو پڕوپاگەندەیان بۆ حوکمی سۆڤیەتی دەکرد ئەمەش بووە هۆی ترساندنی بەریتانیەکان.
ئی. بی. سون E.B.Soane ی سیخوڕی بەریتانی کە لەبەرگی کەسایەتی تردا خۆیی حەشارداوەو سەردانی کوردستانی کردووە لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمداو لەساڵی ١٩١٩دا بەپلەی مێجەر گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی لە شوباتی ١٩٢٠دا نوسیویەتی و دەڵێت: " ناوی بولشەڤ و بەچاوپۆشین لەوەی مانای چی دەگەیەنێت لێرە ناسراوە– بۆ بەدبەختی لەسلێمانی– ئەمەش دەخوازێت بەپێی ڕای مێجەر سۆن بەخێرایی چارەسەر بکرێت جگە لەشاری سلێمانیش لە– کۆیسنجق کۆمەڵێك لەدیلە کوردەکان کە

لەروسیا گەڕاونەتەوە خوازیاری حوکمی سۆڤیەتین و لەناو خەڵکدا بە –بەلشەفیك– ناسراون واتە بەلشەفیەکان و ئەم دەستەیەش لەگەڵ دەرەبەگەکاندا کەوتنە ململانێوە ئەوانەی کە هەوڵیاندا بیانکوژن.

هەروەها کۆمەڵەی– کوردستان[10]–ی نیشتمانی بەدەرکەوت کەتێدەکۆشا بۆ یەکخستنی کۆششەکانی خوێنەواران و رۆشنبیران و کاسبکارە نیشتمانپەروەرە کوردەکان، سەرەڕای ئەوەی کۆمەڵەیەکی بچووك بوو بەلاَم لەسلێمانیدا چالاك بوو کۆمەڵێك بیرۆکەی مەعقولی پێشنیارکرد سەبارەت بە پێویستی ئەوەی حکومەتەکەی شێخ مەحمود بکرێتە حکومەتێکی نیشتمانی کوردی و مۆرکی عەشایەریی و خێزانی لێ دوربخرێتەوە.

پرۆفیسۆر– بوخارد برینتیس[11] دەڵێت :" سەرکردە سیاسیەکانی ئەهلی شارەکان پەیوەست نەبوون بەشێخ مەحمودەوە پەیوەستبوونێکی عەشایەری، بەڵکو کاریان کرد لە– کۆمەڵەی کوردستاندا[12] کە دەوترێت لەنێوان سالأنی ١٩٢٢–١٩٢٥ کاری کردووە،

[10] –مامۆستا رەفیق حیلمی باسی ئەوە دەکات یەکێك بووە لەدامەزرێنەرەکانی کۆمەڵەیەکی کوردی کە ناونرا (کۆمەڵی سەربەخۆیی کوردستان) دەکرێت ئەوە بهەڵێنجرێت کە مێژووی دامەزرانەکەی هاوینی ١٩٢٠ بووە مامۆستا رەفیق حیلمی باس لەوە دەکات خوالێخۆشبووان مەحمود جەودت و ماجد مستەفا و سەید عەبدوڵلای حاجی سەید حەسەن لە چالاکترین ئەندامەکانی کۆمەڵەکە بوون لەگەڵیدا، کۆمەڵەکە هەوڵیدا حەمدی بەگی بابان بکاتە سەرۆکی خۆی بەلاَم ئەم هیوایە بەدینەهات و کۆمەڵەکە پێکهاتبوو لە کاسبکاران و خوێنەواران و لاولنی نیشتمانپەروەرو هەندێك لەسەرۆك هۆزەکانی جاف و پشدەر و شێخەکانی بەرزنجەو سەرۆکەکانی هەورامان و هەمەوەندو جەباریی. بەلاَم کۆمەڵەکە وەك مامۆستا رەفیق حیلمی باسی دەکات دوای ماوەیەکی کورت لەدامەزرانی هەڵوەشایەوە پێش ئەوەی تەمەنێکی درێژ بەرێبکات، ئەویش بەهۆی ئەوەی کەوا خوێنەوارە کوردەکان دامەزران و پەت و بلاَوبوونەوەو ئیدی مامۆستا رەفیق حیلمی بووە چالاکترین ئەندامەکانی.

[11] – بگەڕێرەوە بۆ توێژینە بەنرخەکەی پرۆفیسۆر برینتیس کەلەگۆڤارە زانستیەکەی زانکۆی مارتین لۆسەر لەئەڵمانیای دیموکراسی بلاَبۆتەوە بەناونیشانی دەربارەی هەندێك گرفتی مێژویی بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی ئەم وتارەی پێشتر ناومهێنا.

[12] – کۆمەڵەی کوردستان لەکۆبونەوەیەکدا دامەزرا لەرۆژی ٢١/تەمموز/١٩٢٢ لەمزگەوتی سەید حەسەن لەسلێمانی بەسەرۆکایەتی مستەفا پاشای یامولکی کە وتارێکی گەرمی نیشتمانی پێشکەش کردو داوای کرد کۆمەڵەی کوردستان دابمەزرێت کە لیژنەی سەرکردایەتیەکەی پێکهاتبوون لەم بەڕێزانەی خوارەوە:

سەرکردەکەیان مستەفا پاشای یاموڵکی وەزیری پەروەردەی حکومەتەکەی شێخ مەحمود بوو، پێشتریش حاکمی سەربازی گشتی بووە لەخزمەتی دەوڵەتی عوسمانیدا.

رۆژنامەی- بانگی کوردستان- زمانحاڵی کۆمەڵەکە بوو- بۆ ماوەی سێ ساڵ بەهەر سێ زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی دەردەچوو. کۆمەڵەکە رەخنەی لەهەوڵەکانی شێخ دەگرت کە دەیویست بوار بکاتەوە تا ئەرستۆکراتیەتی عەشاریەری لەشارەکەدا باڵادەست بێت و داوای کرد یاسایەکی بنچینەیی دەربکرێت و کارگێڕیی نوێ بکرێتەوە.

" رەگەزە چەپەکان رۆڵێکی کەمتریان بینی بەناوبانگترینیان جەمال عیرفان بوو کە دەوترێت بانگەشەی بۆ دیموکراسیەت و بێباوەڕیکردوە.. لەسەردەمی حکومەتەکەی شێخ مەحمودا کوژرا بڕوا وایە لەلایەن دەرەبەگانەوە کوژرابێت کە لەدەوری حوکمداربوون".

بەڵام رۆژنامەی حکومەتەکەی شێخ مەحمود - رۆژی کوردستان- بوو کە لە١٥-١١-١٩٢٢ لەشاری سلێمانی دەرچوو. لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی لەکوردستانی عێراق راپەڕی داوای ئازادی ومافی چارەی خۆنوسینی دەکرد ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ هەڵچوونی راپەڕینی شۆڕشگێڕانەی ناوچەکانی تری کوردستان و، بەپشت بەستن بەبەڵێنەکانی داگیرکەری بەریتانی ئەم بەڵێنانە هێندەی نەبرد رووە راستە فریودەری و چەواشەکاریەکەی ئاشکرابوو بەپێچەوانەی ئەو یارمەتیەی بزوتنەوەی نیشتمانی لەهاوپەیمانانی چاوەڕوان دەکرد.

بەریتانیا رووبەڕوی بۆوەو دژایەتی کردو هێزە چەکدارەکانی بۆ خستە ئامادەباشیەوە کە پڕچەك کرابوون بە تانك و تۆپ و لەلایەن هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانیاوە پشتیوانی دەکرا بۆ داپلۆسین و لەناوبردنی لەوکاتەداو دوای ئەوەی کە هاوپەیمانان بزوتنەوەی نیشتمانی کوردیان بێهیواکرد لەبەدیهێنانی ئاواتەکانیان و کاتێك راستی داگیرکەران و دوژمنایەتی بۆ گەلی کورد ئاشکرابوو، بزوتنەوەی کوردی پەنایبردە بەر

---

مستەفا یاموڵکی، رەفیق حیلمی، ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ، صالح ئەفەندی قەفتان، حاجی ئاغا فەتحوڵلا، فایەق بەگی عارف بەگ عیزەت بەگ عوسمان پاشا، ئەدهەم ئەفەندی یوزباشی، شێخ محمد گوڵانی، ئەحمەد بەهجەت ئەفەندی، عەلی ئەفەندی باپیر ئاغا، شوکری ئەفەندی عەلەکە.

شۆڕش لەدژی داگیرکەری بەریتانی کە بوو بووە یەکەم دوژمنی سەر سەختی ئەو و ئیدی دوژمنایەتی لەنێوان بەریتانیای داگیرکەرو گەلی کورد دا بەرپابوو بەمەش کورد ڕووبەڕووی هەڵمەتە سەرکەوتکەرییە سەربازیەکانی بەریتانیا بووە کە تێدا هێزی ئاسمانی بەریتانیا ڕۆڵێکی دزێوی گێڕا لەلێدانی گوندو شارە کوردیە هێمنەکاندا بە بوردومانکردن و تانك و تۆپ و ڕوخاندی بەسەر دانیشتوانە بێ چەك و مەدەنیەکەیدا.

هێزی ئاسمانی بەریتانیا دەستی کرد بە پرۆسە ئاسمانیە فراوانەکانی هەر لەکۆتایهاتنی جەنگەوە بۆ دوای چوونە ناوەوەی عێراق بۆ ناو کۆمەڵەی گەلان لەساڵی ١٩٣٢ و هەموو جۆرە چەکەکانی تاقیکردەوە کە هەیبوون لەدژی گەلی کوردی و مەشقەکانی بەچەکی زیندوو بەسەر جەماوەری کوردستاندا ئەنجام دا، هەتا سەرکردەی شۆڕشی کوردی شێخ مەحمودی حەفید لەلایەن بەریتانیەکانەوە نازناوی- ڕاهێنەری هێزی ئاسمانی بەریتانی نافەرمیی لێنرا. لەچاکەکانی ئەم هێرشە ئاسمانیانەش بۆ سەر کوردستان (هەڵبەتە چاکەکانی بۆ داگیرکەران و داروودەستەکانیان) سەرۆکی هیندی کۆچکردوو جەواهر لال نەهرۆ[٩٣] دەڵێت:

" بەدرێژایی کات وڵات لەهەڵچوونێکی بەردەوامدا بوو.. ئەوەش لەبەرژەوەندی ئینگلیزو حکومەتەکەی فەیصەڵدا نەبوو چونکە بەردەوامی شۆڕشەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی گەل ڕازی نین لەو حکومەتەی کە بەریتانیا بەسەریدا سەپاندوون بۆیە بەگونجاویان زانی کۆمەڵەی گەلان لەبارەی ئەم شۆڕشانەوە ئاگادارنەبن بۆیە بڕیاریاندا بەهێزو تیرۆر لەناویبەرن لەپێناو ئەم مەبەستەشدا هێزی ئاسمانی بەریتانیایان بەکارهێنا. باشترین پێناسەیەك بۆ ئەنجامی هەوڵەکانیان و سەپاندنی ئاشتی و ڕژێم بوو بەچەك، ئەوەبوو کە ئەفسەری ئینگلیزی کۆلۆنیل سێر ئەرنۆڵد ویلس لەوتارێکدا کردی لەبەردەم کۆمەڵەی ئاسیایی شاهانە لە لەندەن ٨ یۆنیۆی ١٩٣٢، کە بەشداری تێدا کرد"-

" تێکرتن یان ئاراستەکردنی ڕاست و بەجێ- سەرەڕای هەموو ئەوەی لەجنێف دەوترا- کە هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانیا پێی هەستا لەلێدانی دانیشتوانە کوردەکاندا، لەماوەی دە ساڵی ڕابردوداو بەتایبەتی لەماوەی شەش مانگی دواییدا گوندە

---

[٩٣] - ج. لال نەهرۆ- چەند سەرنجێك لەمێژووی جیهان- لا ٣٢٤. چاپە عەرەبیە نووەمەکە.

روخێنراوەکان و مەڕومالاَتە سەربڕاو ژنان و منالاَنی کەمئەندام بوو جەستە شێوێنراو بەلگەیەکی حاشاهەلَنەگرن، بەپێی ئەوەی کە پەیامنێری رۆژنامەی تایمس ووتی دیمەنێکی دانسقەو بێهاوتایە لەشارەکەدا، هەروەها جەواهر لال نەهرۆ[١٤] لەکتێبەکەیدا بەردەوام دەبێت و وەسفی دڕندەیی ئاسابیانەی داگیرکەران دەکات (کە ئەوە کارێك نیە بێهاوتا)بێت لەلێدانی دانیشتوانە کوردە بێ چەکەکاندا بەبۆمبی تەوقیتکراو و دەلێت:

" کاتێك بینیان دانیشتوانی گوندەکان هەلدێن و خۆیان دەشارنەوە کاتێك کە فرۆکەکان نزیك دەبنەوە، رۆحێکی وەرزشیان نیشان نەدا لەچاوەڕوانیکردنی ئەو بۆمبانەدا کە دەکەوت بەسەریاندا بەئەنقەست جۆرێکی نوێ لە بۆمبیان بەکارهێنا کە بۆمبی تەوقیتکراوبوون بۆ ئەوەی گوندنشینەکان دەستخەڕۆبکەن و دوای گەڕانەوەی فرۆکەکان بگەڕێنەوە بۆ کوخەکانیان و ئەوکات بۆمبەکان پێیاندا بتەقنەوە.. ئەوانەی کەلەم هێرشانەدا دەمردن بەخۆشحالَ دادەنران بەنسبەت ئەوانەوە کە دەستوقاچیان دەپەڕی و جەستەیان دەشێوێنرا یان تووشی دەردی ترسناك دەبوون بەتایبەتی بەهۆی نەبوونی ئاسانکاری پزیشکی لەو گوندە دوورە دەستانەدا".

بەوشێوە ئەزمونەکان و ڕوداوەکان جەختیان کردۆتەوە لەوەی کە داگیرکەرە ئینگلیزەکان دوژمنی سەرسەختی گەلی کوردمان و بزوتنەوە رزگاریخوازەکەی بوون، هەروەك چۆن ئاستەنگی سەرەکی بوون لەرێگەی رزگاربوونی کوردستاندا بۆیە ئەوانیش هەروەها کەوتنە بەر رق و دوژمنایەتی گەلەکەمان. لەو ماوە مێژوییەدا داگیرکەرانی ئینگلیز سەرکەوتوو بوون لەداگیرکردنی هەموو گوندو شارەکانی کوردستانی باشور و هیچ شتێك لەژێر دەسەلاَتی شۆڕشدا نەمایەوە تەنها چەند شوێنێکی سنووردار نەبێت ، داگیرکەران هەستان بەپلانگێڕیی لەدژی گەلی کوردمان لەکوردستانی باشور بەوەی خستیانە ژێر فەرمانڕەوایی فەیسەلی سەر بەخۆیان و نکولَیان لەمافەکانی گەلەکەمان کردو بەدرۆو دەلەسەکانیان یاریان بەئیرادەی کرد لەرزگاربوونی نیشتمانییدا هەروەك چۆن بەلێن و پەیماننامەکانی پێشویان خستە ژێر پێیانەوە، لەدوایشدا ئەوەیان بەسەر

---

[١٤] - ج- لال نەهرۆ-چەند سەرنجێك لەمێژووی جیهان-ل٢٢٥٧. چاپە عەرەبیە دووەمەکە.

گەلی کورد دا هێنا کۆمەڵەی گەلانیان ناچارکرد بڕیارێك دەربکات و گەلی کورد بێبەش بکات لەمافە نەتەوەییەکانی[٩٥] ئەگەرچی بڕیارەکە هەروەها پێویستی پاراستنی مافە کارگێڕیی و رۆشنبیریەکانی کوردی لەخۆگرتووە، لەناویشدا پێویستی دامەزراندنی فەرمانبەرە کوردەکان ئەگەر پاساوێکی هونەری و پسپۆڕی رێگرنەبوو و هەروەها بەفەرمی دانانی زمانی کوردی و بەکارهێنانی لەخوێندنگاو دەزگاو دادگاکانداو هەروەها بڕیارەکە ئەوەش لەخۆدەگرت پێویستە یەکسانی هەبێت لەنێوان کوردەکان و عەرەبەکاندا لەماف و ئەرکەکانداو لەژێر فشاری بزوتنەوەی نیشتمانی کوردیدا کە بەردەوام بوو لەسەر داواکردنی مافە نەتەوەییەکانی و رەچاوکردنی ئیعتیباراتە نێودەوڵەتیەکان پەیوەست بەبڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان لەبەرامبەر کوردەکاندا حکومەتی عێراقی ناچاربوو بەڵێن بدات ئەو بڕیارانە جێبەجێ بکات و رێز لەمافە کارگێڕی و رۆشنبیرەکانی کوردەکان بگرێت، ئیدی هەر لەمەلیك فەیسەڵ و سەرۆك وەزیرانی حکومەتەکەیەوە تا دەگاتە فەرمانبەرە کارگێڕیەکان دەستیان کرد بەلێدوانی دۆستانە لەبەرامبەر (برا کوردەکانیاندا)و بڕیاریاندا بڕیار لەسەردراوەکانی کۆمەڵەی گەلان جێبەجێ بکەن زیاتریش لەلایەنە کارگێڕی و رۆشنبیریەکانیش بۆ نمونە سەرۆك وەزیرانی عێراقی لەشوباتی ١٩٢٦دا لەبەردەم ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا[٩٦] لەبەغداد ووتی:

" پێویستە لەسەرمان کوردەکان مافەکانی خۆیانیان پێ ببەخشین، پێویستە لەناوچەکانی خۆیاندا کارو وەزیفەکان بدەینە رۆڵەکانیان و پێویستە زمانی کوردی زمانی فەرمی بێت و پێویستە لەسەر منداڵەکانیان لەخوێندنگاکانیاندا فێری بن".

لەو کاتەدا لای هەندێك هیوایەك هەبوو لەوەی حکومەتی عێراقی هەوڵی راکێشانی دڵی کوردەکان بدات لەرێگەی پێبەخشینی خودموختاری یان خۆبەڕێوەبردن و بەکرداریش

---

[٩٥] –ئەگەر وردەکاریت ویست دەربارەی بابەتی لکاندنی کوردستانی عێراق بەحکومەتی بەغداوە بگەڕێرەوە بۆ –مشکلة الموصل– بەپێنوسی فاضل حسین (تاریخ الوزارات العراقیة)ی مامۆستا عبدالرزاق الحسنی بەعەرەبی و کتێبی Les Kurdcs et le droit نوسەرەکەی بیربوا (رامبۆ) بەزمانی فەرەنسی و کتێبەکەی مێجەر ئەدمۆنس بەئینگلیزی (Kurds Turks and Arabs).

[٩٦] – ب . نیکیتین لەکتێبەکەیدا– الاکراد– لا ٢٠٢. چاپە عەرەبیە یەکەمەکە.

چەند هەوڵێك لەپەرلەمانی عێراقی درا[٩٧] بۆ ئەوەی وا لەحکومەت بکرێت جۆرێك لەحوکمی خۆیی بدرێتە کوردەکان کاتێك کە دانوستانەکان چوو بوونە قۆناغێکی جدیەوە لەنێوان عێراق و بەریتانیادا بۆ کۆتایی هێنان بە ئینتیدابی بەریتانی و گۆڕینی بەسەربەخۆییەکی سەر زاری بەڵام داگیرکەری بەریتانی و نوری سەعیدی بەکرێگیراوی و فەرمانڕەوا عێراقیەکانی سەر بەداگیرکەر ئەم داوایانەیان رەتکردەوە کە هەندێك لەنوێنەر کوردەکانی پەرلەمان پێشکەشیان کرد بۆ پێدانی مافە نەتەوەیەکان بەکوردەکان" لەوکاتەشدا بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی سەرەڕای خامۆشبوونی خەباتە چەکدارانەکەی فراوان دەبوو بۆ ئەوەی چەندین کەس لەڕۆشنبیران و کاسبکاران و بازرگانان و فەرمانبەرە کوردەکان بگرێتەوەو لەشارەکانیشدا دەستی بەوە کرد کە وورده وورده بگۆڕێت بۆ چەند ناوەندێك بۆ بزوتنەوەی نیشتمانی کە دەستی کرد بە گواستنەوەی ناوەندەکانی قورسایی و سەرکردایەتیەکەی بۆ شارەکان و خەڵکە شۆڕشگێڕەکەی، ئەوەش بەحوکمی پەرەسەندنەکان و گۆڕانکاریەکان کە هات بەسەر بزوتنەوەی نیشتمانی کوردیداو فراوانی بوونی بنکە جەماوەریەکەی ئەوەش لەڕاپەڕینی جەماوەری سلێمانی پاڵەواندا بەدیهات لە ٦ ئەیلول ١٩٣٠[٩٨]دا کاتێك کە ڕاپەڕینی جەماوەری لەسەر دەستی کاسبکاران و زەحمەتکێشان و بازرگانان و خوێندکاران و مامۆستایاندا ڕویدا کە سەرکردەکانیان ڕۆشنبیران و کاسبکاران بوون لەخەڵکی شارەکان ئەوەش پەرەسەندنێکی نوێ بوو لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا.

---

[٩٧] – نوێنەرە عێراقیەکان ئەم بەڕێزان بوون سیف الله خاندان، محمد جاف، جمال بابان و حازم شمدین ئاغا، ئیسماعیل بەگی رەواندزی، محمد صالح بن محمد علی کە پێشنیارێکیان لەساڵی ١٩٢٩دا پێشکەشی پەرلەمان کردو داوایان کرد جۆرێك لە حوکمی خۆیی بدرێتە کوردەکان بەڵام نوری سەعید بەرهەڵستی ئەمەی کردو ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە هەوڵەکانیان شکست بێنێت.

[٩٨] – بەپێچەوانەی ڕاپەڕینی چەکداریەوە کە لەسەردەستی پیاوانی ئایینی یان فەرماندار یان خاوەن موڵکەکاندا لەگوند دەستی پێکرد ئەم ڕاپەڕینە شۆڕشگێڕییە لەشاری سلێمانی دەستیپێکردو کاسبکارو خوێندکارو رۆشنبیرو زەحمەتکێش و بازرگانە کوردەکان پێی هەستان. تێیدا کرێکارو نوسەرو خوێندکار شەهیدبوون لەدیارترین سەرکردەکانی ئەم ڕاپەڕینەش شاعیری میللی خوالێخۆشبوو– فایەق بێکەس– بوو کە مامۆستای سەرەتایی بوو هەروەها بەڕێز رەمزی فەتتاح– ئەفسەری خانەنشین– و تۆفیق قەزاز–ی بازرگان).

## لەگوندەوە بۆ شار:

### پەرەسەندنێکی نوێ لەبزوتنەوەی نیشتمانی کوردیدا

راپەڕین لەدژی پەیماننامەی ١٩٣٠ رویدا کە عێراقی بەکۆت و بەندێکەوە بەستەوە قورستر لە کۆتەکانی ئینتیداب و بەستیەوە بە چەرخەی داگیرکەری بەریتانیەوە لەرووەکانی سیاسی و سەربازی و ئابوریەوەو مافەکانی کوردەکانیش نکوڵیان لێکراو بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان و راسپاردەکانی ئەو لیژنەیەی کەوا کۆمەڵەی گەلان ناردبووی بۆ بەئاگابوون لەرەوش و بارودۆخەکان لەویلایەتی موسڵ فەرامۆشکران، ئەو راپەڕینە جەماوەریەی شاری سلێمانی و رۆڵەکانی لەکاسبکاران و خوێندکاران و خوێنەواران پێی هەستان و سەرکردەکانی کودەتاکەو کەسانی تر لەخەڵکی شارەکە بروسکەییان نارد بۆ کۆمەڵەی وڵاتان و داوایان کرد کە دان بەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کورددا بنرێت.

راپەڕینە جەماوەریەکە بەمانگرتنێکی جەماوەری گشتگیر دەستی پێکرد تێیدا بازاڕو خوێندنگاکان داخران و کارکردن لەهەموو سلێمانیدا وەستا، پاشان مانگرتنە گشتیەکە گۆڕا بۆ خۆپیشاندانێکی میللی گەورە جەماوەری شارەکە و خوێندکاران بە چالاکی و دڵگەرمییەوە بەشداریان تێدا کرد.

پۆلیسی کۆنگرە بەفەرمانی ئینگلیز ئاگری رەشاش و تفەنگەکانیان کردە خۆپیشاندەران کاتێک کەوا گەیشتنە ئەو گۆڕەپانەی کە دەکەوێتە بەردەم سەرای حکومەتەوە، ژمارەیەکی زۆر لەخۆپیشاندەران کوژران و زۆرێکیشیان لێ بریندار بوو، ئەمەش بووە مایەی وروژاندنی رق و تورەیی لەهەموو شوێنەکانی شارەکەدا کە دانیشتوانەکەی بە برواوەو بە بەردبارنکردن رووبەڕووی پۆلیس بوونەوە، هەروەک چۆن ئەم قەسابخانە دڕندانەیە شەپۆلێك لەتورەیی و خەشمی توندی لەهەموو ناوچەکانی کوردستاندا لێکەوتەوەو سەرلەنوێ شۆڕشی کوردی هەڵگیرساییەوە کاتێك شێخ

مەحمودی حەفید لەشاخ دابەزی و سەرلەنوێ دەستیکردەوە بەهێرشکردنە سەر لایەنگرانی حکومەت.

راپەرینی -٦ ئەیلول- یەکەم بزوتنەوەی نیشتمانی جەماوەری بوو لەشارەکەدا رویدات لەژێر سەرکردایەتیکردنی دەستەیەکی نوێدا کە خاوەن سەرکردایەتیەکی نوێ بێت ئەوەش پەرەسەندنە گرنگەکەیە.. بلاوکراوەی رۆژنامەوانی خۆرهەلاتی ناوەراستی سۆڤیەتی لەژمارە -١٠-١١ی سالی ١٩٣١دا لەم بارەیەوە دەلێت:

" هەرچی حکومەتی عێراقی و داگیرکەری بەریتانی هەیە کە ئەم قەسابخانە خوێناویەیان بۆ کوردەکان دانا لەخەملاندنەکانیاندا بەهەلەدا چوون چونکە تەقەکردن لەخۆپیشاندەرە کوردەکان نەك تەنها نەیتوانی دایمرکێنێتەوەو کوردەکان بێ دەنگ بکات ، بەلکو بەپێچەوانەوە نەوتی لارکردەوە بەسەر کلپەی ئاگردا. بەلام ئەو وێرانکاری و کاولبونە رەق و بێ بەزەیانەی کە قەیرانی ئابوری بەسەر جوتیاری کوردیدا هێنابووی لەسەر دەستی فەرمانرەوا عەرەبەکان و کۆنەپەرستەکان و فشاری ئەوانە بۆ سەر کوردەکان و هارینیان، هەروەها خەباتی رزگاریخوازیی کوردی لەتورکیاو ئێران لەدژی تورك و ئێرانیەکان، هەموو ئەمە وایکردبوو کەشی کوردستانی عێراق لەنێوان کوردەکاندا کەشێکی شۆرشگێریی شەحنکراو و زۆر گڤوئالۆزبێت وەك بەرمیلێك لەباروت وایە کە بۆ تەقاندنەوەی تەنها دەنکە شقارتەیەك بەسە دابگیرسێنیت".

## بایەخی مێژوویی راپەرینی ٦ی ئەیلولی ١٩٣٠

راپەرینی ٦-ئەیلول-١٩٣٠ی نیشتمانی خالێکی وەرچەرخانی تۆمارکرد لەبزوتنەوەی کوردیدا ئەم راپەرینە وەرچەرخانێکی قولی تۆمارکرد لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی کوریدا لەرووی سروشت و بنکەی جەماوەری و سەرکردایەتیەوە. بۆ یەکەمجار لەمێژوی نوێی کوردیدا راپەرینێکی نیشتمانی لەشاردا روودەدات کاسبکاران و خوێندکاران و زەحمەتکێشان و بازرگانانی کورد پێ هەستن وە بۆ یەکەمجار لەمێژوودا رۆشنبیران و کاسبکارانی کورد دەبنە سەرکردەی راپەرینێکی میللی لەجێی پیاوانی ئایینی و فەرمانرەوایانی کوردو سەرکردایەتیکردنی لەگوندەوە بۆ شارو لەنێو دانیشتوانی

شارەکاندا فراوان بوو وایلێهات کە بنکە جەماوەریەکەی بەپلەی یەکەم پێکهاتبوون لەزەحمەتکێشانی شارەکان و خوێندکاران و کاسبکاران و بازرگانان و خوێنەواران ، لەوکاتەوە دەستەو گروپی خوێنەوارانی کورد لەپێشەوەی ریزەکانی بزوتنەوەی نیشتمانی کوردیدا بەدیارکەوتن، بەوەش کۆتایهاتنی رۆڵی سەرکردایەتی عەشایەریی و تەقلیدیان لەکوردستان ڕاگەیاند.

ئەمە بایەخی مێژویی ڕاپەڕینی ٦-ئەیلول-ی ساڵی ١٩٣٠ ز کەوا لێکرد لەمێژووی تێکۆشانەکانی گەلی کوردیدا نەمر بێت، کە لەدڵ و دەروونی کوردەکاندا شوێنێکی دیاری هەیە. شاعیران و ئەدیبانی کورد پێیاندا هەڵداوەو هەواڵ و کارەساتەکانی گۆرانیبێژان لەهەموو ناوچەکانی کوردستاندا باسیان کردو لاواندویانەتەوە تائێستاش کوردەکان بەداخ و پەژارەوە یادی " رۆژی رەشی شەشی ئەیلول" دەکەنەوە -و یادی دەکەنەوە وەك رۆژێکی تێکۆشان بۆ یادی راپەرینێکی میللی کە وەرچەرخان و گۆڕانێکی گرنگی تۆمار کرد لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا وەك رۆژێك کە بەتوندی ڕاپەڕینی شۆڕشێکی کوردی تری هەڵگیرساند ئەو شۆڕشەی کە سەرکردە پاڵەوانە نیشتمانیە نەمرەکەی شێخ مەحمودی حەفید هەڵیگیرساندو وەك شۆڕشەکانی پێشتری ئەمیش شکستی خوارد لەبەدیهێنانی ئامانجەکانی گەل و نیشتماندا بەهۆی دەستوەردانی داگیرکەرانی ئینگلیز لەدژی و بەکارهێنانی تانك و فرۆکەکان بۆ داپڵۆسینی لەلایەك و بەهۆی کەموکورییە خۆییەکان لەبزوتنەوەی شۆڕشگێریی کوردی خۆیدا لەلایەکی ترەوە.. ئەم کەموکوڕیانە کە دەکرێت تێبینی بکرێن- سەرەڕای نیشتمانپەروەریی و دڵسۆزی سەرکردەکانی- لەسروشتە کۆمەڵایەتیە-ئاینی و عەشایەری و خێزانیەکەیدا، چونکە بزوتنەوەی رزگاریخوازیی کوردی پێش راپەرینی ٦ ئەیلول رەگەزە سەرەکی و دیارەکانی پێکهاتبوون لەسەرۆك عەشارەیەکان و -شوێنکەوتوەکانیان-و پیاوانی ئاینی و هەندێك لە دەوڵەمەندەکانی گوند، بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بنکەیەکی جەماوەری هۆشیارو سەرکردایەتیەکی شۆڕشگێریی نەبوو پەیوەست بێت بەکێشە ژیاریەکانی گەلەوەو مەسەلە بنچینەیەکانیەوە لەچاکسازی کۆمەڵایەتی و کشتوکاڵی ، بەڵکو تەنها بایەخدانی بەچەند دروشمێکی سیاسی رووت دەدا، هەروەك چۆن چەندین

کەموکوڕی هەبوون لەبزوتنەوەوە سەربازیەکان و ڕێکخستنی سەربازی و سەرکردایەتیکردنی شۆڕش و شێوازەکانی جەنگ و تەکنیکەکانی، سەرەڕای ئەو هەلپەرستیە دوو ڕوویانەیەی ئەو خەڵکانە پێی هەڵدەستان کە دەوری شێخ مەحمودی حەفیدیان گرتبوو، ئەمانە ڕۆڵێکی بەدوخراپیان گێڕا لەلاوازکردنی شۆڕش و تێکدانی و دورخستنەوەی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیش ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لەشکستخواردنی شۆڕشی کورددیا لەبەدیهاتنی ئامانجە نەتەوەییەکانیدا.

ڕاپەڕینی ئەیلولی میللی بایەخێکی نێودەوڵەتیشی هەبوو لەرووی کاریگەریەوە لەسەر ئەو بڕیارەی کۆمەڵەی گەلان دەریکرد لەوەلآمی ئەو بروسکانەدا کە نیشتمانپەروەرە کوردەکان لەکاتی ڕاپەڕینەکەدا لەسلێمانیەوە ناردیان بۆ کۆمەڵەی گەلان لەلاپەرە ٨٩ی کتێبی (خناجر والجبال)ی بەرێز ئەحمەد فەوزیدا هاتووە کۆمەڵەی گەلان بینی "چەند بڕیارێك هەیە کە داوا دەکات مامەڵەیەکی تایبەتی لەگەڵ کوردەکاندا بکرێت کە بەتەواوەتی بۆیان فەراهەم نەکراوە" ئەمەش بەپێی دواین ئەو زانیاریانەی لای وڵاتانی چاودێریکەر هەیە- بەپێدانی هەندێك گرەنتی پێیان کە پەیوەندی بە کارگێڕیی خۆجێییەوە هەیە، وا دیارە کە هەتا ئێستا جێبەجێ نەبوون بۆیە ڕاسپاردە دەدات بە:

١- ڕەتکردنەوەی ئەوەی لە سکاڵانامەکەدا هاتووە سەبارەت بە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لەژێر سەرپەرشتیاری کۆمەڵەی گەلاندا.

٢- داوا لەوڵاتی چاودێریکەر (منتدب) بکرێت چاودێریی بکات تا بزانێت ئایا ئەو ڕێوشوێنە تەشریعی و کارگێڕیانەی کە دانراون تا ئەو ڕەوشە بۆ کوردەکان فەراهەم بکات کە هۆگریی بوون و شیاوە بۆیان، بەچاوی گرنگیەوە بۆی دەڕوانرێت و دەخرێتە ژێر جێبەجێکردنەوە بێ هیچ کەموکوڕیەك یان فەرامۆشکردنێك.

٣- لەبڕیارەکەیدا بەمەرجگرتنی وەرگرتنی ڕێوشوێنەکان رەچاوبکرێن کە مانەوەی ئەم جۆرە ڕەوشە بۆ کوردەکان گرەنتی دەکات ئەگەر عێراق بەتەواوەتی ڕزگاری بوو لە سەرپەشتیکردنی دەوڵەتی چاودێریکەر-.

## ( لاوازی بزوتنەوەی کوردی لەکوردستانی خۆرهەلآت )

هەرچی سەبارەت بە بزوتنەوەی نەتەوەییە لەکوردستانی خۆرهەلآت–ئێران– ئەوا لاوازو نارێکخراو بوو خەڵك لەبەشە باکوری و ناوەڕاستەکەیدا سۆزیان بەلای حکومەتەکەی شێخ مەحمودو بزوتنەوەی نیشتمانیدا هەبوو لەکوردستانی باشورو هەندێکیشیان بەشداریان تێیدا دەکرد. بەلآم لەبەشە باشوریە خۆرهەلآتیەکەیدا کوردەکان بەرهەڵستی حوکمی رەزا شاو هەوڵەکانیان دەکرد بۆ سەپاندنی مەرکەزیەت و حوکمی تاران بەسەریاندا بەزەبری چەك.. بێ ئەوەی هیچ پەیڕەوێکی نیشتمانی ڕونیان هەبێت یان کۆمەڵە داخوازییەکی نەتەوەیی کوردیی دیاریکراو. بەلآم بزوتنەوەی ئیسماعیل ئاغای شکاك –سمکۆ– ئەوا شێوەی بزوتنەوەیەکی عەشایەریی توندی وەرگرت و بۆ ماوەیەك لەسەر ئەو شێوازە بەردەوام بوو پاشان تووشی سستی و لاوازی هات بەهۆی نەگۆڕانیەوە بۆ بزوتنەوەیەکی نیشتمانی خاوەن ئامانجی نەتەوەیی ڕوون بەهۆی هەڵەکان و ئاڕاستە تاکە کەسیەکانی سمکۆو کردەوەو هەڵسوکەوتە زیانبەخشەکانیەوەو دەرکەوتنی بەسیمایەکی دەرەبەگی زۆردارەوە.

پرۆسەکانی غەدرو ئەو تاوانانەی کە سمکۆ لەدژی برا ئاشوریەکانمان ئەنجامی دا لاپەڕەکانی رەشکرد و زەحمەت و ناڕەحەتی زۆریان بۆ بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی دروستکرد کە تائێستاش شوێنەوارەکانی ماونەتەوە.

دواکەوتنی ئابوری کوردستان و بەردەوامی پاشماوەکانی دەرەبەگایەتی تێیداو پاشانیش بوژانەوەی دەرەبەگایەتی لەسەر دەستی ئینگلیزی و کەسانی تر لەزەوتکەرانی کوردستان و هەروەها نەبوونی پیشەسازی و بازرگانیەکی گەشەسەندو لەکوردستان لەکات و دوای جەنگی جیهانی یەکەمدا– و ئەوەی لێی دەکەوێتەوەلەبوونی چینێکی کرێکاری نوێ– و بلآوبونەوەی نەخوێنەواری و نەزانی سیاسی لەناو خەڵکە گشتیەکەدا، هەموو ئەمانی رۆڵێکی گرنگیان گێڕا لەگەڵآڵە نەبوون و چۆڕبەست نەبوونی بزوتنەوەیەکی رزگاریخوازی نەتەوەیدا بۆ گەلی کورد بەشێوەیەکی پەرەسەندو نوێ و پاشانیش لەشکستپێهێنانی شۆڕشی کوردی لەبەدیهێنانی ئامانجەکانی بزوتنەوەی نیشتمانی کوردیدا.

بۆیە دەبینین دوژمنانی گەلی کوردی لەداگیرکەران و زەوتکەران کار دەکەن بۆ ئەوەی کوردستان بە دواکەوتوویی بهێڵنەوە لەرووی پێشکەوتن و پەرەسەندنی پیشەسازی و کشتوکاڵی و رۆشنبیریەوەو پارێزگاری لەمانەوەی دەرەبەگایەتی و عەشایەری دەکەن بۆ ئەوەی بەو کارەیان داگیرکردنیان بۆ کوردستان بەردەوامی پێبدەن.

## خوێندکاران و رۆشنبیران سەرۆکایەتی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردی دەکەن

ئەگەر گەڕاینەوە بۆ رەوشی دوای راپەرینی ٦-ئەیلولی جەماوەریی دیاردەیەکی نوێ دەبینینەوە تێیدا ئەویش سەرەتای مایەپوچبوونی سەرکردە عەشایەرییەکان و خاوەن موڵکەکان و بەربوونی جڵەوی کارەکانە لەدەستیدان و دەرکەوتنی دەستیەکی خوێنەواری کوردییە لەسەرو بزوتنەوەی نیشتمانی کوردییەوە.
بەوشێوەیە تێبینی دەکەین زۆرینەی فەمانڕەواو سەرۆك هۆزە کوردیەکان خۆیان خستە باوەشی داگیرکەرانی کوردستان و فەمانڕەوایانی کوردستانەوە لەبەرامبەر پلە حکومیەکاندا یان پاراستن و دڵنیاییکردنی بەرژەوەندیەکانیان و رۆیشتنی کاروبارەکانیاندا، ئەمەش بەشداری لەوەدا کرد کە شێخ مەحمودی حەفید ناچاربێت مەرجەکانی حکومەتی عێراقی قەبوڵ بکات لەئاشتەواییەکدا کە وەك خۆبەدەستەوەدان وابوو کاتێك قەبوڵی کرد بچێت لەبەغدا لەژێر چاودێریی حکومەتدا نیشتەجێ ببێت، لەکاتێکدا دەبینین دەستەی خوێنەواری کوردی و لەناویشیاندا خوێندکارە کوردەکان هەر لەسەرەتای دەیەی چوارەمی سەدەی بیستەمەوە لەعێراقدا چالاك دەبوون، حزبی خۆیبوون بەردەوام بوو لە تێکۆشان و چالاکیەکانی لەتورکیاو سوریادا، خوێندکارە کوردەکان لە پەیمانگاکانی بەغداد پەیوەندیەکی رۆشنبیری کۆمەلایەتییان هەبوون (سیاسی بەجۆرێك لەجۆرەکان) کەلەژێر ناوی (کۆمەڵی لاوان)دا کۆی دەکردنەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم کۆمەڵەیە رێکخراو نەبوو وەك ئەوەی خاوەن ئامانج و بەرنامەی سیاسی یان پەیڕەوێکی ناوخۆیی نوسراو بێت، بەلام کۆکەرەوەی کارو چالاکیەکانی

خوێندکارە کوردەکان بوو هەروەها زیندوکەرەوەی رۆحی هاریکاری و یارمەتیدان بوو لەنێوانیان و خزمەتکردنی رۆشنبیری کوردی بوو.

-کۆمەڵی لاوان- بەشداریکرد لە بڵاوکردنەوەی ئەو هۆشیاریە نەتەوەییەدا کەوا دەستی بەچوونە ناو ریزەکانی خوێنەواران و کاسبکارانی کورد کردبوو ئەدیبان و رۆشنبیران دەستیان بە بڵاوکردنەوەی بیرۆکەکانیان کردبوو لەناو شارەکانداو لەنێوان پیاوانی ئایینی و خوێنەوارەکانی تردا لەگوند، -کۆمەڵی لاوان- لەساڵی ۱۹۳۳دا یەکەم ژمارەی لە -یادگاری لاوان[99] توێژینەوەی ئەدەبی و شیعری نیشتمانی وتاری پەروەردەیی و رۆشنبیری لەخۆگرتبوو، ئەو لیژنە کارایە سەرپەرشتی چالاکیەکانی لاوانی کوردی دەکردو ئەم ژمارەیەی دەرکردو چالاکیە کوردییەکانی تری رێکخست پێکهاتبوو لەخوێندکارە کوردەکان: فازل رەئوف تاڵەبانی کەلەهەمویان بەتەمەنتربوو ئەمینداری سندوقیش بوو هەروەها ئیبراهیم [100]ئەحمەد (سکرتێری لیژنەو نوسەری سەرەکی ژمارەی یەکەم)و حامد فەرەج یەکێك بوو لەخوێندکارە چالاکەکان و شاکر فەتتاح کە لەساڵی دواتردا بووە سکرتێری لیژنەو نوسەری سەرەکی ژمارەی دووەمی - دیاری لاوان- کە لەساڵی ۱۹۳٤دا دەرچوو.

ئەوەی جێگەی داخە چالاکی (لاوان)ی رۆشنبیری کوردی لەو کاتەدا کورت بوو بوویەوە لە چەند مەسەلەیەکی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و دەرکردنی نامیلکەیەکی ساڵانە لەگەڵ گرتنی وێنەیەکی یادگاری خوێندکارە کوردەکاندا ئەوکات ئەو بیرۆکەیەی خوالێخۆشبوو ئەمین زەکی بەگ زاڵبوو کە داوای دەکرد لاوانی کورد تەنها بایەخ بەخوێندن و زانست و مەعریفە بدەن و بە سیاسەتەوە سەرقاڵ نەبن، بە پاساوی ئەوەی کەبێجگە لەوە هیچی تر سودی نیەو بێکەڵکە.. ئەم بیرۆکەیەش هەتا پێش جەنگی جیهانی دووەم هەر زاڵ و

---

[99] - یادگاری لاوان وەك زمانحاڵی کۆمەڵی لاوان بوو کە لەنوسین و دەرکردنی ژمارەی یەکەمیدا ئیبراهیم ئەحمەدو فازل رەئوف تاڵەبانی و حامد فەرەج و شاکر فەتاح بەشداریان کرد تێیدا شیعری نیشتمانی شاعیرە نیشتمانپەروەرەکانی وەك حاجی قادری کۆیی و فایەق بێکەس و گۆران و هی تر بڵاوکرایەوە.

[100] - ئیبراهیم ئەحمەد هەمان مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدە پارێزەرو سکرتێری لیژنەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستانی کە ئەو کات خوێندکاربوو لەبەغداد.

کاریگەربوو تا ئەو کاتەی حزبی هیوا دامەزراو خوێندکاران پایەو پاڵپشتی کاریگەرو سەرەکی بوون.

بزوتنەوەی رۆشنبیریش بەردەوام بوو لەسەر پێشکەوتنی. لەسوریا میرەکان جەلادەت بەدرخان و دکتۆر کامران بەدرخان و ئەوانی تر لەبنەماڵەی بەدرخان گۆڤاری –هاوار–ی کوردیان دەردەکردو ئەلفوبێی لاتینیشیان بۆ زمانی کوردی دانا.

گۆڤاری هاوار رۆڵێکی هەستپێکراوی بینی لەبلاوکردنەوەی هەستی نەتەوەیی و پەرەپێدانی ئەدەبی کوردی و بلاوکردنەوەی رۆشنبیری و بوژاندنەوەی زمانی کوردی ئەوەش سەرەڕای ئاراستە بورژوازی و بیرۆکە ڕاستڕەوکانی.

ساڵی ١٩٣٥ بە سەرەتای بلاوبونەوەی بیرۆکەی دیموکراسی و چەپ دادەنرێت لەنێوان لاوانی کورد دا لەعێراق. رۆشنبیرانی کوردی نمونەی بەرێزان حەمزە عەبدوڵلاو رەشید عارف و ئیبراهیم ئەحمەدو عەبدولصەمەد محمد و حەسەن تاڵەبانی و ئەوانی تر پەیوەندیەکی توندوتۆڵیان دروست کرد لەگەڵ کۆمەڵەی– الاهالی–ی دیموکراسی لەعێراق کەوا کامل چادرچی یەکێك بوو لەجەمسەرەکانی[١٠١] هەروەها عەبدولفەتاح ئیبراهیم[١٠٢] و محەمەد حەدید[١٠٣] و سەرکردەی نیشتمانی ئەمر جەعفەر ئەبو تمەن

---

[١٠١] –مامۆستا کامل چادرچی سەرۆکێکی نیشتمانی دیموکراسی عێراقیە بەدڵسۆزی بۆ گەل و خەباتی دوورودرێژ لەپێناو رزگارکردنی عێراق و دیموکراسیەت و پاکی و نەزاهەت ناسرابوو لەژیاندا. هەر لەکۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووەمەوە بووە سەرۆکی حزبی نیشتمانی دیموکراسی، چادرچی لەلایەن هەموو هاوڵاتیان و دیموکراسیخوازانی عێراقەوە جێی رێزو ستایشە لەناویشیاندا دیموکراسیخوازانی عێراق.

[١٠٢] – مامۆستا عەبدولعەزیز ئیبراهیم لەبەناوبانگترین رۆشنبیرانی عێراق و لەپێشڕەوانی دیموکراسیەتە لەعێراق بەخەباتی دوورو درێژ لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی و خەباتی لەپێناو سەربەخۆیی عێراق و دیموکراسیەت ناسراوە لەساڵی ١٩٤٥دا بووە سەرۆکی حزبی یەکێتی نیشتمانی کە حکومەتەکەی صالح جەبر لەگەڵ حزبی گەلدا ساڵی ١٩٤٧ دایخستن لەسەردەمی کۆماریدا بووە سەرۆکی دەستەی دامەزرێنەری حزبی کۆماری عێراقی کە قاسم مۆڵەتی پێدا.

[١٠٣] – مامۆستا محمد حدیدی ئابوریناسی عێراقی ناسراو کە بۆ ماوەی نزیکەی سی ساڵ هاوەڵی مامۆستا چادرچی بوو لەخەباتیدا هەروەك چۆن جێگری سەرۆکی حزبی نیشتمانی دیموکراسی بوو تا ئەوکاتەی لەساڵی ١٩٦٠دا لەمامۆستا چادرچی جیابۆوە و حزبی نیشتمانی پێشکەوتنخوازیی دامەزراندو بە بەهێزترین پشتیوانانی قاسم مایەوە هەتا ناوەڕاستەکانی ساڵی ١٩٦٢ کاتێك دورکەوتەوە لەوەو چالاکیەکانی خۆی و حزبەکەی وەستا.

پێشرەوی رۆحیان بوو بەلاّم لاوانی کوردی بەتەواوی هاورِا نەبوون لەنێوان خۆیاندا، مامۆستا حەمزە عەبدوللاّ و بەرێز عەبدولصەمەد محمد چوونە ناو یەکەم رێکخراوی مارکسیەوە کە دامەزرا، ئەمە لەکاتێکدا بەرێز رەشید عارف و حەسەن تالّەبانی لە کۆمەڵەی –الاهالی–یەوە نزیک بوون، بەلاّم مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بەپێشکەتنخوازێکی سەربەخۆ مایەوەو پارێزگاری لەپەیوەندی باشی خۆی کرد لەگەڵ پێشکەوتنخوازو دیموکراسیەکانی عەرەبدا لەگەڵ ئەوەشدا کە پێشکەتنخوازانی کورد کەوا کاریگەربوون بەبیرۆکەی پێشکەتنخوازی و دیموکراسی کەم بوون بەلاّم رۆڵێکی گرنگیان گێرِا لەبزوتنەوەی کوردیدا مامۆستا حەمزە عەبدوللاّی پارێزەر بووە یەکێك لەدامەزرێنەرانی حزبی دیموکراسی کوردستانی و سکرتێری بۆ ماوەی نزیکەی چوار ساڵ پاشان ئەندامێکی سەرکردایەتی دیار تا ئەوکاتەی لەساڵی ١٩٥٩دا لەلایەن کۆنگرەی چوارەمی حزبەوە لەحزب دورخرایەوە.

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدیش سکرتێری ئێستای حزب رۆڵە ناسراوەکەی خۆیی گێرِا لەبزوتنەوەی نیشتمانی دیموکراسیدا و لەبواری فیکری و رۆشنبیریدا لەساڵی ١٩٣٧دا نامیلکەکەی– الاکراد والعرب–ی دەرکرد بنچینە زانستیەکان لەخۆدەگرێت سەبارەت بەرونکردنەوەی برایەتی عەرەبی کوردی و خەباتی هاوبەش لەنێوان هەردوو گەلدا لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی هەروەك چۆن کۆمەڵێك لە رِستەو بیرۆکەی زانستی لەخۆگرتبوو بۆ گۆرِینی یەکێتی پێوەلکاندن و پێویستی بوونی هاریکاری و یارمەتیدانی خەباتی یەکتر لەنێوان کوردو عەرەبدا لەدژی داگیرکەرو دارودەستە کۆنەپەرستە ناوچەییەکەی– پاشان مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد گۆڤاری – گەلاوێژ–ی بۆ ماوەی دە ساڵ دەرکرد، ئەو گۆڤارەی کە رۆڵی سەرپەرشتیاری خۆیی بینی لەبلاّوکردنەوەی هۆشیاری نیشتمانی و دیموکراسی و لەتێکۆشاندا لەدژی فاشیزم و هەروەها لەگەشەپێدانی رۆشنبیری و خزمەتکردنی ئەدەب و زمانی کوردیداو لەپەروەردەکردنی نەوەیەك لە نوسەران و ئەدیبانی کورد بەشێوەیەکی پێشکەوتنخوازی و دیموکراسی، بەوشێوەیە دەبینن کە

---

مامۆستا چادرچی وێرای هەڵوێستەکانی دوایی لەسەردەمی قاسمدا ئەوا رۆڵێکی دیاری هەیە لەبزوتنەوەی نیشتمانی دیموکراسیدا.

دەرخـواردەدانی بزوتنـەوەی رزگـاریخوازی کـوردی لەرێگـەی لاواوە سەربەسـتەکانیەوە بەبیرۆکـەی پێـشکەوتنخوازی و دیموکراسـی سـەرەتاکەی دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵەکانی ١٩٢٥–١٩٣٧– کـە بزوتنـەوەی دیموکراسـی لەعێراقـدا بەشـێوەیەکی هەسـتپێکراو دەرکەوت.

***پرۆفیسۆر بوخارد برینیتس[١٠٤] لەوبارەیەوە دەڵێت:***

" لەژێر کاریگەری بەریکەوتنە سیاسیەکان و کاریگـەری فیکـری کۆمەڵـەی –الاهـالی–دا لەنێوان خوێندکارە کوردەکاندا لەبەغدا بازنەی نیشتمانپەروەرە هۆشیارەکان لـەدەوری (ئیـبراهیم ئەحمـەد)کۆبوونـەوە کـە (دیـاری لاوان)ی دەردەکـرد تێیـدا ئاراسـتەیەکی دژ بەفاشـیزم بەدەرکـەوت لەبزوتنـەوەی نیـشتمانی کوردیـدا هـەروەها وتارەکـانی دژ بەفاشیزمیشی لەرۆژنامە بەریتانیەکانەوە دەگواستەوە، لەهەمان کاتیشدا ئەو کۆمەڵـەی لەدەوری (ئیـبراهیم ئەحمـەد) کۆبووبونـەوە بـۆ یەکـەم جـار تەبـەنی بیرۆکـەی خـەباتی هاوبەش و یەکێتیان کرد لەنێوان عەرەب و کورد دا لەدژی داگیرکـەرو ئیـبراهیم ئەحمـەد کتێبەکەی بلاّوکردەوە (الاکـراد والعـرب) لەساڵی ١٩٣٧دا کەهێشتا وەك هێڵـی لەسـەر رۆیشتنی بزوتنەوەی کـوردی وایـە لەپەیوەندیەکانیـدا لەگـەڵ بزوتنـەوەی رزگـاریخوازی عەرەبیدا".. پرۆفیسۆر برینیتس بەردەوام دەبێت و دەڵێت:–

" لایەنـە ڕاسـتڕەوەکان کـە هاتنـە سـەر حـوکم نوسـەرەکەیان دەسـتگیرکرد بـەلاّم نەیانتوانی رێگە لەبلاّوبونەوەی کتێبەکە بگرن لەهـەموو ناوچـەکانی کوردسـتاندا، لـەنێو کوردەکانیـشدا ڕاوبۆچـونی جیـاواز دروسـت بـوو سـەبارەت بەناوەڕۆکەکـەی. سـەرۆك هۆزەکان و بورژوازیەتی شۆفێنی یەکگرتنـە پێـشنیارکراوەکەیان رەتکـردەوە. ئیـبراهیم ئەحمـەدو هاوڕێکانیـان بەخیانـەتکردن بـۆ عـەرەب تاوانبـارکرد بـەو شـێوەیە بـاڵی دیموکراسی لەبزوتنەوەی کوردیدا بەتەنیشت باڵی ڕاستڕەوی کەنارگیریەوە دروسـت بـوو وە هەر لەسـاڵی ١٩٣٥ەوە رێکخستەکانی حزبـی شـیوعی عێراقـی لـەنێوان کوردەکانـدا پەیدابوون لەنێوان ئەو کەسانەشدا حەمزە عەبدوڵلاّ و صەمەد محمد دەرکەوتن".

---

[١٠٤] – پرۆفیسۆر برینیتس– لەتوێژینەوە بەنرخەکەیدا کەپێشتر ناومان هێنا.

لەو ماوەیەشدا کەوتە دوای کودەتاکەی فەریق بەکر صدقیەوە بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردی جموجوڵی تێکەوت بەتایبەتی کرانەوەیەك لەکەشی سیاسیدا لەدوای ئەو حکومەتەوە رویدا کە بەسەرۆکایەتی حکمت سلێمان پێکهات و ژمارەیەك وەزیری نیشتمانپەروەرو دیموکراسی لەخۆگرت نمونەی خوالێخۆشبوو جەعفەر ئەبو تمەن و مامۆستا کامل چادرچی و یوسف ئیبراهیم لەم ماوەیەدا کۆمەڵەی (برایەتی)ی کوردی لەسلێمانی پەیدابوو بەسەرۆکایەتی شێخ لەتیفی کوڕی سێیەمی سەرکردەی کوردی شێخ مەحمودی حەفید، بەڵام فراوان نەبوو بەڵکو چالاکیەکانی لەچوارچێوەی شاری سلێمانی و بەتایبەتیش ناو شاری سلێمانیدا مایەوە لەساڵی ١٩٣٩دا ڕێکخراوێك دروست بوو دوای بەخێرایی گۆڕا بۆ حزبی (هیوا) کە فراوان بوو بووە حزبێکی گەورە لەساڵەکانی یەکەمی جەنگی جیهانی دووەمدا سەرکردەی حزبەکە خوالێخۆش بوو مامۆستا رەفیق حیلمی بوو. حزب زۆرینەی هەر گەورەی لە خوێندکارە کوردەکان و ئەفسەران و خوێنەوارانی تربوون هەروەها بەسەدان ئەندام لەکاسبکاران و بازرگانە کوردەکان، حزبێکی نەتەوەیی بوو کە تێکەڵەیەك لە لاوە نەتەوەییەکانی لەخۆگرتبوو کەوا کاریگەربوون بەبیرۆکە نەتەوەیی ڕاسترەو و دیموکراسی و سەربازیەکان، بەڵام ئەو دەستە رۆشنبیرەی کەوا کاریگەربوون بە بیرۆکە سیاسیە چەپەکان هەر لەساڵی ١٩٣٥ەوە خۆیان بەدورگرت لەحزبی هیواو بەحزبێکی ڕاسترەویان دانا. لەواقیعدا حزبی هیوا حزبێکی نەتەوەیی نیشتمانی بوو (لەسەرەتایەوە ئاراستەیەکی ڕاسترەوانەی هەبوو. رۆڵێکی گرنگی گێڕا لەبڵاوکردنەوەی هەستی نەتەوەیی و فراوانکردنی بنکەی جەماوەری بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی. هەروەها لەدامەزرانی حزبی (ژ.ك)کە دوای گۆڕا بۆ (حزبی دیموکراتی کوردستان) لەمەهاباد.

بەتێڕوانینی من ئەوە گرنگترین دەستکەوتەکانی ئەم حزبە نەتەوەییە کوردییە بوو کە دواتر ئاژاوە کەوتە نێو ریزەکانیەوەو بوونە چەند دەستەو گروپێك، زۆربەیان چوونە ناو حزبی رزگاری کوردەوە کە هاوپەیمان بوو لەگەڵ حزبی شیوعی لەکوردستانی عێراق کە دایمەزراندو سەرکردایەتی کردو بەناوی رۆژنامەکەیەوە ناسرا (شۆڕش).

(خۆیبون)یش پێش حزبی هیوا کەوت لەهەڵوەشانەوەو نەمانی دوای ئەوەی ئاژاوە کەوتە نێو ریزەکانی و کەمبونەوەی چالاکیەکانی و لقەکانی؟.

هەردوو حزبەکە هەندێك کەموکوریان هەبوو کە هاوشێوەو هاوبەش بوون لەرووی سروشتیان و ناروونی ئامانجەکانیان لەرووەکانی ئابوریی و کۆمەلآیەتیەوەو نەگۆرانیان بۆ دوو حزبی جەماوەری و پشتکردنیان لەتیۆری زانستی و بیرۆکە دیموکراسیەکان و لەسەر سروشتە کۆنەکەیان مانەوە، ئەگەرچی حزبی هیوا تاکرەوانە بوو بیرۆکەکانی یەك سەرکردەیی کە هاوشێوەی چەمکی کۆنەپەرستانەی (سەرۆکی فەرماندەو پێشەنگ) حوکمی دەکرد، ناکۆکیە کەسیەکان و هەروەها هەلپەرستی رۆڵیان گێرا لەهەڵوەشاندنەوەی هەردوو حزبەکەدا بەشێوەیەك وایان لێهات هەردوو حزبەکە نەیانتوانی رۆڵەکانی خۆیان بەئەنجام بگەیەنن و دواکەوتن لەوەی هاوشانی بزوتنەوەی گەلی کوردی هەنگاو بنێن و ئیدی پەرت بوون و هەڵوەشانەوە، بەتایبەتی کە بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردی هەر لەجەنگی جیهانی دووەمەوە دەستی بە پەرەسەندن کردبوو پەرەسەندنێك کە سروشتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی و ئامانجەکانی و سەرکردایەتیکردنی و دەرکەوتنی پێشرەوانێك بۆی لەخۆدەگرت، بەهۆی بلآوبونەوەی بیرۆکەی رزگاریخوازی و دیموکراسی لەکاتی جەنگ و بەکاریگەری مەزن بوونی بزوتنەوە رزگاریخوازو شۆرشگێریەکان لەئەوروپاو ئاسیاو بەهۆی پەرەسەندنە ئابوریی و کۆمەلآیەتیەکانەوە کەلەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا رویاندا لەرووی گەشەکردنی سەرمایەدارییەوە و بوژانەوەی بازرگانی و دەرکەوتنی چینی کرێکارو بلآوبونەوەی فێرکردن لەکوردستان کە ئەوەی لەئێران روویدا رۆڵێکی دیاری گێرا لەوەدا لەروخانی حوکمی رەزا شای سەر بە ئەڵمانیاو سوپای سۆڤیەتی سور لەگەڵ سوپای ئینگلیزی و ئەمریکیدا چوونە ناو خاکی ئێران و ناوچەی کوردستانیەوە کە ناوچەی (موکریان)ی کەوتە ژێر دەسەلآتی داگیرکەری سۆڤیەتیەوە.

# پێشکەوتنێك لەکوردستانی ئێراندا

بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردیی لەکوردستانی ئێران لاواز و کورتبوو بووەوە لەدەستەیەك لەپیاوانی ناوچەی موکریاندا ئەوانەی لەماوەی ساڵەکانی (٢٩-٣٠) پەیوەندیان هەبوو بەشۆڕشی ئاراراتەوە کە ژەنراڵ ئیحسان نوری پاشا سەرکردایەتی کرد، پەیوەندیەکیش هەبوو لەنێوان هەندێك لەنیشتمانپەروەرە کوردەکان لەماوەی ساڵەکانی (١٩٣٥-١٩٣٨)کە ئەمانە پەیوەندیان هەبوو بە هەندێك لەئەفسەرە کوردەکانەوە لەعێراق نمونەی خوالێخۆشبووان (ئەمین رەواندوزی)و (فایەق کاکە ئەمین) وە لەساڵەکانی (١٩٣٩-١٩٤٢) رێکخراوێکی بچووك ژیا کە لەژێر ناوی (حزبی رزگاری کوردستان)و بەسەرکردایەتی (عەزیز زەندی) خەباتیکرد، بەلاّم ئەم رێکخراوە هیچ پەیڕەوێك یان بلاّوکراوەیەکی بەجێنەهێشتووە تەنها یەك بلاّوکراوە نەبێت کە بە بۆنەی هاتنی سوپای سورەوە بۆ باکوری ئێران دەریکردووەو پێشوازو خۆشحاڵی بەهاتنی ئەو سوپایە دەربڕیوەو داوای مافی چارەی خۆنوسینی کردووە بۆ گەلی کورد لەئێراندا. ئەم چالاکیە نیشتمانیانە رێگەیان خۆشکرد بۆ دەرکەوتنی کۆمەڵەیەکی سیاسی نیشتمانی بەتایبەتی دوای باشبوونی رەوشەکان و هەڵکردنی شنەی ئازادی لەگەڵ هاتنی سوپای سۆڤیەتی بۆ بەشێك لەکوردستانی ئێران.

کۆمەڵەی (ژ.ك)- کۆمەڵی ژیانەوەی کوردستان کە لە ١٦ سێپتەمبەری-١٩٤٢- دامەزرا دوای سەردانێکی بەرێز میر حاجی ئەحمەد- ئەندامی دیاری حزبی هیوا- بۆ شاری مەهاباد و بەنهێنی پەیوەندیکردنی بەهەندێك لە نیشتمانپەروەرە کوردەکانەوە ئەوانەی لەناو بزوتنەوەی کوردیدا کاریان دەکرد.

ولیەم ئایکتن لەبارەی دامەزرانی کۆمەڵەی (ژ. ك)ەوە دەڵێت:

لە ٢٥- شەهرور- ١٣٢١ی بەرامبەر بە ١٦ سێپتەمبەری ١٩٤٢[١٠٥]، دەستەیەك لەهاوڵاتیانی مەهاباد کە سەر بەچینی ناوەڕاست بوون چوون بۆ باخچەی حاجی داود لەنزیك سابلاّخ.

---

[١٠٥] - بڕوانە کتێبی (The Kurdish Republic of ١٩٤٦)بەپێنوسی : William Eagleton Jr ل ٢٣ و، بەرێز ئایکتن دبلۆماتکارێکی ئەمریکی رۆشنبیرە بەیەکێك لەو کەسانە دادەنرێت کە بەئاگایە

بــچوکترین کەســیان لــەرووی تەمەنــەوە- عبــدالرحمن حلــوی ١٩ ســاڵ بــوو- بەتەمەنترینیشیان مەلا عەبدوڵلای داودی بوو کە نزیکەی پەنجا ساڵ دەبوو، یەکەمیان دەرچووی قوتابخانەی رەزاییە و دووەمیان توتن فرۆش بوو.

هــەموویان نزیکــەی ١٥ کــەس دەبــوون پێکــەوە کۆبوونــەوە لــەو رۆژەدا بــۆ وتوێــژکردن دەربارەی گەلی کوردی و رێکخستنی پارتێکی سیاسی، مەبەستەکەیان بەدوور بوو لەهەر ئیحایەکی دەرەکی، ئەوان بۆ خۆیــان چــەندین ســاڵ بــوو هەریەکــەیان بەشــێوازی خــۆی کاریان دەکرد لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا، لەگەڵ ئەوەشــدا ســەیری کوردەکــانی عێراقیان دەکرد کە لەرووی سیاسیەوە لەمانە پەرەسەندوتربوون تا سود لە رێنموماییــە کرداریەکانیان وەربگرن. هەڵگری ئەم رێنماییانــەش کــاپتن مــیر حــاج ئەحمــەد بــوو کــە نوێنەرایــەتی حزبــی هیــوای دەکــرد کەلــەباکوری عێــراق دروســت بــوو بــوو.. بــەڵام دامەزرێنەرەکان وەك ئەوەی مــستەر ویلیــەم ئــایگلتن[١٠٦] ی کــور باســیان دەکــات بــریتین لە:١- عبدالرحمن حلوی ٢- محمــد امــین شــریفی ٣-محمــد نانــەوازادە ٤- عبــدالرحمن زبیحیی ٥- حسین فروهر - رزگاری ٦- عبدالرحمن امــامی ٧- قاســم قــادری ٨- مــلا عبدالله داودی ٩- قادر مدرســی ١٠- احمــد امــامی ١١- عزیــز زنــدی ١٢- محمــد یــاهو. هێندەی نەبرد کــە (ژ.ك) فــراوان بــوو چــەندین لــق و پــەلی لێبــۆوە لەهــەموو ناوچــەکانی موکریــان و خۆرئــاوای ئازربایجــان پاشــان لــەعێراق و تورکیــاش لقــی بــۆ دروســت بــوو

---

لەباروبۆخەکانی کوردستان. خۆشحاڵبووم لەساڵی ١٩٦٥ لە لەندەن پێی ئاشنابووم و بینیم بایەخ بــە کاروبــاری کوردســتان دەدات و هاوســۆزە لەگــەڵ بزوتنــەوە رزگاریخوازییــە دابپەروەرانەکەیــدا وێــرای رەوشــت و ئەدەبــە بەرزەکەی.

[١٠٦] - هــەمان سەرچــاوەی پێشوو لا ١٣٢: پێموایــە زانیارییــەکانی بــەرێز ئــایگلتن ســەبارەت بــە دامەزرێنــەرانی کۆمەڵــەی ژ. ك تــەواو نــین چــونکە مامۆســتا زەبیحیــی لەنامەیەکــدا کــە بــۆ منــی نوســیبوو بەمــشێوەیە نــاوی دامەزرێنەرەکانی هێنابوو کە بریتین لەبەرێزان:

١- حسن زرگری ٢- عبدالرحمن زبیحی ٣- عبدالرحمن امامی ٤- عبــدالقادر مدرســی ٥- نجــم الــدین توحیــدی ٦- محمد نانەوا زادە ٧- علی محمــودی ٨- محمــد اصــحابی ٩- عبــدالرحمن کیــانی ١٠- صــدیق حیــدری ١١- قاسم قادری.

کۆمەڵەکە گۆڤاری (نیشتمان)ی بەزمانی کوردی دەرکرد و بەشێوەیەکی نهێنی و دەرچوونیشی ناوبانگێکی فراوانی هەبوو لەناوەندە میللیەکاندا.
لەنیسانی ١٩٤٢دا دوای ئەوەی رێکخستنەکانی (ژ.ك) پێکهاتبوون، نزیکەی سەد کەس کۆبوونەوەو بوونە (ئەندام) تێیدا لەدەرەوەی شاری مەهاباد لەسەر گردی (خواپەرست) بەبیانوی رێکخستنی گەشت و گەڕان، لەسەر شێوەی کۆنفرانسێکی حزبی کەتێیدا لیژنەی ناوەندی حزب هەڵبژێردرا. لەواقیعدا کۆمەڵەی (ژ.ك)ی سیاسی نیشتمانی یەکەم کۆمەڵەی کوردیی جەماوەری بوو کە نیشتمانپەروەرانی کورد دایمەزرێنن و سەرکردایەتی بکەن کەلەناوجەرگەی جەماوەری کوردییەوە هەڵقوڵابن، چونکە هەتا لەحزبی –هیوا–ی نەتەوەیی میللیشدا کوڕی خاوەن موڵکەکان و پیاوانی بوژوازی کوردی دەسەڵات و پلەو پێگەیان هەبوو تێیدا، وێڕایی سەرکردایەتیە تاکە کەسیەکەی، کە پێکهاتبوو لە (سەرۆك) خوالێخۆشبوو رەفیق حیلمی و تێیدا خاوەن موڵکەکان و سەرۆك هۆزەکان هەبوون، ئەمە لەکاتێکدا کۆمەڵەی (ژ.ك) بنکەکەی پێکهاتبوو لە جەماوەری شارو گوند– کاسبکاران، خوێندکاران، خوێنەواران، پیاوانی ئاینی و، جوتیاران و، زەحمەتکێشان– هەروەها سەرکردایەتیەکەشی میللی بوو دیارترینیان تێکۆشەری جەماوەریی عەبدولڕەحمان زەبیحی بوو[١٠٧] کە رۆشبیرێکی تێکۆشەری ناوجەرگەی جەماوەری میللیە هەروەك چۆن (ژ.ك) یەکەم کۆمەڵەی سیاسی کوردییە رەخنەی لەرژێمی دەرەبەگایەتی گرت و سوکایەتی بە سەرۆك هۆزە چاوچنۆکەکان

---

[١٠٧] – عبدالرحمن زبیحیی تێکۆشەرو شۆڕشگێری جەماوەری ئامادەباش، لەجەرگەی جەماوەری میللییەوە هەڵقوڵاوە وەك تێکۆشەرێکی خۆپێگەیەن خۆی بەخۆی پەروەردەو رۆشنبیر کردبوو. هەر لەلاویەوە بەشداری لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا کردووەو یەکێك بووە لەچالاکترین دامەزرێنەرانی (ژ.ك) و پارتی دیموکراتی کوردستان و ئەندامێکی ناسراوە لەهەردوو سەرکردایەتیاندا. دوای روخانی کۆماری کوردستان رویکردە عێراق و لەگەڵ پارتیدا کاری کرد، پاشان ناچاربوو کۆچ بکات بۆ سوریا کە لەوێ بەخۆحەشاردان ژیاو پاشان خۆیی پەنهان کردو تێکۆشا بۆ دروستکردنی هۆشیاریی نیشتمانی کوردی لەسوریاو تورکیا. دوای شۆڕشی ١٤/تەممووز گەڕایەوە بۆ عێراق و لەناو پارتی و لەرۆژنامەی خەبات و پاشان رۆژنامەی کوردستاندا کاریکرد، لەکۆنگرەی چوارەمدا بە ئەندامی لیژنەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان هەڵبژێررا و لەکۆنگرەی پێنجەمیشدا هەڵبژێرایەوەو ئێستا ئەندامی مەکتەبی سیاسیە، زمانی کوردی و فارسی و تورکی و عەرەبی دەزانێت و، بە فەرەنسی و ئینگلیزی قسە دەکات و کەمێکیش روسی دەزانێت.

کردو، خیانەتی بەشێکی سازشکارانی ئاشکراکرد، کۆمەڵی (ژ.ك) هەوڵیداو سەرکەتووش بوو لەسەرەتاوە لەنەهێشتن و پاکتاوکردنی رۆڵی سەرۆك هۆزەکان لەبزوتنەوەی کوردیداو گۆڕینی بۆ بزوتنەوەیەکی میللیی فراوان بەوشێوەیە بیرۆکە نیشتمانیەکان لەناو ریزەکانی جەماوەردا رۆچوو بنجی داکوتا بەوەش دەسکەوتێکی نیشتمانی گرنگی بەدەستهێنا، کۆمەڵەکە بەشێوەیەکی دروست تێگەیشت لەسروشتی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان و سودی لە هەلۆیستی یەکێتی سۆڤیەتی دۆستانە وەرگرت لەبەرامبەر کوردو کوردستاندا. مەسەلەی کوردی بەشێوە نوێیەکەی خستەڕوو بەو پێیەی مەسەلەی میللەتێکی زوڵملێکراوی چەوساوەیە، بەڵام نەبوونی تیۆرێکی کرداریی کەوا ببێتە میتۆدێك بۆ کۆمەڵەکەو لەژێر رۆشناییەکەیدا سیاسەت و هەڵوێستە جۆراوجۆرەکانی خۆی و شێوازەکانی خەبات و تێکۆشانی خۆی دیاری بکات و پێنەگەیشتنی زۆرینەی سەرکردەکانی لەرووی سیاسی و فکریەوە بووە هۆی ئەوەی کە هەندێك لە خاوەن موڵك و قەڵەمڕەوەکان بێنە ناو حزبەکەوەو دوای ئەوەش بەیارمەتی شەهید قازی محەمەد[١٠٨] بازیان پێدان بۆ ناوەندی سەرکردایەتی لەحزبداو پاشانیش بۆ حکومەتی دیموکراسی کوردستانیش.

لەژێر کاریگەری ئارەزومەندیی بۆ بەدەستهێنانی سۆڤیەت و یارمەتیدانیان بۆ بزوتنەوەی کوردیی و ، بەهۆی لاوازی ئاستی زانستی و تیۆریی سەرکردایەتی (ژ.ك)ەوە کۆمەڵەکە قازی محەمەدی وەرگرت بێتە ناو ریزەکانیەوە سەرەڕای ناڕەزایی هەندێك لەهۆشیارەکان لەسەرکردایەتی کۆمەڵەکەدا کە هەستیان بەمەترسی زاڵبوونی کەسایەتی قازی محەمەد کردبوو لەکۆمەڵەکەدا بەتایبەتی کە ئەو لەلایەن سۆڤیەتەوە لایەنگریی لێدەکرا.

---

[١٠٨] – پرۆفیسۆر بوخارد برینتیس لەبارەی ئەم بابەتەوە دەڵێت:

" هاتنەناوەوەی پیاوماقوڵانی شارەکان بەسەرکردایەتی قازی محەمەد بووە هۆی وەستاندنی زۆرێك لەئاراستە شۆڕشگێڕیەکانی (ژ.ك). بەهۆی ئەوەشەوە کە سەرکردایەتی کەوتە دەست سەرۆك هۆزەکان و دەرەبەگەکان ریبازەکەیان– رێبازی حزبی دیموکراسی کوردستان کە لەخودی (ژ.ك)ەوە بەرهەم هاتبوو – بەتاڵیان کردەوە لە داخوازییە کۆمەڵایەتیەکان" بگەڕێرەوە بۆ توێژینەوەکەی پرۆفیسۆر کە پێشتر ناومان هێنا.

لەڕاستیشدا گومانی ئەو دەستە هۆشیارەی (ژ.ك) هاتەدی و هەر لەدوای ئەوەی قازی محەمەد چووە ناو کۆمەڵەکەوە لەساڵی (١٩٤٤) زاڵبوو بەسەر ڕێکخراوەکەو بەسەر هەموو دەزگاکانی و چالاکیەکانیدا بەهۆی کەسایەتیە بەهێزەکەی و ناوەندە کۆمەلآیەتیەکەی و جەماوەرەکەی و هەروەها پشتیوانکردنی لەلایەن سۆڤیەتەوە.. قازی محەمەد بووە سەرۆك و ئاراستەکەری حزب. بەئامۆژگاریکردنی هاوڕێیەکی– جەعفەر باقرۆف[109]–ی سەرۆکی کۆماری ئازربایجانی سۆڤیەتی هەستا بەگۆڕینی (ژ.ك) بۆ حزبی دیموکراتی کوردستان، ئەوەش لەسەر شێوەی گۆڕانی لقەکانی حزبی تودە بۆ حزبی دیموکراتی ئازربایجان لەئازربایجانی ئێرانی و شەهید قازی محەمەد بووە سەرۆکی حزب و ئاراستەکەری و سەرۆکی هەموو چالاکیەکانی و سیاسەتەکانی و سەپاندنی لیژنەیەکی ناوەندیی نوێ کە ئەندامەکانی خاوەن موڵکەکان و سەرۆك هۆزەکان یان پیاوانی ئایینی بوون لەگەڵ هەندێك لەئەندامە کۆنەکان لەسەرکردایەتی (ژ.ك) نمونەی عەبدولڕەحمان زەبیحی.

---

[109] – جەعفەر باقرۆف ئەندامی لیژنەی ناوەندی حزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی و سەرۆکی کۆماری ئازربایجانی سۆڤیەتی بوو لەگەڵ لافرنتی بیریا لەساڵی ١٩٥٤ بەتۆمەتی ئەنجامدانی چەندین تاوان و هەڵەی ترسناك کە بەشداریکردبوو لەئەنجامدانیدا لەسێدارەدرا ئەو سیاسەتەی کە باقرۆف کێشابوی بۆ سۆڤیەت بۆ ئەوەی پێی مامەڵە لەگەڵ ڕەوشی کوردستاندا بکرێت سیاسەتێکی هەڵەبوو لەسەر ئەو بونیادنرابوو کە کۆمەڵگەی کوردستانی کۆمەڵگەیەکی عەشایەریەو پیاوانی ئایینی دەسەلآت و قەڵەمڕەویەکی مەزنیان هەیە تێیدا، بۆیە هەوڵیاندا سەرکردایەتیەك دروست بکەن بۆ بزوتنەوەی کوردی کە لەم ڕەگەزانە پێکهاتبێت و نکوڵیان کرد لەو پەرەسەندنانەی کە لەبزوتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردیدا ڕویاندابوو وە گۆڕابوو بۆ بزوتنەوەیەکی میللی. ئەم سیاسەتە هەڵەیەی سۆڤیەت کە دواتر باقرۆفی نەخشەکێشی تاوانبارکرا هەوڵیدا کە سەرکردایەتیکردنی قازی محەمەد بسەپێنێت بەسەر حزبی دیموکراتی کوردستانی لەئێران و هەروەها سەپاندنی مەلا مستەفای بارزانی (کە لەسەرۆك هۆزەکانی بارزانە) بەسەر پارتی دیموکراتی کوردستان لەکوردستانی عێراقدا.

ئەمە لەکاتێکدا ئەرکی مەبدەئی ئەوە بوو کە پشتیوانی لە ڕێکخراوە میللیە کوردیەکان بکات بەرەو پەرەسەندن بۆ حزبی دیموکراتی کوردستانی و هاندانی ئەم کەسایەتی و پیاوماقوڵە کوردیانە بۆ ئەوەی لەبزوتنەوەی کوردیدا بەشداری بکەن بێ ئەوەی بیانسەپێنێت وەك سەرکردەی تاکڕەو، هەوڵبدات بۆ دروستکردنی کادیری میللی شۆڕشگێڕی. هەروەها بەشداریکردن لە پەروەردەکردن و مەشقپێکردنی ئەم کادیرانە و یارمەتیدانیان بۆ ئەوەی بە ئەرکە نیشتمانیەکانیان هەستن.

ئەم وەرچەرخانە رێکخراوە لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا بەتەنیشت لایەنە ئیجابیە گرنگەکانی و دەستکەوتە نیشتمانیە ترسناکەکانیەوە، لایەنێکی سلبیشی هەبوو ئەویش گێڕانەوەی باڵی عەشیاریی (ئایینی)بوو بۆ سەرکردایەتیکردن لەبزوتنەوەی نیشتمانی کوردیداو پێدانی سەرکردایەتیکردنی بەهەندێکیان، کە مێژوو سەلماندویەتی ئەم دەستە کۆمەڵایەتیە ناتوانن هەستن بەسەرکردایەتیکردنی هەروەها بەحوکمی رەوشە نوێیەکانیشەوە لەکوردستاندا، ناتوانێت بچێتە ژێر ئەو بارە قورسەوەو پێی هەستێت تەنها کەسانێکی شۆڕشگێڕو میللی بەئەزمون نەبن لەبواری تێکۆشانداو بەئاگاو هۆشیاربن و تیۆرێکی زانستی شۆڕشگێڕیی رێنیشاندەریان بێت بۆیە ئەم هەنگاوە گەڕانەوەو کۆنخوازی بوو لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیداو پاشانیش لاوازکردنێك بوو بۆی لەمەودای ستراتیژی دووردا.. هەروەك چۆن سەپاندنی شەهید قازی محەمەد و سەپاندنی سەرۆك هۆزێك لەعێراق بەشێوازە فەرمانیەکە بانگدانێك بوو بۆ ئەنجامدانی گۆڕانێکی ترسناك بەشێوازێکی نادیموکراسیانە، هەروەك چۆن سەرەتایەك بوو بۆ زۆرداریی – تاکە سەرۆك– و دیکتاتۆریەتی تاك هەروەك چۆن گێڕانەوەی باڵی عەشایەری بۆ سەرکردایەتیکردنی حزبی پێشڕەوی لەگرنگترین هۆکارەکانی لاوازی و لەگەورەترین ئاستەنگەکان بوون لەبەردەم پەرەسەندنی و گەشەکردنیداو پاشانیش لەبەردەم چوونیدا بەرەو سەرکەوتنی تەواوەتی.

ڕاستە گۆڕانی (ژ.ك) بۆ حزبی دیموکراتی کوردستان لەرووی بنچینەو بنەماوە، کارێکی ڕاست و دروست بوو پێویست بوو لەو کاتەدا لەبزوتنەوەی رزگاریخوازیی کوردیدا ئەنجام بدرێت و بگونجێت لەگەڵ رادەی پەرەسەندنی و داخوازیەکانی سەرکەوتنیدا، بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی زۆر پێویستی بەحزبێکی پێشڕەوی شۆڕشگێڕیی بوو، بە حزبێکی دیموکراسی لەجۆرێکی نوێ، بتوانێت هێزەکانی گەل و جەماوەرەکەی و سەرکردایەتیەکەی رێکبخات لەخەبات و تێکۆشانی رزگاریخوازیی و دیموکراسیدا.

بەڵام سەپاندنی سەرکردایەتیەکی خاوەن مۆرکێکی عەشایەریی– یان ئایینی– بەسەر حزبی پێشڕەودا دژ دەوەستێتەوە لەگەڵ سروشتی حزبی پێشڕەوداو دەبێتە ئاستەنگ لەبەردەم ئەوەی هەستێت بەکارەکانی و رۆڵ و ئەرکە ترسناکەکانی بەباشی بگێڕێت،

ئەمە لەکاتێکدا کە دەکرا پارمەتی (ژ.ك) و رێکخراوە دیموکراسیەکان لەکوردستانی عێراق بدرایە بۆ ئەوەی بگۆڕانایە بۆ حزبی پێشەنگ و پێشڕەو لەبری گرتنەبەری ئەو رێوشوێنانەی کە بزوتنەوەی نیشتمانی رزگاریخوازیی کوردی زۆری بەدەستەوە نالاند. بەتایبەتی ئەو پەرەسەندنە گرنگانەی کە لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا رویاندا لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا پارمەتیدەر دەبوون لەوەی بەئاراستەی دروست برۆیت..

***ئەو پەرەسەندنانەش چی بوون؟***

لەکاتی جەنگی جیهانیداو دوای فراوانبوونی پرۆسە بازرگانیەکان و سەرهەڵدان و فراوانبوونی پیشەسازی نەوت و دەرکەوتنی هەندێك لەئامێری نوێ و زیادبوونی ژمارەی کرێکاران و رۆشنبیران و خوێنەواران لەکوردستان و چالاکبوونی بازاڕی ناوخۆیی و پەیوەستبوونی بە بازاڕی سەرمایەدارییەوە بەشێوەیەکی توندوتۆڵ و گەشەکردنی چینی ناوەندو کاسبکار لەکوردستان و، بلاوبونەوەی هەژاریی و نەداریی و ئەوەی لەئاکامی جەنگ دەکەوێتەوە لەنەهامەتی و ناڕەحەتیەکان لەناو ریزەکانی جەماوەری میللیداو بەکاریگەری بلاوبونەوەی بیرۆکە دیموکراسیەکانی دژ بە فاشیزم و، بیرۆکە پێشکەوتنخوازیەکان و مەزن بوونی بزوتنەوەکانی ئازادی لای نەتەوە ئەوروپیەکان و ئاسیایی و ئەفریقیەکان و فراوانبوونی بزوتنەوەی چینی کرێکاری جیهانی، بیرۆکەکانی دیموکراسیەت و پێشکەوتنخوازی لەناوەندەکانی خوێنەواران و کاسبکارانی کورد دا بلاوبووەوەو بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردییش لەو پێوەن بوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیش هەروەها فراوان بێت و بەهێزبێت و ببێتە بزوتنەوەیەکی خاوەن ئامانجی دیموکراسی و ریشەکانی بەقولایی کۆمەڵگەی کوردستاندا رۆبچێت و دروشمەکانی و ئامانجەکانی لەناو ریزەکانی جەماوەری میللی کوردیدا بنج دابکوتێت کە بووە بنکەیەك بۆ بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی و پاڵپشتی و سەرچاوەی ئۆرگانیەت و چالاکیەکانی.. مایەپوچبوونی ئەو دەستە کوردیەش کەدەسەلاتیان بەدەستەوە بوو سازشکاربوون لەگەڵ داگیرکەران و زەوتکەرانداو ڕوو هەڵماڵرانیان لای نیشتمانپەروەرانی کوردو لەنێو میللەتدا بواری کردەوە بۆ دەستەیەکی

دیموکراسی شۆڕشگێر کە لەناو جەرگەی جەماوەری میللیەوە هەڵقوڵابوون بۆ ئەوەی سەرکردایەتیکردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیی بگرنە دەست.

بۆیە هەروەها رەفتاری ئەم شێوازە بیرۆکراسیە لەسەپاندنی سەرکردەکان بەسەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیداو لەگەڵیشیاندا دەستەو تاقمە عەشایەریەکان یان خاوەن موڵکەکان دژ دەوەستایەوە لەگەڵ ئەم پەرەسەندنانەداو رەتکردنەوەی ناوەڕۆکەکەی بوو وە دژ بوو لەگەڵ پەرەسەندنە خودییەکانیداو پاشانیش کۆنخوازی بوو لەباشترین حاڵەتەکاندا دروستکردنی دوو فاقیەك دەگەیەنێت لەسەرکردایەتیکردنی رزگاریخوازی گەلی کوردیدا موڵکدارەکان و سەرۆك هۆزەکان بەتەنیشت رۆشنبیران و شۆڕشگێرانی زەحمەتکێشەوە سەرکردایەتیکردنی بزوتنەوەکەیان گرتە دەست، کە زۆربەی جار تای تەرازوی بەهێزو قەڵەمڕەو داراکان و شوێنکەوتوان و چەك زاڵبوو بەسەر تای- خاوەنانی فیکرو قەڵەمدا- هەژاران و زەحمەتکێشەکان، بەتایبەتی لەکاتی بزوتنەوە شۆڕشگێڕیەکان و چەکداریەکاندا، ئەمەش بەتەواوەتی ڕوویدا دوای ئەوەی کە (ژ.ك) گۆڕا بۆ حزبی دیموکراتی کوردستان لە نۆڤەمبەری ١٩٤٥- دوای دانانی قازی محەمەد بەسەرۆکی و سەپاندنی سەرکردایەتیەکەی کە زۆرینەی لە موڵکدارو بازرگانەکان بوون[١١٠] دەسەلات و هەژمونی خۆیی سەپاند بەسەر کۆماری دیموکراتی

---

[١١٠] - لەسەرنجدانێك لە ئەندامانی لیژنەی ناوەندی حزب و سەرکردەکانی کۆمارەکەدا ئەم راستیە روون دەبێتەوە کە بەمشێوەیەی خوارەوە بوو:

١- قازی محەمەد- زانای ئایینی و موڵکدار- سەرۆکی حزب و کۆمار.

٢-حاجی بابە شێخ- پیاوی ئایینی موڵکدار. سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران

٣-محمد حسین سیف قازی- خاوەن موڵك- جێگری سەرۆك وەزیران و وەزیری بەرگری.

٤-مناف کەریمی- خاوەن موڵك و بازرگان- جێگری سەرۆك وەزیران و وەزیری مەعاریف.

٥- سەید محمد ئەیوبیان- دەرمانسازی ئەهلی- وەزیری تەندروستی.

٦-عەبدولڕەحمان ئاغا ئێلخانی زادە- موڵکدار- وەزیری بەرگریی.

٧-ئیسماعیل ئاغا ئێلخانی زادە- موڵکدار- وەزیری گەیاندنەکان.

٨- ئەحمد ئیلاهی- بازرگان- وەزیری ئابوریی. .

٩- خلیل خسروی- بازرگان- وەزیری کار.

١٠- کەریم ئەحمدیان- فەرمانبەری حکومی- وەزیری بروسکەو تەلەگراف و تەلەفون.

کوردستاندا کە شەهید قازی محمد لەکۆبونەوەیەکی جەماوەری گەورەدا رایگەیاند کە لە ٢٢ کانونی دووەم ١٩٤٦ لەگۆڕەپانی چوارچرادا بەسترا، هەمان ئەو گۆڕەپانەیە کە قازی محەمەدو کۆمەڵێك لە سەرکردەکانی کۆمارەکە لە کۆتایی مارتی- ١٩٤٧دا تێیدا لەسێدارە دران دوای گەڕانەوەی هێزەکانی داگیرکەری ئێرانی.

بەلای منەوە کۆماری کوردستان کە پایتەختەکەی مەهاباد بوو، بەو خێراییەو بەبێ بەرگریکردن نەدەڕوخا ئەگەر پێکهاتە سەرکردایەتیەکەی جەماوەریی شۆڕشگێڕیی بوایەو حزب و حکومەت لەلایەن سەرکردایەتیەکی شۆڕشگێڕەوە ببرایە بەڕێوە کە لە جەماوەری میللیەوە هەڵقولابوایە، سەرکردایەتیەکی هۆشیارو بەئەزمون لەخەباتی شۆڕشگێڕیی ڕێکخراودا، کە پشت بە هێزە زەحمەتکێشەکانی گەل ببەستێت و، ئامۆژگاریەکانی باقرۆف بەئایەتێکی دابەزیو نەزانێت کە نابێت سەرپێچیان لێبکرێت.

مێژوو جارێکی تر جەختی لەو ڕاستیە کردەوە کەوا زۆرو گران لەسەر گەلی کوردی کەوت ڕاستی نەتوانایی و دەستەوسانی دەستەی موڵکدار لەسەرکردایەتیکردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی هەتا ئەگەر لەدەرەوەش پشتیوانی لێبکرێت، بەڵکو جەماوەری میللی کوردستانی بریتیە لەهێزە بنچینەیی و سەرەکیەکان لەم بزوتنەوەیەدا نەك یارمەتیەکان و پشتیوانی دەرەکی- لەگەڵ ئەو بایەخەی هەیەتی و ڕێزو پێزانینی گەلی کوردی بۆی- کەتەنها فاکتەرێکی لاوەکیە لەفاکتەرەکانی سەرکەوتن و بردنەوە، تەنها فاکتەرێکە بۆ پشتیوانی ئەم هێزە بنچینەییە و چالاککردنی کاروکردەوەکانی و ئاسانکاریی تێیدا و نابێتە ئەلتەرناتیڤێك بۆی.

---

١١-حاجی مصطفی داودی- بازرگان- وەزیری بازرگانی.

١٢-محمد ئەمین معینی- بازرگان- وەزیری ناوخۆ.

١٣-مەلا حسێن مجدی- ئیمامی مزگەوت- وەزیری داد.

١٤- محمود ولی زادە- کوتاڵ فرۆش- وەزیری کشتوکاڵ

١٥- عبدالرحمن زەبیحی.

١٦- محمد ئەمین شریف بگەڕێرەوە بۆ کتێبی (The Kurdish Republic of ١٩٤٩.) بەپێنوسی William Eagleton Jr.

لەگـەڵ ئـەم کەموکورِیانـەش لـە سـەرکردایەتی حزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانیدا ئـەوا دامەزراندنی لاپەڕەیەکی نوێی کردەوە لەخەباتی ڕێکخراوی گەلی کورد داو، سەردەمێکی نوێ تێیـدا دەسـتی پێکـرد، کـە سـەردەمی ڕێکخـستنی حزبـە پێـشڕەوە دیموکراسـیە کوردسـتانیەکانە، بـەوەش ئـەو بنکـە دروسـتە پتـەوەی جێگیرکـرد بـۆ ڕێکخـستنی بزوتنـــەوەی ڕزگـــاریخوازی نیـــشتمانی لەکوردســـتان، هـــەروەك چـــۆن هـــەڵقولآنی وەلآمدانەوەیەکی لۆژیکی بوو بۆ پێویستیەکی مێژوویی، پێویستی دۆزینـەوەی حزبێکـی پێشەنگ و پێشڕەو لەکوردستان.. ئەم حزبەش دەستکەوتی گـەورەی هـەبوو لەوانـەش ڕاگەیانـدنی کۆمـاری کوردسـتانی دیمـوکراتی و هانـدانی شۆڕشـگێڕانی کـورد- لـەژێر کاریگەری دەرئەنجامەکانی دامەزراندنی ئەم حزبەداو چالاکیەکانی لەکوردستانی عێراق- حزبی دیموکراتی کـوردی- عێراقـی- کـە دواتـر ناوەکـەی گـۆڕا بـۆ -حزبـی دیمـوکراتی کوردستان- هەروەك چـۆن پەیـدابوونی حزبەکـە وەك حزبێکـی دیمـوکراتی پێـشڕەو بـۆ کوردستان خاوەن پەیڕەوێکی ڕوونە و سەرەتایەکە بـۆ سـەردەمی خـەباتی ڕێکخـراو بـۆ بـەدیهاتنی ئامانجـە ڕوون و دیاریکراوەکـانی لەکوردسـتان بـەووتن و بـەکارو کـردەوەش گرنگترینی خاڵەکانی ئەم پەیڕەوەش ئەمانە بوو[١١١]:

١- -پێویـستە گـەلی کـورد لـەئێران حکومـەتێکی خودموختـاری هـەبێت کاروبـارە کارگێڕیەکانی و نەتەوەییەکانی تری ڕاپەڕێنێت.

٢- -پێویستە زمـانی کـوردی زمـانی فـەرمی بێـت و، پێویـستە لەپرۆسـەی خوێنـدندا بەکاربهێنرێت.

٣- -پێویستە خێرا بکرێت لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی یاساداناندا بۆ کوردسـتان بـەپێی دەســـتوری ئێرانـــی، هـــەروەها پێویـــستە مومارەســـەی دەســـەڵاتەکانی بکـــات لەسەرپەرشتیکردنی کاروبارە گشتیەکاندا.

٤- -فەرمانبەرەکان لەکوردستان لەکوردەکان دەبن.

٥- -ئـەو داهاتانـەی لەکوردسـتان کۆدەکرێنـەوە پێویـستە هـەر لەکوردسـتاندا خـەرج بکرێن.

---

[١١١] - هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٥٧ چاپە ئینگلیزیەکەمەکە.

٦- -حزبی دیموکراتی کوردستان هەوڵدەدات بۆ بەرپاکردنی باشترین پەیوەندیی برایانە لەگەڵ گەلی ئازربایجانی و ئەو کەمایەتیانەی لەگەڵیدا دەژین.

٧- -حزبی دیموکراتی کوردستان تێدەکۆشێت بۆ گەشەپێدان و چاککردنی کاروبارە رۆشنبیری و تەندروستی و رەوشە ئابوریەکانی گەلی کوردی و گەشەپێدان و فراوانکردنی فێرکردن و تەندروستی گشتی و بازرگانی و کشتوکاڵ.

بەوشێوەیە دەبینین کە پەیرەوی نیشتمانی روونی حزبی دیموکراتی کوردستان- سەرەرای کەموکوریەکانی لەبوارەکانی چاکسازی کشتوکاڵی و پیشەسازیدا- یەکەم بەرنامە و پەیرەوی دیموکراتی روونە حزبێکی کوردستانی پێشکەشی بکات و کۆمەڵێك ئامانجی کۆمەلأیەتی و رۆشنبیری و تەندروستی لەخۆگرتبێت. حزب پەیرەوە رۆشنبیریەکەی بەدیهێنا بەکردنەوەی خوێندنگەکان بەزمانی کوردی و خوێندنی مێژوو و ئەدەبی کوردی بۆ یەکەمجار لەمێژووی نوێداو هەروەها رۆژنامەی کوردستانی بەزمانی کوردی دەرکردو خانەیەکی بۆ چاپ و بلأوکردنەوە لە مەهابادی پایتەخت دامەزراندو شاندێکی رۆشنبیریی نارد بۆ یەکێتی سۆڤیەت لەساڵی ١٩٤٦ و حزب بنکەیەکی تۆکمەو پتەوی دانا بۆ پەیوەندییە برایەکان لەکردنەوەی- دەروازەی دۆستایەتی سۆڤیەتی - کوردی و لە دانانی رێساو بنەمایەکی پتەو بۆ ئەم دۆستایەتیە، بەمەش کاری باش و شوێنەواری نەمری بەجێهێشت لەماوەی دۆستایەتی سۆڤیەتی کوردیدا، نەریتێکی نەمر کرد بۆ گەلی کوردمان، بەوەش حزب یەکێتیەکی نایابی بەدیهێنا کەئەوکات و ئائێستاش سود بە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیمان دەگەیەنێت هەروەك چۆن حزب بەشداریکرد لەپێوەنکردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کرودی بەبیرۆکەی مارکسی- لینینی و بلأوکردنەوەی بیروبۆچونەکانی لەنێوان رۆشنبیرانی کورد دا و لەریزەکانی خەباتگێرانی حزبە پێشکەوتنخوازیە کوردستانیەکاندا.

بوونی حزب و دەسکەوتەکانی و تێکۆشانەکانی و هەستانی بەدامەزراندنی کۆماری کوردستان بووە هۆی زیندوکردنەوەی هەستی نیشتمانی لای گەلی کورد لەچوارچێوەی هەموو کوردستاندا، بەمەش بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی فراوانکردو بەشداریکرد لەوەدا کە بیکاتە بزوتنەوەیەکی میللی و جەماوەریی، ئەمەش لەلایەکەوە داگیرکەران و

زەوتكەرانی كوردستانیان لەعێراق و توركیا ترساندو، لەلایەكی تریشەوە هانی ناوەندە نیشتمانیە كوردییەكانی داو بەشداریكرد لەبەرزكردنەوەی مەعنەویات و ڕۆحی شۆڕشگێڕانەیان و هاندانیان بۆ ئەوەی بەوپەڕی تواناو هیمەتیان تێبكۆشن لەمەیدانی تێكۆشانی شۆڕشگێڕانەدا، هەروەك چۆن لەدڵ و دەرونی كوردەكاندا رق و كینەی ورووژاند لەدژی داگیركەرانی ئینگلیزو هاوپەیمانەكانیان و داردەستەكانیان ئەوانەی كەلەدژی گەلی كوردی و بزوتنەوە دیموكراسیە نوێیەكەی وەستانەوەو بەشداریكرد لەئاشكراكردنی هەموو داگیركەران بەوپێیەی كە دوژمنی سەرسەختی بزوتنەوەی رزگاریخوازی كوردین ئەمەش یارمەتیدەر بوو لەخێرایكردن لە ڕاگەیاندنی مایەپووچ بوونی – ئەو دەستەو تاقمە كوردییە كەوا دەسەلاتداربوون– و سەر بە بەریتانیا بوون یان داوای سازشیان دەكرد لەگەڵ ئەو و لەگەڵ داگیركەرانی تردا.

هێشتاش بزوتنەوەی رزگاریخوازی كوردی لەكوردستانی خۆرهەلات ئەو بزوتنەوەیەی لەخۆگرتووە كە حزبی دیموكراتی كوردستان رێكیخست و سەركردایەتی كردو مۆركی ئەو بزوتنەوەیەو دەسكەوتەكانی و شوێنەوارەكانی ئەوی پێیەوەیە.

## پەرەسەندن لەکوردستانی عێراق

بەلآم لەکوردستانی عێراق بیرۆکە دیموکراتی و پێشکەوتنخوازیەکان کە لەکاتی جەنگدا بلآوبوونەوەو ئەو گۆڕانکاریانەی لە کۆمەڵگەی کوردستانیدا رویانداو پێشتر ئاماژەم پێکردن، بەشداریان کرد لە پەرەپێدانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردیدا بەتایبەتی دوای دامەزراندنی حزبی شیوعی کوردستانی عێراق کە بەناوی رۆژنامەکەیەوە ناسرا- شۆڕش- و (حزبی رزگاری کورد) حزبی شیوعی لەکوردستانی عێراق لەپایزی ساڵی ١٩٤٥ز دامەزرا دوای هەڵوەشانەوەی حزبی شیوعیی عێراق- کۆمەڵەی یەکێتی تێکۆشین- و دابەشبوونی باڵە عەرەبیەکەی بۆ بەشێك کە چوونە ناو حزبی شیوعی عێراقی هەڵبژاردو، بەشێکی تری چووە ناو حزبی (الشعب) گەل، بەلآم باڵە کوردییەکەی حزبی شیوعی لەکوردستانی عێراق دامەزراند[١١٢] لیژنەی ناوەندی حزبی شیوعی

---

[١١٢] - مامۆستا صالح حەیدەری سکرتێری -شۆڕش- لەدەستنوسی یادەوەریەکانیدا دەگێڕێتەوە دوای ئەوەی رێکخراوی یەکێتی تێکۆشین هەڵوەشایەوە باڵە کوردیەکەی ئەو رێکخراوە (یەکێتی تێکۆشین) دەستیکرد بە دانوستان لەگەڵ خوا لێخۆش بوو (فەهد) بۆ ئەوەی بچنە ناو حزبی شیوعیەوەو دەڵێت کە دوای چاوپێکەوتن لەنێوان شاندێکی لقەکە کە پێکهاتبوو لە صالح حەیدەری و عەلی عبدالله و نافع یونس و خوا لێخۆش بوو فەهد زەکی بەسیم لەلایەنی حزبی شیوعیەوە، ڕای سەرکردەکانی - یەکێتی تێکۆشین- لەسەر ئەوە جێگیربوو کە رێکخراوەکەیان چاکبکەنەوە چونکە خوالێخۆشبوو فەهد وەلآمی داواکاریەکانیانی دایەوە سەبارەت بەچۆنیەتی رێکخستنی لقی کوردی حزبی شیوعی کەبەمشێوەیە بوو- ئێوە واتە لقی ئێوە بەشێکن لەئەسڵ و بنچینە واتە لە- رێکخراوی یەکێتی تێکۆشین، مادام ئەسڵ و بنچینە بێ هیچ مەرجێك خۆیی هەڵوەشاندەوەو مادام لقیش سەر بە بنچینەو سەرچاوەیە ئەوا مەسەلەو رەوشەکە بەو شێوەیە کە ئێوە وەك تاك پەیوەندیتان کردووە بەحزبەوە بێ هیچ کۆت و مەرجێك واتە ئێمە سەرپشکراو نین بۆ وتووێژکردن لەسەر ئەم مەسەلەیە و ووتی- ئەم بڕیارە دراوە و مشتومڕ لەبابەتەکەدا ناکرێت" ئەمە ئەوەیە کە مامۆستا حەیدەریی دەیگێڕێتەوەو هەروەها دەڵێت: فەهد ڕایەکی خۆیی خستۆتە بەردەمیان کە ئەوە دەگەیەنێت حزبێکی جەماوەری کوردی دروست بکرێت هەموو دڵسۆزانی کورد لەنیشتمانپەروەران و نەتەوەییەکان و دیموکراتیەکان لەخۆبگرێت". پاشان بەردەوام دەبێت و دەڵێت " لە پایزی ١٩٤٥ گەڕاینەوە- مەبەستم خوێندکارە کوردەکانی کۆلیژەکانە کە خۆشم یەکێك بووم لەوان- بۆ بەغدا و بڕیارماندا رێکخراوەکەمان کە پێشتر بەیەکێتی تێکۆشین ناسرابوو لقێك بوو سەر بەکۆمەڵی یەکێتی تێکۆشین بوو بگۆڕین بۆ - حزبی شیوعی لەچوارچێوەی کوردستاندا کاربکات" و دامەزراندنی حزبێکی جەماوەری دیموکراتی تر بۆ ئەوەی بتوانین سەرکردایەتی بزوتنەوەی نەتەوەیی دیموکراتی

لەکوردستانی عێراق پێکهاتبوون لەم بەرێزانە:- صالح حەیدەری-سکرتێری حزب-عەلی عەبدوڵلا و رەشید عەبدولقادر و عەبدولصەمەد محمد و نافع یونس و کەریم توفیق و نوری محمد ئەمین کە هەر هەموویان لەرۆشنبیرانی کوردبوون ئەوکات زۆربەیان خوێندکاربوون. وە بەدەستپێشخەری و سەرپەرشتی حزبی شیوعی لەکوردستانی عێراق- حزبی - رزگاری کورد- دامەزرا کە رۆژنامەی -رزگاری بەزمانی کوردی دەرکرد -شۆڕش- بانگەوازێکی بۆ کوردەکانی عێراق دەرکرد کە پەیوەندی بکەن بە -حزبی رزگاری کورد-ەوە دوای رێکەوتنی لەگەڵ هەندێك لە نیشتمانپەروەرە کوردەکانی نمونەی مامۆستای شەهید عەلی حەمدی و دکتۆر جەعفەر محمد کەریم و پارێزەر رەشید باجەلان و ئەوانی تر بۆ دامەزراندنی ئەم حزبە ئەمەی خوارەوەش دەقی بەیاننامەی شۆڕشە لەم بارەیەوە[113]

لەکوردستانی عێراق بکەین" مەبەستیشی لەوە (حزبی رزگاری کورد)بوو کە شۆڕش دایمەزراند وەك چۆن لەشوێنێکی تردا باسی لێوە دەکەین.

[113] - لەکتێبی (قاسم والاکراد) -خناجر وجبال- بەرێز ئەحمەد فوزی وەرگیراوە کە بەیاننامەکەی لەکتێبی-نضال الاکراد-ەوە وەرگرتووە لەکاتی خۆیدا پارێزەری کوردی زەید ئەحمەد عوسمان بەناوی محمد شێرزادەوە بلاویکردوە کە ئەوکات قوتابی بوو لەزانکۆی قاهیرەو لەلاوانی خوێنەواری هەولێرەو ئەندامە پەرلەمان بووە لەپەرلەمانی یەکێتی هاشمیدا. مامۆستا صالح حەیدەری لەدەستنوسی یادگاریەکانیدا باسی ئەوە دەکات سەرکردەکانی -یەکێتی تێکۆشین- کۆبونەوەیەکیان لەماڵی مامۆستا عەلی حمدی لەگەڵ هەندێك لەنیشتمانپەروەرەکاندا سازکرد بەمەبەستی دامەزراندنی حزبێکی جەماوەریی کوردی. حەیدەری دەڵێت ( هەندێك لەئەندامانی حزبی هیواو هەندێك لەسەربەخۆکان هاوکاریان کردین و بریارماندا حزبە نوێیەکە ناوبنێین (حزبی رزگاری کورد) زمانحاڵەکەشیمان ناو نا (رزگاری).

## بەیاننامەی حزبی شیوعی بۆ کوردەکانی عێراق

## یەکبگرن بۆ دامەزراندنی حزبی رزگاری کورد تێبکۆشن بۆ لەناوبردنی پلانەکانی داگیرکەرو کۆنە پەرستیی

لەم رۆژانەدا کە تێیدا جەنگ کۆتایی هات، بەسەرکەوتنی بنـەماکانی ئـازادی و، روخـانی بنـەماکانی هێـزە داگیرکـەرو کۆنەپـەرسـتەکان لەخۆرهـەلآت و خۆرئـاوادا، ئـەویش بـە ئاوابوونی هێزەکانی ولآتە فاشیەکان هەموو نەتەوە بچوك و دیلکراوەکـان لەجیهانـدا کـە خەباتیان کردووە و خـوێنی پاکیـان لـەپێناو پێـشکەوتندا رژانـدووە، چـاوەڕوانەو داوای ئازادیـەکانی و مافـە نەتەوەییـەکانی دەکـات هـەروەها مـافی چـارەی خۆنوسـین بـەپێی رەوشە جیهانیە باوەکان و ئەو بەلگەنامانەی کە ولآتانی یەکگرتوو رایگەیاندون.

بۆیە پێویستە بەباشی ئەوە بـزانین فێـل و تەلەکـەکانی داگیرکـەرو کۆنەپەرسـتی ئێـستا بەهەموو هێزیەوە کـار دەکـات، بۆیـە ئازادیـەکان ناکرێـت سـوکایەتیان پێبکرێـت بـەلکو پێویستە بەهێزی جەماوەری گـەل و نیـشتمانپەروەرە دڵسۆزەکان وەربگیرێـت ئەمـەش بیرۆکەیەکە بەشێوەیەکی کرداری دەرکەوتووە لەزۆرێك لەولآتانی خۆرئاوادا.

بـەناوی –بـەرەی بـەرگری– لەفەرەنـساو –بـەرەی رۆژەکـان– لـەیۆنان و –بـەرەی رزگـارکردنی ولآت– لەیۆگـسلافیا تێکۆشـان و بـەرگری لـەدژی هێـزە کۆنەپەرسـت و داگیرکەرەکان دەستی پێکرد.

نەتەوەی کورد بەپێی پـلان و تـەماحخوازیی داگیرکـەر دابەشـکراوە، پێویـستە لەسـەری تێبکۆشێت لەپێناو بڕیاری چارەی خۆنوسینداو رزگارکردنی کوردستانی گـەورە ئـەویش بـەلابردن و بڕینـی رەگ و ریـشەی داگیرکـەری ئینگلیـزی و خزمـەتکارەکانی، بـە بـەکارهێنانی هێزێکـی رێکخـراو و بەڕێوەبـەر لـەناوەوەی هـەموو ناوچـە کوردیەکانـدا بەشێوەیەك کە تەواو یەکگرتووبن لەنێوان خۆیاندا.

لـەم رۆژانـەدا لـەئاکامی هەوڵـەکانی حزبـی شـیوعی لەکوردسـتانی عێـراق و نیشتمانپەروەرەکانی تر حزبی هەمووان بەناوی –رزگاری کورد–ەوە لەزۆرێك لە کۆمەڵە کوردییە عێراقیە بچووکەکان دروست دەبێت.

لەگەڵ ئەوەی کە حزبی شیوعی پارێزگاری لەقەوارەی خۆی دەکات ئەوا بەشێوەیەکی تەواوەتی هاوکاریان دەکات بۆ گەیشتن بەئامانجە هەنووکەییەکان ئەم حزبە وەك چۆن پێشتر خەباتی کردووە ئێستاش خەبات دەکات و بەردەوامیش دەبێت لەسەری لەپێناو رزگارکردنی ولاتدا.

لەکۆتایدا ئێمە وەك حزبی شیوعی داوا لەجەماوەری گەلی کوردی خۆشەویست دەکەین لەعێراق کاربکەن بۆ پێشخستنی حزبی- رزگاری کورد-و هاریکاری بکەن.

هەروەها بەوپەڕی دەنگی بڵندمانەوە داوا لەهەموو نیشتمانپەروەران دەکەین هیچ تواناو کۆششێك بەفیڕۆنەدەن و سستی نەنوێنن لەبەهێزکردنی حزبی- رزگاری کورد دا-.

## مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی لەکوردستانی عێراق

دوای رێکەوتن لەسەر دامەزراندنی حزبی رزگاری کورد- دەستەی دامەزرێنەری حزب هەستا بە دەرکردنی بەیاننامەیەك تێیدا ئامانجە دوورو قۆناغیەکانی حزبی رونکردەوە، ئامانجی نەتەوەیی دووری ئەم حزبەش رزگارکردن و یەکخستنەوەی کوردستان بوو بەلام ئامانجی قۆناغیی خەباتکردن بوو بۆ رزگارکردنی عێراق لەداگیرکەرو بەدیهێنانی سەربەخۆیی خۆجێیی بۆ کوردستانی عێراق لەچوارچێوەی یەکێتی عێراقیدا ئەمەی خوارەوەش دەقی ئەو بەیاننامەیە کە دەستەی دامەزرێنەر دەریانکردو لەکتێبی- قاسم والاکراد- خناجر وجبال-ی بەرێز ئەحمەد فوزی- وەرگێراوە لا[114].

[114] - لا ١٠٢ لەکتێبی (قاسم والاکراد-خناجر وجبال)ی بەرێز ئەحمەد فوزی- چاپە عەرەبیە یەکەمەکە.

## ( بەیاننامەی حزبی رزگـاری کـورد ) کـە لەلایـەن دەسـتەی دامەزرێنـەرەوە دەرچووە

یەکەم– ئامـانجی بالآمـان: بریتیـە لەیەکخستنەوەو رزگـارکردنی کوردسـتانی گـەورە. لەبەرئەوەی کە ناوەندی حزبیش لەکوردسـتانی عێراقـە ئـەوا ئێمـە خـەبات دەکـەین بـۆ رزگاربوونی عێراق لەدەسەلآت و قەڵـەمڕەوی داگیرکـەرو حکومەتـە کۆنەپەرستەکان کـە هێشتا لەگەورەترین بەربەستەکانە لەرێگەی پێشکەوتنی کوردەکانی عێراقدا بۆ گەیشتن بەئامانجە هەرە گەورەکە ئەویش ئازادی و مافی چارەی خۆنوسینە.

دووەم– هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆی کارگێڕیی بۆ کوردستانی عێراق کە ئەوە هەنگاوێکی گەورەیە بۆ دیاریکردنی چارەنوسی گەلی کوردی.

سێیەم– هەوڵدان بۆ لابردنی هەموو جۆرەکانی چەوساندنەوەو جیاکردنەوەی نەتـەوەیی کەلەبەرامبەر گەلی کوردی و کەمینەکانی تردا پیادە دەکرێت.

چوارەم– هەوڵدان بۆ دۆزینەوەو بەهێزکردنی پەیوەندیەکان لەگەڵ حزبـەکان و ناوەنـدە کوردیەکانـدا لـەدەرەوەی عێـراق بـۆ یەکخسـتنی هـەموو هـەوڵ و کۆشـشەکان لـەپێناو گەیشتن بە ئامانجە بالآکە– مافی چارەی خۆنوسین و رزگاربوون–.

پێنجـەم– هەوڵـدان بـۆ چاکسازی هەمـەگیر بـۆ گیروگرفتـە سیاسـی و کۆمەلآیـەتی و ئابوریەکان بەفەراهەمکردنی مافە دیموکراسیەکان و بەرزکردنـەوەی ئاسـتی کشتوکاڵ و پیـشەسازی و بلآوکردنـەوەی زانـست و زانیـاری و زیندوکردنـەوەی مێـژووی ئـەدەبی کوردی.

شەشـــەم– گـــشتاندنی بـــەکارهێنانی زمـــانی کـــوردی لەهـــەموو دەزگاکـــان و بەرێوەبەرایەتیەکان و قوتابخانەکانی ناوچە کوردیەکاندا.

حەوتەم– کارکردن بۆ رونکردنەوەی مەسەلەی کورد لای هـەموو نەتـەوەکان بەتایبـەتی نەتەوەکانی خۆرهەلآتی ناوەڕاست.

هەشـتەم– کـارکردن بـۆ دۆزینـەوەی پەیوەندیـەکان و هاریکـاری لەگـەڵ حزبـەکان و رێکخراوە دیموکراتیەکاندا.

سێیەم- کارکردن بۆ دروستکردنی پەیوەندیە سیاسیەکان لەگەڵ وڵاتانی دیموکراتیدا بۆ بەرەنگاربونــەوەی پلانــەکانی داگیرکـــەرو کۆنەپەرســـتیی و بـــەکرێگیراوەکانی کـــە هەوڵـدەدەن بەڵێننامـــەی ســـەعد ئابـاد زیندوبکەنـەوە. و بەرنگاربونـــەوەی تەکتولاتـە داگیرکـاری و کۆنەپەرسـتیەکان کـە ئاسـتەنگ لەبـەردەم ئازادیـە گـشتیەکان و ئـازادی کوردەکانـدا بەتایبـەتی دروسـت دەکـات. ئـەم بەیاننامەیـەش وەك پـەیڕەو بەڵێننامـەی حزبی نیشتمانی وابوو.

دوای ماوەیەکی کـورت لـەکارکردن زۆربـەی بنکـەی جـەماوەری هیـوا هاتنـە پـاڵ حزبـی رزگاریــەوە کــە لەســاڵی ١٩٤٥دا بەتــەواوەتی کۆتــایی پێهـات هــەروەها دیموکراسـیە کوردەکانی تریش هاتنە نـاو ریزەکانیـەوە هاوشـان لەگـەڵ ئەندامـەکانی حزبـی شـیوعی لەکوردستانی عێراق -شۆڕش- و سەرکردایەتیکردنی رێکخراوەکـانی ئـەم حزبـەی گرتـە دەست کە وەك بەرەیەکی نیشتمانی کوردی وابوو.

لەسەردەمی -شۆڕش- و -رزگاری[115] دا بزوتنـەوەی رزگـاریخوازی کـورد دروشمـەکانی تێکۆشـانیان لـەدژی داگیرکـەرو حکومەتـە کۆنەپەرسـتەکان بـەرزکردەوە لـەپێناو مافـە نەتەوایەتیەکاندا بۆ گەلی کورد لەچوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتی و رزگاربوو لەدەست داگیرکەر، بڕوای ئەم دوو حزبەش ئەوە بوو رزگاربوونی گەلی کوردی لـەعێراق بەنـدە بـە رزگـارکردنی عێـراق لەداگیرکـەرو بونیادنـانی حـوکمێکی دیمـوکراتی تێیـدا ئەمـەش لەبروسکەیەکدا هات کە- حزبی رزگاری کورد- ناردی بۆ کۆنگرەی وەزیرانـی دەرەوەی وڵاتانی زلهێز لەمۆسکۆ دوای کۆتایی هاتنی جـەنگی جیهـانی دووەم کـە ئەمـەی بـەدەق تێیدا هاتبوو[116].

( .. بۆیە داوای جێبەجێکردنی داخوازیـە نیـشتمانیەکانی کوردەکـان دەکـەین لـەعێراق لەکاتێکدا کە ئێمە بڕوامان وایە ئەوە نایەتە دی تەنها بەلەناوبردنی داگیرکەرو حکومەتـە کۆنەپەرسـتە ناوچـەییەکان نەبێــت و گۆڕینیـان بەیـەکێکی تـری دیمـوکراتی ڕاسـت و

---

[115] - حزبی شیوعی لەکوردستانی عێراق بەناوی رۆژنامەکەیەوە ناسرا-شۆڕش- هـەروەك چۆن حزبـی رزگـاری کوردیش بەناوی رۆژنامەکەیەوە ناسرا- رزگاری- بۆیە کاتێك دەوترێت- شۆڕش- و- رزگاری- مەبەست پێیان هەردوو حزبەکەیە.

[116] - لا ١٠٤ لەکتێبی (قاسم والاکراد- خناجر وجبال) ی بەرێز ئەحمەد فەوزی چاپە عەرەبیە یەکەمەکە.

دروست که مافه نەتەوەییەکانی گەلی کوردی لەعێراق زامن بکات).
لەژێر کاریگەری شۆڕش– و –ڕزگاری– یشدا بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردی پێوەن بوو بەبیرۆکەی پێشکەوتنخوازی نوێ و مارکسی– لینینی، بووە فەلسەفەی پەسەندکراو لای لاوانی ڕۆشنبیرو ئەو کرێکارانەی کە لەفیلدی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیدا کاریان دەکرد. ئەوەش کە یارمەتیدەربوو لەمەدا بوونی سۆڤیەت بوو لەبەشێك لەکوردستانی ئێرانداو، پشتیوانیکردنیان لەخەباتی گەلی کوردی لەوێ هەتا وای لێهات تێکۆشەرە کوردەکان بڕوایان وابوو کورد ڕزگاری نابێت تەنها بەهۆی سۆڤیەت و پشتیوانیەکانی ئەو و لەسایەی (فەلسەفەی سۆڤیەت– مارکسی لینینی)دا نەبێت. بەتایبەتی کە دوژمنکاریی داگیرکەرانی ئینگلیز بۆ گەلی کوردی لەزیادبوونێکی بەردەوامدا بوو.
ئەوەش کە ئەم بڕوایەی بەهێزکرد ڕۆڵی ئینگلیز بوو لە دژایەتیکردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیدا لەعێراق و ئێران و هاندانی ولاتانی عێراق و تورکیاو ئێران بۆ ئەوەی لەناو خۆیاندا ڕێکبکەون لەدژی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیی.
حزبی شۆڕش– و ڕزگاری– هاوپەیمان ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لەقوڵکردنەوەو فراوانکردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی و پەرەپێدانی بۆ ئەوەی ببێتە بزوتنەوەیەکی جەماوەریی میللی لەڕووی بنکەی جەماوەری و سەرکردایەتیەوەو کاربکات بۆ چاکسازییە کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیریەکان بەتەنیشت ئامانجە نیشتمانیە هەرە گەورەکانەوەو لەکارکردنیشدا تیۆری شۆڕشگێڕیی پەیڕەو بکات.
هەردوو حزب کۆششێکی باشیان کرد کە جێی ستایشە لەخستنەڕووی مەسەلەی کوردیدا لەنێوەندە نێودەوڵەتیەکانداو پێشکەشکردنی یاداشتنامە بە دامەزراوە نێودەوڵەتیەکان و کۆنگرەی وەزیرانی دەرەوەی چوار ولاتە گەورەکە بۆ کۆنگرەی سان فرانسیسکۆ و بەدەرکردنی بلاوکراوەو نامیلکە، ئەمەی خوارەوەش دەقی یاداشتنامەیەکە نێراوە بۆ کۆنگرەی وەزیرانی دەرەوەی بەریتانیاو یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا[١١٧] لەمۆسکۆ.
مرۆڤایەتی خۆشحاڵ و شادومان بوو بەکۆتایهاتنی جەنگ و سەرکەوتنی هێزە

[١١٧] – لا ١٠٤ سەرچاوەی پێشوو.

دیموکراسـیەکان و بـەزینی درنـوترین شـێوەکانی داگیرکـەر- فاشـیزم- لـەخۆرئاواو خۆرهەلاتدا گەلی کوردی پارچە پارچەکراو و بەشـخوراو هـەر لـەزۆر زووەوە لـەژێر نێلـەی زولم و چەوساندنەوەدا دەنالێنێت و بێبەشکراوە لەهەموو مافە نەتـەوەیی و مرۆییـەکانی ئـەویش لەئـەنجامی پـیلان و بەرژەوەندیـەکانی داگیرکـەری بـەریتانی و حکومەتـە کۆنەپەرستە فاشیستەکان لەئێران و تورکیاو عێراقدا.

بەبۆنـەی کۆتـایی هـاتنی جـەنگ و سـەرکەوتنی هاوپـەیمانان گـەلی کـورد هیـوادارە بەدادپەروەرانـەوە سـەیری کێـشەکەی بکرێـت و بێبـەش نـەکرێت لـە بەڵێنـەکانی هاوپەیمانان و بەلێننامەکانی بۆ گەلە بچوکەکان لەپێناو رزگـاربوونی و بریـاردان لەسـەر چارەنوسی.

ئێـستا کـە لەمۆسـکۆ وەزیرانـی دەرەوەی سـیّ وڵاتـە مەزنەکـە کۆدەبنـەوە هیـوادارین بەچاوی ویژادنەوە بروانە کێشەی گەلان و نەتەوەکان.

ئەمە و حزبی رزگاری کورد خۆشحاڵە کە ئەم خاڵانە بخاتە پێش چاوتان کە پەیوەنـدیان هەیە بە مەسەلەی گەلی کوردو ئاشتیەوە لەخۆرهەلاتی ناوەڕستدا:-

١-ئێمـە پـشتیوانی لـە خـەباتی بـرا کوردەکانمـان دەکـەین لەئێرانـدا لەگـەڵ بـرا ئازربایجانیـەکانیان لـەپێناو سـەربەخۆیی خـۆجێیی و حـوکمی دیموکراسـی و تێکۆشـان لەدژی حکومەتی کۆنەپەرست و ئەوانەی سەر بەون.

٢- بەچاوی بایەخەوە بروانرێتە رەوشی گەلی کوردی لەتورکیا کـە حکومـەتی فاشـستی تـورکی بەشـێوازگەلێکی درندانـە مامەلـەی لەگەلـدا دەکـات بـۆ ئـەوەی بەتـەواوەتی لەناوبیەرێت و بەزەبری هێز بیکاتە تورك.

٣- گەلی کوردی لەعێراق رەوشی زۆر خراپ بووە بەرادەیەکی زۆر خـراپ و بێبەشـکراوە لەهەموو مافە دەسـتوریەکانی ئەمـەش بـەهۆی بـوونی داگیرکـەری بـەریتانی حکومـەتی کۆنەپەرستی ئێستاو شێوازە درندانەکەیەوە سوتاندنی گوندە بارزانیـەکان و ناوچـەکانی دەوروبەری و پەراگەندەکردنی هاولاتیان چەند شایەتحالێکی کردارین لەسەر ئـەوە بۆیـە داوا دەکەین داخوازیە نیشتمانیەکانی کوردەکان لەعێراق جێبەجیّ بکرێن.

لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە پێمانوایە ناکرێت ئەوە بەدی بێت تەنها بـە لـەناوبردنی داگیرکـەرو

ولآتـانی کۆنەپەرستی ئێستا نـەبێت و گـۆڕینی بـە یـەکێکی تـری دیموکراسـی ڕاسـت و دروست کە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی لـەعێراق زامـن بکـات.. ئەمـەو سـەرنجمان ڕاکێشان بۆ ئەم ڕاستیانە هیـواداریـن بـەرۆحێکی مرۆییانـەوە چارەسـەری بکـەن چونکە چارەسەرکردنی بەشێوەیەکی واقیعی دروست دەبێت هۆکارێك بۆ بوژانەوەی مەدەنیـەت و ئاشتی لەخۆرهەلآتی ناوەڕاستدا.

"لیژنەی تەنفیزی حزبی رزگاری کورد"

هەردوو حزب کۆششێکی بەهاداریان کرد لە سەر ئاستی خـەباتی فیکریـدا، هـەردووکیان بـەرگریان کـرد لـە مافـەکانی گـەلی کـوردو لەپێویـستی بـوونی حزبـەکان و ڕێکخـراوە دیموکراسیە کوردستانیەکان. هەروەك چۆن هـەردوو حـزب کاریـان کـردو تێکۆشـان بـۆ دامەزرانـدنی حزبـی دیمـوکراتی کـوردی- عێراقـی کـە دواتـر ناوەکـەی کـرا بـە حزبـی دیموکراتی کوردسـتان بـەلآم هـەردوو حزبەکـە لەئاسـتی ئـەرك و ڕوداوەکانـدا نـەبوون و دروشمی خەیاڵی و ئامانجی دووری ناموومکینیـان هـەبوو هـەروەها پێکهاتـە چینایەتی و فیکریەکەیان فشەڵ بوو.

بەتەنیـشت ئـەم دوو حزبەشـەوە هـەروەها لقـی حزبـی (ژ.ك)یـش لەکوردسـتانی عێـراق بەسەرکردایەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد هەبوو... ئەم لقەی کۆمەڵەی (ژ.ك) لایەنگری لـە سـلێمانی و کـەرکوك و کفـری هـەبوو. لیژنـەی لقەکـەش جگـە لەمامۆسـتا ئیـبراهیم ئەحمەد پێکهاتبوو لەهەریەك لە مامۆستا ئیسماعیل شـاوەیس و شـاعیری میللـی فایـەق بێکەس و خاتوو زەکیە بابان و ئەوانی تر.

هەروەها لقێکی کوردی حزبی شیوعی عێراقیش هەبوو کە مەلا شەریفی ئەربیلی دەیـبرد بەڕێوەو ڕۆژنامـەی (ئـازادی) بـەزمانی کـوردی دەردەکـرد بـەلآم ئـەم لقـە زۆر لاواز بـوو بەڕادەیەك تەنها چەند ڕێکخراوێکی بچوکی هەبوو لەهەندێك لەشارەکاندا وەك سلێمانی و هەولێرو کەرکوك.

ئەمە لەبواری سیاسیدا بەلآم لەمەیدانی سەربازیدا ئەوا لەساڵی ١٩٤٣ وە بزوتنەوەیـەکی سەربازیی بچووك لەناوچەی بارزاندا ڕویدا- بەسەرکردایەتی مەلا مستەفای بارزانی کە لە

مەنفاکەی هەڵهاتبوو بەنهێنی گەیشتبۆوە ناوچەی بارزان و هەستا بەداگیرکردنی چەند مەخفەرێك و دروستکردنی کۆمەڵێك مەفرەزەی چەکدار لەو بارزانیانەی کە بەدەست زوڵم و زۆری حوکمی پادشاییەوە دەیاناڵاند، سەرەرای ئەوەی ئەمە هیچ ئامانجێکی نەتەوەیی کوردیی گشتی هەڵنەگرتبوو، بەلأم نیشتمانپەروەرە کوردەکان بە بزوتنەوەیەکی دادپەروەرانەیان دانا دژ بە چەوساندنەوەی نەتەوەیی و زوڵم و ستەمی بێگانەو داگیرکەر بۆیە پشتیوانیان لێکردو هەوڵیاندا سودی لێ ببینن و پەرەی پێبدەن بۆ ئەوەی ببێتە بزوتنەوەیەك کە هەڵگری داخوازییە نەتەوەیەکانی کورد بێت و نیشتمانپەروەرە کوردەکانی تر بەشداری تێدا بکەن لەبەشەکانی تری کوردستان و پاشانیش ویستیان بارزان ببێتە پێگەی سەرهەڵدانی شۆرشێکی کوردیی نیشتمانیی نوێ و لەمبارەیەشەوە حزبی هیوا هەولێکی زۆری خستەگەڕ و ژمارەیەك ئەفسەر کەلەناو ئەم حزبەدا بوون وەك سەید عەزیز سەید عەبدوڵلای شەمزینی و سەرۆك میرحاج ئەحمەدو خوالێخۆشبوو موقەدەم ئەمین رەواندوزی و شەهیدان سەرۆك موستەفا خۆشناو و سەرۆك یەکەمی روکن عیزەت عەبدولعەزیز و مولازمی یەك خەیروڵلا عەبدولکەریم و مولازم محمد قودسی، پەیوەندیان بەم بزوتنەوەیەوە کرد کەوا سەرۆکەکەی مەلا موستەفای بارزانیی بوو کە ئامادەیی نیشاندا بۆ هاریکاریکردن لەگەڵ حزب و لەگەڵ ئەماندا. هەر لەساڵی ١٩٤٤ بزوتنەوەی بارزانی تەبەنی داخوازییە نەتەوەیەکانی کرد ئەوەش بەهۆی کاریگەری حزبی هیوا و ئەو ئەفسەرانەوە بوو کە لەساڵی ١٩٤٥دا و دوای هەڵوەشانەوەی حزبی هیوا (لیژنەی ئازادی)یان دامەزراندو مەلا مستەفایان راسپارد سەرکردایەتی خەباتی چەکداریی بکات و کار بکات بۆ فراوانکردنی ناوچەی شۆرش و گشتاندنی بزوتنەوە چەکداریەکان ئەگەر جەنگ دەستی پێکردەوەو بۆ ئەمەش مەلا مستەفای بارزانی پەیوەندیکرد بە ژمارەیەك لەسەرۆك هۆزە کوردیەکانەوەو ئەوانیش بەڵێنیان پێدا کە یارمەتی بدەن لەدژی حکومەتی عێراقی.

بەلأم کاتێك حوکمی پادشایی هێرشی کردە سەر بارزان لە ١٠ ئابی ١٩٤٥داو بەپشتیوانی هێزی ئاسمانی بەریتانی و لەژێر سەرپەرشتی ژەنراڵ (رنتن)ی بەریتانیدا ئەوا خاوەن موڵکەکان و ئاغا کوردەکان بەڵێنەکانی خۆیانیان نەبردە سەرو نەجوڵان بۆ

پشتیوانیکردن لەبارزان و جەنگاوەرەکانی ئەوانەی کە تەنها بۆ ماوەیەکی دیاریکراو نەبێت نەیانتوانی خۆڕاگربن و دواتر کشانەوە بۆ کوردستانی ئێران- ئەو ناوچەیەی کە سوپای سوری سۆڤیەتی لێبوو- دواتریش خۆیان خستە ژێر فەرمانی حکومەتی کوردستانی دیموکراتی کە لێیانەوە هێزێکی بارزانی چەکدار دروستکرا کە لە (١٢٠٠) بارزانی پێکهاتبوون لەژێر سەرکردایەتی مەلا مستەفادا کە پلەی ژەنراڵی پێدرا لەسوپای کوردستاندا لەگەڵ هەندێك سەرۆك هۆزی تردا وەك سەید حەمەرەشیدخان و عومەر ئاغای شکاك ، هەر لەوکاتەشەوە هەندێك بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ژەنراڵ مستەفای بارزانی ژەنراڵ بووە لەسوپای سوری سۆڤیەتدا رەنگیشە ئەوە بەهۆی لێکچوونی جلی ئەفسەرانی سوپای کوردستان و جلی ئەفسەرەکانی سوپای سوری سۆڤیەتەوە بووبێت کاریگەری هەبوو لەسەر بڵاوبونەوەی ئەم پڕۆپاگەندەیە کەوا داگیرکەران و زوڕناژەنەکانیان بانگەشەی بۆ دەکەن.

کوردە عێراقیەکانیش و لەپێشیانەوە ئەفسەرە دلێرە کوردەکان: سەرۆکی یەکەمی روکن عیزەت عەبدولعەزیز و سەرۆك میرحاج ئەحمەد و سەرۆك بکر عەبدولکەریم و سەرۆك موستەفا خۆشناو و مولازمی یەك نوری ئەحمەد تەهاو مولازمی یەك خەیروڵلا عەبدولکەریم و مولازم محمد قودسی و مولازم جەلال ئەمین رۆڵێکی شەرەفمەندانەیان گێڕا لەبەرگریکردن لە کۆماری کوردستانی دیموکراسی.

ڕاستیە مێژوییەکانیش جارێکی تر جەختیا کردەوە لەسەر ئەو -رۆڵ-ەی کەوا موڵکدارەکان و هۆزە کوردیەکان دەتوانن بیگێڕن و مایەپووچیی ئەم تاقمە لەمەیدانی سەرکردایەتیکردنی شۆڕشدا.. ئەو رۆڵەی گێڕا لەئاشکراکردنی زهنیەتی کۆن و هۆزایەتیداو لە پەرەسەندنی بزوتنەوەی ررزگاریخوازی کوردیدا بۆ بزوتنەوەیەکی میللیی.

هەروەك چۆن ئەم روداوانە کە هاوکات بوون لەگەڵ جوڵانەوەی بارزانی لەساڵی ١٩٤٥دا، بەشداریان کرد لەوەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کوردی بکەنە بزوتنەوەیەکی میللی دژ بەداگیرکەرو کۆنەپەرستیی، شۆڕشگێڕیی لەشێوازیدا و دیموکراسی و پێشکەوتنخوازی لەسروشتی و ئامانجەکانیداو، جەماوەریی لەناوەڕۆك و

بنکە و سەرکردایەتیدا بەتایبەتی دوای مایەپووچبوونی تاقمە ململانێکەرەکان لە هۆزچیەتی و بورجوزایەتی و هەمیشە سازشکار لەگەڵ داگیرکەران و زەوتکەراندا، ئەوەی سەلماند توانای سەرکردایەتیکردنی نیە و ناتوانێت بەردەوامێتی بە خەبات بدات هەربۆیە بوونی سەرکردایەتیەکی میللی هۆشیاری شۆڕشگێرو خۆڕاگر کەلەناو جەرگەی گەلەوە هەڵقوڵابێت بووە پێویستیی و زەرورەت، سەرکردایەتیەك لەپەرەسەندنەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی تێبگات و دەرك بە بەرپرسیارێتیە گەورەکەی بکات و پاشانیش بۆ دۆزینەوەی پێشرەوانێکی شۆڕشگێڕیی دیموکراسی بۆ بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردی .. بۆ ئەمەش ئەو حزبانەی کەلەو کاتەدا لەکوردستاندا کاریان دەکرد دەستیان کرد بە پەیوەندیکردن بە نیشتمانپەروەرە کوردەکانەوە کە لەو بەشەی کوردستاندا بوون دەکەوتە ژێر دەسەلاتی داگیرکەری سۆڤیەتیەوە.

بۆ ئەمەش سەرکردایەتی شۆڕش مامۆستا حەمزە عەبدوڵلای پارێزەریان نارد بۆ ئێران بۆ ئەوەی لەوێ پەیوەندی بکات بەسۆڤیەت و نیشتمانپەروەرە کوردەکانەوە کەلەوێ بوون، هەر بەو شێوەیەش مامۆستا حەمزە عەبدوڵلا لەوێ پەیوەندی کرد بە ئەفسەرە کوردەکان سەرۆك میرحاج و سەرۆك موستەفا خۆشناو و ئەوانی تر و هەروەها بە مەلا مستەفای بارزانیەوەو لەگەڵیاندا گەیشتە بڕیارێکی گرنگ ئەویش کارکردنە بۆ دامەزراندنی حزبێکی پێشرەوی دیموکراسی لەکوردستانی عێراق لەسەر هەمانشێوەی (حزبی دیموکراتی کوردستان) و حزبی دیموکراتی ئازربایجان کە تازە لەکوردستان و ئازربایجانی ئێران دروست بوو بوون، دوای ئەوەش مامۆستا حەمزە عەبدوڵلا گەڕایەوە بۆ کوردستان بۆ پەیوەندیکردن بە سەرکردایەتی شۆڕش و رزگاری و لقی "ژ.ك"ەوە وتوێژکردن لەگەڵیاندا دەربارەی هەمان بابەت لەبەرامبەر ئەمەدا سەرکردایەتی شۆڕش و رزگاری هانیان دا بۆ ئەوەی ئەم ئەرکە نیشتمانیە بەئەنجام بگەیەنێت دوای ئەو کە دەستەی دامەزرێنەر بۆ حزبی دیموکراتی کوردی – عێراق پێکهێنرابوو.

## دامەزراندنی حزبی دیموکراتی کوردستان[118]

مامۆستا حەمزە عەبدوڵلا لەئێران بیرۆکەی پێکهێنانی حزبی دیموکراتی پێشڕەوی لەکوردستانی عێراق گەڵاڵە کرد لەسەر فۆرم و شێوەی حزبی دیموکراتی کوردستان– ئێران بەرێکەوتن لەگەڵ بەرێزان میرحاج ئەحمەد و موستەفا خۆشناو و سەید عەزیز شەمزینی و هەندێك لەنیشتمانپەروەرە کوردەکانی تر بۆ ئەمەش دەستەیەکی دامەزرێنەریان پێکهێنا بەسەرۆکایەتی فەخریی مەلا مستەفای بارزانیی. دەستەی دامەزرێنەر بەیاننامەیەکیان بۆ گەلی کوردی لەعێراق دەرکرد. بەیاننامەکە لەچاپخانەی کوردستان لەمەهاباد چاپکرا.. بەیاننامەکە بانگەوازێك بوو بۆ هەموو نیشتمانپەروەرەکان و کۆمەڵە کوردیەکان لەعێراق بۆ تێکۆشان و یەکگرتن بۆ دامەزراندنی ئەم حزبە دیموکراتیە پێشڕەوە نوێیە.

پێش دەرچوونی ئەم بەیاننامەیەش مامۆستا حەمزە چەندین راپۆرتی نوسیبوو بۆ سەرکردە نیشتمانپەروەرەکان لەعێراق– سەرکردەکانی شۆڕش و ژ.ك– لەبارەی ئەم بیرۆکەیەوە داوای لێکردبوون بۆ لێك تێگەیشتن و یەکگرتن لەپێناو سەرکەوتنی ئەم

---

[118] – لەبارەی چۆنیەتی دروستبوونی پارتیەوە مامۆستا صالح حەیدەریی لەدەستنوسی یادەوەریەکانیدا دەنوسێت" دوای ئەوەی برا تێکۆشەرەکان کە لەکوماری کوردستان بوون بریاریان دا حزبێکی نوێ دابمەزرێنن لەسەر هەمان شێوازی پارتی دیموکراتی کوردستانی کەوا قازی محەمەد سەرکردایەتی دەکرد، دەڵێم دوای ئەوەی بریاری ئەوەیان دا نوێنەرێکی خۆیان نارد بۆ بەغداد بۆ ئەوی دانوستانمان لەگەڵدا بکات لەو بارەیەوە، ئەو نوێنەرەش کەنێرابوو مامۆستا حەمزە عەبدوڵلا بوو" پاشان بەردەوام دەبێت و دەڵێت" ناوبراو راوبۆچونی برا تێکۆشەرەکانی خۆی لەکوماری کوردستانی بۆ خستینەروو لەو کوردە عێراقیانەی کەوا لەگەڵ بارزانیدا کشابوونەوە کە لەمەدا پوخت دەکرێتەوە:

" پێویستە حزبێکی دیموکراتی نەتەوەیی فراوان دابمەزرێنرێت هەموو رەگەزە کوردییە دڵسۆزەکان لەخۆبگرێت لە نەتەوەییەکان و دیموکراتیەکان و شیوعیەکان، بۆ ئەوەی سەرکردایەتی خەباتی گەلی کوردی لەکوردستانی عێراق بکات و ببێتە پێشڕەوی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی.

بۆ بەدیهاتنی ئەوەش پێویستکرا هەموو رێکخراوەکان لەکوردستانی عێراق هەبوون خۆیان هەڵبوەشێننەوەو لەحزبێکی دیموکراتیدا خۆیان رێکبخەنەوە" مامۆستا حەیدەریی لەمامۆستا حەمزە عەبدوڵلاوە ئەو وتەیە دەگێرێتەوە کە : " بریارە لەسەرکردایەتی حزبە نوێیەکەدا کەسایەتی کۆمەڵایەتی مولکدار هەبن بەهۆی ئەو دەسەلات و قەڵەمرەویەوە کە هەیانە لەناو هەندێك لەناوەندە عەشایەرییە کوردیەکاندا بەتایبەتیش ناوی هێنابوون کە ئەوانیش شێخ لەتیفی کوری شێخ مەحمودی حەفیدو کاکە زیاد ئاغابوون.

'بیرۆکەیەدا لەسەر پێشنیاری ئەویش عەلی عەبدوڵڵای ئەندازیار ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی شۆڕش چوو بۆ سلێمانی بۆ بینینی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد سەرۆکی لقی حزبی دیموکراتی کوردستان– کە لقی ژ. ك بوو– گۆڕا بۆ –حزبی دیموکراتی کوردستان– لە کوردستانی ئێران.

لەو دیدارەدا باسی بابەتی دامەزراندنی ئەم حزبە کرا – حزبی دیموکراتی کوردستان– دوای ئەم دیدارەش دیدارێکی تر بەداویدا هات دوای گەشتکردنی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو کۆبونەوەی لەگەڵ مامۆستایان صالح حەیدەریی و نافع یونس و عەلی عەبدوڵلا، بەلأم مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد شێنەیی کرد لەهەڵوەشاندنەوەی لقی– حزبی دیموکراتی کوردستان– دا بۆ ئەوەی رەزامەندی سەرکردایەتی – قازی محەمەد– لەسەر ئەمە وەربگرێت، لە بەهاری ساڵی ١٩٤٦دا مامۆستا حەمزە عەبدوڵلا لەکوردستانی ئێرانەوە گەڕایەوە بۆ سلێمانی و پەیوەندیکرد بە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدەوە، هەروەك چۆن پەیوەندیکرد بە سەرکردایەتی حزبی شۆڕشەوە کە ئەوان مامۆستا (نافع یونس)یان ناردبوو بۆ سلێمانی بۆ ئەنجامدانی ئەو دیدارە، لەو کۆبونەوەیەدا رێکەوتن کرا لەسەر هێڵە سەرەکیەکان بۆ پێکهێنانی حزبە نوێیەکە کە سەرکردەکانی شۆڕش لەرووی مەبدەئیەوە رەزامەندبوون لەسەر دروستبوونی لەهاوینی ١٩٤٦دا مامۆستا حەمزە چوو بۆ بەغداو بووە میوانی هەندێك لە سەرکردەکانی شۆڕش و لەوێ دەستی کرد بە پەیوەندیکردنی رێخۆشکەریی لەگەڵ هەندێك لەسەرکردەکانی شۆڕش و رزگاریدا بۆ دامەزراندنی حزبە نوێیەکە، ئەم دوانەش دەستیان کرد بە ئامادەکاریی بۆ بەستنی کۆنگرەکەی، بەلأم بەداخەوە ناکۆکیەك رویدا لەنێوان مامۆستا حەمزە کە نوێنەری دەستەی دامەزرێنەری حزبی دیموکراتی کوردی– عێراق– و بریکاری مەلا مستەفای بارزانیدا، کە هەموو دەسەلأتێکی پێدرابوو لەلایەك و لەنێوان مامۆستا صالح حەیدەری کە هەندێك لە سەرکردەکانی شۆڕش پشتیوانیان لێدەکرد لەلاکەی ترەوە، ئەوەش دەربارەی بابەتێکی لاوەکی بوو پەیوەندی هەبوو بەخستنە ناوەوەی دوو خاوەن موڵکی

گەورە[١١٩]ی نیشتمانپەروەرەوە هەبوو بۆ ناو سەرکردایەتی حزبە نوێیەکە. ئەوکات مامۆستا حەیدەریی ناڕازی بوو لەوەی ئەو دوو کەسە بخرێنە ناو سەرکردایەتی حزبەکەوە ئەوەش بووە هۆی روودانی دووبەرەکی و جیابوونەوە لەکۆنگرەی حزبی شیوعی لەکوردستان کە لە ئابی ساڵی ١٩٤٦ لەشاری بەغدا بەسترا. لەو کۆنگرەیەدا مامۆستا صالح حەیدەریی و لەگەڵیشدا بەڕێزان نافع یونس، حمید عوسمان، جمال حەیدەریی، عەلی پێشکەوتن کە لەئەندامانی کۆنگرەی –شۆڕش– جیابوونەوە و چوونە پاڵ حزبی شیوعی عێراقی بەسەرۆکایەتی خوالێخۆشبوو فەهد. بەلأم بەڕێزان عەلی عەبدوڵلاو، کەریم تۆفیق، عەبدولصەمەد محەمەد، نوری محمد ئەمین، محەمەد ئەمین مەعروف، رەشید عەبدولقادریش پێیان باش بوو بێنە ناو حزبی دیموکراتی کوردستانەوە بەوشێوەیە ئەندامانی حزبە نوێیەکە لەئەندامانی کۆنگرەی رزگاری و شۆڕش پێکهاتن کە بڕیارياندا حزبی دیموکراتی کوردی پێکبهێنن.

مامۆستا حەمزە بەم هەڵسوکەوتەی لەگەڵ مامۆستا صالح حەیدەری و کۆمەڵکەیداو نیشان نەدانی نەرمیی پێویست بۆ پاراستنی یەکێتی شۆڕش بووە هۆی ئەوەی ئەوانە پەرتەوازە بکات کەلەباشترین رۆشنبیری هەولێربوون، هەروەها لەوانە بوون رۆڵێکی شەرفمەندانەیان هەبوو لەدروستبوونی هەردوو حزبی شۆڕش و رزگاری و لەپەرەپێدانی

---

[١١٩] – مەبەست لەم دو موڵکدارە بەڕێزان شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحمود بوو کە مامۆستا حەمزە وەك جێگری سەرۆك سەپاندی و، بەرێز محەمەد زیاد ئاغای غەفووریی بوو وەك جێگری دووەم لە لیژنەی مەرکەزیدا.

سەبارەت بەهەڵوێستیشیان لەم مەسەلەیەدا مامۆستا صالح حەیدەریی ڕاوبۆچوونەکانی خۆی لەدەستنوسی یادەوەریەکانیدا بەمشێوە باس دەکات: " سەرکردایەتی حزبە نوێیەکە پێویستە پێکهاتبێت لە رەگەزو کەسایەتیە شۆڕشگێڕییە کوردییە دڵسۆزەکان و لەسەر بنچینەی توانستی زەینی و سیاسی و زانستی بێت نەك لەسەر بنچینەی پلەی کۆمەلأیەتی – کەبەهۆی موڵکداریەوە دروست بووبێت– بۆ ئەم ئەندامە یان ئەو ئەندامە. لەسەر ئەمەش ئێمە رەتمانکردەوە ئەو دوو کەسە لەسەر داوای نوێنەرەکە دانرابوون ببنە ئەندام لەسەرکردایەتی حزبە نوێیەکەدا، هەروەها نوێنەرەکە پێداگری کرد لەسەر ئەوەی هەموو ئەو رێکخراوانە هەڵبوەشێنرێنەوە کە لەکوردستاندا هەبوون. ووتی پێویست ناکات لەقۆناغی ئێستادا شیوعیەکان رێکخستنێکی تایبەتی و سەربەخۆی خۆیانیان هەبێت، لەسەر بنچینەی ئایدۆلۆژیی لەبەرئەوەی کە: چینی کرێکار لەکوردستاندا نیە، کۆمەڵگەی کوردیش کۆمەڵگەیەکی سەرەتایی عەشایەریەو هێزی سەرەکی لەشۆڕشی کوردیدا بریتیە لە جەماوەری دڵسۆز بۆ ئامانجە نەتەوەییە کوردیەکان.

بزوتنـــەوەی رزگـــاریخوازی کـــوردی و بڵاوکردنـــەوەی بیرۆکـــەی پێـــشکەوتنخوازی و دیموکراسیدا.

لەکاتێکدا کـە پێویـست بـوو هـەروەها ڕاسـتربوو ئـەو مەسـەلەیەی بـەجێ بهێـشتایە بـۆ ئەندامانی کۆنگرەکەو ئەو دوو موڵکدارە نیشتمانپەروەرەی نەسەپاندایەو پاشـانیش ئـەو دەسـتە رۆشـنبیرە بەئاگایـەی لـەپێناو موڵکـدارە نیـشتمانپەروەرەکاندا پەرتـەوازە نەکردایە.

بەوشـێوەیە دەبیـنین سـەرکردایەتی پـارتی دەسـتی بـەکارەکانی کـرد لەگـەڵ ڕوودانـی جیابوونەوەیەکی ترسناك لەناو ریزەکانی شۆڕشدا[120] ئەمـە لەکاتێکـدا ئـەرکی ئـەوە بـوو سووربێت لەسەر یەکێتی شۆڕش و تێڕوانینی ئەو سەرکردانە قەبوڵ بکات. ئـەم نـاکۆکی و کەرتبوونەش بووە هۆی جیابوونەوەی هەردوو ڕێکخراوەی شۆڕش لەهەولێرو ڕەواندوز لە حزبە نوێیەکە و چوونە پاڵ حزبی شیوعی عێراق ئەمەش کاریگەرییـەکی سلبی لـەناو ڕیزەکانی حزبە نوێیەکەدا بەجێ هێشت لـەو دوو شـارەدا و، بزوتنـەوەی حزبـی کـوردی چەند کەسانێکی بەتواناو لێهاتووی لەدەستدا.

من پێموایە هەڵوێستی سەرکردەکانی شـۆڕش ئەوانـەی کەبەشـێوەیەکی مەبـدەئی ڕازی بوون لەسەر دامەزراندنی حزبـە نوێیەکـە بـەڵام ڕەتیـان کـردەوە بـچنە ناویـەوە بـەهۆی سەپاندنی موڵکدارە نیشتمانپەروەرە کوردەکانەوە، ڕاسـت بـوو لـەو ڕووەوە کـە ڕەتیـان کردەوە ئەم دوو کەسە بـچنە نـاو لیژنـەی ناوەنـدی حزبەکـەوە کـە پێویـست بـوو بـاڵی

---

[120] – پرۆفیسۆر روخارد برینیتس لەبارەی بابەتەکەوە دەڵێت:

" هەوڵەکانی حەمزە عەبدوڵلا بۆ کۆکردنـەوەی رەگـەزە ڕاسـتڕەوەکان بـۆ نـاو بزوتنـەوەی کـوردی لەحزبەکـەدا یـەکێتی حزبـە پێـشنیارکراوەکەی تەقانـدەوە، ئـەو پێـداگریی کـرد لەسـەر هەڵبـژاردنی دووان لەنوێنـەرانی ئەرستۆکراتی کوردیی لە لیژنەی ناوەندی حزبە نوێیەکەدا ئەوەش لەسەر ئارەزووی مـەلا مستەفابوو کـە محمد زیاد ئاغاو شـێخ لـەتیفی پێـشنیارکردبوو وەك جێگرانـی سـەرۆکی حـزب و هەڵبژێراشـن" شـێخ لـەتیفیش کـوڕە بچوکی شێخ مەحمودە.

"... پێنج لە چاکترین سـەرکردەکانی شۆڕش لەناویانـدا صـاڵح و جـەمال حەیـدەریی پێیـان وابـوو کـە هێنانـە ناوەوەی ئەرستۆکراتەکانی وڵات بۆ ناو سەرکردایەتی حزب وەك خیانەتکردن وایە لەبەرامبەر شۆڕشدا، هەربۆیـە ڕەتیان کردوە بێنە ناو ڕێکخراوە نوێیەکەوە.

عەشایەری سەرلەنوێ نەهێنرێتەوە بۆ ناو بزوتنەوەی شۆڕشگێڕیی کوردی ڕێکخراو کە ڕزگاری بوو بوو لە سەرکردە عەشایەرییی و بورجوازیەکان و بهێڵرایە ئەو موڵکدارە نیشتمانپەروەر کوردانە ڕێکخستنێکی تایبەت بەخۆیان هەبووایە کە پەیوەندی بەحزبی دیموکراتەوە هەبووایە، وەك ئەوەی لەسەردەمی -ڕزگاری- دا هەبوو کە لقێکی عەشایەریی تایبەتیان هەبوو.

بەڵام هەڵەی ئەم تاقمە شۆڕشگێڕە ئەوەبوو حزبە نوێیەکەیان بەجێهێشت- سەرەڕای ڕازیبوونی مەبدەئیان لەسەر دامەزراندنی و سەرەڕای پشتیوانیکردنیان و پێباشبوونیان بۆ پێویستی بوونی نمونەی ئەم حزبە ئەوان لەسەریان بوو لەناو حزبەکەدا خەباتیان بکردایە بۆ سەرخستنی لیستی شۆڕشگێڕە ڕاستەقینەکان. ئەو تێکۆشەرانە بەشێکی گەورە لە لێپرسراوێتی پەرتبوونی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕیی پێشڕەوییان لەکوردستانی عێراق دەکەوێتە ئەستۆوە. هەروەك چۆن مامۆستا حەمزەش بەشێکی گرنگ لەبەرپرسیارێتی سەرلەنوێ هێنانەوەی باڵی عەشایەریی بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا بۆ سەرکردایەتیکردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی شۆڕشگێڕیی نوێی دەکەوێتە ئەستۆوە کە بووە هۆی ئەوەی زۆرجار دوولایەنیەك لەسەرکردایەتیدا دروست بێت لەڕووی پێکهاتەو بیرکردنەوەو هەڵوێستەکانەوە هەروەها ئەم دوانگیرییە بووە هۆی لاوازکردنی حزبە دیموکراتیە نوێیەکەو وایکرد کەمێك ناساغانە لەدایك بوو.

سەرەڕای جیابوونەوەی ئەم تاقمە گرنگەش لەحزبی- شۆڕش- و ڕەتکردنەوەی بەشداریکردنی لەکۆنگرەی دامەزراندنی حزبی دیموکراتە نوێیەکەدا لە ١٦ ئابی ١٩٤٦ لەشاری بەغداد بەشێوەیەکی نهێنی و بە بەشداریکردنی دەیان نوێنەرو ئەندامێکی چاودێر لە لقی حزبی دیموکراتی کوردستان کە ئەویش مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بوو. کۆنگرە ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر پەیڕەو پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆی حزب و لیژنەی مەرکەزیی هەڵبژێردراو، بڕیاریدا ڕۆژنامەی -ڕزگاری- دەربکات بۆ ئەوەی ببێتە زمانحاڵی حزبە نوێیەکە، بەشێوەیەکی مانگانەو بەنهێنی دەردەچوو، مامۆستا حەمزە عەبدوڵلاش بووە پێچکەی سەرکردایەتە نوێیەکەو سکرتێری لیژنەی ناوەندیی و

پاشانیش بووە دەسەڵاتداری یەکەم تێیدا. بەوشێوەیە حزبە پێشڕەوییە[١٢١] کوردستانیەکە هاتە بوون بۆ ئەوەی سەرکردایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بکات، کە لەناوجەرگەیەوە هەڵقوڵابوو بەرزکەرەوەی دروشمە شۆڕشگێڕییەکەی بوو بەرگریکەربوو لەسروشتە دیموکراتی و جەماوەرییەکەی. سەرەڕای هەندێك کەموکوڕیش[١٢٢] کەهاوەڵێتی لەدایك بوونی حزبەکەی کرد، ئەوا رۆڵێکی گرنگی سەرکارو سەرپەرشتیارانەی گێڕا لەهەموو بوارەکانی خەباتی نیشتمانیدا وەك دواتر باسی دەکەین.

پەیڕەو پرۆگرامی حزبەکەو پەیماننامە نیشتمانیەکەی جەختکردنەوە بوو لەسەر ئامانجەکانی گەلی کوردی لەبەدەستهێنانی مافە نەتەوەیی و دیموکراتیەکانی لەچوارچێوەی یەکێتیەکی نیشتمانی بۆ عێراق کە حزب داوای بەرپاکردنی کرد لەسەر بنچینەیەکی ئارەزوومەندانەی برایانەی ئازاد، لەبری پێوەلکاندنی بەزۆر کە داگیرکەری بەریتانی سەپاندبووی پەیماننامە نیشتمانیەکەی حزب جەختی کردبۆوە لەسەر برایەتی عەرەبی کوردی و داوای خەباتی هاوبەشی کرد لەنێوان هەردوو گەلی عەرەبی و کوردیدا لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی و فەرمانڕەوایی سەر بە داگیرکەرو کۆنەپەرستیی، هەروەها لەپێناو رزگاربوونی عێراق و سەربەخۆیی تەواوەتی و بەرپاکردنی سستمێکی دیموکراتی پەرلەمانی دروست بۆ عێراق، بەوشێوەیە حزبێکی کوردستانی

---

[١٢١] – ناوی یەکەمی حزبەکە" پارتی دیموکراتی کورد–عێراق بوو. لەبری ووشەی حزبی عەرەبیش ووشەی پارتی لاتینی دانراو بەهۆی نامۆیی و نەناسراوی ووشەی پارتی و نوێیەکەی لەناوەندەکانی کۆمەڵگەی کوردیدا ئەوا حزبەکە بەناوی پارتیەوە ناسرا کاتێکیش دەوترێت –پارتی– ئەوا هەتا ئەمڕۆشمان مانای – حزبی دیموکراتی کوردستان– دەگەیەنێت– بەوشێوەیە پارتی بووە ناو و ئاماژەدەرێك بۆ ناوی ئەم حزبە، کۆنگرەی سێیەمی حزبیش ناوەکەی گۆڕی بۆ – پارتی دیموکراتی کردستان– عێراق– لەو کاتەوە کە لەسەردەمی لیوا قاسمدا مۆڵەتی پێدرا بووە حزبی دیموکراتی کوردستان.

[١٢٢] – بەتێڕوانینی من گرنگترین کەموکوڕیەکان جگە لەسەپاندنی ئەو ئەندامە موڵکدارانە نەبوونی دەقێك بوو لەبارەی چاکسازی کشتوکاڵی و ریشەکێشکردنی رەگی دەرەبەگایەتی و نەبوونی سیاسەتێکی شۆڕشگێڕیی پشت بە کرێکاران و جوتیاران و زەحمەتکێشان و رۆشنبیرە شۆڕشگێڕەکان ببەستێت پاشانیش نەبوونی دەقێکی راشکاو لەبارەی بانگەشەکردنەوە بۆ یەکێتیەکی نیشتمانی بۆ هەموو هێزە دیموکراتی و شۆڕشگێڕیەکان لەعێراقدا.

پێشکەوتنخوازی شۆڕشگێڕیی بۆ یەکەم جار لەمێژووی خەباتی نیشتمانی کوردیدا پەیڕەوێکی گشتگیر دەخاتەڕوو کە خزمەتی ئامانجەکانی هەردوو گەلی کوردی و عەرەبی دەکات ولەهەمانکاتدا دژ بە جیابوونەوەو پێوەلکاندن دەبێتەوە، داوای خەباتی هاوبەش دەکات لەنێوان نیشتمانپەروەرە کوردو عەرەبەکاندا حزب ئەو دروشمە ناسراوەی دارشت و بلاویکردەوە کە دواتر بزوتنەوەی دیموکراتی عێراقی تەبەنی کرد ئەویش ئەمەیە: -لەسەر تاوێری یەکێتی عەرەبی کوردی داگیرکەرو پرۆژەکانی و کلکەکانی لەناودەبرێن- هەروەها پرۆگرامەکە داوای چاکسازیی کرد لەژیانی کۆمەلایەتی و کشتوکاڵ و کانزایی و بانکەکان و بنبڕکردنی نەخوێنەواری و بلاوکردنەوە فێرکردنی بالاو دامەزراندنی زانکۆی کوردستان و هەروەها گەشەدان بە زمانی کوردی و ئەدەبەکەی و بلاوکردنەوەی رۆشنبیریی لەکوردستان و کردنی زمانی کوردی بەزمانی فەرمیی لەقوتابخانەکان و دامودەزگاکاندا.

بەلام ئاراستەی عەشایەریی[١٢٣] لەسەرکردایەتیدا کە بایەخپێدانی زیادی دەدا بە موڵکدارە کوردەکان و سەرۆك هۆزەکان رێگربوو لەوەی کە دەقێك بخرێتە ناو پرۆگرامی حزبەکەوە بۆ داواکردنی چاکسازی کشتوکاڵی و نەهێشتنی سستمی دەرەبەگایەتی، ئەم بەندە کە حزب لە کۆنگرەی سێیەمیدا لە ٢٧- کانون یەکەم-١٩٥٣دا خستیە ناو پرۆگرامەکەیەوە ئەویش دوای ئەوەی کە حزب هەڵوێستی دروستی تەبەنی کرد دەربارەی بابەتەکە لەساڵی ١٩٥١دا.

---

١٢٣ - لەمبارەیەوە پرۆفیسۆر بوخارد برینتیس دەڵێت:

" رەخنە لێگرتنی سەرەکی ئاراستەی سیاسەتی یەکگرتنی کۆمەلایەتی شکستخواردوی حەمزە عەبدوللا کرا، هەروەها تێگەیشتنە ئەندلمیە نەتەوەییەکەی بۆ شۆڕش. کورتکردنەوەی رەخنەکەش لەسەر خودی سکرتێر ئاڕادەیەك لەجێی خۆیدابوو. چونکە ئەو یەکەم و تاکە بەرپرسی کاروبارە کارگێڕیی و حزبیەکانە. حەمزەو نزیکترین پشتیوانەکانی پێیان وابوو کە بەرپابوونی شۆڕشی رزگاریخوازی نیشتمانی لەباکوری عێراق نزیکە" سەرکردایەتیشیکردنی بەدەست سەرۆك هۆزەکان دەبێت، هەربۆیە وازیان هێنا لەبونیادنانی رێکخراوێکی میللی ماندەرو داخوازییە کۆمەلایەتیەکانیان نەخستە ناو پەیڕەوەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە رێکخراوی ناوچەیی زۆر دروست بوون بۆ حزبە نوێیەکە بەلام حزب فەلسەفەو سەرکردایەتیەکی سیاسی روونی نەبوو".

دەرئەنجامەکانی پرۆفیسۆر برینتیس ئەوە پشتیوانی لێدەکات کە مامۆستا صالح حەیدەریی ئاماژەی بۆ کردووە دەربارەی ئەوەی مامۆستا حەمزە عەبدوللا وایدادەنا کە هۆزە دڵسۆزەکان بۆ نەتەوەی کوردی، هێزی سەرەکی شۆڕشی کوردن.

## ململانێی فیکری لەنێوان پارتی و شیوعیدا
## دەربارەی مەسەلە کوردیەکان

ئەوەی جێی داخە ململانێیەکی توند سەریهەڵدا لەنێوان حزبی شیوعی عێراقی و پارتیداو هەر لەوکاتەوە من پێموایە ئەگەر جیابوونەوەی ئەم- کۆمەڵە شیوعیە- نەبوایە هەروەها هەڵوێستی هەڵەی سەرکردایەتی هەردوو حزبی شیوعی و پارتی نەبوایە لەبەرامبەر یەکتردا، ئەوا دەکرا بگەنە بەیەکگەیشتنێکی ریشەیی پتەو لەنێوان هەردوو حزبەکەدا، بەتایبەتی کە یەکێتی سۆڤیەت- پێشەنگی بزوتنەوەی شیوعی جیهانی- بێ رکاربەر لەوکاتەدا- جەختی دەکردەوە لەسەر بوونی ئەم حزبە پێشڕەوە دیموکراتیانە وەك ئەوەی کە لە ئازربایجان و کوردستان هەبوو، لەبەرئەوە خوالێخۆش بوو "فەهد" یوسف سلێمان یوسف- سکرتێری حزبی شیوعی عێراقی لەوکاتەدا لەوتارێکیدا کە رۆژنامەی -القاعدة- بڵاویکردەوە لەنیسانی ۱۹٤٥دا داوای لە نیشتمانپەروەرە کوردەکان کرد بۆ ئەوەی حزبێکی وەك ئەم حزبە دروست بکەن. لە بانگەوازەکەیدا هاتبوو:

ئەی هاوڵاتیە هۆشیارەکان لەهەموو چینەکانی گەلی کورد، مەسەلەی گەلەکەتان ئەمانەتێکە لەگەردنتاندایەو ئێوە هەستن بە ئەرکی خۆتان لەبەرامبەر ئەو گەلەتانەدا کەهێنانیە بوون، بیبەن بەرەو ئەو رێگەیەی رزگاری دەکات لەم رەوشە خراپەی کە تێیدایە، رێکخراوێکی میللی و جەماوەری کوردی دروست بکەن بەشێوەیەك کە دەگونجێت لەگەڵ رەوشی گەلی کورددا رێکخراوێك کە خزمەتی بەرژەوەندیەکانی بکات، ئێوە کاربکەن و لەحزبەکەی ئێمەشەوە هەموو لایەنگریی و پشتیوانیەکتان لێدەکرێت-.

بەڵام ئەوەی جێی داخە ئەم بانگەوازە نەگۆڕا بۆ واقیعێکی بەرجەستە لەلایەن شیوعیەکانەوەو بەجدی کاریان بۆ نەکرد وەك ئەوەی کە دەبوو وە چاوەڕوان دەکرا، لەوەش زیاتر هەڵوێستی کرداریی لەگەڵ ئەم بانگەشەیەدا دژ دەوەستایەوەو، ناکۆکی لەنێوان هەردوو حزبەکەدا پەرەیسەندو ئەم شێوەیەی خوارەوەی وەرگرت:

١-لەمشتومڕدا دەربارەی بوونی -نەتەوەیەکی کوردی- بە تێگەیشتنی نوێ بۆ نەتەوە، شیوعیەکان نکوڵیان لێدەکرد تا ساڵی ١٩٥٢ کە پەیماننامەیەکی نوێی حزبی شیوعی عێراقی دەرچوو بە پەیماننامەی -باسم- ناسرا کە ناوی خوازراوی سکرتێری نوێی حزبەکە بوو- بەڕێز بەهادین نوری-. کە بەتوندی رەخنەی لەو هەڵوێستە گرت بەرامبەر مەسەلەی کوردو بە هەلخوازانە پێناسەی کرد بەهۆی بوونی مادەیەك لە پەیڕەوی حزبی شیوعیدا کەلەسەردەمی -فەهد-دا دەرچوو بوو هەریەك لە کوردەکان و تورکمان و یەزیدیەکان بە کەمە نەتەوە دادەنێت[١٢٤] ئەمە لەکاتێکدا کوردەکان خاوەن نەتەوەیەکی تایبەت بەخۆیانن- ئەگەرچی نەتەوەی بچووکن لەعێراقدا- یەزیدییەکانیش کوردن و تەنها بەئایین لەبرا کوردەکانیان جیاوازن، -باسم- رەخنەی لەپەیماننامەکەی فەهد گرت بەهۆی نەبوونی دەقێك تێیدا دان بە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد دا بنێت لەدیاریکردنی چارەنوسی خۆیدا.

کارێکی بەویژدانانەشە بوترێت هەڵوێستی -فەهد- لەبەرامبەر مەسەلەی کورد دا دۆستانە بوو سەرەڕای ئەو هەڵەیەی کە لەپەیڕەوی حزبی شیوعیدا هاتبوو تێیدا نەهاتبوو سەبارەت بەدیاریکردنی چارەی خۆنوسینی گەلی کورد چونکە پێشتر خوالێخۆشبوو -فەهد- وتارێکی لە -القاعدة- دا نوسیبوو لایەنگریی لەمافەکانی گەلی کورد کردبوو لەدیاریکردنی چارەنوسی خۆیدا، لە ژمارەی تشرینی دووەمی ساڵی

---

[١٢٤] -ئەو ڕاستیەی کە باسکرا لەدەقی مادەی دەدا بەدیار دەکەوێت:

"١٠- تێدەکۆشین لەپێناو دۆزینەوەی یەکسانی ڕاستەقینە لەمافەکاندا بۆ کەمە نەتەوایەتی کورد لەگەڵ رەچاوکردنی مافەکانی کۆمەڵە نەتەوەیی و رەگەزیە بچوکەکان وەك تورکمان و ئەرمەن و یەزیدیەکان" بگەڕێرەوە بۆ لا ١٥ لەکتێبی- مەسەلەی نیشتمانیمان- بە پێنوسی هاوڕێی نەمر فەهد) چاپخانەی النجوم- بەغداد ١٩٥٩.

لەدەقی ئەو مادەیەدا کە باسکرا ئەم هەڵانەی خوارەوە بەدیار دەکەوێت:

(١) کورد بەکەمە نەتەوە دادەنێت لەکاتێکدا نەتەوەیە.

(٢) لەبری دەقێك لەسەر چارەی خۆنوسین لەمادەی دەدا هاتووە کەوا خەبات دەکرێت لەپێناو یەکسانیدا وەك ئەوەی کێشەکە مەسەلەی یەکسانی بێت.

(٣) نەزانینی ڕاستەیەك کە یەزیدیەکان لەرووی نەتەوەییەوە کوردن و مایەی داخە حزبێکی سیاسی رەوشی کۆمەڵگەکەی خۆی نەزانێت.

١٩٤٥دا –القاعدة– نوسیویەتی و دەڵێت:– مافی چارەی خۆنوسین بۆ هەموو میللەت و نەتەوەیەك لەبنەماکان و ئامانجە بنچینەییەکانی حزبە شیوعیەکانە لەهەموو جیهاندا لەناویشیاندا حزبی شیوعی عێراقی.. حزبمان حزبی شیوعی عێراقی، حزبی کرێکاران و جوتیاران، حزبی جەماوەری گەلی عێراقمان بەتێکڕایەوە، تێدەکۆشێت لەپێناو بەرژەوەندی هەموو جەماوەری گەل، لەپێناو ئازادی کۆمەڵگەدا، بەمەش بۆ گەلی کوردو بۆ جەماوەرە زەحمەتکێشەکەشی رێکخراوە دیموکراتیە پێویستەکان فەراهەم دەبێت کەوای لێبکات بتوانێت ڕای خۆی دەربڕێت لەمانەوەی ئارەزومەندانە یان جیابونەوە کاتێك کەوا عێراق رزگاری بوو لەکۆت و بەندی داگیرکەر یان لەرەوشێکدا کە بگونجێت لەگەڵ گەلی کوردو لەبەرژەوەندی جەماوەر زەحمەتکێشەکەیدا بێت.. بەلآم بەداخەوە ئەو پەیماننامەی ناسرابوو بە پەیماننامەی فەهد بەتاڵ بوو لەهەر مادەیەك کە باس لەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد بکات لەدیاریکردنی چارەنوسدا یان حوکمی زاتیدا، لەکاتێکدا پێویست بوو یان ئەرك بوو دەقێکی راشکاوانە بخرێتە ناو پەیماننامەکەوە لەبەرامبەر مەسەلەی کوردیداو لەژێر رۆشنایی بیرۆکەو بنەماکانی لینیندا کە ئەو وایدادەنێت مافی چارەی خۆنوسین مافێکی رەهایە بۆ هەموو نەتەوەو گەلێك. نەبوونی ئەم مادەیەش لەپەیرەوەکەدا فاکتەرو هۆکارێك بوو لەسەر پێداگریی شیوعیە کوردەکان لەسەر پروپاگەندەکەیان دژ بەوەی کوردەکان بەنەتەوە دابنرێن.

بەلآم پارتیەکان لەو واقیعەوە دەیانڕوانی کە کوردەکان نەتەوەن و هەموو ئەو مافانەیان هەیە نەتەوەکانی تر هەیانە لەناویشیدا مافی چارەی خۆنوسین تێدەکۆشان بۆ بەکارهێنانی لەلایەن گەلی کوردەوە بەشێوەی یەکگرتنێکی ئارەزومەندانەی برایانە لەگەڵ گەلی عەرەبیدا لەسەر بنچینەی یەکگرتنێکی فیدراڵی وەك ئەوەی لەپەیماننامەی حزبی دیموکراتی کورددا هاتووە.

لەگەڵ ئەوەی حزبی شیوعی عێراقی پەیماننامەکەی –باسم–ی دواتر هەڵوەشاندنەوە بەلآم ڕاستیەتی ئەوەی کوردەکان نەتەوەن هەر لەو رۆژەوەو هەتا ئێستا بەجێگیریی و چەسپاوی مایەوە.

٢- لەبابەتی پێویستی بوونی حزبێکی پێشڕەوی کوردی و بوونی ڕێکخراوە کوردستانیە دیموکراتیەکان، ئەوان نکوڵیان لەبانگەوازەکەی -فەهد- کرد کە پێشتر باسمان کرد و دژایەتی بوونی حزبێکیان کرد ئەرکەکەی- سەرکردایەتیکردنی گەلی کوردی بێت بۆ گەیاندنی بەئازادی و رزگاربوونی- بەو پێیەی حزبی شیوعی عێراقی- سەرۆکی خەباتی گەلی عێراقیە بەکوردو عەرەبیەوە- بەپێی بانگەشەکانی ئەوان، هەروەك چۆن دژایەتیان کردو دژوەستانەوە لەبەرامبەر بوونی - ڕێکخراوە دیموکراتیە کوردستانیەکاندا- کە تایبەت بوون بەلاوان و خوێندکاران و ژنان بۆ ماوەیەکی درێژو لەسەر هەمان بنچینە.

ئەمە لەکاتێکدا پارتیەکان داوای پێویستی بوونی ئەم جۆرە حزبەیان دەکرد هەروەها بوونی ڕێکخراوە دیموکراتیەکان، پارتیەکان لەو ڕاستیەوە تێڕوانینەکانیان سەرچاوەی دەگرت کەوا کوردەکان نەتەوەیەك پێکدەهێنن خاوەن کۆمەڵگەی کوردستانیانەی جیایەو تایبەتمەندی و خەسڵەتی خۆیی هەیە، ئەگەرچی ئێستاش کوردستان داگیرکراو و دابەشکراوە بەهۆی سیاسەتە داگیرکاریەکانەوەو بەزۆر لکاندنی بەوڵاتانی ترەوە هیچ لەم ڕاستیە ناگۆڕێت.. بۆیە دەبێت خەبات بکرێت بۆ رزگارکردنی ئەم نەتەوەی کوردە لەدەست داگیرکەرو کۆنەپەرستی و بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکانی ئەم خەباتەش بەرهەمدارو بەسود نابێت ئەگەر ڕێکخراو نەبێت و لەژێر سەرکردایەتی حزبێکی پێشڕەودا نەبێت- بەشێوەیەك لەگەڵ رەوشی گەلی کوردا بگونجێت- کەواتە هەر دەبێت نمونەی ئەم جۆرە پارتە هەبێت، بەتایبەتی بوونی بزوتنەوەیەکی رزگاریخوازی شۆڕشگێڕیی بۆ گەلی کورد بەشێوەیەکی مێژوویی پەیدابووەو بابەتیانە پەرەدەسەنێت، بۆ سەرکەوتنی لەلایەك و بۆ چاککردنەوەی ئاراستە پێشکەوتنخوازی و شۆڕشگێڕیەکانی و بۆ گرەنتی سەلامەتی ئاراستە دژ بەداگیرکەریەکەی، هەردەبێت حزبێکی پێشڕەوی شۆڕشگێر بوونی هەبێت.

بەڵام مارکسیە کوردەکان ئەوانەی پێیان باشبوو بێنە ناو پارتیەوە جەختیان کردەوە کە مادام بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد، بزوتنەوەیەکی بەرپایەو هەیە بزوتنەوەیەکی رزگاریخوازی دژ بەداگیرکەرو کۆنەپەرستی و خاوەن ووزەگەلێکی شۆڕشگێڕییە، ئەوا دەبیت تەبەنی ئامانجە پێشکەوتنخوازی و دیموکراتیەکانی بکرێت و

کار بکرێت لەناو ریزەکانیداو بچنە سایەوە وەك رێخۆشکردنێك بۆ بردنی بەئاراستەی بەرژەوەندیەکانی جەماوەری گەلی زەحمەتکێش و لەرێگەی خەباتی هاوبەش لەگەڵ بزوتنەوە رزگاریخوازیەکانی گەلان لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی و لەپێناو رزگاربوونی هەموان و دیموکراسیەتدا، بەپێچەوانەی ئەوەشەوە وازهێنان لەم بزوتنەوە مێژوییە بابەتیە و چونە سایەی حزبی شیوعی عێراق ئەوا دەبێتە هۆی بواردان بە رەگەزە نەتەوەییە راستڕەوەکان و ئەو لایەنانەی کە حەزیان بەسازشکردن و بازرگانی کردن هەیە، بۆ ئەوەی هەستن بە ئاراستەکردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی و هەستە نەتەوەییەکانی ئاراستەیەکی زیانبەخش بە بەرژەوەندیەکانی عەرەب و کورد پێکەوە.

بەلام ئەو شیوعیانەی کە هاوکات دژی بوونی حزبێکی پێشڕەوی دیموکراتی بوون سوربوون لەسەر ئەوەی کە مارکسیە عێراقیەکان پێویستە یەك حزبی شیوعی لەخۆیان بگرێت بەبێ رەچاوکردنی جیاوازی نەتەوەییان. سەرەرای ئەوەش کە بوونی لقێکی حزبی شیوعی لەکوردستان شتێکی داهێنراوەو جیاوازە لەرێکخستنەکانی شیوعیەکان لەیەکێتی سۆڤیەت یان چیکۆسلۆفاکیا کە بۆ هەر گەلێك حزبێکی شیوعی هەیە کە بەشێکە لە حزبی شیوعی لەیەك دەوڵەتدا.. لەچیکۆسلۆڤاکیا بۆ نمونە حزبی شیوعی سلۆفاکی هەیە کە ئەندامە لەحزبی شیوعی چیکۆسلۆفاکیاداو سەرکردایەتیەکی تایبەت بەخۆیی هەیە کە بەسەرپەرشتی سەرکردایەتی حزبی شیوعی چیکۆسلۆڤاکی کار دەکات.

بەوشێوەیە دوو هەڵوێستی دژ بەیەك دەبینینەوە.. هەڵوێستی خوالێخۆشبوو -فەهد- کە داوای لە- هاوڵاتیە بەئاگاو هۆشیارەکان دەکرد لەهەموو چینەکانی گەلی کوردی- بۆ ئەوەی رێکخستنە جەماوەریی و میللیەکانیان پێکبهێنن- واتە دەبویست حزبێکی میللیان هەبێت بۆ ئەوەی -سەرکردایەتی گەلی کورد بکات- بەرەو رزگاربوون لەو رەوشە خراپەی- کە تێیدابوو، پاشانیش ئەو نیشتمانپەروەرە کوردانە رادەسپێرێت- نەك لقی کوردی حزبی شیوعی عێراقی- بۆ ئەوەی ئەرکی سەرکردایەتیکردنی گەلی کوردی لەئەستۆ بگرن، ئەو نیشتمانپەروەرانەی کە ئەگەر لەناو حزبە جەماوەرییەکەیاندا خۆیان رێکبخستایە ئەوا حزبی شیوعی یارمەتی دەدان وەك ئەوەی سکرتێرەکەی

بەڵێنی دابوو. ئەوە هەڵوێستی خوالێخۆشبوو– فەهد– بوو وەك لەوتارەکەیدا ڕایگەیاند.
بەڵام هەڵوێستی کرداریی شیوعیەکان ئەوا دژایەتیکردنی– پارتی دیموکرات – بوو– کە نیشتمانپەروەرە کوردە هۆشیارەکان دایانمەزراند.
کوا ئەو هەڵوێستە دۆستانەو زانستیانەو بەرژەوەندیەکان و ڕێنومایییەکان، لەو هەڵوێستە کردارییانەی کە دواتر شیوعیەکان لەبەرامبەر کوردەکاندا گرتیانەبەر دژایەتیکردنی هەموو جۆرێك ڕێکخستنی دیموکراتی و حزبی و پیشەیی بوو؟.
٣–سەبارەت بەهەڵوێست لەبزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردی کەلەکوردستان بە – کوردایەتی– ناسراوە شیوعیەکان و پارتیەکان هەروەها ناکۆك بوون لەسەری لەکاتێکدا شیوعیەکان نکوڵیان لێدەکردو بەشێوەیەکی کرداریی فەرامۆشیان دەکرد و بەشێوەیەکی تیۆریی بەحزبێکی نەتەوەیی بورجوازی– دەربەگایەتیان دادەنا کە سەردەمی بەسەرچووە– پارتیەکان جەختیان دەکردەوە لەوەی بزوتنەوەکەیان بزوتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی نیشتمانی دژ بە داگیرکەرو کۆنەپەرستیە، بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی بابەتی کە ناکرێت و دروست نیە نکوڵی ناوەڕۆکە پێشکەوتنخوازیەکەی و جەوهەرە شۆڕشگێڕیەکەی بکرێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێت لەناو ریزەکانیدا کاربکرێت و لەخۆبگیرێت و تەبەنی دروشم و داخوازیە ڕەواکانی بکرێت و گونجان لەگەڵ خەسڵەتە شۆڕشگێڕیی و پێشکەوتنخوازیەکەی بکرێت وەك ڕێگەخۆشکردنێك بۆ ڕێکخستنی و سەرکردایەتیکردنی لەلایەن حزبێکی کوردستانی شۆڕشگێڕەوە کە هەموو شۆڕشگێڕە کوردە مارکسی و پێشکەوتنخوازیەکانی کوردستان لەخۆی بگرێت.
لەکاتێکدا کەوا شیوعیەکان هەڵوێستی خۆیان گۆڕی لەبەرامبەر بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورددا، هەر لەکۆنفرانسی حزبەکەیانەوە ساڵی ١٩٥٦ گۆڕانکاریەکی ریشەیی ، بەڵام ململانێی فیکری بەچەندین شێوە لەسەر ئەو سێ خاڵەی کە باسکران لەنێوان هەردو حزبی شیوعی عێراقی و پارتی دیموکراتی کوردستاندا بەردەوام بوو. ململانێکەش کۆتایی هات دەربارەی گرنگترین ئەم خاڵانە بەسەرکەوتنی بیروبۆچونە ڕاست و دروستەکان. شیوعیەکان دانیان بەوەدا نا کوردەکان میللەتن و مافی چارەی خۆنوسینیان هەیە هەروەها مافی بوونی حزبێکی دیموکراتیش. هەندێ جاریش دانیان

دەدانا بە مافی دروستکردنی ڕێکخراوە دیموکراتیەکاندا. کۆنفرانسی حزبی شیوعی لەساڵی ١٩٥٦دا دانی نا بەڕاستیە بەرپێشەکانداو پێویستی خەباتی هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی هاوبەش لەدژی داگیرکەر چەسپێنرا لەپێناو:- دانپێدانی هاوبەرامبەر بە مافی بڕیاری چارەی خۆنوسین و بەڕەوایەتی خواستی هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی بۆ ڕزگاربوون و یەکێتی نەتەوایەتی- هەروەها کۆنفرانسەکە سەربەخۆیی خۆجێی بۆ کورستانی عێراقی تەبەنی کردو دانی نا بە:- سەربەخۆیی خۆیی بەپێی یەکگرتنێکی ئارەزومەندانەی خەباتێگڕانەی برایانە هاوپەیوەست بەو ڕەوشانەوە کە بەرژەوەندیەکانی هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی دەیخوازێت و بەشێوەیەکی روونیش بەرژەوەندیی خودی گەلی کورد، واتە ئەوە چارەسەرێکی کۆتایی نیە بۆ مەسەلەی نەتەوەی کوردو ناکرێت ببێتە ئەلتەرناتیڤێك بۆ مافی چارەی خۆنوسین بۆ نەتەوەی کورد[١٢٥]

هەروەها شیوعیەکان دواتر دانیان نا بەچەند ڕاستیەکی گرنگدا لەبارەی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کوردەوە- ئەوەشی لەراپۆرتی لیژنەی ناوەندی حزبی شیوعی عێراقدا چەسپاند لە ئازاری ساڵی ١٩٦٢ وەك لەخوارەوەدا هاتووە:

-بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد لەهەموو بەشەکانی کردستاندا بزوتنەوەیەکە[١٢٦] ناوەڕۆکێکە دیموکراتی گشتی هەیە چونکە لەخواستەکانی میللەتی کوردەوە هەڵقوڵاوە بۆ ڕزگاربوون و یەکێتی نەتەوەیی چونکە ئاراستەیە لەدژی چەوساندنەوەی نەتەوەیی و دژ داگیرکەرو بەکرێگیراوەکانی، هەروەها ئەمە بزوتنەوەیەکی هاوپەیمان و پێویستە بۆ خەباتی چینی کرێکارو جەماوەری میللی و هەموو هێزە دیموکراتیەکان- لەوڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەتێکۆشان دژ بەداگیرکەر و لەپێناو دیموکراتیەدا.

---

[١٢٥] - راپۆرتی لیژنەی ناوەندی حزبی شیوعی عێراق کەوا کۆنفرانسی دووەمی حزب لەئەیلولی ١٩٥٦دا رەزامەندی لەسەر نیشانداوە.

[١٢٦] - سەیری ئەو نامیلکەیە بکە بەناونیشانی- سیاسەتمان و رێبازمان بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوەی کورد لەعێراق چارەسەرێکی دیموکراتی دادپەروەرانە. بەغداد- ئازار ١٩٦٢ لا ٣٢.

سەرەڕای ئەوەی کە خەملاندن و نرخاندن لەلایەن شیوعیەکانەوە بۆ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەل هاوشێوەن لەگەڵ خەملاندن و نرخاندنی پارتی بۆی. بەلام شیوعیەکان تا ئێستا لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە نەکردووە لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیرو کامڵ و، تائێستا خەملاندنەکان کۆن و دیاریکراون و هەندێك جار لەئەدەبیاتیاندا دەردەکەوێت.

خاڵی ناکۆکی سەرەکیش لەوەدا مایەوە لەهەڵوێستی مارکسیە کوردەکاندا ئایا واباشترە بچنە ناو پارتیەوە یان لەناو حزبی شیوعیدا بمێننەوە.

خوا لێخۆشبوو سەلام عادل لەساڵی ١٩٥٦دا لەدیدارێکیدا لەگەڵ سەرکردەکانی پارتیدا بیرۆکەیەکی پێشنیارکرد پوختەکەی ئەوەبوو کە : شیوعیە کوردەکان هەموویان بچنە ناو پارتیەوە بەمەرجێك ژمارەیەك کادیری مارکسی دیاریکراو کەهەن لەناو پارتیداو لەناو حزبی شیوعیدا ڕێکبخرێن، واتە مانەوەی ژمارەیەك لەکادیری مارکسی دیاریکراوی ڕێکخراو لەناو حزبی شیوعیدا هاوکاتیش ئەم کادیرانە لەناو سەرکردایەتی پارتیشدا بن. لەگەڵ ڕاگەیاندنی ئەوەی کە حزبی شیوعیش ئامادەیە ژمارەیەك کادیری پارتی بخاتە ناو سەرکردایەتی حزبی شیوعیەوە. بەلام پارتی بیرۆکەی یەکخستنی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕیی لەکوردستان خستەڕوو ئەویش بەوەی کە شیوعیە کوردەکان بێنە ناو پارتیەوە و پارتیش وەك حزبێك بچێتە ناو لیژنەی هاریکاری و یەکخستنی خەبات لەگەڵ حزبی شیوعی عێراقدا. لەو کاتەدا پەیوەندی پارتی لەگەڵ حزبی شیوعی عێراقدا باش بوو.

# پارتی و حزبە نیشتمانیەکان

ئەمە بەنسبەت پەیوەندی پارتی لەگەڵ حزبی شیوعیدا کە هەندێك کات ئاڵۆز دەبوو کاتەکانی تریش باش بوو، بەڵام هەردوو حزبەکە وەك دوو هێزی لێك نزیك لەکوردستاندا مانەوە لەرووی دروشمەکانیان و چەمکە سیاسیەکان و ئامانجە قۆناغیەکانەوە.

بەڵام پەیوەندی پارتی- هەر لەدروستبوونیەوە- لەگەڵ حزبە دیموکراتیە عێراقیەکاندا وەك حزبی گەل بەسەرۆکایەتی مامۆستا عەزیز شەریف و حزبی نیشتمانی دیموکراتی بەسەرۆکایەتی مامۆستای خوالێخۆشبوو کامل چادرچی و حزبی یەکێتی نیشتمانی بەسەرۆکایەتی مامۆستا عەبدولفەتتاح ئیبراهیم بەگشتی پەیوەندیەکی باش بووە و پتەویش بووە لەگەڵ حزبی نیشتمانی دیموکراتیداو هەروەها لەگەڵ حزبی یەکێتی نیشتمانی کە هەر لەساڵی ١٩٤٧وە داوایکردووە چارەسەری مەسەلەی کوردی بکرێت لەسەر بنچینەی مافی چارەی خۆنوسین بۆ گەلی کورد. بەوەش دەبێتە یەکەم حزبی سیاسی عێراقی داوای ئەم چارەسەرە زانستیە بکات بۆ مەسەلەی کورد لەعێراقدا بەشێوەیەکی ئاشکراو بەفەرمی، هەڵوێستی هەموو حزبە چەپ و دیموکراتیەکانیش لەماوەی ساڵەکانی ١٩٤٦و ١٩٤٧دا لێك نزیك بوون لەبەرامبەر کۆمەڵێك لەگرنگترین مەسەلەکانداو هاوشێوەبوون بەتایبەتی لەو روەوە کە هەموویان دژی نوێکردنەوەی بەستنەوەی عێراق بوون بە داگیرکەری بەریتانیەوەو لەپێناو رزگارکردنی عێراق لەکۆت و بەندەکانی داگیرکەر لەرووی سیاسی و ئابوریی و سەربازیەوەو بۆ بەرپاکردنی ژیانێکی دیموکراسی پەرلەمانی دروست. تەنها پارتی بوو پەرچەمی بەرگریکردنی لەبارزانیەکان هەڵگرتبوو ئەوانەی گەڕانەوە بۆ عێراق لەسەرەتای ساڵی ١٩٤٧ و حکومەتی عێراق نەفیکردن. بەڵام حزبە عێراقیەکان- لەڕاستیدا- لەسەر ڕوپەڕی ڕۆژنامەکانیان هاوسۆزیان دەردەبڕی و داوایان لەحکومەتی عێراقی دەکرد بەباشی مامەڵەیان لەگەڵدا بکات.

بارزانیە دەربەدەرەکانیش ناچارکران بگەڕێنەوە بۆ عێراق دوای کەوتنی کۆماری دیموکراتی کوردستان و داگیرکردنی پایتەختەکەی لەلایەن هێزەکانی ئێرانەوە لەمانگی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦دا کەوتنی ئەم کۆمارەش گورزێکی بەهێزبوو بەر بزوتنەوەی

رزگاریخوازی کورد کەوت و شۆکێکی توند بوو بۆ هەموو نیشتمانپەروەرە کوردەکان لەهەموو شوێنەکانی کوردستاندا. بەتایبەتی کوردەکانی ئێران کە رێکخستنەکانی حزبەکەیان دارماو پەراگەندەبوو کۆمەڵێك گورزی بەهێزیان بەرکەوت دوای لەسێدارەدانی شەهید قازی محەمەدی سەر کۆمار کە خۆی دا بەدەست هێزەکانی ئێرانەوە لەگەڵ کۆمەڵێك لە نیشتمانپەروەرەکانی تردا[127].

بەڵام لەکوردستانی عێراق ئەوا نیشتمانپەروەرە کوردەکان خۆراگربوون لەبەردەم ئەم شۆکە بەهێزەدا بێ ئەوەی بهێڵن ئەم شۆکە- سەرەرای قورسیەکەشی- باوەڕیان پێ لەدەست بدات بە دادپەروەری و رەوایی مەسەلەی گەلەکەیان و حزبەکەیان و بەپێویستی بەردەمبوون لەسەر تێکۆشانی نیشتمانی و بەردەوامبوون لەسەر خەبات بەهێزو گورێکی توندڕەوە بۆ ڕوبەڕووبونەوەی رەوشە سەختە لەپێشەکان، لەساڵی ١٩٤٧دا دانوستان کرا لەنێوان پارتی و لقی حزبی دیموکراتی کوردستانیدا کۆتایی هات بەوەی لقەکە بێتە پاڵ پارتیەوە بەسەرکردایەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کە بووە سەرۆکی لیژنەی ناوچەی سلێمانی حزبی دیموکراتی کوردی-پارتی- ئەم یەکگرتنەش بەهێزبوونێك بوو بۆ پارتی و بۆ بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردو لەو کاتەوە ئیدی پارتی بەتەنها نوێنەرایەتی رووی دیارو ئاشکرای بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی دەکردو سەرکردایەتیکردنی لەکوردستان عێراق لەئەستۆگرت و، لایەنە پێشکەوتنخوازو شۆڕشگێڕیەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیش خۆیان تێدا دەبینینەوە وەك چۆن پارتیش گوزارشتی لێدەکردن و لەئامانج و خواستەکانیان هەتا بووە نوێنەریان.

بەڵام چوار ئەفسەرەکە سەرۆکی یەکەمی روکن عیزەت عبدولعزیز و سەرۆك مستەفا خۆشناو و مولازمی یەك خەیروڵلا عبدولکریم و ملازم محمد قودسی کە خۆیان رادەستی حکومەتی عێراقی کردەوە لەبەرەبەیانی رۆژی ١٧- حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧دا لەسێدارە دران لەسەر دەستی حکومەتەکەی صاڵح جەبردا ئەم تاوانە گەلی کوردی وروژاندو لە

---

[127] - خۆبەدەستەوەدانی شەهید قازی محەمەد هەڵەیەکی سیاسی گەورە بوو کەهەرگیز شایانی ئەو نەبوو. ئەو تێکۆشەرەی کە سەرکردایەتی بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی بکات هەرگیز نابێت ڕیزەکانی بەجێ بهێڵێت لەهەموو رەوش و بارودۆخەکاندا.

شاری سلێمانی و لەناوچەکانی تردا خۆپیشاندانی گەرمی لێکەوتەوە وەك نارەزاییەك لەبەرامبەر رژێمی کۆنەپەرستی عێراقی کە تاوانێکی نوێی دەرهەق بەگەلی کورد ئەنجام دا.

حزب سەرکردایەتی ئەم خۆپیشاندانە جەماوەریانەی کردو هەڵمەتێکی نارەزایی لەهەموو ناوچەکانی کوردستاندا رێکخست دژی لەسێدارەدانی چوار لەباشترین ئەفسەرەکانی کوردستان و لەکۆنترین ئەندامەکانی و دامەزرێنەرەکانی، بەوشێوەیە حزب بەچالاکیەکانی پەرۆشی و ئازایەتی جەماوەری کوردی تاودا کە کۆنەپەرستی عێراقیی وویستی بەر بە ئیرادەکانی بگرێت لەخەبات و تێکۆشان، ئەویش بەتاج لەسەرنانی تیرۆرە رەشەکەی بەخوێنی چوار ئەفسەرە شەهیدەکەی کوردستان، ئەو خۆپیشاندانە جەماوەرییە پاڵەوانانەش وەڵامدانەوەیەکی بەهێزی کۆنەپەرستیی عێراقی بوو کە دەستەکانی بەخوێنی رزگاریخوازانەی گەلەکەمان سوور بوو بوو.

چوار ئەفسەرە نیشتمانپەروەرەکە لەلایەن سەرکردایەتی عەشایەریی بزوتنەوەی بارزانەوە و لەژێر هەرەشەی کوشتندا ناچارکران بگەرێنەوە بۆ عێراق، دوای ئەوەی چوار ئەفسەرەکە رووبەرووی سوکایەتی و کەساسی و بێدادی و هێرشکردنە سەری نابەجێ بوونەوە ناچاربوون خۆیان رادەستی دەسەڵاتدارانی عێراق بکەنەوە پێیان باشتربوو وەك شەهیدی گەلەکەیان بەدەستی دوژمنانی گەل بمرن نەك بەتۆمەتی جوراوجۆری ناماقوڵ و لاواز بەدەستی خەڵکانی هاوخوێنیان تیرۆر بکرێن.

لەوەستانی ئەو تێکۆشەرانەشدا وەك پاڵەوانی شۆرشگێرو راپەریو لەبەردەم سێدارەکاندا ئەوەی لەوتەکانیاندا دەردەکەوێت کاتێك چوونە بەر سێدارەو لەوەسیەتنامە مێژووییە بڵاوکراوەکەیاندا دیارە باشترین بەڵگەیە لەسەر رۆحیەتی خەباتێگێریی و دڵسۆزیان بۆ گەل و نیشتمانەکەیان.

## -وەسیەتنامەی چوار شەهیدەکە-

*لەشەهیدانی نیشتمانەوە، عیزەت عبدولعزیز، مستەفا خۆشناو، خەیروڵلا عبدولکریم، محمد قودسی. بۆ براکانمان ڕۆڵەکانی گەلی کوردی خۆشەویست..*

*دوای ئاگادارکردنەوە بۆ جێبەجێکردنی لەسێدارەدان بەکاتژمێرێك..*

*برایان..*

*لەکاتی نوسینی ئەم نامەیەوە تەنها (١٤) کاتژمێرمان ماوە لەکۆیلایەتی و ژیان لەژێر دەسەلاتی داگیرکەردا پاشان بەدونیای ئازادی دەگەین و ڕۆحمان بەرۆحی شەهیدە سەربەرزەکانی نیشتمان شاد دەبێت..*

*برایان..*

*لەراستیدا ئێمە خۆشحاڵین بەوەی لەبەجێگەیاندنی ئەرکی نیشتمانیماندا دوانەکەوتووین و تاکە ئامۆژگاریشمان ئەوەیە بۆ نیشتمانپەروەران و لاوانی کورد خۆنەویستیی رێچکە و یەکگرتن ئامانجیان بێت لەتێکۆشان بۆ شکاندنی تەوقی کۆیلایەتی داگیرکەرو رزگاربوونی هەموو نەتەوە زوڵملێکراوەکان بەبێ جیاوازی.*

*ئەی برایان..*

*دوژمنی نەزانی بن و بەهەموو هێزو تواناکانتانەوە ڕووبەڕووی ببنەوەو هەرگیز شوێن نەزانی مەکەون. ئێمە هێمای تێکۆشانی گەلەکەمانین بۆ ساڵی ١٩٤٧. برا خۆڕاگرەکانیشمان بەردەوام دەبن لەتێکۆشان لەرێگای شەرەفداو پشتیوان بەخوای گەورەش سەردەکەون و گەلەکەمان رزگاری دەبێت.*

*ئەی برایان..*

*وەستانمان لەبەردەم سێدارەکاندا لەبەزین و کۆڵدان و دووردڵیمانەوە نەبووە لەتێکۆشان، بەڵکو هەمیشە وەك سەربازێکی بەوەفاو دڵسۆز ماینەوەو بەهەموو توانایەکمانەوە تێکۆشاین تا بەم ئەنجامە گەیشتین..*

*بەرەو یەکگرتن.. بەرەو رزگاربوون*

*بژی کورد... بژی کوردستان..*

گەلی کورد بەسەرکردایەتیکردنی پارتی لەخەباتکردن بەردەوام بوو ، هاوشان لەگەڵ گەلی عەرەبی برایدا دژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی فەرمانڕەواو پارتی دیموکراتی کوردی وەك سەرکردەو پێشڕەوی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی رۆڵێکی گرنگی گێڕا لەگەڵ تێکڕای نیشتمانپەروەرە عێراقیەکاندا لەپوچەڵکردنەوەی پرۆژە داگیرکەریەکاندا بەگشتی و پەیماننامەی پۆرتسموث بەتایبەتی.. حزب لەگەڵ حزبی گەل و حزبی شیوعی و باڵی جیابۆوە لەحزبی نیشتمانی دیموکراتی بەسەرۆکایەتی کامل چادرچی، بەگەرموگوڕیەوە بەشداری کرد لە خۆپیشاندانەکانی راپەڕینداو لەگەڵ ئەم راپەڕینەدا- لیژنەیەکی هاریکاری دروستکرد کە سەرکردایەتی راپەڕینی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ی شکۆداری کرد کە شکستی بە پەیماننامەی (جبر- بیفن) ی داگیرکاریی هێنا کە ئامانجی ئەوە بوو کۆتەکانی کۆیلەکردنی عێراق نوێکاتەوە سەرلەنوێ بیبەستێتەوە بە چەرخەی ئیمپراتۆری بەریتانیەوە، ئەو لیژنەی هاریکاریەش یەکەم لیژنە بوو چەند حزبێکی چەپی یەکخست.. هیوا وابوو ببێتە ناوك و کرۆکی بەرەیەکی نیشتمانی هەموو حزبە دیموکراتیەکان لەخۆبگرێت بەڵام ئەو هیوایە نەهاتە دی بەڵکو بەپێچەوانەوە لیژنەی هاریکاریەکە هەڵوەشایەوە.

دوای سەرکەوتنی یەکەم کە هاریکاری نیشتمانی بەدیهێناو لیژنەکە پێکهاتبوو لە بەرێزان خوالێخۆش بوو عەبدولڕەحیم شەریف[١٢٨] پارێزەر لەحزبی گەل و پارێزەر رەشید عەبدولقادر[١٢٩] لەپارتی دیموکراتی کوردی و مالك سەیف لەحزبی شیوعی عێراقی و

---

[١٢٨] - خوالێخۆش بوو عەبدولڕەحیم شەریفی پارێزەر، لەسەرکردەکانی حزبی گەل و برای سەرۆکەکەی مامۆستا عەزیز شەریف بوو بەهۆی خیانەتکردنی مالك سەیفەوە بەسێ ساڵ زیندانی و کاری قورس حوکمدرا، دوای دەرچوونی بووە یەکێك لەسەرکردەکانی حزبی یەکێتی شیوعیەکانی عێراق، پاشان بووە ئەندام لە لیژنەی ناوەندی حزبی شیوعی عێراق دوای ئەوەی ئەم حزبە لەساڵی ١٩٥٦دا پەیوەندی کرد بەحزبی شیوعی عێراقەوە، بەردەوام بوو لەخەباتکردن دەمێك بەخۆپەنادان و بە چوونە زیندان و دەستگیرکردن هەتا شۆڕشی ١٤ تەمموز دوای ئەوە گۆڤاری (الثقافة الجديدة)ی دەرکرد، پاشان بووە سکرتێری سەندیکای رۆژنامەنوسان لەدەستەی کارگێریدا کە مامۆستا جەواهیری سەرۆکایەتی دەکرد، (هەروەها نوسەری ئەم چەند دێڕەش ئەندام بوو تێیدا).

[١٢٩] - پارێزەر رەشید عەبدولقادر لە گەنجە رۆشنبیرەکانی هەولێر بوو، لەسەرکردەکانی شۆڕش و پارتی بوو- سێ ساڵ زیندانی کرا دوای خیانەتکردنی مالك سەیف کەلەدادگا لەدژی شایەتی دلو سێ ساڵ زیندانی کرا، دوای

خوالێخۆشبوو کامل قازانچی و پارێزەر لەباڵی جیابۆوە لەحزبی نیشتمانی دیموکراتی. بەڵام پەیوەندی لەنێوان هەردوو حزبی گەل و حزبی دیموکراتی کوردی پەیوەندیەکانی هەردوو حزبی پتەو و توندوتۆڵکرد.

پارتیەکان لەو خۆپیشاندانانەدا چالاکانە بەشداریان کرد کە بووە هۆی هەڵگیرساندنی راپەرینی نیشتمانی و پێشڕەوانی پارتی رۆڵێکی دیاریان گێڕا لەخۆپیشاندانەکانی کۆلیژی مافدا کەلەسەرەتای کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ەوە دەستیپێکردو لەو خۆپیشاندانانەدا تێکۆشەری شۆڕشگێڕ عومەر مستەفا دەبابەی پارێزەر – ئێستا ئەندامی لیژنەی ناوەندی حزبی دیموکراتی کوردستانە.– بریندابوو کە رۆڵێکی دیاری تێیاندا گێڕا.

جەماوەری شاری سلێمانیش بەشداریان کرد لەو خۆپیشاندانانەدا کە حزب هەستابوو بەرێکخستنیان وەك پشتیوانیەك لەجەماوەری تووڕەی شاری بەغدا. محمد زیاد ئاغای نوێنەری کۆیەش کە ئەوکات ئەندامی حزب بوو دەستی لەکارکێشایەوە وەك نوێنەر لەگەڵ کوتلەی نیشتمانیدا لەنوێنەرە بێ لایەنەکان ئەوەش وەك نارەزاییەك بەرامبەر ئەو قەسابخانەیەی حکومەتەکەی صالح جەبر دژ بەنیشتمانپەروەران بەرپای کرد، پاشان حزب دەستی کرد بەرێکخستنی خۆپیشاندان و کەرنەڤاڵی میللی و چەندین کۆبونەوەی جەماوەری بۆ بەرگریکردن لە دەسکەوتەکانی گەلی عێراق وە لەو راپەرینەی کە لەو هێرشە پێچەوانەیەدا وون بوو کە کۆنەپەرستیی عێراقی کردی و سودی لە جەنگی فەلەستین و حوکمە عورفیەکان و پەرت و بڵاوکردنی حزبەکان و هێزە نیشتمانیەکان وەرگرت هەروەها پەلکێشکردنی حزبی سەربەخۆیی نەتەوەیی عەرەبی بۆ هەڵوێستگەلێکی تیرۆرستی کە ئازاری بزوتنەوەی نیشتمانی داو زیانێکی زۆری پێگەیاند

---

دەرچوونی لەزیندان بەردەوام بوو لەخەباتی وەك ئەندام لەلیژنەی ناوەندی پارتیدا تا ساڵی ١٩٥٥ کە وازی لەحزب هێنا. مامۆستا صالح حەیدەریی لەبارەیەوە دەڵێت ئەو یەکەم قوتابی هەولێری بوو فەلسەفەی مارکسی– لینینی قەبوڵکردو هاوکاریکرد لەبڵاوکردنەوەی لەشارەکەیدا. دەرچوونی لەحزب مایەی داخێکی زۆربوو لای ئەوانەی کە خەبات و رەوشتی بەرزو دڵسۆزیی ئەم پیاوەیان دەناسی، بەتایبەتی کە ئەو لەدرەوشاوەترین لاوانی رۆشنبیری هەولێر بوو.

پاشـان ئـەو خیانەتـەی کـە لەسـەرکردایەتی حزبـی شـیوعی عێراقیـدا رویـدا کـە مالـك سەیف[١٣٠]ی بەرپرسی یەکەم لەدەرەوەی زیندان کـردی و کۆنەپەرسـتی عێراقـی بـەکاری هێنـا بـۆ ئەنجامـدانی هەڵمـەتێکی دەسـتگیرکردنی فـراوان و پاشـان دانـانی پیلانـی تیرۆرکردنی سەرکردەکانی حزبی شـیوعی عێراقـی: فەهـد، زەکـی بـسیم، حـسێن محمد الشبیبی کە نوری سەعید لەساڵی ١٩٤٩دا جێبەجێی کرد.

لەو ماوە کورتەدا کە عێراق هەندێك ئـازادی دیمـوکراتی بـەخۆوەبینی حزبـی دیمـوکراتی کوردی هەوڵیدا رەوشـەکە بقۆزێتـەوە بـۆ ئـەوەی سـوود لەهـەموو شـێوەکانی خـەبات و تێکۆشان وەربگرێت لەناویشیدا تێکۆشانی ئاشکراو رۆژنامەی ئاشکرا.

هـەروەها لـەو ماوەیـەدا حـزب بـەردەوام بـوو لەسـەر بەیاننامـەکانی و بلاوکراوەکـانی وەلەرێگـەی بەشـداریکردنی ئەندامەکانیـەوە لەخۆپیـشاندانەکان و کۆبونەوەکانـدا، بەردەوام بوو لەپشتیوانیکردن لەخەباتی گەلانی عەرەبی دژی داگیرکەرو هاوپەیمانیەتیە داگیرکەریەکان لەپێناو سەربەخۆیی تەواوەتیدا.

هەروەها حزب بەردەوام بوو لەدەرکردنی گۆڤارەکەی– رزگـاری– کـە دەنگدانەوەیـەکی دروستکرد لەناوەندە نیشتمانیەکاندا لەدوای راپەرینەکەوە بەبلاوکردنەوەی وتارێك تێیدا رەخنـەی لەهەڵوێـستی وەصـی ئـەمیر عەبـدولئیلاە گـرت کـە دژ بەگـەل و ئامانجـە نیشتمانیەکانی بوو.

لەهەڵبژاردنەکانیشدا کە لەژێر رەوشی تیرۆرو تۆقاندندا ئەنجامدرا سەرلەنوێ پـاڵێوراوی پارتی دەرچووەوەو بووە نوێنەر لەپەرلەماندا کە پاشان هاریکاری کرد لەگـەڵ نوێنـەرانی حزبی– نیشتمانی دیمـوکراتی و سـەربەخۆیدا– بـۆ پێکهێنـانی ئۆپۆزسیۆنی نیـشتمانی لەناو ئەنجومەنی نوێنەراندا.

چالاکیەکانی حزب و کارە نیشتمانیەکانی زۆر نارەحـەتی و ئاسـتەنگی بـۆ دروسـتکرد و داگیرکـەران و فـەرمانڕەوا کۆنەپەرسـتەکان ئیرەییـان پێـبرد بۆیـە دەسـتیان کـرد بـە

---

[١٣٠] – مالك سەیف ئەندام بوو لە لیژنەی ناوەندی حزبی شیوعی عێراقیدا تا رۆژی ناپاکیکردنەکەی ١٩٤٨–١٩٤٩ پاشان بووە بەکرێگیراوێکی ئاشکرا بۆ لێکۆڵینەوە تاوانیەکان، پاشانیش بووە بـەکرێگیراوی دەزگا ئەمینـەکانی عێراق.

هەڵمەتێکی دەستگیرکردنی فراوان– دژ بەئەندامەکانی و سەرکردە ناسراوەکانی–. حکومەت دکتۆر جەعفەر محمد کەریمی دەرکردو رەگەزنامەکەی لێسەندەوەو، لەعێراق دەرکرا، هەروەها مامۆستایان: ئیبراهیم ئەحمەدو، عومەر مستەفا، رەشید عەبدولقادر و سەدان کەسانی تر لەسەرکردەکانی حزب و رێکخستنەکانی و ئەندامە چالاکەکانی دەستگیرکران. تیرۆر بەسێبەرە قورسەکەی باڵی بەسەر عێراقدا کێشا، کوردستان و ناوەڕاست و باشوری گرتەوە. بزوتنەوەی نیشتمانی و دیموکراتی بەرتەسک بۆوە. بەهەزاران خەڵکی ئازادیخواز ڕاپێچی زیندانەکان کران. لەبری رزگارکردنی فەلەستین و رێگرتن لەدامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل تێیدا، حکومەتی عێراقی هەموو تواناکانی خۆیی بەکارهێنا بۆ سەرکوتکردنی بزوتنەوەی نیشتمانی تازە گەشەکردو. لەبەرامبەر هەموو ئەمانەدا چالاکی پارتیش بەوە کاریگەر بوو رێکخراوەکانی کەمبونەوەو بازنەی چالاکیەکانی بەرتەسک بوونەوە، لەساڵی ١٩٥٠دا مامۆستا حەمزە عەبدوڵلا دەستگیر کراو بەوەش لیژنەی ناوەندی یەکەم کۆتایی هات کە زۆربەی ئەندامەکانی وازیان لەکاری حزبی هێنا یان زیندانی کران یان ئاوارەبوون.

## پەرەسەندنەکان لەناو پارتیدا

دوای دەستگیرکردنی مامۆستا حەمزە کۆنفرانسێکی حزبی بەسترا لێیەوە سەرکردایەتیەکی کاتی هەڵقولا کە دواتر بەشی هەرە زۆری ئەندامەکان و ڕێکخراوەکان پێی ڕازی نەبوون ئەمەش بووە هۆی ئەوەی لەساڵی ١٩٥١دا کۆنگرەی دووەمی حزب ببەسترێت لەماڵی شەهید عەلی حەمدی لەبەغداد تێیدا لیژنەیەکی ناوەندی هەڵبژێرا سکرتێرەکەی ئیبراهیم ئەحمەد بوو، هەڵبژاردنی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد ڕێکەوتنێکی دەستەجەمعی لەسەر بوو لەنێوان راوبۆچونە جیاوازەکاندا، بەڵام کۆنگرەکە نەچووە ناو بابەتی پەیرەو و پرۆگرامی ناوخۆو لێیگەڕا بۆ کۆنگرەی سێیەم لە٢٦ کانونی دووەمی ساڵی ١٩٥٣دا بەشێوەیەکی نهێنی لەشاری کەرکوك بەستراو تێیدا ناوی حزب لەحزبی دیموکراتی کوردی عێراق–ەوە گۆڕا بۆ حزبی دیموکراتی کوردستان– عێراق.

ئاراستەی سەرکردایەتی حزبی –سکرتێرەکەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد– بەچەپرەویەکی ئاشکرا جیادەکرایەوەو بە پێشکەوتنخوازی دانرا بە بەراوورد لەگەڵ پێشینەکەیدا لەگرنگترین بابەتە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکاندا. لەسەر ئاستی ناوخۆیی حزب تەبەنی چاکسازی کشتوکاڵی و دژایەتی کردنی دەرەبەگایەتی و عەشایەریی و سیاسەتی بەگریکردن لەجوتیاران کرد هەروەها پێکهێنانی کۆمەڵەی نهێنی بۆیان و هاندانیان بۆ تێکۆشان لەدژی دەرەبەگایەتی کوردی و داوایکرد نەوت و پیشەسازیە گرنگە سەرەکیەکان خۆماڵی بکرێن و بەرگری بکرێت لەمافەکانی چینی کرێکارو تێکۆشان لەگەڵیداو چوونە ناو ریزکانیانەوەو لەسەر ئاستی سیاسیش سەرکردایەتیە نوێیەکە داوای چوونە بەرەی سەربازگەی سۆشیالیستی کرد لەدژی داگیرکەری بەریتانی و بیرۆکەی بێ لایەنی ڕەتکردەوە و داوایکرد ڕێکەوتنامەکان لەگەڵ بەریتانیادا هەڵبوەشێنرێنەوەو حوکمی پاشایەتی بڕوخێت و کۆمارێکی دیموکراتی میللیی لەعێراق دابمەزرێت و حوکمی زاتی بدرێتە گەلی کورد لەچوارچێوەی کۆماری عێراقی دیموکراتی میللیدا.

لەبواری جەماوەریشدا حزب تێکۆشا بۆ دامەزراندنی یەکێتی قوتابیانی کوردستان کە لەساڵی ١٩٥٣دا بەسەرۆکایەتی شەهید خالید ئەحمەد عەبدوڵڵا دامەزرا و دامەزراندنی

یـەكێتی لاوانـی دیمـوكراتی كوردسـتان و یـەكێتی ئافرەتـانی دیمـوكراتی كوردسـتان و ڕێكخـراوە دیموكراتیـە كوردسـتانیەكانی تـر، لـەبارەی دەسـكەوتەكانی كـۆنگرەی سێیەمەوە پرۆفیسۆر بوخارد برینیتس دەنوسێت:-

-حزب بڕیاریدا ڕێكخستنەكانی بونیادبنێتەوە بەپێدانی بایـەخ بـە كادیرەكـانی و كـاری پڕوپاگەندەو هاندان لەناو جەماوەردا. ئـەوەی جێگـەی بایەخـە بەشـێوەیەكی تایبـەتی پرۆژەی پەیڕەو پرۆگرامی ناوخۆییە لەلایەن كۆنگرەوە..-

- پرۆفیسۆر بەردەوام دەبێت لە ژماردنی خاڵە بنـچینەییەكان تێیـدا وەك: دامەزرانـدنی كۆمـارێكی دیمـوكراتی میللیـی و دەركردنـی هێزەكـانی بـەریتانیاو ڕوخانـدنی ڕژێمـی پاشـایەتی و هاوكـاری لەگـەڵ سـەربازگەی خۆرهـەڵاتی و بـەرپاكردنی سـستمێكی دیموكراتی نـوێ لـەعێراق و حـوكمی خـۆجێی بـۆ گـەلی كـوردی لەچوارچـێوەی كۆمـاری عێراقیداو چاكسازیەكی ڕیشەیی لەكشتوكاڵداو خۆماڵیكردنی نەوت و دامەزراندنی كێڵگـە هەرەوەزیەكان و فێركردنـی زۆرەملێیـی و خـۆڕایی و دواجـار دەڵێـت: ( بـۆ یەكـەم جـار پرۆگرامەكە ئەوەی تێدا دێـت كـە بزوتنـەوەی ڕزگـاریخوازی كـوردی بەشـێكی یەكسانە لەبزوتنەوەی ڕزگاریخوازی عێراقی و لەبەرئەوە ئەو كارەی كردۆتـە ئـەرك بەسـەر حزبـی دیموكر اتی كوردستانی-عێراقی كە بەپێی بەرژەوەنـدی كـۆی بزوتنـەوەی دیمـوكراتی و هەموو بزوتنەوە ڕزگاریخوازەكان كاربكات.

لەڕاستیدا ئاراستەی پێشكەوتنخوازیی چەپی نوێ لەحزبدا جەختی كردۆتەوە لەشوناسی حزبی جەماوەری شۆڕشگێڕیی و مۆركی بزوتنەوەی نەتەوەیی دژ بەداگیركەرو پاشایەتی و كۆنەپەرسـتی لـەدژی توانـەوەو جیابونـەوە پێكـەوە، هـەروەها جـەختی لـەهێڵی پێكەوەگرێدانی خەباتی هاوبەشی عەرەبی كوردی كردۆتـەوە لەچوارچێوەی بەرەیـەكی پێشكەوتنخوازی شۆڕشـگێڕی و وازهێنـان لەوەهمـەكانی بورجوزایـەت و ڕاسـتڕەوی لـە دیموكراتیەتی لیبرالی و چاكسازی دەستوری پاشـایەتی و هـەروەها حـزب سیاسـەتێكی ڕاشكاوانەی دیاریكرد لەدژایەتیكردنی داگیركەرو دەستوپێوەندەكانی و لەبانگەشـەكردن بۆ برایەتی عەرەبی كوردی و یـەكگرتنی ئارەزومەندانـە لـەنێوان هـەردوو نەتـەوەی بـراو لەبەسـتنەوەی بزوتنـەوەی نەتـەوەیی كـوردی بەبزوتنـەوەی دیمـوكراتی عێراقیـەوە

بەستنەوەیەکی چارەنوس سازانە و ڕوانین بۆی وەك بەشێك لە بزوتنەوەکانی گەلانی خۆرهەلاتی و ڕزگاریخوازیی کە هەرگیز لێی جیانابێتەوە.
سەروەریی ئەم ئاراستە پێشکەوتنخوازیەش لەحزبدا گەلاڵە بوو لەبەشداریکردنی حزبەوە لەچالاکیەکی یەککگرتوودا لەگەڵ لایەنە چەپەکان و شیوعیە عێراقیەکان و لەجموجوڵەکانی ئاشتی و فیستیڤاڵە نێودەوڵەتیەکان و لەو هەڵبژاردنانەوە کە بەرەی نیشتمانی بەشداری تێدا کردو پاڵێوراوی پارتی سەرکەوت و پاڵێوراوەکانی تریش هەزاران دەنگیان بەدەست هێنا سەرەڕای ساختەکردن و دەستوەردانی حکومیش.
حزب خەباتێکی سەرسەختانەی کرد لەدژی داگیرکەرو پەیماننامە دوژمنکاریەکانی بەتایبەتی پەیماننامەی بەغداد-سنتۆ- کە ئامانج لێی دژایەتیکردنی نەتەوەی عەرەب و نەتەوەی کورد بوو هەروەها هەڕەشەکردن لەئاسایش و سەربەخۆیی گەلان و یەکێتی سۆڤیەت و توندکردنی چنگی قۆرخکاریی داگیرکاری لەخۆرهەلات و فراوانکردنەوەی قەڵەمڕەویی داگیرکاریی، لەنێو ئامانجە سیاسیەکانی سنتۆشدا دژایەتیکردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی بوو هەروەها تێکشکاندنی و هێشتنەوەی گەلی کورد بەشێوەیەك بێبەش لەهەموو مافە نەتەوەییەکانی. دواتریش بەڵگەنامەکان دەریانخست کە ئەو پەیماننامە تاوانکارییە ئامانجی ئەوە بوو بۆمبی ئەتۆمی لەکورستان بدرێت بۆ ئەوەی دیوارێکی ئەتۆمی لەرووی هێزەکانی سۆڤیەتدا دروست بکرێت. ئەم ڕاستیە لەبارەی پەیمانی سنتۆوە بەتەنیشت سروشتە داگیرکەریی و کۆنەپەرستیە تاوانکاریەکەیەوە، پێویستە لەبەرچاوی هەموو کوردە نیشتمانپەروەرەکان روون بێت بۆ ئەوەی ڕاستی نیازو نیەتەکانی ئەم پەیمانە ببینن و بۆ ئەوەی بە پلانەکانی و هەوڵە پیسەکانی هەڵنەخلەتێن بۆ سودوەرگرتن لەناکۆکی نێوان کوردەکان و حکومەتی عێراقی، ئەویش لەبەرئەوەی داگیرکەرو پەیمانی سنتۆ- دوژمنانی سەرسەختی گەلی کوردن.
ئەو فرمێسکە تیمساحیانەش کە سنتۆ بۆ نەتەوەی کوردیان دەڕێژێت تەنها بۆ ئەوەیە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی لەسەر ڕێی خەباتی شۆڕشگێڕیی لابدەن و هەندێك لەبەشەکانی لێ بکڕن بەئامانجی ئەوەی لەدژی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی کوردی بەکاری

بێنێتــەوەو ناوەرۆکــە پێــشکەوتنخوازی و دیموکراتیەکــەی دەربهێنێــت و پاشــانیش بزوتنــەوەی پێــشکەوتنخوازی کــوردی تێکبــشکێنێت. ئــەو هەنــدە یارمەتیانــەش کــە پێشکەشی دەکات تەنها هەنگوینێکە ژەهری کوشندە بـۆ بزوتنـەوەی نەتـەوەی کـوردی دەشارێتەوە.

لەکاتی توندبوونی خەباتی نەتەوەی عەرەبی دژی داگیرکەر و پەیمانـەکان و دەرکـەوتنی قاهیرە پایتەختی کۆماری میصریی- دژ بەداگیرکەر- وەك قەلآیەك بۆ خەباتی عـەرەبی لـەدژی پەیمانـەکان و داگیرکـەر، نەتـەوەی کـورد هـەر زوو دەسـتیکرد بـە پتـەوکردنی خەباتی هاوبەش لەگـەڵ عەرەبداو پێشڕەوە پێـشکەوتنخوازەکەشی-پـارتی- هـەر لـە ساڵی ١٩٥٦ەوە دەستی بە کاری جدیی کرد بۆ نزیککردنەوە لەنێوان هەدوو بزوتنـەوەی نەتەوەیی عەرەبی و کوردیـدا و لـەپێناو یەکخـستن و پێکـەوە پەیوەسـتکردنی خـەباتی شۆڕشگێڕیدا، لەساڵی ١٩٥٦دا بزوتنـەوەی عـەرەبی ئـازاد کـە میـصریی ناصـریی کـردە بنکەو پێگەی خۆی ، دەستیکرد بە چوونە نـاو جـەنگێکی ئاشـکراوە لـەدژی داگیرکـەرو پەیمانی بەغدای داگیرکاریەوە.

دوای خۆمـاڵیکردنی کـەناڵی سـوێس و ئـەو مامەڵـەی چـەکەی کـە میـصر لـە یـەکێتی سۆڤیەت و چیکۆسلۆفاکیای کڕی لەعێراق بزوتنەوەیـەکی هاریکـاری نیـشتمانی لەگـەڵ میصر بەرپابوو کە حزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان بەشداری تێدا کردو خـەباتی عەرەبی تاوسەندووی عەرەبیش بووە هۆی تاودانی خەباتی گەلی کوردیش کە ڕاپەڕی بۆ پتـەوکردنی خـەباتی هاوبەشـی لەگـەڵ گـەلی عەرەبیـدا لـەدژی داگیرکـەرو پەیمانـە سەربازیەکان و لەپێناو رزگاربوونی نیشتمانیدا و، پشتیوانیکردن لەبزوتنـەوەی عـەرەبی ئازادو سەربەست.

لـەکاتی هێرشـی دوژمنکـاریی داگیرکـەری- زایـۆنیزم بـۆ سـەر میـصر لەسـاڵی ١٩٥٦دا خۆپیــشاندانی پــشتیوانیکردن لەمیــصر رویــدا کەلــەدژی داگیرکــەر ڕاپــەڕی بــوو بەسـەرۆکایەتی پاڵەوانـە نیـشتمانیەکەی جمـال عبدالناصـر کـە تێیـدا لاوانـی کـوردی و قوتابیانی کوردستان بەشداریان کرد.

نیشتمانپەروەرەکانی کوردو لەپێشی هەمووشیانەوە سەرکردەو ئەندامەکانی حزبی دیموکراتی پشتیوانیان کرد لەخەباتی گەلی میصری دلێر بەهۆی ئەمەشەوە تووشی گرتن و چەوساندنەوە هاتن و لەساڵی ١٩٥٦دا تێکۆشەران ئیبراهیم ئەحمەدو عومەر مستەفاو، مەلا عەبدوڵڵا ئیسماعیل درانە دادگای عورفی بەتۆمەتی کارکردن بۆ پشتیوانیکردن لەمیصر و خەباتەکەی ، لەدوایدا حوکم دران بەوەی خرانە ژێر چاودێریی پۆلیسەوەو مەلا عەبدوڵڵاش کەفالەتێکی نەختیی دا لەبەرامبەر ئازادکردنیدا.

هەر لەساڵی ١٩٥٧ەوە حزب هەوڵەکانی خۆیی خستەگەڕ بۆ پەیوەندیکردن بە بزوتنەوەی عەرەبی ئازادەوە کە لەمیصرو سوریا گەشەی کردبوو. هەر لەهەمان ساڵیشدا وەفدێك لە لاوانی کورد بەشداریان لەفیستڤاڵی لاوان و قوتابیانی مۆسکۆدا کرد.

لەسوریاش وەفدێکی حزبی کە پێکهاتبوون لەجەلال تاڵەبانی و، عبدالرحمن زەبیحی و، کەمال فوئاد[١٣١] ، چەند دانوستانێکیان لەگەڵ سەرکردە سوریەکاندا ئەنجام دا نمونەی مامۆستا اکرم الحورانی کە سەرۆکی پەرلەمانی سوری بوو- هەروەها مقدم عبدالحمید السراج- کەسایەتی سەربازی دیار لەوکاتەدا- هەروەها چەند هەوڵێك درا بۆ پەیوەندیکردن بەمیصرەوە.

لەهاوینی ١٩٥٧دا سەرکردەکانی لقی کوردستانی حزبی شیوعی عێراقی وەك بەڕێزان صاڵح حەیدەریی و کەمال فوئاد لەگەڵ هەندێك لەشیوعیە کوردەکانی تردا هاتنە ناو حزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانەوە، ئەمەش بووە هۆی خراپبوونی پەیوەندیەکانی نێوان حزبی دیموکراتی کوردستان یەکگرتوو لەگەڵ حزبی شیوعی عێراقیدا کە نامیلکەیەکی بڵاوکردەوە پڕبوو لەتۆمەت و هێرشی توند بۆ سەر پارتی.

لەو ساڵانەدا بەرەی یەکێتی نیشتمانی لەم حزبانە پێکهات:

---

[١٣١] - کەمال فوئاد ئێستا سەرۆکی کۆمەڵەی قوتابیانی کوردە لەئەورووپا و بەرپرسی لقی حزبی دیموکراتی کوردستانیە لەئەورووپا و لەچالاکترین و هۆشیارترین کوردەکانە لەوێ، پێش ئەوەی بێتە ناو پارتیەوە لەساڵی ١٩٥٧دا بەرپرسی حزبی شیوعی عێراق- لقی سلێمانی بوو.

حزبی نیشتمانی دیموکراتی، حزبی شیوعی، حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی، حزبی سەربەخۆیی، بەلأم پارتی لەو بەرەیە دووخرایەوە. بەلأم پەیوەندی پارتی لەگەڵ حزبی نیشتمانی دیموکراتیدا باش بوو لەساڵی ١٩٥٧ حزب پەیوەندیەکی دروستکرد لەگەڵ حزبی سەربەخۆیی و هەردوو حزب بابەتی ناردنی وەفدێکی کوردیان بۆ قاهیرە تاوتوێکرد بۆ بینینی سەرۆك جەمال عەبدولناصر بۆ باسکردنی مەسەلەی کوردی بۆی و رێکەوتن لەگەڵیدا بۆ رێکخستن و دروستکردنی پەیوەندی لەنێوان هەردوو بزوتنەوەی رزگاریخوازی عەرەبی و کوردی.

رێکەوتنێکی مەبدەئی کرا، حزب هەوڵیدا فیزەی گەشتکردن بۆ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دەست بخات بۆ ئەوەی بچێت بۆ قاهیرە بۆ دیتنی سەرۆك جەمال عەبدولناصر. بەلأم حکومەت رەتیکردەوە فیزەی پێبدات و بەربەستی خستە بەردەم گەشتەکەیەوە. بریاردرا کەسێکی دۆستی حزب بنێررێت کە پاسپۆرتی هەبێت، بەلأم شۆرشی ١٤ تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ کە رژێمی پاشایەتی لەناوبرد هەروەها ئەندامێتی عێراق لەپەیمانی بەغداو رێکەوتننامە داگیرکەریەکانی تری هەڵوەشاندەوەو، حکومێکی کۆماری ئازادی بەرپاکرد، هەروەها وای خواست ناردنی ئەو شاندەش دوابخرێت.

بەسەرکەوتنی شۆرشی ١٤ تەمموزی دژی داگیرکەرو پەیمانی بەغداو دەرەبەگایەتی، بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی کۆمەڵێك هەنگاوی گەورەی نا بۆ پێشەوەو، زیاترو زیاتر یەکانگیر بوو لەگەڵ بزوتنەوەی دیموکراتی عەرەبیدا لەعێراق و چووە ناو خەباتی هاوبەشەوە لەگەڵ هێزە نیشتمانیەکانداو لەپێناو بەهێزکردن و پشتگیریکردن لە کۆماری عێراقی تازە– کۆماری عەرەب و کورد– و بەرگریکردن لە دەسکەوتەکانی گەل تێیدا، ناکۆکیەکانی نێوان پارتی و حزبی شیوعی عێراقیش کەمبونەوەو گەیشتنە پەیماننامەی هاریکاریی لەنێوانیاندا، حزبی دیموکراتی کوردستانیش چووە ناو بەرەی یەکێتی نیشتمانیەوە کە ئێستا پێنج حزب لەخۆدەگرت و بەوەش دروشمەکانی تێکۆشانی هاوبەشی عەرەبی کوردی بەرجەستەبوون.

شۆرشی ١٤ تەمموز ووزەکانی گەلی عێراقی تەقاندەوە بەهەردوو نەتەوەی عەرەب و کوردیەوە بەوەش بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی فراوان بوو کە پشتیوانی لە شۆرش و

رژێمی کۆماری کرد پشتیوانیەکی گەرم و بزوتنەوەی لاوان و قوتابیان و ئافرەتانی کوردستان بەهێزبوون و لەکوردستان بزوتنەوەیەکی جوتیاری بەرفراوان گەشەی کرد هەروەها بزوتنەوەی سەندیکای کرێکارانیش گەشەی کرد، حزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عێراق فراوان بوو فراوانبوونێکی مەزن و بووە حزبێکی جەماوەریی، بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بەجەماوەری بوونی و دیموکراتی بوونەکەیدا جیادەکرایەوەو وەك حزبێکی مەزن دەرکەوت بۆ پشتیوانیکردن و پەرەپێدانی کۆماری عێراقی بەئاراستەی دیموکراتی.

بەلاَم حزب هەر لە راگەیاندنی کۆمارییەوە دەستی بەهەڵمەتێك کرد بۆ ئەوەی حوکمی زاتی بۆ کوردستان بەدەست بهێنێت و لەکاتی دانانی دەستوری کاتیدا هەوڵیدا دەقێك بەم مانایە بخاتە ناویەوە، بەلاَم هەوڵەکانی حزب رووبەڕووی بەرگریەکی توند بۆوە لەلایەن عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارفەوە، هەروەها بەرەی یەکێتی نیشتمانیش پشتیوانی لەم داوا ڕەوایە نەکرد، بۆیە لەدەقەکەداو لەمادەی سێی دەستوردا تەنها ئەوە هات کە — عەرەب و کورد شەریك و هاوبەشن لەنیشتماندا— دەستور دان بەمافە نەتەوایەتیەکانیاندا دەنێت لەچوارچێوەی یەکێتی عێراقیدا.

لەکاتی دانوستانیشدا بۆ بەستنی پەیماننامەیەك لەنێوان پارتی و حزبی شیوعیدا شیوعیەکان پشتیوانیان لەحوکمی زاتی و بەڵکو چارەی خۆنوسینیش کرد بەلاَم ئەو دەقەیان رەتکردەوە کە رێکەوتنی لەسەر کرابوو دواتر دەقێکی لاوازتریان پێشنیارکرد.

لەبەرەی یەکێتیشدا پارتی ئیبراهیم ئەحمەدی کردە نوێنەر کۆششێکی بەهاداری کرد بۆ ئەوەی دەقێك بخرێتە ناو پەیماننامەی بەرە نوێیەکەوە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی لەخۆگرتبێت. بەلاَم بەداخەوە بەرەی یەکێتی نیشتمانی لاواز بوو بەهۆی ئەو ناکۆکیانەوە لەنێوان لایەنەکانیدا دروست بوو لەسەر هەڵوێست لە داوای حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست بۆ یەکێتیەکی خێرا لەنێوان عێراق و کۆماری عەرەبی یەکگرتوودا بێ هیچ بیرکردنەوە لێکدانەوەیەك لەبارەیەوە.

بەلاَم شیوعیەکان بە پێشنیاری یەکێتی فیدراڵی وەلاَمی بەعسیەکانیان دایەوە، ئەوەش کە مایەی داخ و ئازارە ئەم ناکۆکیانە هێزە نیشتمانیە هاوپەیمانەکانی ناو بەرەی

یەکێتی نیشتمانی ڕاکێشا بۆ جەنگکردن و کوشتارکردنی یەکترو گۆڕانی ناکۆکیەکان کە دەبوو کورتبکرایەتەوە بۆ ناکۆکیەك لەنێو ریزەکانی گەلدا کە بە ئامرازی برایانەو دیموکراتیانە چارەسەری بکرێت، بۆ ناکۆکی نێوان دوژمنەکان و هێزی چەکدار بەکارهێنرا بۆ چارەسەرکردنی.

## تایبە تمەندیەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردی

پێشتر باسمان لەپەرەسەندن و گەشەکردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد کردو سودبەخشیشە لێرەدا کورتەیەك باس بکەین لەبارەی تایبەتمەندیەکانی ئەم بزوتنەوە مێژوییە ئەم تایبەتمەندیانەی کە دروست بوون بەهۆی فاکتەرە کوردستانیە تایبەتیەکان و کاریگەرییە نێودەوڵەتی و عێراقی و ئێرانی و تورکیەکانەوەو بەهۆی ئەو پەرەسەندنە کۆمەلأیەتیانەوە کەوا کۆمەڵگەی کوردستانی لەماوەی پەرەسەندن و بەرەوپێشچووونیدا بەخۆیەوە بینی.

ئەمەی خوارەوە کورتەیەکی ئەم تایبەتمەندیانەیە کە لەکتێبێکمەوە وەریدەگرم کەبەناونیشانی– کوردایەتی– بزوتنەوەی رزگاری نەتەوایەتی گەلی کوردستانە––

ئەم تایبەتمەندیانەش بریتین لە:

یەکەم: بزوتنەوەیەکی مێژوویی بابەتیە بەو مانایەی کە بزوتنەوەیەکی کتوپڕ نیە، یان هەڵچونێکی ساتەوەختی بێت و ئارەزووەکانی چەند دەستەیەك یان حزبێکی دیاریکراو دروستی کردبێت. بەڵکو بزوتنەوەیەکە و دەرئەنجامی پێویستیەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵگەی کوردستانە، ئەم پەرەسەندنە کە هێزەکانی دەسەلأتی بیانی و کۆنەپەرستیی بەربەستیان بۆ دروستکردووە، سەرهەڵدانی– کۆرپەلەی بورجوزای–یش لەمنالأنی کۆمەڵگەی کوردستان و گەشەکردنی و هەوڵەکانی بۆ شکاندنی قابلۆخی دەرەبەگایەتی کە داپۆشی بوو لەگرنگترین فاکتەرەکانی دروستبوونی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردین.

هەروەك چۆن هەوڵەكانی داگیركەران و زەوتكەرانی بیانی كە ئامانجیان توندكردنی تەوقی كۆیلایەتی بوو لەگەردنی گەلی كورداو سەپاندنی مەركەزیەتێكی بەهێز بەسەر هەموو ناوچەكانی كوردستانداو بێبەشكردنی گەلی كوردی لەهەموو شێوەكانی حوكمی كوردی، -وەك پەرچەكردارێك بۆ ئەوە- بەرگریەكی كوردی هێناوەتە بوونەوە ئامانجی بەرگریكردنە لە مافە زەوتكراوەكانی كورد، كەهەر ئەوەش بەشداریكرد لەدۆزینەوەو ژیانەوەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی كوردیدا.

هەروەها لە پێكدادان و دژیەكی نێوان هێزە تازە گەشەكردوەكان لەكۆمەڵگەی كوردستاندا، كەوا گەشەو پێگەیشتنی دەویست و، هێزە بیانیە كۆنەپەرستەكان كە بەربەست بوون لەبەردەم ئەم گەشەكردنەداو دژی هێزە تازە گەشەكردوەكان بوون و هەروەها لەپێكدادانەوە لەنێوان هەوڵە بیانیەكاندا كە دەیوست كوردستان بكاتە كۆیلەو گەلەكەی بێبەش بكات لەهەموو مافە نەتەوەییەكان و، لەزەرورەتەكانی پەرەسەندنی كۆمەلأیەتی حەتمیی كە هەمیشە هێزگەلێك دەبن بۆ ئەوەی كارەكانی بۆ ئاسان بكات یان بەربەستەكان لەبەردەمیدا لابەرێت لەهەموو ئەمانەوە بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی كورد لەرەوشە مێژووییە تایبەتیەكەیدا پێگەیشت.

بەوشێوەیە دەبینین كە- رەوتی پەرەسەندنی كۆمەلأیەتی- لەكوردستان بزوتنەوەی رزگاریخوازی كوردی لەخۆیدەگرێت و خۆیی تێدا نمایش دەكات و بەتەنیشت مۆرك و بەرگە نەتەوەییە رزگاریخوازیەكەشیەوە هەروەها ناوەرۆكێكی كۆمەلأیەتیشی پێدەبەخشێت.

بۆیە بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی كوردی بزوتنەوەیەكی سیاسی رووت نیە ئامانجی بەدیهێنانی مافە نەتەوەییەكان بێت بۆ گەلی كوردی و رزگاربوون لە دەسەلأت و شوێنكەوتەیی بیانیی بەڵكو بزوتنەوەیەكی كۆمەلأیەتی و بابەتیانەشە واتە:-

<u>دووەم</u>:- بزوتنەوەی رزگاركردنی نیشتمانی و دیموكراتیە، بەو مانایەی مەبەستیەتی و دەیەوێت چاكسازی كۆمەلأیەتی- ئابوری و سیاسی و فیكری- ئەنجام بدات بەتەنیشت خەباتیەوە بۆ رزگاركردنی نیشتمان لەدەسەلأتی بیانی ئەوەش بەحوكمی جوڵەو بزواتی رەوتی پەرەسەندنی كۆمەلأیەتی و خۆبینینەوە تێیداو بەحوكمی گۆڕانی بزوتنەوەی

رزگاریخوازی بەگشتی بۆ بزوتنەوەیەکی خاوەن ناوەرۆکی جوتیاری هەر لە جەنگی جیهانی یەکەمەوەو بەهۆی پێوەن بوونی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بە بیرۆکەو بنەما دیموکراتی و پێشکەوتنخوازەکان هەر لەجەنگی جیهانی دووەمەوە کە تێدەکۆشێت بۆ بەدیهێنانی جۆرێك لە حوکم و فەرمانرەوایی نیشتمانی کوردی- بەشێوەی حوکمی زاتی لە-قۆناغی ئێستادا- وەك زەمینەسازیەك بۆ بەرپاکردنی سستمێکی دیموکراتی کە بەچاکسازییە پێویستەکان هەستێت وەك چاکسازی کشتوکاڵی و پیشەسازی و ئاوەدانکردنەوەو بلاوکردنەوەی مەعریفەو رۆشنبیری و رەهاکردنی ئازادییە دیموکراتیەکان..

بەوشێوەیە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی ئامانجەکانی تەنها لەکۆمەڵێك داوای سیاسی دیاریکراودا نەماونەتەوە، بەڵکو ئامانجەکانی داخوازی کۆمەلایەتی و ئابوریی و رۆشنبیریەکان و .. هتد لەخۆدەگرێت.

*سێیەم*:- بزوتنەوەیەکی میللیی جەماوەرییە، ئەوەش نەك تەنها لەبەرئەوەی سەدان هەزار هاولاتیانی کوردستان لەژێر پەرچەمیدا کۆبونەتەوە بەڵکو لەبەرئەوەی هەروەها بەرگری لەداخوازیەکان و ئامانجە جەماوەریە کۆمەلایەتی و ئابوری و رۆشنبیری و سیاسیەکانیش دەکات.. وەلەبەرئەوەی پەناو پشتیوانانی و سەرکردایەتیەکەی لەجەرگەی گەل و جەماوەرەوە هەڵقولاون.

*چوارەم*:- بزوتنەوەیەکی دژ بەداگیرکەرو زەوتکەرانە، هەروەها بزوتنەوەیەکی تێکۆشەرو شۆرشگێرە ئەوەش بەحوکمی خەسڵەت و سیفەتە پێشکەوتوەکانی و بەهۆی ئەوەوە کە داگیرکەران و زەوتکەران دژایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیان کردووە بەهەموو ئامرازە تۆقێنەرو درندانەییەکان و رێگیریان کرد لەهەموو مافەکانی لەناویشدا جۆرێك لەحوکمی ئەهلی سەربەداگیرکەریش بەڵکو کوردو کوردستانیان دابەش کردو مەحرومیان کرد لەهەموو مافە نەتەوەییەکانی، نەك تەنها ئەمە بەڵکو بەدرندانەترین شێوە سەرکوتیان کرد، ئەمەش دوژمنایەتیەکی توندی دروست کرد لەنێوان داگیرکەرو زەوتکەران لەلایەك و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لەلایەکی ترەوە، دوژمنی

سەرسەختی سەرەکی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی داگیرکەرو پەیمانە داگیرکارییی و کۆنەپەرستیە بەکرێگیراویەکان بووە بەئێستاشیەوە.

لەکاتێکدا کە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بزوتنەوەیەکی مێژوویی بابەتی حەتمی بووەو گەلی کورد بەحەسرەتەوەیە بۆ بەدەست هێنانی ئازادی و مافە نەتەوەییەکانی و، هاوکاتیش داگیرکەران و کۆنەپەرستەکان هەموو جۆرەکانی تیرۆرو سەرکوتکردن و درندایەتی لەدژی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد بەکاردەهێنن و بێبەشی دەکەن لەهەموو جۆرەکانی تێکۆشانی ئاشکراو رەوا، لەبەرئەوە بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردیش بووە بزوتنەوەیەکی تێکۆشانی شۆڕشگێڕیی، هیچی لەبەردەمدا نەماوەتەوە جگە لەئامرازەکان و شێوازەکانی خەباتی شۆڕشگێڕیی و نهێنیانە بەزۆریی.

مێژووی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد، بریتیە لەمێژووی پڕ لە دژایەتیکردنی داگیرکەرو زەوتکەران و رووبەڕووبونەوەو سەرکوتکردنی ئەوان بۆی، خەباتی گەلی کوردیش پڕە لەقوربانیدان و لەدژ وەستانەوەیان.

مێژووی خەباتی گەلی کوردیش بۆمان دەردەخات کە شۆڕشی چەکداریی ئامرازی بنەڕەتی بووە لەنێوان ئەم ئامرازو شێوازە تێکۆشان و شۆڕشگێڕانەیەدا. ئەوەش بەهۆی هەروەها پەنابردنی داگیرکەرو زەوتکەرانەوە بۆ بەکارهێنانی هێزی چەکدار بێجگە لەئامرازەکانی تر کە پێشتر باسمان کردن و هەروەها بەهۆکارێکی مێژوویش ئەویش ئەوەیە بەهۆی رەوش و بارودۆخی تایبەتی کوردستانەوە هەمیشەو هەر لەسەرهەڵدانیەوە شۆڕش لەگەڵ بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا جمك و دووانە بووە.

دیاریشە نیشتمانپەروەرە کوردەکان نەبوون کە شۆڕشیان کردبێتە پەیڕەو بەرنامەی بزوتنەوەی رزگاریخوازیی، بەڵکو ئەوە رەش و بارودۆخەکەیە سەپاندویەتی بەسەریاندا هەر وەك پێشترو لەم باسەدا خستمانەڕوو.

<u>پێنجەم</u>: رزگاربوونی بزوتنەوەی کوردی لەکۆتەکان و شێوازە کۆنەکان و هەڵقولاّنی سروشتە دیموکراتیەکەی لێیەوە.

بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لەژێر سەرکردایەتی پیاوانی ئایین و فەرمانڕەوا کوردەکاندا دەستیپێکردو ئەو نەوەیەی کە لەرۆڵەکانی خێزانە قەڵەمڕەوەکانەوە

لەچینی ناوەندەوە هاتبوون بەشداریان لەسەرکردایەتیکردنیدا کرد تا بزوتنەوەی ٦ ئەیلولی سالّی ١٩٣٠ کاتێك ناوەندەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لەگوندەو گوێزرایەوە بۆ شار بۆ سەر دەستی چینی رۆشنبیر لەجەماوەرو چینی ناوەند.

لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمداو دوای جەنگەکە دەستەی رۆشنبیر لەجەماوەری میللی سەرکردایەتیان گرتە دەست لەگەلّ گەرانەوەی بالّی عەشاریی بۆ ناو سەرکردایەتی وەك باسمان کرد.

دوای جەنگی جیهانی دووەم بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد گۆرا بۆ بزوتنەوەیەکی جەماوەریی میللی، خاوەن سروشتێکی دیموکراتی و، رزگاری بوو لەسەرکردایەتیە دەرەبەگایەتی و مولّکدارو بورجوزایەکان کە مەیلداریان بۆ سازشکردن هەیە، بەتایبەتی دوای دامەزرانی حزبی دیموکراتی کوردستان ١٩٤٦ و مایەپووچبوونی سەرکردایەتی عەشایەریی و بورجوازی سازشکار.

ئەمە ئەو هێلّی بەیانیەیە کە پەرەسەندنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردی دەیکێشێت هەروەك لەبواری لێکۆلّینەوەیدا خستمانەروو.

# پارتی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی[132]

پارتی دیموکراتی کوردستان لەموتوربەکردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردییەوە بەبیرۆکەی پێشکەوتنخوازی و شۆڕشگێرییەوە لەدایك بوو، هەروەها لەئەنجامی پەرەسەندنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیەوە بۆ بزوتنەوەیەکی جەماوەری میللی و، وەك وەلآمدانەوەیەکی لۆژیکی بۆ پێویستیەکانی رێکخستنی و سەرکردایەتیکردنی بۆ سەر ئەو رێگەیەی کە بەرەو سەرکەوتنی و بەدیهێنانی ئامانجە رزگاریخوازی و دیموکراتیەکانی دەبات لەبەرئەوە بەهەمان ئەو مۆرکەی ئەو و گونجاو لەگەڵ جەوهەرو فۆرمەکەیداو هەڵگری ئامانجەکانی و داخوازیەکانیدا مایەوە.

بەلآم پارتی بەرۆڵی خۆی بەردەوام کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد هەبوو لەرووی پەرەپێدانی و دارشتنی بیرۆکەو راوبۆچون و هەڵوێستەکانیەوە لەچوارچێوە زانستی و دیموکراتیەکان و رێکخستن و یەکخستنی هەوڵ و کۆششەکانی لەگەڵ بزوتنەوەی رزگاریخوازیدا لەعێراق و، لەکێشانی سیاسەتێکی زانستی و دیموکراتی بۆی و دیاریکردنی ستراتیژیەتێکی راست و دروست و دانانی تەکتیکاتی زانستیانە بۆی. هەروەها لەئاشکراکردنی دوژمنەکانی و جیاکردنەوەی دۆستەکانی لەدوژمنەکانی و پاککردنەوەی ریزەکانی لەخەڵکانی هەلپەرست و سازشکارو بازرگانیکەر و راڕاو لە ئاشکراکردنی بەکرێگیراوان و لایەنگرانی نهێنی و ئاشکرای داگیرکەران و زەوتکەران و دورخستنەوەیان لەریزەکانی و لەسەرکردایەتی خۆی.

پارتی کۆششێکی بەهاداری کرد لەسەر هەردوو ئاستی نیشتمانی و نێودەوڵەتی بۆ نیشاندانی رووی ئاشکراو روونی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی و پەیداکردنی دۆست و لایەنگر بۆی و، لەپوچەڵکردنەوەی درۆو دەسەلەکانی داگیرکەرو زەوتکەران کە هەوڵیاندا بیپێچنەوە بە تەم و مژی دەلەسەو تۆمەتە ناڕاستەکانەوە. هەروەها پارتی بنەماگەلێکی جێگیری بۆ برایەتی عەرەبی و کوردی دارشت وە خەباتی هاوبەش لەناو بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا و لەپەروەردەکردنی جەماوەری کوردی بەرۆحیەتی برایانە لەگەڵ

---

[132] – پارتی ناوی میللی و بەکارهێنراوی حزبی دیموکراتی کوردستانە لەعێراق بەگشتی و لەکوردستان بەتایبەتی.

جەماوەری عەرەبیداو بەرۆحیەتی یەکانگیریی و پێکەوگرێدانی خەبات لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی و دوژمنی هاوبەش، هەروەها پارتی بەشداریکرد لەوەدا کە فۆرمەلەکردنەوەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی وەك بزوتنەوەیەکی میللیی جەماوەری خاوەن دورشمگەلێکی دیموکراتی و ئاراستەی پێشکەوتنخوازی و خاوەن داواکاری کۆمەلآیەتی وەك چاکسازی کشتوکالی و پەرەپێدانی کۆمەلگەو بلأوکردنەوەی رۆشنبیری و مەعریفەو پاشانیش لەفراوانکردنی بزوتنەوەکەو قولکردنەوەی و چاندنی ریشەکانی لەناو کۆمەلگەی کوردستانیدا قولترو قولتر. هەروەها پارتی پارێزگاری کرد لەپەیرەوی شۆرشگێری بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی و لەرۆشنکردنەوەی جەماوەرو هۆشیارکردنەوەی بۆ ئەوەی بمێنێتەوە لەسەر رێبازو پەیرەوی مێژوویی شۆرشگێریی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی.

لەبواری فیکریشدا پارتی بەسەرکەوتوویی لەدژی هەموو بیرۆبۆچونە نامۆکان بۆوە لەکۆسمۆپۆلیتیەوە بۆ دابرانی نەتەوەیی و رەگەزپەرستی کە هەولیدا دزە بکات ناو ریزەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیەوە.

هەروەها پارتی بیرۆکە تەصەفەویەکانی بەزاند کە دژایەتی رێکخستنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی دەکرد لەناو رێکخراوە دیموکراتیەکان و حزبێکی پێشرەوی دیموکراتیدا بەهۆی پارتیشەوە رێکخراوەکانی لاوان و قوتابیان و ژنانی دیموکراتی کوردستانی پەیدابوون.

پارتی هۆشیاری چینایەتی و نیشتمانی بلأوکردەوە لەناو جەماوەرداو پەیوەندیەکی ئۆرگانی دروستی کردو رونیکردەوە کە خەباتی رزگاریخوازی کوردی بریتیە لەخەباتی جەماوەری میللیی– لەبنچینەدا– بۆ رزگاربوونی نیشتمانی و دیموکراتی.

وە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی یەکەمجار بزوتنەوەی جەماوەری میللیە.. هەروەها سەرکردایەتی تێکۆشانەکانی جوتیارانی کرد لەدژی دەرەبەگایەتی و بلأوکردنەوەی چەمکی راست و دروستی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی کە کۆمەلێك دەستەو تاقمی مولکداری کوردی هەولیاندا سودی لێوەربگرن بۆ داپۆشینی ململانێی چینایەتی جەماوەری زەحمەتکێش. ئەو راستیەی رونکردەوە کە تێکۆشانی زەحمەتکێشان و

بـــەدیهاتنی ئامانجـــە کۆمەلآیـــەتی و ئـــابووریی و سیاســـیەکانیان بریتیـــە لەجەوهـــەری بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی هەروەك چۆن پارتی رۆڵی سەرەکی گێرا لەرێکخستن و سەرکردایەتیکردنی شۆڕشی رزگاریخوازی کوردی لەکوردستانی عێراقدا لەساڵی ١٩٦١-١٩٦٤ و تا ئێستاش هێزی سەرەکییە تێیدا.

شەشەم: هەستی نەتەوەیی کوردی بەهێزو گشتگیرە

لەئـەنجامی تایبەتمەندیـە پێشکەتوەکانی بزوتنـەوەی رزگـاریخوازی کـوردی و بـەهۆی سیفەتە نەتەوەییەکانی گـەلی کوردمانـەوە[١٣٣] و وەك پەرچـەکردارێك بـۆ چەوسـاندنەوەی توندی نەتەوەیی کەوا گەلی کورد بەدەستیەوە دەناڵێنێـت و بـەهۆی بێبەشـکردنی گـەلی کورد لەهەموو مافە نەتەوەییەکانی لەناویشدا مافە رۆشنبیریەکانی و هەتا مـافی ئـەوەی بانگەشـەی کوردبـوونی خـۆی بکـات ئـەوا هەسـتی نەتـەوەیی کـورد بـەهێزەو هـەموو چینەکانی گەلی کورد دەگرێتەوە. ئەم هەستە نەتەوەییە کە شۆڕشە کوردییە فرەکـان و ئەو نامونەنگی و تاوانە دڕندانانەی داگیرکەران و زەوتکەران لەدژی گەلی کورد ئەنجامیان داوە... مێژووی گەلان ئەوە دەسـەلمێنێت بـەهێزی هەسـتی نەتـەوەیی لای نەتەوەیـەك بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوانە دەگونجێـت لەگـەڵ تونـدی چەوسـاندنەوەی نەتـەوەیی و دڕندایەتیەکەیـدا، چـەندەش ئـەو زوڵـم و زۆر و هەڵمـەتی چەوسـاندنەوەی نەتەوەییـە توندبن، بەهەمانشێوەش هەسـتی نەتـەوەیی تونـدو بـەهێز دەبێـت وەك پـەرچـەکردارێك بۆی و بەهێزی هەستی نەتەوەیی کوردیش باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە.

زانراویشە هەستی نەتەوەییە هەندێ جـار بـە ئـەدەبیات و هـۆنراوەو هەسـتی نەتـەوەیی گوزارشـتی لێـدەکرێت، تـەنها وەك هەسـت و شـعور نامێنێتـەوە بـەڵکو دەگۆڕێـت بـۆ بزوتنەوەیەك خەڵك لەدەوری کۆدەبنەوە ئەگەر چـووە نـاو ڕیزەکـانی خەڵکەوە. ئەگـەر بیرۆکەکانیشی چوونە ناو جەماوەرەوە ئەوا هەروەها دەبێتە هێزێکی مادیش.

---

[١٣٣] - بەتایبەتی ئـەوەی پەیوەنـدی بەخۆشەویستی گـەلی کـوردەوە هەیـە بـۆ ئـازادی و ئـارەزوی زۆریـەوە بـۆ رزگاربوون، ئەم لایەنە مێژوییە زۆرێـك لەوانـەی لێکۆڵینـەوەیان بـۆ مێـژووی گـەلی کـورد کـردووە لەسـەر کۆك و هاوڕان.

هەستی نەتـەوەیی ئەگـەر بەشـێوەیەکی ڕاسـت و دروسـت ئاراسـتەکرا خرایـە نـاو چوارچێوەگەلێکی دیموکراتیەوەو بەشێوازێکی پێشکەوتنخوازی و میللی داڕێژرا ئـەوا لـە کاریگـەرترین چـەکەکانی خـەبات دەبێت لـەدژی داگیرکـەرو زەوتکـەران و کۆنەپەرسـتە بەکرێگیراوەکان.

حەوتەم:

بەکاریگەری سیفەتە پێشکەوتوەکان و گۆڕانی هەستی نەتـەوەیی بـۆ هێزێکـی مـادیی بەهۆی چوونە ناویـەوە بـۆ ریزەکـانی جـەماوەرو سیاسـەتی بەکۆیلـەکردن و تـالآنکردنی داگیرکاری کە زیان بەهەموو چینە کۆمەلآیەتیـەکانی گـەلی کـورد دەگەیـەنێت و بـەهۆی بوونی سیاسەتی چەوساندنەوەی نەتەوەیی توندەوە کە بەئاگرەکەی هەموو گـەلی کـورد دەسـوتێنێت و وەك پەرچـەکردارێك بـۆی و بـۆ سیاسـەت و هەوڵـەکانی تواندنـەوەی نەتەوەی کوردو بەکاریگەری هەستی بەهێزی نەتەوەیی، ئـەوا بزوتنـەوەی رزگـاریخوازی کورد بەرەیـەکی فراوانـی گـشتگیری هەیـە بـۆ هـەموو چینەکانی گـەلی کـورد لەلایـەك و هـەلگری چـەندین ئامانجـە لەلاکـەی تـرەوە کـە لـەمافی چـارەی خۆنوسـین تـا مافـە رۆشنبیریەکان و مافی بانگەشەی بەکوردبوونەوە لەخۆیی دەگرێت.

بەلآم هێزی سەرەکی لەخەباتی نیشتمانی لەگەڵ هەموو ئەمانەدا بریتیـە لـە جـەماوەری میللی لە جوتیاران و کرێکاران و زەحمەتکێشان و ئەوانی تـر و کاسبکاران و رۆشـنبیرە شۆڕشگێڕکان بەلآم خاوەن موڵکەکان یان بورجوزلیەت ئەوا هاوپەیمانی ئـەم جـەماوەرە زەحمەتکێـشەن لەخـەباتی نیـشتمانیدا بـەلآم کەمتوانایـە لـەوەی سـەرکردایەتی ئـەم بزوتنەوەیە بکات یان بەشداریەکی کاریگەرانە لەم خەباتەدا بکـات بەهۆیـەك کەلـەلاوازی چـــینایەتیەوەیە و گەشـــەنەکردنی بورجوازیـــەتی کـــوردی و بـــەهۆی سروشـــتە چـینایەتیەکەیەوەو بـێ مایـەبوونی مێـژوویی لـەم گۆڕەپانـەدا. هـەروەها بـەهۆی پەرەسەندنە گرنگەکانەوە کە بەسەر بزوتنـەوەی رزگـاریخوازی کوریـدا هـاتووەو پێـشتر ئامارەمان پێکرد.

لەبەرئــەوە ئــەوا حزبــی پێــشڕەوی دیموکراتیــە کــە نوێنەرایــەتی ئــەم جــەماوەرە زەحمەتکێـشە دەکـات و لێیــەوە سەرچـاوە دەگرێـت و ڕێکخـستنەکانی خـۆی لێیــەوە پێکدێت، کەواتە ئەم حزبـی جـەماوەرە میللیەیـە کـە زۆرینـەی هـەرە زۆری گـەلی کـورد پێکدەهێنێت.

هەشتەم:

بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی گرنگی و سودی تایبەتی هەیە بۆ گەلان، گومـانی تێـدا نیــە ســەرکەوتنی هــەر بزوتنەوەیــەکی ڕزگــاریخوازی نیــشتمانی گــوورزێکی بــەهێزە لەداگیرکەرو سەرکەوتنێکە بۆ مەسەلەی گەلان، بۆ مەسـەلەی ئـازادی کـە بـەلای سـەرپا گـەلانی جیهانــەوە گـرنگ و جێـی بایەخـە، بۆیـە سـەرکەوتنی بزوتنـەوەی ڕزگـاریخوازی کـوردی هـەروەها سـەرکەوتنە بـۆ گـەلانیش. بـەلآم بـەهۆی بایـەخی تایبـەتی ناوچـەی ستراتیژی کوردستان و سامانە نەوتیەکانیەوەو بەهۆی ئـەوەی کـە کوردسـتان کەوتۆتـە ژێر دەسەلآتی سێ حکومەتەوە لەخۆرهەلآتی ناوەڕاسـتدا ئـەوا سـەرکەوتنی بزوتنـەوەی ڕزگـاریخوازی گـەلی کـوردی دەبێتـە هـۆی ڕوخـانی ڕژێمـە کۆنەپەرسـتەکان لـەگرنگترین ناوچەی خۆرهەلآتی ناوەڕستداو ڕودانـی قـەیرانێك ڕێگخۆشـکەر دەبێـت بـۆ سـەرکەوتنی هێــزە دیموکراتیــەکان لەناوچــەکەدا وەك چــۆن مــەزنترین زیانــەکان بەداگیرکــەرو هاوپەیمانــەکانی و پیلانــەکانی دەگەیــەنێت، هــەروەها قەلآیــەکی دیمــوکراتی لەســەر داروپەردوی ئەم قەلآ کۆنەپەرستیانە بونیاد دەنێت، هەربۆیە دەبینین داگیرکەر بەهەموو هێزەکانیەوەو بەهەموو شێوازێك بەرەنگاری سەرکەوتنی بزوتنەوەی ڕزگـاریخوازی گـەلی کورد دەبێتەوە.

نۆیــەم: خۆبــەدورگرتنی بزوتنــەوەی ڕزگــاریخوازی کــوردی لەبیرۆکــە شــۆڤێنی و کۆسمۆپۆلیتیەکان

بەتێبینیکردنی خەسڵەتە نەتەوەییەکانی گەلی کوردو بەتایبەتی ئارەزووی گەلی کورد بـۆ پارەتیدانی نەتەوە دراوسێ و نزیکەکان و مامەڵەکردن لەگەڵیانـدا. هـەروەها بـەحوکمی

ئەوەی گەلی کورد نەتەوەیەکی بچووکی چەوساوەی ژێردەستە، ئەوا بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لەشۆڤێنیەت و بیرۆکە نەتەوەییە خۆدابڕکردنەکان دوردەکەوێتەوە.

بەلاّم کۆسمۆپۆلیتی کە چەمکەکانی دوای جەنگی جیهانی دووەم لەریزی پێشکەوتنخوازە چەپەکان و خوێنەوارانی کورددا بلاّوبۆوە ئەو بیرۆکەیە بە خەباتی حزبی دیموکراتی کوردستان لەرووی فیکریەوە بۆڕدراو بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لە پۆخڵەییەکانی پاکرایەوەو ئێستا بەتوندی خۆیی لێ بەدوردەگرێت ولێی هەڵدێت، مەترسی سەرهەڵدانی هەندێك بیرۆکەی خۆدابڕکردنی نەتەوەیی هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی جەنگەوە لەکوردستان بەدیارکەوتووە، بۆیە ناکرێت نەرمی لەبەرامبەریدا بنوێنرێت بەڵکو پێویستە خەباتی پێداگرانە بکرێت دژی پەیدابوونی هەر رەگ و بنجێکی کە هەوڵبدات فیلّدی برایەتی عەرەبی و کوردی ژەهراوی بکات.

ئەرکێکی گەورەش دەکەوێتە ئەستۆی هێزە دیموکراتی و پێشکەوتنخوازە عەرەبیەکانیش ئەرکی پەروەردەکردنی جەماوەری عەرەبی بەرۆحی برایانە لەگەلّ نەتەوەی کوردیداو بەرۆحی دانان بە بوونیداو بەمافەکانیدا ئەمەش ئەرکی پێشکەوتنخوازە کوردەکان ئاسان دەکات کە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بهێڵننەوە بەشێوەیەك پاك و بێگەرد بێت لەهەر گەردو خەوشێکی بیرۆکەکانی خۆدابڕکردنی نەتەوەیی و بەدوربوون لەهەڵەکانی و پاشانیش دەستگرتنی بەخەباتی هاوبەشەوە لەگەلّ بزوتنەوەی رزگاریخوازی عەرەبیدا.

دەیەم: هاریکاری و خەباتی هاوبەش لەگەلّ بزوتنەوەی دیموکراتی عەرەبیدا

بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد هەر لەزۆر زووەوە رێگای خەباتی هاوبەشی لەگەلّ بزوتنەوەی دیموکراتی عێراقیدا بۆ خۆی کێشاوە، دژی داگیرکەرو حوکمی کۆنەپەرستی سەر بەئەو و لەپێناو رزگاربوون و حوکمی دیموکراتی و شۆڕشگێڕیدا.

لایەنە کوردییە بەئاگاو هۆشیارەکانیش هەر لەزۆر زووەوە دەرکیان بە بایەخ و زەرورەتی خەباتی هاوبەشی نێوان جەماوەری گەلی عەرەبی و کوردی برا کردووە هەربۆیە

بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بەم بیرۆکە هۆشیارانەیە رۆشنبیر بووەو دەرکی بەوە کردووە کە بەرژەوەندی نیشتمانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی خۆی لە هاریکاری خەباتدا حەشارداوە لەگەڵ بزوتنەوەی دیموکراتی عەرەبیداو کۆمەڵێك ئامانج و هەڵویستی هاوبەش هەیە کە بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە بەتایبەتی لەبەرئەوەی کە بزوتنەوەی رزگاریخوازی عەرەبی بەردەوام بانگەشەی بۆ برایەتی کردووە لەگەڵ کوردەکانداو دژی هەوڵەکانی تواندنەوەو نکوڵی کردنی نەتەوەییانەیە ئەگەرچی هەندێك لایەنی بزوتنەوەی دیموکراتی عەرەبی بەباشی لەسروشت و ناوەڕۆکی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی تێنەگەیشتووە.

بەوشێوەیە یەك ئامانجی و یەك دوژمنی و بەرژەوەندیەکان و لەیەکچوویی رەوش و بارودۆخەکان و، رەوشە مێژوویی و جوگرافیەکان هەموو ئەمانە خەباتی هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی یەکخستووەو چەندین پەیوەستی و پەیوەندی توندوتۆڵی هێناوتە کایەوە کە بەیەکیانەوە دەبەستێتەوەو ئەوە بەسەریاندا دەسەپێنێت کە پێکەوە خەباتی برایانە بکەن.

ڕاستە هەڵوێستە شۆفێنیەکانی دەستەو تاقمە کۆنەپەرستەکان کە نکوڵی لەبوونی گەلی کوردی دەکەن لەسەر زەوی نیشتمانەکەی کوردستان و دژی داننانە بە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورددا و، دژایەتی بزوتنەوەی نەتەوەیی گەلی کوردی دەکات و، دژایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد دەکات، ڕاستە ئەم هەڵوێستە شۆفێنیە کۆنەپەرستیانە زیانێکی زۆریان بە برایەتی عەرەبی کوردی گەیاندووەو زیانی بەخەباتی هاوبەشی گەیاندووە بەڵام پارتیەکان و شیوعیەکان بەشداریەکی بەهاداریان کردووە لەگەڵ هێزو لایەنە پێشکەوتنخوازەکاندا کە پشتی مەسەلەی گەلی کوردیان گرتووەو بەرگری لە مافەکانی کردووە لەباشکردنەوەو بەهێزکردنەوەی برایەتی عەرەبی کوردی و پتەوکردنی هاوخەباتیاندا. دیارە بەڕادەی ئاڵوگۆڕکردنی یارمەتی و پشتیوانیکردن و لایەنگری هاوبەرامبەر لەنێوان هەردوو گەلی عەرەبی و کوردیدا لەتێکۆشانی نیشتمانی لەپێناو مافە نەتەوەیی و دیموکراتیەکانیان بەهەمان ئەو ڕادەیە برایەتی و هاوخەباتی لەنێوان هەردوو گەلی برادا پتەو بەهێز دەبێت بەپێچەوانەشەوە هەڵوێستە شۆفێنیە

عەرەبیەکان زیانێکی گەورە بەم برایەتیە دەگەیەنن و وەك پەرچەکردارێکی ئەم هەڵوێستە شۆفێنی و دوژمنکاریەش کە شۆفێنیەت و کۆنەپەرستی گرتۆتەبەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیش دورکەوتۆتەوە لێی و لەبزوتنەوەی دیموکراتی عەرەبی نزیك بۆتەوە.

## بەشی سێیەم

# شۆڕشی نیشتمانی
# رزگاریخوازی کوردی

*سروشتی شۆڕشی کوردی
*شۆڕش لەشەمزینان
*شۆڕشی کوردی بەسەرکردایەتی شێخ مەحمود و سیاسەتی داگیرکەری بەریتانیی
*شۆڕشی کوردی و کۆماری کوردستانی دیموکراتی
* هۆکارەکانی شکستهێنانی شۆڕشی کوردی

# سروشتی شۆڕشی کوردی

پێشتر ئەو ڕاستیەمان خستەڕوو کە شۆڕش بریتیە لە پەیڕەو و بەرنامەی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، کە هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە ڕووبەڕووی هەڵمەتەکانی سەرکوتکردن و تۆقاندنی عوسمانی بۆوە کە ئامانجی ئەوەبوو تەوقی کۆیلایەتی بخاتە گەردنی گەلی کوردو لەناوبردنی دوواین سیماو روخساری سەربەخۆیی هەندێك لەو میرنشینە کوردیانەی کە مابوونەوە، بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد بەشێوەی شۆڕشێك دەرکەوت کە بەرگری لەمافەکانی کوردەکان دەکات و ڕووبەڕووی دوژمنکاری چەکدارانەی تورکی دەبێتەوە بەوشێوەیە شۆڕشی کوردی لەگەڵ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردیدا تێهەڵکێش بوو تا وای لێهات بەشێوەیەکی ئۆرگانی پێوەی پەیوەست بوو، تاوای لێهات شۆڕشی کوردی تاڕادەیەك بووە هاوواتا بۆ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردی کە بەشێوەی شۆڕشێکی چەکداری بەدیارکەوت. ئەمەش تایبەتمەندیەکی تایبەتە بۆ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی کە داگیرکەران و زەوتکەران هەموو ڕێگەکانی خەباتی پەرلەمانی یان ئاشتیانە یان ڕەوایان بەڕویدا داخست و چەندین جار ڕووبەڕووی هەڵمەتەکانی سەرکوتکردنی چەکداری بۆوە، ئەمە وایکرد شۆڕش ببێتە پەپرەوێکی مێژوویی بۆی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت شۆڕشی چەکداری شێوازی سەرەکی بووە لەخەباتی گەلی کوردیدا، بەلام لەبەرئەوەی شۆڕش ئامانجی بەدیهێنانی ئامانجەکانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی بووە، بۆیە تەنها وەك شێوازێکی خەبات نەماوەتەوە، بەڵکو بۆتە هەڵگری دروشمەکان و ئامانجەکانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیش، پاشانیش بووە شۆڕشێك بۆ ڕزگاربوونی نیشتمانی، کە خاوەن ناوەڕۆکێکی نیشتمانی و دیموکراتیە بەو مانایەی دەیەوێت چاکسازییە کۆمەلایەتیەکان بەدیبێنێت کە ناوەڕۆکی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی پێکدەهێنێت، لێرەدا پێویستە بوەستین بۆ لێکۆڵینەوە لە چەمك و تێگەیشتنی کۆمەلایەتی شۆڕش، بەتایبەتیش شۆڕشی کوردی.

# چەمکی شۆڕشی کوردی و ناوەرۆکەکەی

کاتێک باس لە شۆڕش دەکەین یەکسەر بزوتنەوەیەکی چەکداری یان ڕاپەڕینێکی چەکداری خوێناویش دێتە ناو زەین و خەیاڵمانەوە، بەلآم بێگومان ناکرێت هەموو بزوتنەوەیەکی چەکداری ببێتە شۆڕش، ڕەنگە بزوتنەوەیەکی چەکداری گەڕانەوەیەکی کۆنەپەرستانە بێت، بۆ نمونە، کەواتە کامەیە شۆڕش و، کامەیە چەمك و لێتێگەیشتنەکەی؟..

شۆڕش – بەچەمکە کۆمەلآیەتیەکەی– بریتیە لەبزوتنەوەی ئەنجامدانی گۆڕانکاریەکی ڕیشەیی لەکۆمەڵگەدا، بەشێوەیەك بنەماکانی کۆمەڵگەی ئابوریی و بونیادە سیاسیەکانی هەڵتەکێنێت و لەسەر داروپەردوەکەی سستمێکی کۆمەلآیەتی نوێ و زیاتر پێشکەوتوو بالآتر دابمەزرێنێت، بەو مەرجەی کە ئەم گۆڕانکاریانە خێرابن– بەشێوەی بازدان یان قەڵمبازێك– هەروەها پێشکەوتووانە بێت بەو مانایەی گۆڕانەکە پێشکەوتنێك بێت بەرەو باشتر و بالآترو نوێتر.

ناکرێت ئەم گۆڕانکاریە کۆمەلآیەتیە قوڵ و بنچینەییانە ئەنجام بدرێن تەنها بە تێکۆشانی شۆڕشگێڕیی قورس نەبێت، ناکرێت ببێت جگە لە تێکۆشانێکی شۆڕشگێڕیی چەکدارانە نەبێت.

ئەگەر شۆڕشمان شیکردەوە بۆ ڕەگەزەکانی دەبینین کە:–

یەکەم پرۆسەی گۆڕانکارییە کۆمەلآیەتیە ڕیشەیی و بنەڕەتیەکانە، جۆرێتی و پێشکەوتنخوازی، بەشێوەیەك کە بونیادی سستمە کۆنەکە هەڵتەکێنێت و لەسەر داروپەردوەکەی ژیانێکی ئابوریی و کۆمەلآیەتی و سیاسی نوێ و پێشکەتوو بونیاد بنێت گونجاو لەگەڵ پێویستیەکانی پەرەسەندنی کۆمەلآیەتی لەقۆناغە مێژووییەکەدا.

دووەم: گۆڕانکاریی جۆرایەتی بەرەو بالآترو بەرەو باشتر، بەرەو چاککردنی ژیانی کۆمەلآیەتی و ئابوریی و سیاسی و پەرەپێدانی بەرەو پێشەوە.

سێیەم: گۆڕانکاریی خێراو چالاك بەشێوەی چەند قەڵمبازێك.

چوارەم: بەرژەوەندیەکانی گەل یان بەلانی کەمەوە زۆرینەی لەخۆبگرێت.

بۆیە هەر بزوتنەوەیەکی چەکدار یان ڕاپەڕین نایەتەدی یان نایەوێت یان نیازی نیە ئەم گۆڕانکاریــە جۆرایــەتی و بنــچینەییانەی کۆمەڵگــە بــەرەو بــاڵاترو باشــتر و بــەپێ بەرژەوەندیــەکانی زۆرینــەی خــەڵك ئــەنجام بــدات، نابێتــە شــۆڕش و بەچــەمکە کۆمەڵایەتیەکەی بەشۆڕش دانانرێت. ئەڵێم نیازیە ئەم گۆڕانکاریانە ئەنجام بدات، چونکە شۆڕشی ڕەسەن لەوانەیە ئەویش شکست بخوات و نەگاتە ئامانجەکانی بەڵام ئەوە سیفەتی شۆڕشی لێ ناسەنێتەوە.

تێکۆشــانە چــەکداریەکان کــە ئامانجیــان ئەنجامــدانی ئــەم گۆڕانکاریــە جــۆریی و کۆمەڵایەتیانەیــە هــەروەها ئــەوانیش شۆڕشــن هــەتا ئەگــەر ئەرکەکەشیان بەئــەنجام نەگەیاندبێت، بەڵام شۆڕشێکی شکستخواردون، یان شۆڕشێکی ناکامن، بۆیە دەتــوانین بڵــێین شــۆڕش- وەك ڕوداوێکــی کۆمەڵایــەتی- ســەرەتاو پەرەســەندن و کۆتــایی هەیــە هەروەها کۆتایی شۆڕشی ڕەسەن- بەچەمکە کۆمەڵایەتیەکەی- نە شکستەکەی وە نــە سەرکەوتنە سەربازیەکەی نیە بەتەنها، بەڵکو بەدیهێنانی ئامانجــەکانی یــان ئەنجامــدانی گۆڕانکاریــە کۆمەڵایەتیــە جۆریەکانــە کــە پێداویــستیەکانی پەرەســەندنی کۆمەڵایــەتی لەقۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا دەیخوازێت.

لەوانەیــە شۆڕشــێك ڕووبــدات لەیەکــەم ســەرهەڵدانیدا خــامۆش بکرێــت یــان لەســەرهەڵدانەکانیدا و نەگاتــە نیــازو مەرامــەکانی، بــەڵام ســەرلەنوێ دەســتپێکردنەوەی ئەویش تەواوکاریەکە بۆی، ئەڵقەیەکــە لــەنێو زنجیرەیــەك ئەڵقــەی بەداویەکــدا هــاتوودا، هەروەك چۆن ســەرهەڵدانە فــرەو جۆراوجۆرەکــانی بریتیــە لــە پەرەســەندنەکان چــونکە شۆڕشیش ملکەچی یاسای پەرەسەندن و یاسای پێگەیشتن و گەشەکردن و گــۆڕان و پێشکەوتنە ئەمە لەبارەی -شۆڕش-ەوە بەگشتی.

*بەڵام چەمکی شۆڕشی کوردی چیەو؟ ناوەڕۆکی ئەم شۆڕشە کامەیە؟*

*بەدەستەواژەیەکی تر سروشتی شۆڕشی کوردی کامەیە؟*

پێشتر ئەوەمان ڕونکردەوە شۆڕشی کوردی پەیڕەو بەرنامەی بزوتنــەوەی ڕزگــاریخوازی کوردی بووەو هەڵگری دروشمەکانی و ئامانجەکانیەتی و، پاشــانیش بۆتــە شۆڕشێك بــۆ ڕزگارکردنی نیشتمانی، بۆ ڕزگاربوون لە کۆیلایەتی و ڕزگارکردنی نیشتمان لەدەســەڵاتی

بیانی و، بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکانی گەل، بەو مانایەی شۆڕشێکە خاوەن ناوەڕۆکێکی نیشتمانی و دیموکراتیە، بەواتای ئەوەی ئامانجی بەدیهێنانی جۆرێك نیە لەفەرمانڕەوایی نیشتمانی بەتەنها، بەڵکو نیازی چاکسازی کۆمەڵایەتیشی هەیە، دەیەوێت کۆمەڵگەی کوردستان بەرەو باڵاتر پەرەپێبدات و دەیەوێت دواکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابوریی و رۆشنبیری لەناوبەرێت و کۆمەڵگەیەکی کوردستانی پێشکەتوو هاوچەرخ بونیاد بنێت.

ئەگەر سەرنجمان لەپەرەسەندنە جۆریەکان دا کەلەبزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا رویانداو پێشتر باسمان لەبارەوە کرد، وە ئەگەر سەرنجمان لەو رۆڵە کاریگەرەدا کە پێشڕەوانی دیموکراتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی دەیگێڕن، ئەوا لەو دروشمانە تێدەگەین کە شۆڕش دەیەوێت لەم قۆناغە مێژوییەدا جێبەجێیان بکات دەکرێت لێرەدا کورتیان بکەینەوە:

١- بەدیهێنانی حوکمی زاتی بۆ کوردستانی لەچوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتی شۆڕشگێڕیدا واتە بەرپاکردنی سستمێکی دیموکراتی شۆڕشگێڕ تێیدا.

٢- پەرەپێدانی کۆمەڵگەی کوردستان بەرەو باڵاترو باشتر، بەلەناوبردنی تەواوەتی رژێمی دەرەبەگایەتی و پاشماوەکانی چاخەکانی ناوەڕاست و، کۆتایهێنان بە دواکەوتویی ئابوریی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و، بونیادنانی پیشەسازی نیشتمانی و ئاوەدانکردنەوەی وڵات و بڵاوکردنەوەی مەعریفە و رۆشنبیریی تێیدا لەسەر ئاستێکی میللی فراوان و ئەنجامدانی چاکسازی کۆمەڵایەتی پێویست.

بەوشێوەیە دەبینین کە شۆڕشی کوردی شۆڕشێکی نیشتمانی و دیموکراتیە، بەڵام ئایا شۆڕشێکە لەسەر ریتم و شێوازی نیشتمانیی کۆن؟ بەو مانایەی ئایا دەیەوێت حوکمێکی نیشتمانی بەرپا بکات کە بورجوازیەت و تاقمە موڵکدارە نیشتمانیەکان بەڕێوەی بەرن؟

وەڵام ئەوەیە نەخێر.. شۆڕشی کوردی شورشێکی نیشتمانی نیە لەو شێوازە کۆنە بەڵکو شۆڕشێکی نیشتمانی و دیموکراتی نوێیە بەو مانایەی دەیەوێت حوکمێکی دیموکراتی میللی بەرپابکات کەوا جەماوەری میللی بەڕێوەی بەرێت و لەرێگەی نوێنەرەکانیەوە وەك هێزێکی سەرکردە، رێگیریش نیە لەوەی کە دەستەو تاقمە

نیشتمانیەکانی تر بەشداری تێدا بکەن وەك هێزێکی هاوپەیمان بەلاَم دژ نەبێت یان نەبێتە بەربەست لەبەردەم چاکسازیە کۆمەلاَیەتی و دیموکراتیە پێویستەکاندا.

پاشان شۆڕشی کوردی دەیەوێت گۆڕانکاریی قولّ لەکۆمەلگەدا ئەنجام بدات کەوا دەستەو تاقمە مولّکدارە نیشتمانیەکان یان بورجوازیەتی نیشتمانی – کە ئەمانە دەستەیەکی کۆمەلاَیەتی لاوازن لەرووی چینایەتی و دواکەوتوون لەرووی کۆمەلاَیەتیەوەو لەرووی مێژوییەوە سەلماوە دوورن لەوەی بتوانن سەرکردایەتی بکەن – هەتا لەبیرکردنەوە لێی، چما لەوەی پێی هەستێت یان جێبەجێی بکات، هەر ئەمەش ئەوە دەسەپێنێت کە پێشڕەوانێکی جەماوەری میللی هەستن بەسەرکردایەتیکردنی بۆ بەدیهێنانی ئەم چاکسازییە کۆمەلاَیەتیە قولاَنەو پاشانیش بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم ئەرکە مێژووییە.

بەلاَم ئایا هەموو ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە شۆڕشی کوردی شۆڕشێکی سۆشالیستیە؟ وەلاَم ئەوەیە کە هەروەها نەخێرن ئەوە شۆڕشێکی سۆشیالیستی نیە چونکە ئامانجی بەرپاکردنی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا نیە و، نایەوێت هەموو بوارەکانی ژیان خۆمالّی بکات بەتایبەتی کێلگەکان و زەویەکەی، وەلەبەرئەوەی کە لەکوردستاندا پالّنەرو هاندەرە مادییەکان نیە بۆ بونیادنانی سستمێکی سۆشیالیستی، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە جەماوەری کوردی و پێشڕەوە دیموکراتیەکەی لەدژی سۆشیالیزم دەوەستنەوەو نایانەوێت بونیادبنرێت، نەخێر بەلّکو بەوپەری سادەییەوە: مەرجە مادییەکان بۆ بونیادنانی سستمی سۆشیالیستی لەم قۆناغەی ئێستادا فەراهەم نین، وەك ئاشکراشە سۆشیالیزم بەهیواو ئارەزووەکان و بەتەنها بەخۆمالّیکردنەکان بونیادنانرێت، بەلّکو دەبێت ئەرکی قۆناغی رزگاربوونی نیشتمانی دیموکراتی بەئەنجام بگەیەنرێت بۆ ئەوەی رێگەخۆش بکرێت بۆ بونیادنانی سۆشیالیزم ئەمەو بۆ زانین کە شۆڕشی کوردی هەندێك لەدەسکەوتەکانی خۆمالّیکردووە کە سۆیشالیزم دەیەوێت وەك خۆمالّیکردنی پیشەسازیە قورسەکان و کانزاکان و سامانەکانی زەوی و دارستانەکان و رێگای پەرەسەندنێکی شۆڕشگێڕیی دەگرێتەبەر لەگەلّ ئەنجامدانی چاکسازیە

دیموکراتیەکان وەك چاکسازی کشتوکاڵی و حوکمی دیموکراتی، کە ئەمانە لەکرۆکی ئەرکەکانی شۆڕشی دیموکراتی بورجوازین.

پێویستە کاتێك باس لە چەمکی شۆڕشی کوردی دەکەین هەمیشە ڕاستیەکی گرنگمان لەیادبێت کە ئەویش بوونی حزبێکی پێشڕەوی دیموکراتی شۆڕشگێڕیی– نا بورجوازیە– کە لەسەرەوەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردیدا دەوەستێت و لەپێشەوەی ریزەکانی شۆڕشگێڕەکانیەوەیە، پاشانیش لاوازی حزبی بورجوازی عەشایەریی لەکوردستان و، مایەپووچ بوونی دەستە موڵکدارو بورجوازیە کوردیەکان لەبواری سەرکردایەتیکردنی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕیی کوردیدا لەمێژوودا، لەئەنجامی پەرەسەندنەکان کەبەسەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا هات وەك لەپێشەوە باسمانکرد.

*بەکورتی شۆڕشی کوردی :*

شۆڕشێکی نیشتمانی رزگاریخوازی دیموکراتی نوێیە، لەبار و گونجاو دەبێت لەگەڵ رەوشە کوردستانیەکاندا بەتایبەتی و تێدەکۆشێت بۆ پەرەپێدانی کۆمەڵگەی کوردستان بەرەو باڵاترو باشتر بەرێگەیەکی ناسەرمایەداریی و بەرەو سۆشیالیستی. ئەگەر گەڕاینەوە بۆ شۆڕشی کوردی وەك روداوێك لەکوردستان دەبینین کە لەشۆڕشێکی نیشتمانی خاوەن ئامانجگەلێکی سیاسی رووتەوە، پەرەیسەندووە بۆ شۆڕشێکی هاوچەرخ لەم رۆژگارەماندا وە بە پەرەسەندنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی شۆڕشی کوردی ئەویش پەرەیسەندووە، هەروەها بەپێی پێداویستیەکانی سەرکەوتنی و پێویستیەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵگەی کوردستان.

شۆڕشی کوردی لەو شۆڕشانەیە بەوە جیادەکرێتەوە لەقۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا چەندین بەرپابوونی بەخۆوە بینیوە کە قۆناغی رزگاربوونی نیشتمانی و دیموکراتیە واتە شۆڕشێکی فرە ئەڵقەیە و، بۆ ئەوەی بیرۆکەیەك لەبارەی شۆڕشی کوردی و هەندێك لەسەرهەڵدانەکانی و تێبینیکردنی پەرەسەندنەکانیەوە پێشکەش بکەین ئەوا هەندێك زانیاری دەبەخشینە خوێنەری بەرێز لەبارەی سەرهەڵدانەکانی ئەم شۆڕشانەی خوارەوە:–

# شۆڕشی نیشتمانی کوردی بەسەرکردایەتی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریی

**١٨٨٠-١٨٨١**

ئـەو شۆڕشـە کوردیـە کـە بەسـەرکردایەتی شـێخ عوبەیـدوڵڵای نـەهری لەشـەمزینان هەڵگیرسـا، بـەگرنگترین بزوتنـەوە نەتەوەییـە کوردیـەکان دادەنرێـت لەسـەدەی نۆزدەهەمـدا ڕویانـدا، ئـەویش لەبـەر فراوانـی و گـشتگیریەکەیەوە لەچـەند ناوچـەیەکی گرنگی کوردستان و لەبەر ئامانجە نەتەوەییە روونەکانی.

دکتۆر شاکر خصباک[١٣٤] لەبارەیەوە دەڵێت:-

-لەسـاڵی ١٨٨٠دا شۆڕشـێکی کـوردی تـر لەناوچـەی شـەمزینان بەسـەرۆکایەتی شـێخ عوبەیدوڵڵای نەهری هەڵگیرسا کەخاوەن قەڵەمرەویەکی فراوان بـوو لەناوچـەکەدا، شـێخ عوبەیدوڵڵا ئامانجی پێکهێنانی حکومەتێکی کوردی سەربەخۆبوو بەمەرجێك بەناو لـەژێر سەرپەرشتی تورکیادا بێت، عوبەیدوڵڵا سەرکەتوو بوو لەوەی قەڵـەمرەوی خـۆی بەسـەر ناوچەیەکی فراواندا بکێشێت و چەند چاکسازیەك بکات و بتوانێت تاڵان و بڕین نەهێڵێت و هانی کشتوکاڵ و کارەکانی بونیادنان بدات.

شێخ عوبەیدوڵڵا ڕێگەی خۆشکرد بـۆ شـۆڕش بەئەنجامـدانی ڕاوێـژو پەیوەندیکردنیـەوە بـەپیاوانی ئـایینی و سـەرۆك هۆزەکانـەوە و، بـەجۆرێك لەسـازکردن شـێخ عوبەیـدوڵڵا سەرۆکایەتی کۆنگرەیەکی عەشایەریی کـرد کـە نوێنـەرانی هۆزەکـان لەتـەمموزی سـاڵی ١٨٨٠دا لەگوندی نەهری سازیانکرد وەك ڕێگەخۆشـکردنێك بـۆ ڕاگەیانـدنی شـۆڕش، کـە بڕیاریدا کۆمەڵەی هۆزە کوردیەکان پێکبێت کە پەرچەمی تێکۆشانی لەدژی داگیرکـەرانی تورك و فارس بەرزکردەوە، بەسـوود وەرگـرتن لەهەسـتی ئـایینی و لـەو ڕەوشـانەی کـە

---

[١٣٤] - لا ٢٧ لەکتێبی دکتۆر شاکر خصباك- الکرد والمسالة الکردیـة- ئـەو سەرچـاوەیەش کـە دکتـۆر خـصباك پشتی پێدەبەستێت لەم وتانەیدا بریتیـە لـە: Parlimentary papers. Turkey No. ١١. ١٨٨١. pp. ٣١٠-٢٧٥.

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تێی کەوتبوو. ئەمەش لەخوێندنەوەی وتارەکەی عوبەیدوڵلاوە دەردەکەوێت لەکۆنگرە عەشایەرییەکەدا کە ووتی[١٣٥].

—پـێش ٥٥٠ سـاڵ ئیمپرتۆریـەتی عوسمـانی دامـەزرا، عوسمانیـەکان بەشـێوەیەکی ناشـەرعی گەیـشتنە فـەرمانڕەوایی. حکومـەتی عوسمـانی دوای ئـەوەی ٤٠٠—٥٠٠ سـاڵ فەرمانڕەوایی کـرد وازی لـەئاینی ئیـسلامی هێنـاو ڕێگـەی کـوفری گرتەبـەر، لەوکاتـەوە وورده وورده لە ڕوخان و ئاوابوون نزیك دەبێتەوە.. بۆیـە ئـەی ڕۆڵـە خۆشەیـستەکانم— بەسە — بەپێی ڕاسـپاردەکانی باوباپیرانمـان بەرگـەی ئـەم زوڵـم و کزێلایـەتیان گرتـووە کەلەلایەن تورکە ستەمکارەکانەوە سەپێنراوە بەسەریاندا، پێویستە نـەك تـەنها ئێمـەی کورد لـەتورکیای عوسمانیـدا، بـەڵکو کوردەکـانی ئێـرانیش ڕزگـاربن لەدەسـت ئـەم دوو حکومەتە کە بوونەتە بەربەست و ئاستەنگ لەبـەردەم ڕاپەڕینمانـدا، بۆیـە باوباپیرانمـان فــەرمانیان پێکــردووین هــەموومان بــەخوێنی خۆمــان قوربــانی لــەپێناوی ئــاین و نیشتمانەکەماندا بدەین —.

—هەروەها چەند لایەنێك لە ڕوخسارەکانی نیشتمانی شۆڕشی شەمزینان لەناوەڕۆکی ئەو نامەیەدا دەردەکەوێت کە شێخ عوبەیدوڵلای نەهری سەرکردەی شۆڕشەکە ناردویەتی بۆ کونسوڵی بەریتانی لەئۆرمیە تێیدا هاتووە:[١٣٦]

—کــورد گــەلێکی ئــازاو خــاوەن خەســڵەت و ســیفەتێکە کــە شــایانی پیاهەڵدانــەو دابونەریتێکی تایبەت بەخۆیی هەیـە لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا دوژمنـان دەیانـەوێت بـە ناتۆرەی بکوژو دڕندە ئەنگی بکەن.

— پیـاوە قەڵـەمڕەوەکانی کـورد لـەتورکیاو ڕوسـیاو ئێـران لەسـەر یـەك ئامـانج کـۆك و هـاوڕان، بۆیـە پێویـستە چارەسـەرێکی خێـرا بـۆ مەسـەلەکەیان بدۆزرێتـەوە ئەگـەرنا

---

[١٣٥] — بگەڕێرەوە بۆ ئەتروحەکەی دکتۆر شەمزینی کە ئەم چەند کوپلەیە لەوتارەکەی شێخ عوبەیدوللا لـە ك. ب کامسارکانەوە وەردەگرێت کە کونسوڵی گشتی ڕوسیا بوو لەشارەکەدا—ڤان— لەکاتی شۆڕشدا— لەکۆمەڵەلێك لە سەرژمێریەکان بۆ مادەکانی جوگرافیا و تۆبۆگرافیا لەئاسیا— چاپی ١١ سان پترسبۆرگ. ساڵی ١٨٨٤ لا ٢٤ ی چاپە ڕوسیەکە.

[١٣٦] —لا ٦٢ لەچاپە ئینگلیزیەکەی نوسەر بەڕێز ئارشاك سافرا ستیان:.١٩٤٨ Kurds and Kurdistan

کوردەکان خۆیان چارەسەی گونجاو دەدۆزنەوە، چونکە چیدی بەرگەی زوڵملێکردن و کوشتن ناگرن کە دوژمنەکان بەرامبەریان ئەنجامی دەدەن، ئێمە هەرگیز کەمتەرخەمی ناکەین بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە پیرۆزەو بەهەموو ئەوەی هەمانەو بەرۆحی خۆمان قوربانی دەدەین و دووایین دۆڵپە خوێنی خۆمان دەرێژین بۆ بەرگرتن لەهەردوو دەوڵەتی تورکیاو ئێران و داواکردنی مافی سەربەخۆبوونمان-.

بەوشێوەیە دەبینین ئامانجەکانی شۆڕش چڕدەبنەوە لە نەهێشتنی زوڵم و زۆری تورك و فارسەکان لەدژی گەلی کوردو رزگارکردنی کوردستان و بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، وە دەبینین ئامادەیی هەیە بۆ قوربانیدان و هەڵگرتنی داخوازیەکانی خەباتی شۆڕشگێڕیی.

لەبارەی ئامانجەکانی شۆڕشیشەوە (ئا.ئا ئارالیکیان) لەلێکۆڵینەوەکەیدا لەبارەی- کوردەکان لەئێران دەڵێت[١٣٧]:

-بیرۆکەی پێکهێنانی کۆنگرەیەکی عەشایەریی کوردی لەناوەندی گەلی کوردیدا هەڵقولا، کە شێخ عوبەیدوڵلا دەیویست بەکردەوە دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ پێکبێنێت-.

دوای کۆتایهاتنی کۆنگرەی هۆزە کوردیەکان و کاتێك کە نیشتمانپەروەرەکان بینیان پەیوەندیەکان لەگەڵ فەرمانڕەواکان و ولاتانی بیانی نەزۆك بوون و لەبەدیهاتنی هەتا بەشێك لەداواکانیان بێ ئاکام بوون، لەژێر سەرکردایەتی شێخ عوبەیدوڵلای نەهریدا راپەڕین کە پیاوێکی ئایینی گەورە بوو خاوەن دەسەلات و قەڵەمڕەوی و رێزێکی زۆر بوو لەهەموو ناوچەکانی کوردستاندا، خۆبەخشەکان لەهەموو ناوچەکانی کوردستانەوە هاتنە ناو ریزەکانی سوپای شۆڕشی کوردیەوە، کوردەکان لەناوچەکانی شەمزینان و موکریان و سۆران (شارەزوور)و (بادینان)و (وان)و شوێنەکانی ترەوە بەشداریان تێدا کرد. شۆڕشەکە لەسەرەتایەوە چەند سەرکەوتنێکی سەربازیان بەدەست هێناو شارەکانی مەهابادو ئورمیە-رەزاییە- و هەموو ئەو ناوچانەیان ئازاد کرد دەکەونە خۆرئاوای ئازربایجان و ناوچەی موکریان و شەمزینان و هەندێك لەناوچەکانی بادینان. نیشتمانپەروەرە کوردەکان دەستیان کرد بە رێکخستنی کارگێڕیی نیشتمانی لەناوچە ئازادکراوەکاندا.

---

[١٣٧] - بگەڕێرەوە بۆ ئەترۆحەکەی دکتۆر شەمزینی.

دوای چەند شەڕێك کوردەکان سوپای ئێرانیان بەزاند، شۆڕشگێڕەکان بەرەو شاری تەبرێز بەڕێکەوتن بۆ ئەوەی ئازادی بکەن هەربۆیە حکومەتی ئێران هانای بۆ هەردوو دەوڵەتی بەریتانی و ڕوسیای قەیسەری برد ئەوانیش بەدەم داواکەیەوە چوون و ڕوسیای قەیسەریی سوپاکەی مۆڵکردەوە بۆ لێدانی شۆڕشەکە.

دوای دەستێوەردانی بیانی و هەڕەشەی بەکارهێنانی سوپای قەیسەریی و دوای ڕێکەوتنی تورکیاو ئێران لەدژی شۆڕشی کوردی و کۆکردنەوەی کۆمەڵێکی زۆرو زەبەندە لەسوپاکەیان شۆڕش ناچاربوو بەدانوستان ڕازی ببێت لەگەڵ حکومەتی عوسمانیدا دەربارەی داخوازییە کوردییەکان، شێخ عوبەیدوڵلا فریوی خواردو بەسەرۆکایەتی شاندێکی کوردی چوو بۆ پایتەخت بەڵام دەوڵەتی عوسمانی لەبری ئەوەی دانوستانی لەگەڵدا ئەنجام بدات دەستگیریکردو خستیە زیندانەوە، فشارەکانی ئینگلیزی و قەیسەریی کاریگەریەکی زۆریان هەبوو لە فریودانی شێخداو چوونی بۆ ئەستانە.

گرتنی شێخ بووە هۆی ئەوەی ئەم سەرهەڵدانەی شۆڕشی کوردی کۆتایی پێ بێت چونکە بزوتنەوە شۆڕشگێڕیەکە ڕێکخراو نەبوو وە سەرکردایەتیەکی دەستەجەمعی نەبوو، بەڵکو مۆرکی عەشایەری و دەسەلاتی تاکی بالا دەست بوو.

بەلام شۆڕشی شەمزینان بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بەشێوەیەکی باشتر فۆرمەلەکردو پێداویستیەکان و ڕێگەکانی یەکخستنی هێزە نیشتمانیە کوردیەکانی بەدیارخست بەوەش ڕێگەی خۆشکرد بۆ دەرکەوتنی دەستەو کۆمەڵە کوردیەکان، هەروەك چۆن هەستی نەتەوەیی کوردی فۆرمەلەکردو بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لەبۆتەی ناوچەیی و هەرێمی دەرکرد بۆ چوارچێوەی هەموو کوردستان. هەروەها لاپەڕەیەکی نوێی کردەوە لەپەیوەندیەکانی کوردی-ئەرمەنی کە شێخ پەیوەندی باشی لەگەڵ ئەرمەندا هەبوو هەروەها بەکارەکانی پەیوەندیەکانی کوردی-ئەرمەنی بەهێزکرد.

## شۆڕشی کوردی بەسەرکردایەتی شێخ مەحمود و
## سیاسەتی داگیرکەرانەی بەریتانی

هەرکە بـاری قـورس و گرانـی جـەنگی جیهـانی کۆتـایی پێهـات، دەسـتەو کۆمەڵـە نیشتمانیە کوردیەکان دەستیانکرد بەداواکردنی مافە نەتەوەییەکانی کوردەکان هەروەك چۆن گەلەکانی تری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی داوای مافـەکانیان دەکـرد، لـەرزگاربوون و سـەربەخۆیی، داگیرکـەری بـەریتانی بەرێکـەوتن لەگـەڵ فەرەنـسادا بـەڵێنی دابـوو رێگەنەدات جارێکی تر دەسـەڵاتی تـورکی بگەڕێتـەوە بـۆ سـەر ئـەو گەلانـەی کـە تـورك نەبوون وەك کوردو عەرەب و نەتەوەکانی تر.

لەوەش زیاتر بەریتانیاو فەرەنسا بەیاننامەیەکی هاوبەشـیان دەرکـرد تێیـدا بـەڵێنیان دا یارمەتی ئەم گەلانە بدەن بۆ پێکهێنانی دەوڵەت بۆ خۆیان کەلەژێر سەرپەرشتی خۆیاندا بن!!

نیشتمانپەروەرە کوردەکان وویستیان سوود لـەو ڕەوشـەی دوای جـەنگ وەربگـرن بۆیـە پەیوەندیان کرد بە بەریتانیاوە بەهیوای ئەوەی بگەنـە جۆرێـك لەرێکـەوتن لەگەڵیـدا کـە زامنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی بکات، هەتا ئەگەر ئـەوەش لـەژێر سەرپەرشـتی بەریتانیاشدا بێت. نیشتمانپەروەرە کوردە دڵپاکەکان تا ئەوکات شارەزانەبوون لـەفێڵ و تەڵەکەو شێوازە داگیرکەریەکان بەڵکو وایان زانی کە ئەوە خەیرێکی هاوبەشی تێدایە بـۆ نیشتمانەکەیان و هەروەها بۆ بـەریتانیاش. بەتایبـەتی پڕوپاگەنـدەکانی ئـازادی و مـافی گـەلان لـەدیاریکردنی چارەنوسـیان و بنـەماکانی ویلـسنی ئـەمریکی دەگەیـشتە گـوێ ولەبەرئەوەی کە سروشـتی چینایەتی سـەرکردەکانی بزوتنـەوەی کـوردی موڵکـدار یـان بورجوازی یان ئاییني بوون.

لەشاری سلێمانی– کە نشینگەی میرنشینی بابان بووە شێخ مەحمودی حەفیـدی کـوڕی کاك ئەحمەدی شێخ پیاوی ئاییني هەرە بـەناوبانگ خـاوەن دەسـەڵات و قەڵەمڕەویـەکی گەورە بوو، بەتایبەتی تورکەکان وەك حوکمداری سلێمانی دایانمەزراندبوو وە ئـەو چـەك و تفاقانەی لەوێ بوون پێیان سپاردبوو، ئەمەش وایکرد بەهێزتربێت ئـەوەش تاڕادەیـەك لەکۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا بوو، کاتێکیش ئینگلیز نزیك بـوەوە لەناوچـەکە دوای

داگیرکردنی کەرکوك و دەرکردنیان لێی بەرەو باشور، سەرۆك هۆزە کوردەکان کۆبونەوەیەکیان بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود بەست تێیدا بڕیاردرا نامەیەك لەگەڵ نوێنەرێکی تایبەتدا بنێرێت بۆ لای حاکمی ئینگلیز لەعێراق بۆ داواکردنی فەرمانڕەوایەتیەکی کوردی لەژێر سەرپەرشتی بەریتانیادا بەکردەوەش ئەوە کراو نامەکە نێررا بۆ کفری[۱۳۸] درایە دەست ئەفسەرەکانی ئینگلیزو کاتێکیش نامەکە گەیشت بەفەرمانڕەوای سەربازی بەریتانیا سێر ئەرنۆلد ویلسن لەبەغداد، ڕازی بوو لەسەر ناردنی مێجەر نۆئیلی بەریتانی بۆ سلێمانی و کۆمەڵێك ڕێنومایی تایبەتی پێدا، لە ۱- تشرینی دووەم- ساڵی ۱۹۱۸دا گەیشت و کۆبونەوەیەکی بەست کە پیاوانی ئایینی و سەرۆك هۆزەکان و پیاوماقوڵاتی شارەکە ئامادەیی بوون تێیدا بەناوی حکومەتی بەریتانیاوە شێخ مەحمودی وەك حوکمداری گشتی هەموو کوردستانی باشور ڕاگەیاندو موچەکەیی بە ۱۵۰۰۰ روپیە دەستنیشان کرد و مێجەر نوئیل-یش واتە خۆیی وەك ڕاوێژکاری شێخ مەحمود دامەزراند.

ئەوەش مانۆڕێکی لێهاتووانە بوو ئینگلیز لەکورستان ئەنجامیدا، کە بەریتانیای داگیرکەر ویستی پێی دەسەڵاتی خۆی بەسەر کوردستانی ئازادکراودا بسەپێنێت[۱۳۹] کە ئەوکات سوپای ئینگلیز یان تورکی تێدا نەبوو- ئەمە یەکەم، پاشانیش جێگیرکردنی قەڵەمڕەوی

---

[۱۳۸] - مامۆستا رەفیق حیلمی لەیاداشتەکانیدا کەبەزمانی کوردی بلاَبۆتەوە لەبەشی یەکەمدا باس لەوە دەکات کە شێخ مەحمود نامەیەکی ناردبوو بۆ ئینگلیز هەرکە گەیشتبوونە کەرکوك تێیدا داوایان لێدەکات یارمەتی بدەن بۆ پێکهێنانی فەمانڕەواییەکی کوردی لەژێر سەرپەرشتی بەریتانیادا. بەلاَم دوای کشانەوەی بەریتانیا لەکەرکوك و گەڕانەوەیان بۆ کفری نامەیەك کەلەلایەن ژمارەیەکی گەورە لەسەرۆك هۆزەکانەوە ئیمزاکرابوو لەناویشیاندا شێخ مەحمود نێررا بۆ ئینگلیز. سوپای ئینگلیز بۆ یەکەمجار لە ۷نیسانی ۱۹۱۸دا لەژێر فەرماندەیی ژەنراڵ مارشاڵدا کەرکوکی داگیرکرد بوو. سەیری لاپەڕە ۵۱ ی چاپی کوردی یاداشتەکانی مامۆستا حیلمی بکە -بەرگی یەکەم - بەشی یەکەم بەغداد ساڵی ۱۹۵٦. مامۆستا حیلمی لە لاپەڕە ۵۷ی هەمان سەرچاوەدا دەڵێت کە شێخ مەحمود نامەی دووەمی نارد بۆ ئینگلیز لەکفری لەگەڵ دوو نێراویدا کەبەڕێزان عیزەت تۆپچی و ئەحمەد فایەق بوون.

[۱۳۹] -مامۆستا رەفیق حیلمی لە لاپەڕە ٦۱ی سەرچاوەی پێشوودا دەڵێت (نۆئیل و ئەوەی لەپشتی کارەکەوەیە کە ویلسن بوو ویستیان سوود لە دەسەلاَت و قەڵەمڕەوی شێخ مەحمود وەربگرن و دەسەلاَتی بەریتانی لەم ناوچەیەدا جێگیر بکەن بێ بەکارهێنانی هێزی سەربازی).

خۆی لەعێراق و دروستکردنی جێ پێکانی خۆی لەکوردستان و کڕینی لایەنگریی و بەڵێنی هەندێك لەسەرۆك هۆزەکان و دەسەڵاتدارەکان دووەمیش ئەوەش بۆ دۆزینەوەی قەڵەمڕەوی خۆی لەکوردستان و خستنیە ژێر سەرپەرشتی خۆی بۆ ئەوەی تای تەرزاوەکەی قورس بێت لەکاتی مامەڵەو سازشی لەگەڵ فەرەنسادا کەوا کوردستانی باشور لەپشکی ئەو بوو بەپێی رێکەوتننامەی سایکس بیکۆی نهێنی داگیرکاری و، سێیەمیش بۆ ئەوەی کوردستانی باشور بکاتە پێگەیەك بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی بکێشێت بۆ کوردستانی خۆرهەلات و ناوەندی کە نیشتمانپەروەرەکانی داوای مافی چارەی خۆنوسین و سەربەخۆییان کردبوو وە وەفدێکیان بەسەرۆکایەتی ژەنراڵ شەریف پاشا ناردبوو بۆ پاریس بۆ ئامادەبوون لە کۆنگرەی ئاشتی و داواکردنی سەربەخۆیی کوردستان چوارەم و زیاتر لەوەش وردەکاریەکانی پلانی داگیرکەری بەریتانی و چۆنیەتی جێبەجێکردنی لەخۆرهەلاتی ناوەڕاست بەشێوەیەکی کۆتایی دیاری نەکرابوو، ململانێی داگیرکاری دەستی بەدابەشکردنی خۆرهەلاتی ناوەڕاست کردبوو، لەکاتێکدا بەریتانیا خەریکی نانەوەی فێڵ و تەڵەکەکانی بوو بۆ دەستگرتن بەسەر بەشی فەرەنسادا بەدەسەلات گرتن بەسەر سوریاو کوردستانی باشوردا بەپێچەوانەی رێکەوتننامەی سایکس بیکۆی داگیرکەرانەوە فەرەنساو ئیتالیاو ئەمریکا داوای پشك و بەشی خۆیانیان دەکرد لەتالآنیەکان.

کاتێکیش بەریتانیا هاتە ناو گۆڕەپانی رێکەوتن و یەکلایکردنەوەی ناکۆکەیەکانیان – لۆید جۆرج –ی سەرۆك وەزیری بەریتانیا فێڵی لە –کلیمانصۆ– ی فەرەنسی کردوو ڕازیکرد بەوەی واز لەکوردستانی باشور بهێنێت لەرێکەوتننامەی– سان ریمۆ –دا بۆ بەریتانیا لەبەرامبەر پشکێك لەنەوتەکەی و وەك بەشێك لەو مامەڵەیە بەریتانیا سەرلەنوێ دانی بەدەسەلاتی فەرنسادا نایەوە لەسوریاو لوبنان. کلیمانصۆ دواتر پەشیمانی خۆیی دەربڕی لەوەی کورستانی باشوری لەدەستدا کە دەوڵەمەندە بەنەوت و کانزاکان و سامانەکانی تر.

بەوشێوەیە گۆڕەپانەکە چۆڵ بوو بۆ بەریتانیا بۆ دەستگرتن بەسەر کوردستانی باشوردا بەلآم پەیوەندیە دۆستانەکانی نێوان بەریتانیاو فەرمانڕەوایی شێخ مەحمود تەمەنی

درێژ نەبوو ناکۆکیەکان دەستیان بەدەرکەوتن کرد دوای گواستنەوەی مێجەر نۆئیل و دامەزراندنی مێجەرسۆن[١٤٠] لە شوێنەکەی وەك راوێژکاری حوکمداری کوردستان ناکۆکیەکان توندبوون ئەویش کاتێك کە مێجەرسۆن دەستیکرد بەنانەوەی فێڵ و تەڵەکە لەدژی شێخ مەحمود و کڕینی لایەنگریی و پەیمانی ئاغاکان و دەسەڵاتەدارەکانی کورد و دنەدانیان لەدژی شێخ مەحمود. بەڵام مێجەر نۆئیل ئینگلیز ناردیان بۆ گەڕان بەکوردستانی ناوەندیدا کەهێشتا هاوپەیمانان رێك نەکەوتبوون لەسەر دیاریکردنی هەڵوێست لەبارەیەوە، چونکە پێشتر ئەو ناوچەیە پشکی روسیای قەیسەریی بوو کە رووخابوو وە سەرکردەی شۆرشەکەی ف.ا. لینین ڕایگەیاندبوو ڕوسیای سۆڤیەتی سازش لەهەموو ماف و ئیمتیازەکانی روسیای قەیسەریی دەکات. سەرکردە کوردەکانی ئەم ناوچەیەش سەردانی هاوپەیمانانیان دەکرد و داوای حوکمی کوردیان دەکرد.

نوێنەری سامی بەریتانیا لەئەستەنبول، لەبروسکەیەکیدا کە ناردبووی بۆ نوێنەری بەریتانیا لەبەغدا لەبەرواری ١٨-نیسان-١٩١٩ بەمشێوەیە گوزارشت لەهەڵوێستی سەرکردەکانی کورد دەکات[١٤١]:

[١٤٠] - مێجەرسۆن E.B.Soane پێشترو پێش جەنگی جیهانی یەکەم و بەشێوەیەکی پەنهان کە خۆی لەکەسایەتیەکی تر نیشاندابوو سەردانی کوردستانی کردبوو ووردەکاری ئەو سەردانەشی لەکتێبەکەیدا باسکردوە کە بەناونیشانی .To Mesopotamia and Kurdistan in Disguise مامۆستا رەفیق حیلمی باس لەوە دەکات کە (سۆن) کەسێکی داگیرکەری لوتبەرزو خۆبەزلزان بوو رقی لەشێخ مەحمودو فەرمانڕەواییەکەی بوو رقێکی توند هەر لەکاتی گەشتنیەوە لەشوباتی ١٩١٩ بۆ سلێمانی دوای گواستنەوەی مێجەر نۆئیل دەستیکرد بە نانەوەی داو و تەڵەکە لەدژی فەرمانڕەوایی شێخ مەحمود- بیل کە فەرمانڕەوای بەریتانیا بوو لەکویە و ئەفسەرە ئینگلیزەکانی تر رۆڵی خۆیان گێڕا لەهاندانی ئاغاکانی کورد لەدژی شێخ مەحمودو فەرمانڕەوایەتیەکەی. پەرچەکرداری هەوڵەکانی -سۆن- و ئەوانی تر لەئەفسەرەکانی ئینگلیز کە دژ بە فەمانڕەوایی کوردی بوون بەسەرکردایەتی شێخ مەحمود سەرسورمانی خەڵك و توورەبوونی شێخ لەبەرامبەریان. (بگەڕێرەوە بۆ یاداشتەکانی مامۆستا حیلمی بەشی یەکەم- پەڵ دووەم).

[١٤١] - لاپەرە ٢٢- چاپە عەرەبیەکە لەکتێبی ئەندازیار صەلاح سەعدوڵلا- کوردستان و بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی- بەغداد.

-عبـــدالقادر- ئەگەرچـــی ســـەرۆکی ئەنجومـــەنی دەوڵەتـــە- دەستپێـــشخەریکرد لەنوێنەرایـەتیکردنی لیژنـەی کـوردی لێـرەو داوای سـەربەخۆیی کـوردی و رزگـاربوون لەکۆیلایەتی تورکەکان دەکات-.

لەبروسکەیەکی تردا کە بەروارەکەی ۳ ئایارە دەڵێـت کـە ئـەوان ( دەوڵـەتێکی تایبـەت بەخۆیانیان دەوێت... ئەیانەوێت بۆ هەمیشە رزگاریان بێت لەدەست تورکەکان ئەوانـەی کەبـەپێی قـسەی -عەبـدولقادر- هیـچیان نـەکردووە... وە زۆر بەناخۆشـی لەبارەیـەوە دووا).

بەڵام بەریتانیا بەردەوام بوو لەسـەر سیاسـەتە داگیرکەریەکـەی لـەهاریکاریکردن لەگـەڵ خەلیفـە لەئەسـتەنبوڵ لەلایـەك و دژایـەتیکردنی حـوکمی شـێخ مـەحمود لەکوردسـتانی عێراق لەلایەکی ترەوە. ئەم دوژمنایەتیکردنـە بـووە هـۆی ئـەوەی پێکـدادانی چـەکداری رووبدات لەنێوان ئینگلیزو کوردەکاندا دوای ئەوەی کە نیازە دوژمنکاریەکانی ئینگلیزیش ئاشکرابوو دژ بەفەرمانڕەوایی شێخ مەحمود ئەمانیش هەوڵەکانیان دژ بەئـەو زیـادیکردو چالاك بوو، شێخ مەحمود فەرمانیکرد بە مەحمودخانی دزڵـی کەیـەکێك بـوو لـەنزیکترین پـشتیوانەکانی شـاری سـلێمانی داگیربکـات ئـەویش لەشـەوی ۲۰-۲۱مایـسی ۱۹۱۹دا فەرمانەکـەی جێبـەجێکردو چـی ئەفـسەرو سـەربازی ئینگلیـز هـەبوون لەشـارەکەدا دەسـتگیرکران کـاتێکیش کـە هێزێکـی بـەریتانی هـات بـۆ داگیرکردنـەوەی سـلێمانی[١٤٢] هێزێکی شۆرشگێری کوردی لەناوچەی تاسڵوجە بـەرەنگاری بـۆوەو شکستێکی خراپـی پێهێناو زیانێکی زۆری بەرکـەوت لـەکوژراو و بریندارو دەسـتکەوتنی برێکـی زۆر چـەك و

---

[١٤٢] - هێزێکـی بـەریتانی بەسـەرکردایەتی کۆلۆنیـل بریـدجس Bredjes لـە رۆژی ۲۲ی مایـسی ۱۹۱۹دا کـەپێکهاتبوو لـە پیـادەو هەنـدێك تانـك هەوڵیانـدا جـارێکی تـر سـلێمانی بگرنـەوە بـەڵام هێزێکـی کـوردی بەسەرکردایەتی شێخ مـەحمود بـەرەنگاری بوونـەوە لەتاسڵوجەی نزیـك شـاری سـلێمانی و شکـستێکی خراپـی لێکـەوت دوای ئـەوەی لـە ۲۵ مایـسداو دوای شـەڕێکی تونـد کۆلۆنێـل بـەزێنرا دوای ئـەوەی کـە فریاکـەوتنێکی ئینگلیزیشی پێگەیشت بەسەرکرایەتی کۆلۆنێل-کندی- کە سەرچاوە ئینگلیزیەکان خۆیان دانیان بـەم زیانانـەدا نا: ملازم پۆل لەکەتیبەی ۳۲ کوژراو کاپتنی سوپاکەیان و ملازم دیکسن بریندار بوون و هەشت ئەفسەری پۆل و سەربازی ئینگلیز کوژران و ۱۲یش برینـداربوون و ١٤ ئینگلیـزی تـر بێـسەروشوێن بـوون کەلەناویاندا تۆمـسۆنی ئەفسەر هەبوو.( بگەڕێرەوە بۆ یادداشتەکانی مامۆستا رەفیق حیلمی لا ۱۲۰ بەشی یەکەم پەرتی دووەم).

کەرەستەی جەنگی، جەنگ بەردەوامبوو هەتا رۆژی ١٩ حوزەیران-١٩١٩ کاتێك جەنگێکی مەزن لەدەربەندی بازیان ڕوویدا کە ئینگلیز فرقەیەکی خۆیی تێدا بەکارهێنا لەسەربازو تانك و فرۆکەو تۆپ لەدژی هێزەکانی شێخ مەحمود کەبەخۆی سەرکردایەتی دەکردن[١٤٣] لەئەنجامی ناپاکی و خیانەتی هەندێك لەئاغاکانی هەمەوەند هێزەکانی بەریتانیا پشتیان لە هێزە کوردیەکان گرت و، دوای جەنگێکی سەخت کە تێیدا شێخ مەحمود خۆی برینداربوو ئینگلیزەکان سەرکەوتن و هێزە شۆڕشگێڕە کوردیەکەیان پەرتوبڵاو کردو شێخ مەحمودیان بەدیل گرت و گوێزایانەوە بۆ کەرکوك و پاشانیش بۆ بەغداو لەوێ درایە دادگایەکی سەربازی بەریتانی کە شێخ رەتیکردەوە دان بەوەدا بنێت کە ئەو دادگایە شایستە بێت بۆ ئەوەی دادگایی بکات بەوپێیەی ئەو حوکمداری

[١٤٣] - سەرکردایەتی گشتی سوپای بەریتانی فەرمانیکرد بە فرقەی سەربازی ١٨ کەلەژێر سەرکردایەتی ژەنراڵ فرایزەردا بوو لەموصڵ، فەرمانی پێکرد بچێت بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی کوردی کەلەژێر سەرکردایەتی شێخ مەحمود دا بوو. دوای شکستخواردنی ئینگلیز لەتاسڵوجە شێخ خۆی لە دەربەندی بازیان قایمکرد لەکاتێکدا هێزێك کە پێکهاتبوو لە (٥٠٠) جەنگاوەری کوردی چەکدار بەسەرکردایەتی شێخ قادری برای نارد بۆ (بنە) کە دەکەوێتە باکوری چەمچەماڵەوە بۆ بڕینی رێگەی کەرکوك -چەمچەماڵ کاتێك کە هێزێکی بەریتانیش لە ٣٠ مایسدا ویستی بگاتە چەمچەماڵ هێزێکی کوردی بەرەنگاری بۆوەو پەرتوبڵاویکرد. هێزێکی کوردی تریش بەسەرکردایەتی خوالێخۆشبوو مەحمودخانی دزڵی چواردەوری یەکەیەکی ئینگلیزی گرت لە(قەرەهەنجیر)ی نزیك شاری کەرکوك کە سەرکردەی هێزە ئینگلیزیەکە مێجەر-فرزر- بوو فرقەی هەژدەهەمی بەریتانیش بەسەرکردایەتی ژەنراڵ فرایزر گەیشتە کەرکوك بۆ پاراستنی هێزێکی بەریتانی تر کە ژەنراڵ ساندۆس لەهەولێرو ئاڵتون کۆپری سەرکردایەتی دەکرد لە ١٧ حوزەیران ١٩١٩ هێزە بەریتانیەکان کەوا گەیشت بوونە چەمچەماڵ خۆیان ئامادەکرد بۆ هێرشکردنە سەر دەربەندی بازیان، ئینگلیز لێهاتوو بوو لەفێڵێکی جەنگیدا ئەویش لە ١٩ حوزەیراندا کاتێك هێزێکی ئینگلیز بەرێنومایی یەکێك لەئاغاکانی هەمەوەند توانی بچێتە پشتەوەی سەنگەرەکانی شێخەوە. بەوشێوەیە شێخ کەوتە ناو بارێکی ناهەموارو تەڵزگەیەکەوە بەشێوەیەك هێزە بەریتانیەکان لەدواوە بەرەشاش تەقەیان لێدەکرد لەپێشیشەوە بە تانك و تۆپ، کوردەکان تا شەهیدبوون لەسەنگەرەکانیاندا مانەوەو ٤٨ کەسیان لێ شەهیدکرا کەلەناویاندا حاجی سەید حەسەنی مامی شێخ و تاهر ئەفەندی بەڕێوەبەری پۆلیسی شێخ و ئەو ئەفسەرە کوردانەش کەلە سوپای تورکیا گەڕابوونەوەو پەیوەندیان کردبوو بەشۆڕشەوە دەستگیرکران وەك (قادر ئەفەندی قەرەداخی) و عیزەت مەدفەعی و، عەبدولقادر ئایشەخان و، رەشید جەودت و، رەشید غەفور و، ئەدهەم ئەفەندی و، عەلی یاوەر صاڵح، نێران بۆ زیندانی بەغدا (یاداشتەکانی رەفیق حیلمی لا ١١٧-١٢٨ بەشی یەکەم- پەرتی دووەم).

کوردستانە نەك ئینگلیز یان بۆ دادگایەکی سەربازی بەریتانی ( کە بیانیە) شایستە بێت بۆ ئەوەی دادگایی بکات. بەڵام دادگاکە حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردا سەپاند و پاشان حوکمەکە گۆڕا بۆ هەتاهەتایی و شێخ مەحمود دورخرایەوە بۆ هیندستان.
پێش پێکدادانی چەکدارانەی نێوان شێخ مەحمودو داگیرکەری بەریتانی هۆزی (کۆیان)ی کوردی کە لەباکوری زاخۆ نیشتەجێ بوون لەگەڵ هێزەکانی بەریتانیادا بەیەکیانداداو کاپتن- پیرسن-ی فەرمانڕەوای سیاسی بەریتانی لەزاخۆ لەکاتی جەنگێکی نێوان ئینگلیزو شۆڕشگێڕانی (کۆیان)دا لە ڕۆژی ٢٤-نیسان- ١٩١٩ لەنزیك گوندی بیجو- کوژرا.
مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەیادداشتەکانیدا باس لەوە دەکات بێزاریی لەهەڵسوکەوتەکانی ئینگلیزە لوتبەرزەکان گەیشتبووە ئەوپەڕی و خەڵك بێزاربوون لەحوکمی داگیرکەری بەریتانی و بێ هیوابوون لەوەی کەوایاندەزانی بەریتانیا رزگارکەری گەلانە و دەوڵەتێکی بونیادنا کەوا درندەیەتەکەی کەمتر نەبوو لەهی دەوڵەتی عوسمانیی.
مامۆستا ڕەفیق حیلمی کە وەك یاریدەدەرو وەرگێڕی -بیل-ی ئەفسەری بەریتانی لەگەڵ روداوەکاندا ژیاوە جەختدەکاتەوە لەوەی کە -سۆن- هەر لەسەرەتاوە وویستی ڕێنموماییەکانی (ویلسن) ی -حاکمی گشتی لەعێراق- جێبەجێ بکات ئەویش بەلەناوبردنی حکومەتەکەی شێخ مەحمودو هاندانی هۆزەکان لەدژی کەئەمەش ڕاستی نیازەکانی ویلسن لەدژی کورد ئاشکرا دەکات.

# هۆكارەكانی كۆتـايهـاتنی شۆڕشی یەكەمی شێخ مەحمود

هەڵە سەربازیەكان كە سـەركردایەتی شـێخ مـەحمودی حەفیـد ئەنجامیـدان لـەگرنگترین هۆكارەكـانی كۆتایهـاتنی شۆڕشــەكەی بـوو لـەدژی ئینگلیزەكـان بەشـێوەیەكی خێـراو بەردەوامی نەبوونی. شێخ چووە ناو جـەنگێكی بەرەییـەوە لـەبری ئـەوەی مومارەسـەی تەكتیكی جەنگی پشتیوانەكان بكات كە ئەگەر شێخی پاڵەوان مومارەسەی بكردایە ئـەوا بەرهـەمی دەبـوو بەتایبـەتی شۆڕشـەكەی لەناوەنـدە كوردیەكانـدا سـۆزو پـشتیوانیەكی بەرفراوانی لێدەكرا. هەروەك چۆن شێخ بەشداری كـرد لەسـەركردایەتیكردنی ئـەو یەكـە جەنگیانــەدا كەراســتەوخۆ لــەناو بــەرەی جەنگەكــەدابوون ئەمــە وێــڕای دەلالــەتكردن لەپاڵەوانیەتی و ئازایەتیەكەی بووە هـۆی ئـەوەی كـە لـەدوای برینـداربوون و دیلكردنـی كۆتایی بە بزوتنەوەی شۆڕشگێڕیی چەكداری بێـت كـە ئەگـەر ئـەو بریندارنەبوایـەو دیـل نەكرایە ئەوا بەو خێراییە كۆتایی پێ نەدەهات.

مامۆستا رەفیق حیلمی لەیادداشـتەكانیدا كەلـەو كاتـەدا هاوڕێیـەتی ئەفـسەری ئینگلیـز (بیــل)ی كــردووە دەڵێــت لــەكاتی پێكــدادانی شــێخ مــەحمودو هێزەكــانی بــەریتانیادا تێبینیكرد دانیشتوانی ناوچەكانی رەواندوزو شەقڵاوەو كۆیە سۆزو دڵگەرمیان نیشاندەدا بەرامبـەر شۆڕشـەكەی شـێخ مـەحمودو پـشتیوانیكردن لێـی و زۆرێـك لەخـەڵك ئامـادەو سازبوون بۆ پەیوەندیكردن بەشۆڕشەكەیەوە ئەگـەر شـێخ چـەند یەكەیـەك لـەهێزەكانی بناردایـە بـۆ ئـەو ناوچـانە. پاشـان مامۆسـتا رەفیـق حیلمـی لەیادداشـتەكانیدا– بەشـی یەكـەم– پـەرتی دووەم لا ١٣٨ لـەژێر ناونیـشانی– هەڵـەی شـێخ مـەحمود لەشۆڕشـدا دەڵێت:–

شـێخ ئازایـەتی و پاڵەوانیـەتی خـۆیی نیـشاندا لـەم شۆڕشــەدا بــەلام ئـەو راوێـژكارو یاریـدەدەری بـەتواناو دڵسۆزی نـەبوون.. ئەگـەر شـێخ دوای شكستهێنان بـەهێزەكانی بـەریتانیا لەتاسـڵوجە هەسـتایە بەدابەشـكردنی هێزەكـەی بەشـێوەی چـەند یەكەیـەكی پشتیوانی چەكدارو لەهەموو ناوچەكاندا بلاوبونایەتەوە ئەوا زۆرێك لەپشتیوانانی شۆڕش پەیوەندیان پێـوە دەكـردن، لـەبری ئـەوەی كـە هێزەكـانی لـەژێر سـەركردایەتی خۆیـدا

کۆبکاتەوە لەدەربەندی بازیان کە ئەوە دەبووە هۆی بێزاربوون و بەهیلاك بردنی یەکەکانی بەریتانیاو دوور نەبوو شۆڕشەکەی سەربکەوتایە.
بێجگە لەوەش باسمان کرد نەبوونی بزوتنەوەیەکی نیشتمانی رێکخراو کە هەموو لایەنەکانی کوردستانی عێراق لەخۆبگرێت و نەبوونی حزبێکی نیشتمانی کە هێزەکانی گەلی کورد رێك بخات لەهەموو ناوچەکانی کوردستانداو هێزە کوردیە چەکدارەکان یەك بخات کە دژی بەریتانیابوون کە لەوکاتەدا زۆربوون... هەموو ئەمەو بالآدەستی تەواوی بەریتانیا لەرووی ژمارەو چەك‌و تفاقی سەربازی و تانك و فرۆکەوە هۆکاربوون لە لەناوبردنی خێرای شۆڕشەکەدا.
ئاشکراشە بزوتنەوە نیشتمانیەکان کە مۆرێکی فەردی یان عەشارەیی وەردەگردن لەسەرکردایەتیکردنیدا ناتوانێت خۆڕاگربێت و بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام بێت ئەگەر سەرکردەکەی کوژرا یان دیلکرا یان فێڵی لێکرا، هەروەك چۆن ئەم ڕەوشە بەسەر شۆڕشی یەکەمی شێخ مەحمود دا هات.

## ڕاستی سیاسەتی بەریتانیی و مانۆڕەکانی

جەوهەری سیاسەتی داگیرکەرانەی بەریتانیا لەبەرامبەر کوردستاندا، بەکۆیلەکردن و تاڵانکردنی کوردستان بوو بەڵام جیاوازی لەبارەی چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە بۆ ماوەیەك مایەوەو بەردەوام بوو لەنێوان هەندێك لەفەرمانبەران و بەرپرسانی ئینگلیزدا، سیاسەتی داگیرکەرانەی بەریتانیا لەگەڵ ئەو رەوشانەدا کە دەهاتنە پێش خۆی دەسازاندو دەگۆڕا بەشێوەیەکی لێهاتوویانە و خێراو لەسەر شێوازێکی جێگیرنەبوو لەحوکمکردنیدا بۆ کوردستانی باشورو هەڵوێستی لەکوردستان بەگشتی تەنها لەساڵانی ١٩٢٣و ١٩٢٤دا نەبێت کاتێك بەتەواوەتی بڕیاریدا کوردستانی باشور بەعێراقی عەرەبیەوە بلکێنێت و کورستانی ناوەندیی بەجێ بهێڵێت بۆ ئەوەی لەژێر رەحمەتی کەمالیەکاندا بێت و، کوردستانی خۆرهەڵاتیش لەژێر فەمانڕەوایی تاراندا.

بەڵام مانۆڕەکان و ئاڵوگۆڕەکان لەسیاسەتی بەریتانیدا بەمشێوەیە بوو:-

لەسەرەتاوە سیاسەتی بەریتانیا بەرەو ئەوە چوو کۆمەڵێك ویلایەتی کوردیی جۆراوجۆر دروست بکات کەلەژێر دەسەڵاتی سەرۆکە کوردە قەڵەمڕەوەکاندا بێت و هەڵبەتەش لەژێر سەرپەرشتی بەریتانیادا بێت، ئەم شێوازە داگیرکاریە لەوکاتەدا لای وەزارەتی داگیرکە بەریتانیەکان بەباش دەزانرا.

ئەمە هەندێك ئارەزووی لای خەڵك و بەتایبەتیش لای خاوەن دەسەڵاتەکان بەدیدەهێناو، رێگریش دەبێت لەبەردەم بەدیهاتنی یەکێتی نیشتمانیدا بۆ وڵات چونکە دابەشی دەکات بۆ کۆمەڵێك یەکەی هەمەجۆر، کە ئاسان دەبێت سیاسەتی- جیاوازی بخەرەوە زاڵ و باڵادەست دەبیت- پیادە بکرێت هەروەك چۆن بەریتانیا لەبەردەم جیهان و کۆمەڵەی گەلاندا وانیشان دەدات کە ئەو گەلان سازو ئامادەباش دەکات بۆ ئەوەی خۆیان حوکمی خۆیان بکەن، هەروەك چۆن ئەم شێوازە ئەوە بۆ بەریتانیا ئاسان دەکات ئیدارەی ئەو گەلانە بکات کە گیرۆدەی حوکمی ئەو بوون لەرێگەی سودوەگرتن لە کادیرە ناوچەییەکان یان ئەوانەوە کە دەستکردی تایبەتی خۆین، لەوانەشە هەندێك لەدانیشتوان ئارەزوی ئەوە بکەن بچنە ژێر سایەی حوکمی بەریتانیاوە بەهیوای ئەوەی ئەم ئیدارە ناوچەییە لەئایندەدا پەرەپێبدرێت بەرەو حوکمێکی نیشتمانی.

کوردەکانیش بەهیوابوون ئەم ئیدارەو دەوڵەتۆچکە کوردیانە کەوا کورد دەیویست دایانبمەزرێنێت بگۆڕێن بۆ حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ ئەمە لەکاتێکدا بەریتانیا بەهیوا بوو ئامانجە داگیرکەرانەکەی بەدیبهێنێت و وا لە نیشتمانپەروەرە کوردەکان بکات ببەنە یاریەك بەدەستی بەریتانیاوە و، ئەم دەوڵەتۆچکە کوردیانەش بکاتە داوێك بۆ ئەو نیشتمانپەروەرە کوردانەی لەدەرەوەی دەسەلاتی سەربازی بەریتانیاوەن، هەروەها سودوەگرتن لێیان بۆ ترساندنی بزوتنەوە نەتەوەییە عەرەبیەکان لەعێراق و تورکیەکان لەتورکیادا.

لەکاتی پێکدادان و ناکۆکی لەنێوان بەریتانیاو شێخ مەحمود دا، بەرێز تەها نەهری کوڕی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری گەیشتە بەغداد بۆ پەیوەندیکردن بەئینگلیزەوە بەهیوای ئەوەی ڕازیان بکات یارمەتی کوردەکان بدەن لەدامەزراندنی حکومەتێکدا کەلەژێر سەرپەرشتی بەریتانیادا بێت، نوێنەری سیاسی بەریتانیاش لەبەغداد بروسکەیەکی بەژمارە ٥٢٥٤ و بە بەرواری ١٢-ئایار-١٩١٩ نارد بۆ سکرتێری وەزارەتی هیند لەلەندەن کەتێیدا هاتبوو[١٤٤]:

بەرێز تەها گەیشتە بەغداو بۆ ماوەیەکی درێژ دیدارم لەگەڵیدا کرد.. بەرێز تەها ڕایگەیاند کە ئامانج لەهاتنی بۆ بەغداد ئەوەیە داوای کوردستانێکی یەکگرتوو بکات- لەناویشدا هەموو کوردەکانی ئێران- لەژێر پاراستنی بەریتانیادا، ئەو بێهیواییەکی زۆری نیشاندا کاتێك بۆم ڕونکردەوە کە پێشبینی یارمەتی ئێمە نەکات بۆ گەیشتن بەئامانجەکەی سەبارەت بەکوردەکانی ئێران، هەروەها داوای ئەوەشیکرد کە لێبوردنێکی گشتی دەربکرێت و چەندین ئیدارەی کوردی خاوەن حوکمی زاتی دروست بکرێن و، حکومەتی بەریتانی یارمەتی مادیی پێشکەش بکات وەك ئەوەی لەعێراق هەیە..

---

[١٤٤] - ئەو بروسکانەی کە ئاڵوگۆڕ کراون لەنێوان لەندەن و بەغداد کە لەم بەشەدا بلاویدەکەمەوە لەکتێبی ئەندازیار صلاح الدین سعدالله وەرگیراو بەناونیشانی -کوردستان و بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی-ە بۆیە تەنها بەم ئاماژەپێدانە وازدێنم.

له ٥- حوزەیران-١٩١٩ سکرتێری وەزارەتی هیند له لەندەن بە بروسکەیەکی بەپەلە بەژمارە ١٩٢ وەڵامیداوەتەوە تێیدا هاتووە: ( ئامۆژگاری نادەم بەڵێنی لێبوردن بدەیت) هەروەها تێیدا هاتووە- خۆشحاڵ دەبم ئەگەر بەخێرایی ڕاوبۆچونی خۆتم پێبدەیت لەبارەی سنوری ئەو ناوچە دیاریکراوانەوە خوازیارم پێم ڕابگەیەنیت ئەگەر تۆ هێشتا لایەنگری ئەوەی کە دیاریەکر و ئورفە لەدەوڵەتی عێراق هەڵاوێردە بکرێت..

لەمەوە دەردەکەوێت کە بەریتانیا دەیەوێت بگەڕێت بەدوای شێوەیەکی مەعقولدا بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر کوردستانداو لەوکاتەدا ڕاوبۆچونی جیاواز هەبوو لەبارەی بابەتەکەوە.

ڕای یەکەم: ڕای حاکمی بەریتانی بوو لەبەغداد[١٤٥] کە داوا دەکات کوردستانی باشور بلکێنرێت بەعێراقەوە و دەربهێنرێت لەحکومەتی کوردستان کە پێکهێنانی جێگەی

---

[١٤٥] - حاکمی بەریتانیا لەبەغداد سێر ئارنۆڵد ویلسن لەسەرسەخترین دوژمنەکانی دروستبوونی دەوڵەتی کوردستان بوو. هەروەك چۆن لەسەرسەخترین دوژمنەکانی سەرکردەی شۆڕشی کوردی شێخ مەحمودی نەمر بوو.

ویلسن لەکتێبەکەیدا دەڵێت ئەو نارەزای بووە لەوەی کە لەندەن حوکمی لەسێدارەدانی شێخ مەحمود بگۆڕێت کە دادگایەکی عورفی بەریتانی لە ساڵی ١٩١٩دا لەبەغدا دوای دیلکردنی دەرهەق بەشێخ دەریکردبو ویلسن بەڕەسمی نارەزایی دەربڕی و ووتی:

" مانەوەی شێخ مەحمود بەزیندویی، هیوایەکە بۆ پشتیوانەکانی و ترسێکیشە بۆ دوژمنەکانی و پشتیوانەکانی لە هەڵوێستیان پاشەکشە ناکەن بەهیوای گەڕانەوەی دەبن، دوژمنەکانیش لەترسی گەڕانەوەی ناحەوێنەوە. بەکورتی ئەگەر شێخ بەزیندویی بمێنێتەوە ئەوا ئاسایش لەکوردستان سەقامگیر نابێت" (بگەڕێرەوە بۆ یاداشتەکانی رەفیق حیلمی لا ١٧٠ بەشی یەکەم-پەرتی دووەم- چاپە کوردیەکە).

بەڵام ویلسن لەگەڵ ئەو دوژمنایەتیە توندەی بۆ شێخ مەحمود بەڵام دان بەدلێریی ئەودا دەنێت کاتێك دەڵێت: " سەردانی شێخ مەحمودم کرد لەنەخۆشخانە لەبەغداد و ئەو بە بوێری و دڵگەرمی و ئازایەتیەوە ووتی هیچ دادگایەکی بەریتانی و هی تریش دەسەڵاتی ئەوەیان نیە دادگایی ئەو بکەن، چونکە ئەو لەدژی ئینگلیز جەنگاوە بە پشت بەستن بە مافی شەرعیی دانپێدانراو لەلایەن هاوپەیمانانەوەو ئەو ژیانی خۆی دەکاتە قوربانی کوردو کوردستان". هەروەها ویلسن بەردەوام دەبێت و دەڵێت: شێخ چواردە بەندەکەی ویلسنی بە بیرهێنامەوەو خوێندیەوە بۆم کاتێك کە قورئانی پیرۆزی دەرهێناو لەناویدا چواردە بەندەکەی ویسلنی سەرۆکی ئەمریکای تێدابوو کەوەرگێڕابوو بۆ زمانی کوردی لەگەڵ دەقی بەیاننامەکەدا کە بەریتانیاو فەرەنسا دەریانکردو بڵاویانکردەوە لەساڵی ١٩١٨ لەبارەی مافەکانی نەتەوە بچوکەکانەوە)

بگەڕێرەوە بۆ سەرچاوەی پێشوو کە پشت بەکتێبەکەی ویلسن دەبەستێت .Loyalties Mesopotamia) ١٩١٤-١٩٢٠).

قسەو باس بوو بەتایبەتی کەوەفدێکی کوردی لەپاریس بوو و پێداگری دەکرد لەداواکردنی سەربەخۆیی بۆ کوردستانی مەرکەزیی، ئەم رایەش بەڕوونی لەو بروسکە وەلآمیەدا دەردەکەوێت کە نوێنەری بەریتانی لەبەغداد ناردی لەژێر ناونیشانی – کوردستان–دا کەبەرواری ١٣ حوزەیرانی ١٩١٩ی لەسەرە بەژمارە ٦٦٦٦ نێراوەو تێیدا هاتووە:–

سنوری تورکی فارسی پێویستە زیاتر ببێتە سنوری خۆرهەلآتی بۆ ئەو ناوچانەی کە وادەنرێت زۆرینەی کوردن لەبەرهۆکاری ئابوری و ستراتیژی و بۆ دابینکردنی پارچەیەك سنوری چیایی بۆ دەوڵەتی عێراق کە بەباشی گیراوەو شیاوە بۆ پەرەپێدانێکی گەورە، واباشترە کە سلێمانی و ڕانیەو کۆیە بخرێنە ناو سنوری ئیداریی نێوان دوو ڕووبارەوە – میسۆپۆتامیا– و هەولێر یەکێکە لەهێڵەکانی پێکهێنانی هێڵی ئاسن بۆ موصڵ لەبەرئەوە پێویستە وەك عەقرە هەلآوێردە بکرێت لەکوردستان، هەروەك چۆن پێویستە دهۆك و زاخۆو بخرێنە ناو میسۆپۆتامیاوە بەلآم عەمادیە نا. من بیردەکەمەوە کە سنوری جوگرافی بۆ ئەو ناوچەیەی کە زۆرینەکەی کوردن پێویستە لەباکوری –جەزیرە– کەمێك، باکوری نەصیبێن، باشوری ماردین باکوری ڕەئس و لعەین بەناو هێڵی پانی – ٣٧–دا بۆ برحیك، بۆ فورات و پاشان بەشوێن سنوری ویلایەتەکانی –خەربوت– مەعموریەو بەتلیس– وان– دا بڕۆن، بەوشێوەیە (ئازربایجان)و –ئەرزەڕۆم– هەلآوێرد دەبێت، هەروەها لەناو پێشنیارەکانیدا هاتووە کە ولایەتەکانی " موصڵ و بەغدادو بەصرە دەوڵەتێکی عەرەبی بن لەژێر چاودێریی بەریتانیادا).

ئەمەش ئەو ڕایەیە کەدواتر سەرکەوت بەهۆی گونجانی تەواوەتیەوە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی داگیرکەری بەریتانی و پیادەکردنی پیلان و مانۆڕکانی.

ڕای دووەم: کە ڕای مێجەر– نۆئیل بوو– کە داوای دەکرد کوردستان دابەش نەکرێت و حکومەتی کوردستان پێکبهێنرێت ئەم ڕایەش لەیادداشتەکان و بروسکەکاندا دەرکەوتن کە مێجەر– نۆئیل–ناردی بۆ حکومەتەکەی، کە سکرتێری وەزارەتی هیند لەبروسکەیەکدا کورتی دەکاتەوە کەناردویەتی بۆ نوێنەری بەریتانی لەبەغداد، لەبروسکەیەکدا بە بەرواری ٢٢–تشرینی دووەم–١٩١٩ کاتێك ووتی:

" وادیاره کەپێویستە کوردستان بەجێ بهێڵرێت بۆ چارەنوسی خۆی، مەسەلەی کرداری ئەوەیە کە چۆن دەکرێت ئەمە بەشێوەیەکی جێگیر بەئەنجام بگەیەنرێت، بەئاشتی و ئاسایش لەسەر سنوری میسۆپۆتامیا.. نۆئیل ئامۆژگاریمان دەکات کە سێ مەرج هەیە- یەکەمیان- پێویستە دەسەلاتی تورکی لەکوردستان بکرێتە دەرەوە- دووەمیان- پێویستە کوردستان دابەش نەکرێت و-سێیەمیش- پێویستە هێندەی ئەکرێت ئەو سنورە رەچاو بکرێت کە هێڵی نەتەوەیی-ئەثنولۆژی-یە لەنێوان کوردەکان و عەرەبدا.. نۆئیل پێی وایە ئەگەر لێیان بگەڕێت چارەنوسی خۆیان دیاری بکەن ئەوا دەبنە لایەنگری بەریتانیاو پێویستیان بە هاندان یان یارمەتی نابێت بۆ هێشتنەوەی تورکەکان لەدەرەوەدا هەروەها پێوایە کە دابەشکردنی ولات بەلکاندنی دەوڵەمەندترین بەشەکانی واتە کوردستانی باشور بە میسۆپۆتامیاوە هەلێك پێشکەش دەکات بۆ پروپاگەندەی نەتەوەیی دژ بە بەریتانیا" هەروەها وەزیرە بەریتانیەکە دەڵێت- سەبارەت بەخودی کوردستان ئەوا ئێمە هێشتا پێمان وایە کەوا کرداریی دەبێت هانی دروستبوونی کۆمەڵێك ناوچەی فیدرالی بدرێت خاوەن حوکمی زاتی بن، کە رەنگە لەناوخۆیاندا بکەونە ململانێوە، بەلام زیان بە میسۆپۆتامیا ناگەیەنێت -.

بەلام ڕاوبۆچونەکانی مێجەر- نۆئیل- بەناڕازیی بوون وەلامدرایەوە لەلایەن حاکمی مەدەنی بەریتانیاوە لەبەغداد کە بروسکەی کرد بۆ سکرتێری وەزارەتی هیند ووتبووی: ناڕازیم لەسەر سێ مەرجەکەی نوئیل- ئەوەش لەو بروسکەیدا هاتبوو کە بەرواری ٢٩ تشرینی دووەمی ١٩١٩ی لەسەرە.

-ڕای سێیەم: ئەوەیە کە ئەو کۆنگرەیە پێیگەیشت کە بەسەرۆکایەتی سێر ای. ایچ. هێرتزل، لە رۆژی شەممە ٦ کانونی یەکەمی ١٩١٩ لەشاری لەندەن لەبەڕێوەبەرایەتی هیند بەسترا ئەمەی دەگەیاند:-

" بەبڕوای کۆنگرەکە- کۆنفرانس- پێویستە ویلایەتێکی کوردی هەبێت لەسلێمانی لەژێر چاودێری بەریتانیادا بێت و ئەنجومەنێکیش هەبێت بۆ ئەوەی چارەسەری کاروباری ئەو ناوچەیە بکات کە دەکەوێت نێوان هەردوو زێکەوە بەلام پێویستە ڕەواندوز هەلاوێردە بکرێت تا ئەو کاتەی داوای چوونە پاڵ دەکات، -جەزیرە-ش ببێتە ناوەندێك

بـۆ دەوڵـەتێکی خـاوەن حـوکمی زاتـی لـەژێر چـاودێریی یەکێکـدا بێـت لەبنەماڵـەی بەدرخان".

بەوشێوەیە دەکرێت لەبروسکە فەرمیەکانی خودی بەریتانیادا بگەینە ڕاستی سیاسـەتی داگیرکەرانـەی بـەریتانیا لەبەرامبـەر کوردسـتان لـەنیوەی دووەمـی سـاڵی ١٩١٩ ز کـە دەکرێت لەمەی خوارەوەدا پوختی بکەینەوە:-

یەکەم: بەریتانیا هەوڵیدا بۆ ئـەوەی دەسـەلاتی خۆی بکێـشێت و بیـسەپێنێت بەسـەر کوردسـتاندا بەگـشتی و کوردسـتانی باشـور- عێراقـی- بەتایبـەتی بەئاسـانترین ڕێگـەو کەمترین زەحمەت، لەگەڵ ئامادەیی بۆ ئەنجامدانی ئەوە لەرێگەی هێزی چـەکەوە. دوای پێکدادانی بـەریتانیا لەگـەڵ شـێخ مـەحمود داو دەرکـەوتنی دوژمنایـەتی کوردەکـان بـۆ بـەریتانیا وەك پەرچـەکردارێك بـۆ سیاسـەتە داگیرکەریـەکانی دەبیـنین کـە سـکرتێری وەزارەتی هیند لـە لەندەنـەوە بروسـکەیەك بـە بـەرواری ٢٢- ئـابی ١٩١٩ دەنێرێـت بـۆ نوێنەری بەریتانی لەبەغداد کە ئەمەی خوارەوەی تێدا ڕاگەیاندووە:-

حکومەتی خاوەن شکۆ بەووردی مەسەلەی هێڵی ئاسنی تاوتوێکرد لـە -قزلربـات- ەوە بەرەو کفری- و کەرکوك و بەچاوپۆشین لە بەکارهێنانی کۆتایی بۆ ئەم هێڵـە ئـەوا ئێمـە ڕاسـپاردە دەدەیـن بـە بونیادنـانی دەمودەسـت لەبـەر هۆکارگـەلێکی سـتراتیژی و بـۆ پاراسـتن و ئارامکردنـەوەی کوردسـتانی باشـور، حکومـەتی خـاوەن شـکۆ- تائێـستا پـشتیوانی لـە سیاسـەتی فراوانکردنـی دەسـەلات و قەڵـەمڕەوی کـردووە لەکوردسـتانی باشوردا، چونکە بڕوای وابووە دانیشتوان پێشوازی لێدەکەن، بۆیـە ڕەزامەنـدی دەربـڕی لەسەر ئەو پێشنیارەی لە بروسـکەکەتدا هـاتووە لەبـەرواری ٩ ئایـاردا بـۆ دروسـتکردنی کۆمەڵێك لە میرنشین یان دەوڵەتۆچکە کە خاوەن حوکمی زاتی بن و سەرۆکە کوردەکـان حوکمڕانی بکەن، وا دیارە بۆچونەکەی ئێمە هەڵە بوو چونکە دانیشتوان لەبری پێشوازی لـە دەسـەلاتی بـەریتانی دوژمنایەتیـەکی تونـد نیـشان دەدەن، بۆیـە هێڵـی ئاسـنی ستراتیژیی پێویستە بۆ دامرکاندنەوەیان.

دووەم: ڕەزامەنـدبوونی بـەریتانیاو ئـارەزووکردنی بـۆ دابەشـکردنی کوردسـتان، بـەوەی کوردستانی خۆرهەلات لەژێر دەسەلاتی تاراندا بێت و، کوردستانی باشـوریش لـەپرۆژەی

کوردستان جیابکرێتەوە کە پێشنیارکراوە دابمەزرێنرێت، هەروەها بەرەتکردنەوەی بیرۆکەی پێکهێنانی حکومەتێکی کوردی یەکگرتوو هەتا ئەگەر لەژێر سەرپەرشتی بەریتانیاشدا بێت بۆیە پێمان وایە بەریتانیا ڕەزامەندی دەردەبڕێت لەسەر پەیماننامەی (سیڤەر) لەو دەقەیدا لەبارەی دامەزراندنی حکومەتێك لەکوردستانی مەرکەزیدا، بەلاَم هەوڵ دەدات سیاسەتێکی تر بگرێتە بەر لەبەرامبەر کوردستانی باشووردا وەك ڕەزامەندیەکی مەبدەئی لەسەر دامەزراندنی کۆمەڵە هەرێمێك یان دەوڵەتۆچکەی کوردی و سەپاندنی دەسەلاَت و قەڵەمڕەوی بەریتانی تێیدا لەرێگەی سەرۆکە کوردەکانەوە.

سێیەم: بایەخدانی زیاد بە جێگیرکردنی قەڵەمڕەویی بەریتانیا لەمیسۆپۆتامیا (دۆڵی دوو ڕووبار)دا و چاککردنەوەو سنورەکەی و دۆزینەوەی ئاسایش و ئاشتی لەسەر سنورەکانی، لەگەڵ بوونی پێشنیارێك بەلکاندنی بەشەکانی کوردستانی باشور بەحکومەتی بەغدای عەرەبیەوە( کە نیاز هەیە دابمەزرێنرێت) بەتایبەتی ویلایەتی موصڵ کە لیواکانی موصڵ و هەولێرو کەرکوك و سلێمانی دەگرێتەوە بخرێنە سەر عێراق.

ئەمەش ئەو ڕایەیە کە سیاسەتی حکومەتی بەریتانی لەبەرامبەر کوردستانی باشوردا دواتر لەسەری جێگیربوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی شێخ مەحمود رەتیکردەوە ببێتە گەمەیەك بەدەست داگیرکەرە ئینگلیزەکانەوەو پێداگرتنی لەسەر پێدانی حوکمی زاتی بەتەواوی و دیاریکردنی سەرپەرشتی بەریتانی لەسەر کوردستان، هەروەها دوای ئەوەی کە داگیرکەری بەریتانی بینی گەلی کورد دژی دەسەلاَت و دەست بەسەراگرتنی تەواوە مامۆستا عەزیز شەریف لەسەر ئەوە دەدوێت و دەڵێت:- بەلاَم لەکوردستانی باشور ئەوا سیاسەتی بەریتانی لەهەڵبەزو دابەزدابوو تا ساڵی ١٩٢٦ جێگیر نەبوو لە دەی مانگی ئایاری ١٩١٩دا حکومەتی بەریتانیا فەرمانی بەحاکمە شاهانە گشتیەکەی کرد لەعێراق بەپێکهێنانی چەند دەوڵەتۆچکەیەك کە حوکمی زاتیان هەبێت ولەژێر فەرمانڕەوایی شێخە کوردەکاندا بن بەمەرجێك ئەوانە لەژێر ڕێنومایی ئەفسەرە بەریتانیەکاندا کاربکەن و ئاگاداری کردەوە لەوەی هەر هەنگاوێك بگرێتەبەر کەئامازە بەوە بکات کە سیاسەتی بەریتانیا جێگیر بووە هەروەك چۆن ئەو پێشتر ١٩٢٠حکومەتێکی لەسلێمانی بەرپاکرد

بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود- لەکاتی دانانی پەیماننامەی -سیڤەر-دا باسی پرۆژەی دەوڵەتی کوردی کرد، پاشان بەریتانیا لەبەرامبەر نارەزایەتی تورکیادا لەو پرۆژەیە پاشگەزبۆوە. لەساڵی ١٩٢٢ دا حکومەتی بەریتانیا لەبەیاننامەیەکی هاوبەشدا لەگەڵ حکومەتی عێراقی دەستکردی خۆیدا کەلەژێر ئینتیدابی بەریتانیادا بوو ڕایگەیاند پشتگیری لەپێکهێنانی حکومەتێکی کوردی دەکات لەکوردستانی باشورو لەساڵی ١٩٢٣دا لایدا لەم پرۆژەیە بەڵام لەبارەی ئەم شێوایە لەسیاسەتی بەریتانیادا ئەوا- بەهەڵاوێردەی ئەو سازش و مامەڵانەی کە بە دەستبەرداربوونی داگیرکەری فەرەنسی کۆتایی هات بۆی لەم ناوچەیە بەپێی ڕێکەوتننامەی -سان ڕیمۆ- ١٩٢٠ کە لەپێشەوە باسمان لەبارەوە کرد دەکرێت بگەڕێنرێتەوە بۆ دوو هۆکاری سەرەکی ئەوانیش:

١-متمانە نەبوونی سیاسیەکانی ئیمپراتۆریەت بە کوردێك کە خاوەن دەسەڵات بێت و پشتی پێببەسترێت لەپاسەوانیکردنی بەرژەوەندیەکانیاندا.

٢-دواکەوتنی یەکلایکردنەوەی هەڵوێست لەگەڵ حکومەتی تورکی نوێدا- کەمالیزم و دەستنیشانکردنی ئاراستە سیاسیەکانی هەرچی سەبارەت بە هۆکارەی یەکەمە دەبینین کە داگیرکەری بەریتانی چووە بەرەو شێخ مەحمود کە فراوانترین دەسەڵات و قەڵەمڕەویی هەبوو لەناو شێخەکانی کورد داو وەك فەرمانڕەوای سلێمانی دایاننا و ڕاشیگەیاند کە ڕێگر نیە لەوەی کە دەوڵەتەکەی هۆزە کوردیەکان لەخۆبگرێت لەزێی گەورەوە تا ڕوباری دیالە، بەڵام تەماح و خواستەکانی شێخ مەحمودو شێوازەکانی نەگونجان لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی ئیمپراتۆریەتدا یەکێك لە موعتەمیدەکانی لەبارەی شێخەوە دەڵێت: ( ئەو گرفتی سەرەکیمانە ئەو نەزانە بەڵام ساویلکەو بەریئ نیە، ئەو لەکاتی نەبوونی ڕێگرو سۆپەرێکدا زۆر دڕندەیە. ڕابوردوی ئەویش لەسەردەمی تورکیدا ئەوە دەگەیەنێت جێی متمانە نیە. ئەو هەمیشەو بەردەوام لەشۆڕشدا بووە لەدژی حوکمی تورکی). باشە ئەم بەردە رەق و سەختە لەمەڕمەڕی فەیسەڵی لەکوێ هەیە کە بونیادنەران و بەردتاشانی ئیمپراتۆریەتی ئاسودەو شادکرد؟

بەڵام سەبارەت بە هۆکاری دووەم واتە هەڵوێستی حکومەتی تورکی و مامەڵەو سازشەکانی ئەوا ئەو دڕندایەتیەی کە لەساڵی ١٩٢٥دا پێی شۆڕشی کوردی سەرکوتکرد

ئاراسته فاشیستانەکەیی دەستنیشانکردو لەهەمان ساڵدا بەریتانیا لەکۆمەڵەی وڵاتانەوە بڕیارێکی بەدەستهێنا بەوەی کە ویلایەتی موصڵ- کە لەچوارچێوەی کوردستانی باشووردا بوو- بخرێتە سەر عێراق و لەساڵی ١٩٢٦دا لێکتێکەیشتنێك ڕوویدا کە پەیماننامەی سێ قوڵیی ئەنکەرەی لێکەوتەوە کە لە مانگی حوزەیراندا لەنێوان بەریتانیاو عێراق و تورکیادا بەسترا.

*لەنامەکەی مامۆستا عەزیز شەریفەوە وەرگیراوە*

*مەسەلەی کورد لەعێراق*

لەساڵی ١٩٢٠دا بەریتانیا بەردەوام بوو لەسەر ئەو سیاسەتەی کە باسمان کرد، بەتایبەتی دوای ئەوەی ڕووبەڕووی بەرگریەکی نیشتمانی عێراقی بۆوە کە لەشۆڕشێکی بەزەبرو توندا بڵێسەی سەند لەساڵی ١٩٢٠دا. دوای ئەوەش بزوتنەوەی مستەفا کەمالیی نەتەوەیی تورکیی دژ بە بەریتانیا بەدیارکەوت و لە ڕوسیای سۆڤیەتی نزیك دەبۆوە، لەبەرئەوە بەریتانیا دژی بەندەکانی پەیماننامەی (سیڤەر) نەوەستایەوە کە تێیدا دان بەمافەکانی گەلی کورد دا دەنێت لە کوردستانی مەرکەزیی، و دەکرێت کوردەکانی کوردستانی عێراقیش بچنە پاڵ ئەوانەوە دوای سەربەخۆبوونی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی تورکیا.

لەکاتی ئەنجامدانی ڕیفراندۆمیش بۆ هەڵبژاردنی میر فەیسەڵ وەك پاشای عێراق و ئەنجامدانی هەڵبژاردنی پەرلەمانی لەدواتردا، حاکمی سەربازی بەریتانی لەعێراق ناوچەی کوردستانی لە عێراقی عەرەبی هەڵاوێردە کرد- کە دەیانوویست حکومەتە عەرەبیەکەی بۆ پێکبهێنن ئەوەش تا ئەوکاتەی چارەنوسی کوردەکان یەکلایی دەبێتەوە کەسەرپشکی کردبوون لەنێوان بەشداریکردن یان ڕەتکردنەوەدا.

هەروەك چۆن مادەی ١٦ لەبەڵگەنامەی ئینتیداب ئەمە خوارەوەی تێدا هاتووە:

-هیچ شتێك کەلەم ئینتیدابەدا هاتووە ڕێ لە مونتەدیب ناگرێت لەدامەزراندنی حکومەتێکی سەربەخۆ لەڕووی ئیداریەوە لەناوچە کوردیەکاندا هەروەك ئامازەی بۆ دەکرێت-.

هەروەها لە لاپەڕە ٨٣ لەکتێبی- قاسم والاکراد. خناجر والجبال- دا هاتووە:

کاتێـك حکومــەتی کـاتی لـەعێراق دروسـت بـوو لـە ٢٥- تـشرینی یەکـەم-ی ١٩٢٠ و دەسەڵاتدارانی بەریتانیاو حکومەتی کاتی عێراقی بەسەرۆکایەتی- نەقیب- دەستیانکرد بەرێگەسازیی بۆ ریفراندۆم بۆ دانانی مەلیك فەیسەڵ لەعێراق، لـەم کاتـەدا بەریتانیـەکان وویستیان رەوشـێکی تایبـەت بـۆ کوردەکـان بدۆزنـەوە بۆیـە مەنـدوبی سـامی بـەریتانی بلأوکراوەیەکی دەرکرد کەتێیدا هاتووە:-

مەندوبی سامی تێڕوانینێکی کرداریی هەیە لەگرتنەبەری ڕێوشـوێنی ئیـداریی لەئاینـدەدا بۆ بەڕێوەبردنی ناوچە کوردیەکان. ئـەو پێیگەیـشتووە ئـەو ترسـەی لـەدڵی خەڵکەکەیـدا دروسـتبووە لـەوەی ئەگـەری ئـەوە هەیـە بیـانلکێنن بەحکومـەتی بەغـداوە ئەمـەش وایکردووە هەندێك داوای سستمێکی سەربەخۆ بکەن لەهەمانکاتدا ئەوەشی پێگەیشتووە کە سەرکردەکانی ڕای کوردی هەست بـە پەیوەندیـە ئـابوری و پیـشەسازیەکان دەکـەن کەبەعێراقیانـەوە دەبەسـتێتەوە. لـەم حاڵەتـەدا فەخامـەتی مەنـدوبی سـامی ئـارەزوو دەکات ئەگەر کرا ئەوە بێتەدی کە هێواو ئاواتە ڕاستەقینەکانی کوردە، ئەگـەر ئـەوەیان پێ باشترە لەئامێزی حکومەتی عێراقیدا بمێننەوە ئەوا ئەو ئامادەیە کە پێـشنیار بکـات بۆ دەوڵەت کەبەمشێوەیە چارەسەری بکات:-

١-هەرچی سـەبارەت بەناوچـە کوردیەکانـە دەکەونـە لیـوای موصـڵەوە و دەکەونـە نـاو سنوری ئینتیدابی بەریتانیەوە لیوایەکی فەرعی پێکدەهێنێت کـە پێکـدێت لـە قـەزاکانی زاخۆو ئاکرێ و دهۆك و عمادیە بەو مەرجە ناوەندەکەی دهۆك بێت...هتد

٢- مەنـدوبی بـەریتانی مەسـەلەی بەشـداریکردنی ئەفـسەرە بەریتانیـەکان رێکـدەخات لەبەڕێوەبردنی هەولێرو کۆیـەو رەوانـدزو پـەیمان دەدات بـەوەی کـە رەچـاوی خواسـتی دانیشتوانەکانیشان بکات لەمەسەلەی دامەزراندنی فەرمانبەرانی حکومەتدا.

٣-سـلێمانی وەك موتەسـەریفیەیەك مامەڵـەی لەگەڵـدا دەکرێـت کـە موتەصـەریفێکی راوێژکاریی حوکمی دەکات بەو مەرجەی لەلایەن مەندوبەوە دیاری بکرێت و راوێـژکارێکی ئینگلیزی لەگەڵدا دەبێت هەتاوەکو موتەسەریفێکیش دادەمەزرێت ئەوا حـاکمی سیاسـی بەریتانی شوێنکەی ئەو دەگرێتەوە...هتد.

بەرگریی کوردی لەدژی داگیرکەری بەریتانی بەردەوام بوو، ئەمەش لەرەوشێکی ناڵەباردا بوو بۆ بەریتانیا کە ڕووبەڕووی شۆڕشی عێراق و هەروەها بزوتنەوەی مستەفا کەمال بوو بویەوە.

هەر لەساڵی ١٩١٩ەوە ڕاپەڕینێکی کوردی چەکدار ڕویدا لەدژی بەریتانیا لەهەموو ناوچەکانی کوردستانی باشوردا لە ٢٤-نیسان-١٩١٩ چەکدارە کوردەکانی هۆزی - گۆیان- کاپتن- بیرسن- یان کوشت و لە ١٥ -تەمموز-١٩١٩دا دانیشتوانی عەمادیە بەسەرکردایەتی حاجی شەعبان ئاغا ڕاپەڕین و حاکمی سیاسی بەریتانیای ئەو شوێنەیان کوشت کەناوی -مەکدۆناڵد-بوو هەروەها بەڕێوەبەری پۆلیسیش. دانیشتوانی -بەرواری باڵا-ش بەسەرکردایەتی شێخ حاجی رەشید بەگ هەستان بە ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ هێزێکی بەریتانی گەورەدا لەدەربەندی- مزورکە- و دوای جەنگێکی سەخت هێزە بەریتانیەکەیان لەناوبردو دوای هەفتەیەکیش لەم جەنگە دۆسکیەکان بەسەرکردایەتی تاهر ئاغا ڕاپەڕین لەوەشدا -صادق برو- و- سلێمان قتی- لەسەرکردەکانی کلی و سندی پشتیوانیان لێکردن و لەگەڵ هێزێکی بەریتانیدا لەگەرووی سوارتوکە جەنگان و زیانێکی گەورەیان پێگەیاند لە ٤-تشرینی دووەم-١٩١٩دا چەکدارە کوردەکان لەناوچەی ئاکرێ بەرەنگاری هێزێکی بەریتانی بوونەوەو کۆلۆنیل-بیل-و کاپتن سکۆت- یان لەنزیك- بیرەکەبرە-کوشت- لە ١٤-تشرینی دووەم-١٩١٩ هیزێکی کوردی چەکدار کەپێکهاتبوو لەبارزانیەکان و زێباریەکان شاری ئاکرێیان داگیرکرد.

ئەوەی جێی داخە ئەم ڕاپەڕینە کوردیە چەکدارانە یەك سەرکردایەتی کۆی نەدەکردنەوە یان هەماهەنگی و یەکبوون یان هاریکاریی لەنێوانیاندا نەبوو بەڵکو یەك لەوی دی دابڕاوبوون.

ئۆزدەمیر پاشا لەساڵی -١٩٢١-دا لە رەواندوز بەدیارکەوت بۆ ئەوەی بەناوی تورکیاوە حوکم بکات کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد ویلایەتی موصڵ بەشێکە لەخاکی تورکیا بەتایبەتی چونکە لەکاتی شەڕ ڕاگرتنی -مۆندرۆسدا داگیرنەکرابوو ئەو شەڕ ڕاگرتنەی کە هێڵی سنوری ئەو شوێنانەی دیاری کرد کە تا ئەو کاتە هێزەکانی بەریتانیا

پێیگەیشتبوون و داگیری کردبوون ئەوەش کە بووە هۆی زیادکردنی ئاستەنگ و گرفتەکانی بەریتانیا نەبوونی سەقامگیریی بوو لەعێراق و لەکوردستانی باشوورو دەستپێکردنی هەندێك لە سەرۆك هۆزەکانی سەر بەشێخ مەحمود بەکردەوەی چەکداریی لەدژی هێزەکانی بەریتانیا.

بەهاتنی ساڵی ١٩٢٢ رەوشەکان بەنسبەت بەریتانیاوە زیاترو زیاتر ئاڵۆز دەبوو کاتێك کە هێزەکانی هۆزی پشدەرو رانیە لەژێر سەرکردایەتی خوالێخۆش بوو -عەباس مەحمود ئاغای پشدەر-و- غەفور خانی ناودەشت- و کەریم بەگی هەمەوەندی هێزەکانی داگیرکەری بەریتانیایان لە -دەربەندی پشدەر- بەزاندو زەرەر زیانێکی گەورەیان پێگەیاند، لەئەنجامدا هێزەکانی بەریتانیا هەڵهاتن بۆ کۆیە، پاشان ناچارکران کۆیە و سلێمانیش چۆڵبکەن[١٤٦] دەسەڵاتی ئۆزدەمیر پاشا لەناوچەی رەواندوز لەزیادبوون و فراوان بووندا بوو، هەروەك چۆن ئۆپۆزسیۆنی نیشتمانی لەبەغدا رێگر بوو لە بەستنی پەیماننامەیەك لەگەڵ بەریتانیادا کەبەتوندی عێراق بە چەرخەی ئەوەوە ببەستێتەوە.

رەوشی لیوای سلێمانی شڵەژاو بوو. سەرلەنوێ شۆڕشگێڕی نیشتمانیی دلێر مەحمود خانی دزڵی لەلیوای سلێمانی بەدیارکەوتەوە کە بانگخوازێکی دڵسۆز بوو بۆ فەمانڕەواییەتێکی کوردی لەژێر سەرکردایەتی شێخ مەحمود دا.. هەروەها دەستەو تاقمی کوردی بچووك لەرۆشنبیران و کاسبکارانی شارەکان دروست بوون و بێزاری خەڵك لەئینگلیز زیادیکرد. کەریم بەگی فەتاحی سەرۆکی هۆزی هەمەوەند کاپتن- بۆند- و ئەفسەرێکی ئینگلیزی تری لەنزیك چەمچەماڵ کوشت کە ئەو کاپتەنە بوو شێخ مەحمود گواستەوە بۆ بەغدا بۆ ئەوەی لەبەردەم حوکمی عورفی بەریتانیدا دادگایی بکرێت پاشان بۆ ماوەیەك لەناوچەکانی قەرەداغ و سەنگاو چەمچەماڵ و ناوچەکانی تری سلێمانیدا مایەوە و پاشان چوو بۆ رەواندوز بۆ ئەوەی پەیوەندی بکات بە ئەزدەمیر پاشاوە کەلەوێ بوو، پاشان بەشداری کرد لە جەنگی دەربەندی پشدەر-٢٣ ئاب ١٩٢٢- کە

---

[١٤٦] - جەنگەکە لە ٢٣ئابی ١٩٢٢دا لەنزیك دەربەندی پشدەر رویداو بەتەنیشت هێزە کوردیەکانی رانیە و پشدەر هێزێك بەسەرکردایەتی کەریم بەگی فەتتاح بەگی سەرۆکی هەمەوەند بەشداری تێدا کرد.

تێیدا هێزێکی کوردی پێکهاتبوون لەکوردەکانی پشدەرو ڕانیە سوپای بەریتانیایان شکست پێهێنا و خوالێخۆشبوو کەریم بەگیش لەنزیکترین لایەنگران و خۆشویستانی شێخ مەحمود بوو.

لەو کاتەدا هەروەها گەلی بەریتانی پێداگری دەکرد لەسەر کشانەوەی ڕۆڵەکانیان کەوا گیرابوون بەسەرباز بۆ دورگەی بەریتانی و هاوکات دژی تێچوونە سەربازیە نوێیەکان بوون هەروەك چۆن خەزێنەی بەریتانی بەدەست کورتهێنانەوە دەینالاند لەبەر هەموو ئەوانە بەریتانیا نەیتوانی بەهێزی چەك چارەسەری هەلوێستەکە بکات بۆیە ڕێگەی نزیك بوونەوەی لە بزوتنەوەی کوردی و سەرۆکەکەی لەکوردستانی باشور گرتەبەر کە شێخ مەحمودی حەفید بوو کەوا دورخرابۆوە بۆ هیندستان و دواتر هێنرایە کوەیت و پاشان بۆ بەغداو لەوێوە بەرێزو حورمەتەوە ناردیەوە بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی حکومەتی سەربەخۆی کوردی پێکبهێنێت کە حکومەتی بەریتانیاو حکومەتی عێراق دانیان پێداناو بەیاننامەیەکی رەسمیان لەبەرواری ٢٢ کانونی دووەمی ١٩٢٢دا بەئیمزای هەردوو حکومەت دەرکرد کە ئەمە دەقەکەیەتی:

-حکومەتی خاوەن شکۆو حکومەتی عێراقی دان بەمافی کوردەکاندا دەنێن کە لەچوارچێوەی سنوری عێراقیدا دەژین حکومەتێکی کوردی دابمەزرێنن لەچوارچێوەی ئەم سنورەداو ئەوان هیوا خوازن کە لایەنە کوردیە جۆراوجۆرەکان بگەنە ڕێکەوتنێك لەنێوان خۆیاندا لەبارەی شێوەی خوازراوی حکومەتەکەو سنورەکەی و کوردەکان نوێنەرانی بەرپرسی خۆیان دەنێرن بۆ گفتوگۆکردنی پەیوەندییە ئابوریەکانیان لەگەڵ حکومەتی خاوەن شکۆو حکومەتی عێراقیدا-.

دانپێدانانی بەریتانیا بەحکومەتێکی کوردی لەکوردستانی باشور گۆڕانێك بوو لەسیاسەتەکانیدا، کە کۆمەڵێك رەوش جگە لەوەی پێشتر باسکرا کردیانە پێویستە ئەوانیش مانۆڕەکانی بەریتانیا بۆ ترساندنی بزوتنەوەی نیشتمانی عێراقی لەعێراق کەوا سەرکردەکانی چاویان بڕیبووە کوردستان هەروەها بۆ ترساندنی بزوتنەوەی نەتەوەیی تورکی کەوا سەرکردەکانی هەڵگری بیرۆکەی شۆفێنی فراوانخوازی بوون لەبەرامبەر گەلی کوردو ئەرمینیا بۆیە بەریتانیا ویستی هەردوو بزوتنەوە بورجوازیە کەمالی و عەرەبیەکە

بترسێنێت لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە هەوڵبدات بەپێدانی کوردستان پێیان دەمیان چەور بکات، واتە کوردستان بکاتە بەرتیلی دەستی ئەگەر داخوازیەکانی داگیرکەری بەریتانیان قەبوڵکرد ئەوا کوردستانیان دەداتێ وەك دەسکەوتێك بۆ ئەوەی لەنێوان خۆیاندا بەشی بکەن ئەگەریش ڕەتیان کردەوە ئەوا کوردستان دەبێت موڵکی گەلی کوردو، بەوەش دەسکەوتێك لەدەست دەدەن کە لیك بەدەمیاندا دێتەخوارەوە بۆی.

بەداخەوە بزوتنەوە ڕزگاریخوازە تورکی و کوردی و عەرەبیەکان نەیانتوانی بگەنە ڕێکەوتن لەنێوان خۆیاندا لەسەر خەباتی هاوبەش لەدژی دوژمنی هاوبەش- داگیرکەر- و مەیلی فراوانخوازی هەبوو لای سەرکردایەتی بورجوازی و ڕاستڕەو لەسەر حسابی گەلی کورد و ڕێگە لێگرتنی تا مومارەسەی مافە نەتەوەییەکانی نەکات ئەمانە لەهۆکارە گرنگەکانی دروست نەبوونی ئەم بەرە هاوبەشە بوون لەدژی داگیرکەر.

بەگەڕانەوەی شێخ مەحمودیش بۆ کوردستان بزوتنەوەی نیشتمانی هەستایەوەو مەزن بوو کە سەرکەوتنی بەدەستهێنا بەڕاگەیاندنی حکومەتێکی پاشایی کوردی سەربەخۆ کە پایتەختەکەی سلێمانی بوو وە مەلیکەکەشی شێخ مەحمودی حەفید بوو، شێخ مەحمود شێخ قادری برای ڕاسپارد بۆ ئەوەی وەزارەتێکی کوردی پێك بهێنێت کەوا خوالێخۆشبوو مستەفا پاشای یاموڵکی سەرۆکی کۆمەڵەی کوردستانی نیشتمانی وەزیری مەعاریف بوو تێیداو خوالێخۆشبوو عەبدولکەریمی عەلەکە- لەبرا مەسیحیەکانمان- وەزیری دارایی بوو تێیداو شێخ محەمەد غەریب وەزیری ناوخۆی بوو مەلا سەعید کەرکولی وەزیری دادی بوو.

بەوشێوەیە یەکەم حکومەتی کوردی پێکهێنرا لەسەرەتای تشرینی یەکەم ١٩٢٢ و ئالأی نیشتمانی کوردی بەرزکرایەوە، دوای تێکۆشانێکی قورس و ناڕەحەت کەوا گەلەکەمان بە دلێرییە ناسراوەکەی شانی خستۆتە ژێر باریەوە[١٤٧].

---

[١٤٧] وەزارەتەکە سەرۆکایەتی شێخ قادر پێکهات لە ١٠ تشرینی یەکەم ١٩٢٢ کەبەمشێوەیە بوو:

١-عەبدولکەریم عەلەکە- وەزیری دارایی.

٢-مستەفا یاموڵکی-وەزیری مەعاریف.

٣-شێخ محەمەد غەریب- وەزیری ناوخۆ.

بەڵام ئەم حکومەتە کەبەریتانیا ویستی بیکاتە گەمەیەك بەدەستیەوەو بەکرێگیراوی خۆی بێت و شێخ مەحمودی مەلیکیشی دەیویست حکومەتێکی نیشتمانی بێت و خزمەتی گەلی کوردی بکات بۆیە نەکراو لەگەڵ بەریتانیادا پێکنەهاتن، مەلیك مەحمود ملکەچی رەهای بەریتانیای رەتکردەوەو لەبری دوژمنایەتیکردنی تورکیای ئازادبوو بکات هەوڵیدا پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ مستەفا ئەتاتورکی سەرۆکیدا بدۆزێتەوە.
هەروەها ئاراستەی روانینەکانی کردە روسیای سۆڤیەتی و نامەیەکی نوسی بۆ دەوڵەتی سۆڤیەتی تێیدا داوای هاوکاری و یارمەتی و بونیادنانی پەیوەندیەکی دۆستانە دەکات لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا کە مەلیك مەحمود بەوە وەسیفکرد دۆستی گەلانی خەباتگێرە لەپێناو ئازادبونیاندا و، خزمەتی خواست و ئارەزوەکانی گەلانی راپەرپو دەکات.

---

٤-صالح زەکی صاحیبقران- وەزیری بەرگریی.

٥-ئەحمەد بەگی فەتتاح بەگ-وەزیری گومرگ.

٦-حمە عەبدولرەحمان ئاغا-وەزیری گەیاندن

٧- حاجی مەلا سەعید وەزیری داد.

هەروەها ژەنراڵ صدیق قادری وەك پشکنەری گشتی هێزەکانی کوردستان دانراو سەید ئەحمەد بەرزنجی وەك بەڕێوەبەری گشتی ئاسایش.

## نامەی مەلیك مەحمود بۆ سۆڤیەت

شێخ مەحمود دوای پێکهێنانی حکومەتی کوردی و بەرزکردنەوەی ئالآی نیشتمانی کوردی نامەیەکی نارد بۆ دەوڵەتی سۆڤیەت کە ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی:

نامەی مەلیك مەحمود بۆ سۆڤیەت[١٤٨] ٢٠/کانون دووەم/١٩٢٣

بۆ پایەبەرز جەنابی کونسوڵی روسیای بالآدەست و شکۆدار

لەگەڵ جەختکردنەوە لەرێزی زۆرم سلآوی خۆمتان پێڕادەگەیەنم،

لەساڵی ١٩١٧دا کاتێك دەنگی ئازادی ڕاستەقینە گەیشتە گوێی جیهان و گەلان لەژێر چنگ و کەڵبەی تاوانباران و ستەمکارانی ڕیسوابوو رزگاریان بوو، هەموو گەلان و نەتەوە ژێر دەستەکانی سەر ڕووی زەوی پێشوازیان لێکرد پێشوازیەکی زۆرو هەستا بە تێکۆشان و قوربانیدان لەپێناو ئازادیدا و ئومێدەوار بوو لە شەرەف و نیازی باشی گەلی ڕوسی خواست و داواکارییەکانی بەدیبهێنێت.

هەرچی سەبارەت بەمافەکانی ئێمەشە روون و ئاشکرایە لەزۆربەی رۆژنامەکاندا کە چۆن بەریتانیەکانی تینوی خوێن ڕشتن و مژینی خوێنی گەلان ئەو گورزە بەهێزو کوشندانەیان لەگەلی کورد وەشاند، بەتۆپ و چەك و بۆمبی سوتێنەر بێ ئەوەی جیاوازی بکەن لەنێوان ژنان و منالآن و پیاواندا ئەوەش لەساڵی ١٩١٩دا واتە پێش چوار ساڵ و کاتێك کەوا گەلی کوردی ژێردەستە وویستی مافەکانی و داخوازیە ڕەواو یاساییەکان لەپایتەخت –سلێمانی– بەدیبهێنێت و بۆ بێ چانسی گەلی کوردیش رەوشە ناوخۆییەکان لەحکومەتی روسیای شکۆدار بەشێوەیەك دەڕۆیشت کەوا رێگەی نەدەدا بەوەی بیپەرژێتە سەر ڕەوشی گەلانی بیانی ژێردەستەو چەوساوە. ئەم رەوشە بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی گەلی روسی بەهێز بەسروشتی خۆی و نیاز باشیی و ڕاستی ئامانجەکەی بەدیارکەوت و –سوپاس بۆ خوا– توانی توانا مەزنەکانی خۆی ئاشکرا بکات.

---

[١٤٨] – نامەکەم لەوەرگێڕانە روسیەکەوە وەرگرتووە– بگەڕێرەوە بۆ ئەتروحەکەی دکتۆر شەمزینی– بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد.

گەلی کوردی کۆیلەکراو چەوساوە، شەرەفمەند دەبێت بەوەی لەبارەی ئەم مەسەلانەوە ڕاوێژتان پێبکات: هەموو گەلی کوردستانی باشور زۆر ئارەزومەندە بەدۆستایەتی و یارمەتیدانی حکومەتی ڕوسیای شکۆدارو بۆ قوربانیدان لەپێناو ئەو دۆستایەتیەدا و جێبەجێکردنی بەدڵ و گیان و بەردەوام بەوپێیەی کە ئەو دۆستایەتیە دەیخوازێت لێی ئەمەش وەك مەرجێکی بنچینەیی و پێویست کە بەفەرمی دانبنرێت بەمافە نەتەوایەتیەکانمان و دەسەڵاتماندا وە بۆ دەرخستنی ئەم پەیوەندیەمان بۆ ڕای گشتی جیهانی و بەهێزکردنی تواناکانمان و دەسەڵاتمان بەشێوەیەکی گشتی و لاوازکردنی تواناکانی دوژمن لایەنی ئێمە پێویستی بەهەندێك تۆپهاوێژو ڕەشاش و فڕۆکەو چەك و کەرەستەو تفاقەکانی دەبێت. وردەکاریەکانیش سەرۆکی سوارە عەقید ڕەشید ئەفەندی و سکرتێرەکەی عارف ئەفەندی بەزارەکی پێتان ڕادەگەیەنن.

لەکۆتایدا ئێمە هیوادارین مافە نەتەوەیی و یاساییەکانی گەلی کوردی بەدیبێن کە هەرئێستا دەستی دۆستایەتی و برایەتیتان بۆ ڕادەکێشێت، ئەو برایەتی و دۆستایەتی و یەکێتیە کە بەدڵ و بەگیان ئارەزوی دەکات لەگەڵ ئێوەداو لای ئێوەش ئاشکرایە مەسەلەی ئاگربەست و شەڕی ئێمە لەگەڵ کێیە لەکوردستانی باشور، هەروەها پەیوەندیەکانی حکومەتەکانی دراوسێ بەهەموو ئەمانەوە.

هەڵبەتە ناکرێت وردەکاریەکانی هەموو کارەکانمان بۆ ئێوە بنوسین لەکاتێکدا کە لەنێوان ئێمەو حکومەتی سۆڤیەتیەدا کە ئێمە پشتی پێدەبەستین و بەپشتیوانی خۆمان دەزانین هیچ پەیوەندیەکی دبلۆماسی هەتا ئێستا نیە. بەڵام دەتوانم یەك شت بڵێم ئەویش ئەوەیە کە هەموو گەلی کورد گەلی ڕوسیا بەرزگارکەری خۆرهەڵات دەزانن لەبەرئەوە ئامادەیە چارەنوسی خۆی بەچارەنوسی ئەوەوە ببەستێتەوە.

ئەوەش کە زۆر بیرمان سەرقاڵ دەکات مەسەلەی پشتیوانیکردنەمان.. گەلی کورد بەوپەڕی ئارامیەوە چاوەڕوانی دامەزراندنی پەیوەندیەکانە لەنێوانمانداو ئەگەر ئەو پەیوەندیانەش بەرپابوون و تەواوکاری و هاریکاری نێوانمان بەدی هات کە خەونی پێوە دەبینم، ئەوا ئەو کات گەلی کورد ڕزگاری دەبێت. شایەنی باسیشە ئەگەر ئەم ڕوداوە

گرنگە بەدیهات ئەوا کۆشش و تێکۆشانەکانی هەموومان بەپیتی ئاڵتونین لەمێژوودا دەنوسرێتەوە.

**ئیمزا**

**مەلیکی کوردستان**

**مەحمود**

ئەم نامەیە دکتۆر شەمزینی لە: بلاّوکراوەی رۆژنامەیی نوێنەری کۆماری روسیای سۆڤیەتی فیدراڵیەوە وەریگرتووە کە خاوەن هەموو دەسەلاّتەکانە لەئێراندا لەبەرواری ٣/مارت/١٩٢٨ پاشکۆی ١٢ لەهەمان بلاّوکراوەدا.

## شیکاری سیاسەتی بەریتانی لەبەرامبەر کوردستاندا

## ١٩١٩-١٩٢٤

هەڵوێستە سەربەخۆخوازی و نیشتمانیەکانی شێخ مەحمود بەریتانیای ترساند کە بۆ هەلێك دەگەڕا تا بیڕوخێنێت. لەساڵی ١٩٢٣دا رەوشەکان بەنسبەت بەریتانیاوە رویان لەباشی کرد کاتێك کە دڵنیابۆوە لە سەپاندنی پەیماننامەی بەکۆیلەکردن بەسەر عێراقداو لەرەزامەندی دەربڕینی حکومەتی مستەفا کەمال بۆ ئەوەی کێشەی موصڵ بخاتە بەردەم کۆمەڵەی گەلانەوە کە ئامرازێك بوو بەدەست بەریتانیاوە، ئەمەش بەریتانیای ڕازیکرد بەوەی بەئاسانی عێراق و کوردستانی باشور بەدەست دێنێت، بەتایبەتی کە فەمانڕەواکانی بەغدادو لەسەروشیانەوە مەلیك لەهەرە بانگەشەکەران بوون بۆ ئەوەی هاوپەیمانە گەورەکەیان ڕازی بکەن.

بەوشێوەیە کۆمەڵێك پاساوی دیاریکراو نەمان کە بەریتانیایان ناچارکرد شێخ مەحمود بگێڕێتەوەو دان بەحکومەتە کوردیەکەیدا بنێت، بەڵکو دوژمنایەتیکردنی بۆ حکومەتی کوردستان بووە یەکێك لەمەرجەکان و پێویستیەکانی نزیك بوونەوەی لەهەریەك لەتورکیاو ئێران و عێراق، واتە لەمەرجەکانی رێکەوتنی ئەو وڵاتانە لەگەڵیداو ڕازیبونیان بەپیادەکردنی بەرژەوەندیە داگیرکەرانەکەی بۆیە لەبەرژەوەندی داگیرکەر نەبوو هەموو ئەو وڵاتانە بێزار بکات لەپێناو حکومەتێکی کوردیدا کە ئامرازێکی گوێڕایەڵ نەبوو بەدەستیەوەو، پاشانیش بەرژەوەندیەکانی داگیرکەری بەریتانی وای دەخواست حکومەتی کوردی لەناوببرێت بەتایبەتی دوای ئەوەی کەوا کۆنگرەی قاهیرە بەسەرۆکایەتی سێر ونستۆن چەرچڵ سیاسەتی بەریتانیای دیاریکرد کەبەمشێوەیە بوو سەبارەت بەکوردستان: کوردستانی باشور بخرێتە سەر عێراق[١٤٩] و بیکاتە بەشی باکوری

---

[١٤٩] – کاتێك کە پرۆتۆکۆلی ٣٠ نیسان ١٩٢٣ لەنێوان عێراق و بەریتانیادا بەسترا بەشێوەیەکی کۆتایی ئەوە چەسپا کە ناوچەی سلێمانی لەژێر هەژمونی مەندوبی سامی بەریتانیادا نەمێنێتەوەو، کرنیە لیوایەك وەك لیواکانی تری عێراق و دەبێت وەزارەتی ناوخۆ رەچاوی هەست و سۆزەکانی کوردەکان بکات لەوەی کە فەمانبەرەکانی کوردبن. ئەمە ئەوەیە کەلە لاپەڕە ٨٦ کتێبی– تاسم والاکراد خناجر وجبال– بەڕێز ئەحمەد فەوزیدا هاتووە.

ولاَتەکەی. هەروەها ڕەزامەندی دەربڕین لـەوەی کـە کوردسـتانی ناوەنـدی و خۆرهـەلاَت لەژێر دەسەلاَتی تورکیاو ئێراندا بمێننـەوەو، پاشـگەزبونەوە لەدەقـەکانی پەیماننامـەی سیڤەر لەبەرامبەر کوردستانداو کردنی ئەوە بەمەرجگەلێك بۆ ڕێکەوتنێکی چاوەڕوانکراو لەگەلَ تورکیـای کەمالیـدا. هـەروەها بـەریتانیا بڕیاریـدا هێـزو هـەموو شـێوازەکانی تـر بەکاربهێنێت بۆ سـەپاندنی ئـەم سیاسـەتەو و لـەناوبردنی حکومـەتی کوردسـتان، بۆیـە کاتێك کە شێخ مەحمود مەرجەکانی خۆبەدەستەوە دانـی بـۆ بـەریتانیای ڕەتیکـردەوە، بەریتانیا دەستیکرد بـە بـەکردەوە دوژمنکاریـە جەنگیـەکانی دژ بەحکومەتەکـەی شـێخ مەحمود.

ئیدی فڕۆکەکانی بەریتانیا لە ٤-مارت-١٩٢٣دا هەستان بـە بوردمـانکردنێکی دڕندانـەی شاری سلێمانی کە بەهۆیەوە چەندین لەدانیشتوانە مەدەنیەکەی لەناوچـوون، سـەرەڕای ئەوەش کە شێخ مەحمود شارەکەی پێشتر بەجێ هێشتبوو بۆ ئەوەی بوردومان نەکرێت و لەبەر ئەوەی شارەکەو دانیشتوانەکەی پارێزراوبن.

مامۆسـتا عـەزیز شـەریف- سـەرۆکی حزبـی گـەل ١٩٤٥-١٩٤٧ لـە نامیلکەکەیـدا- مەسەلەی کوردی لـەعێراق- بـەووردی بـاس لەفاکتـەرەکانی تـر دەکـات جگـە لەمانـەی باسمـانکردن- کەلەپـشت ئـەوە بـوون کورسـتانی باشـور بـەهێز بخرێتـە سـەر عێـراق، مامۆستا عەزیز شەریف باسی لێوە دەکات:

-بـەلاَم هۆیـەکانی ئـەم خـستنەسەرە ئـەوا داگیرکەرییـەکی ئاشـکراو سـتراتیژی و ئیستغیلالیە-.

بەمە سودگەلێکی گەورە بۆ داگیرکەری بەریتانیا بەدیهات سـەرەڕای ئـەوەی دەسـەلاَتی خـۆی بەسـەر کوردسـتانی باشـوری دەولَەمەنـد بەنەوتـدا مـسۆگەرکرد کـە شـوێنێکی ستراتیژی گرنگە لەخۆرهەلاَتی ناوەڕاستدا، تێچونەکان و ناڕەحەتیەکانی پارێزگـاریکردن لەبەرژەوەندیەکانی بەریتانیای لەکوردستانی باشور خستە سەر شانی حکومەتی عێراقی بەشـێوەیەك وای لەحکومـەتی عێراقـی کۆنەپەرسـت کـرد- ببێتـە ئـەو پۆلیـسەی کـە هەلَدەستێت بەخزمەتکردنی پاسـەوانیکردنی عێـراق بەکوردستانیـشەوە بەمـەش بـەپێی گوزارشتی مامۆستا عەزیز کە لەمبارەیەوە دەلَێت:-

–بەمشێوەیە سیاسەتی بەریتانیا لەبارەی کوردستانی باشورەوە جێگیربوو ئەوەش بە لکاندنی بەعێراقەوەو بوارنەدان بەهەر جۆر حوکمێکی زاتی کوردی، لەم لکاندنەش لەبەیاننامەو وتاری زۆردا هۆکەی دەرخراوە هەروەها لەنوسینی نوسەرە سەرمایەدارەکاندا وا لێکدراوەتەوە کە زەرورەتە جوگرافی و بازرگانیەکان هۆکاربوون– گومانیشی تێدا نیە لەنێوان کوردستانی باشورو ناوەڕاستی عێراقدا چەندین پەیوەندی ئابوری و کۆمەلایەتی هەیە بەلام ئەم پەیوەندیانە پێویستیان بە خستنەسەری داگیرکەری نیە، بەلام مەبەستەکانی ئەم خستنەسەرە ئەوا داگیرکاریەکی ئاشکراو ستراتیژی و ئیستیغلالیە. خودی نوێنەرەکانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیش نەیانتوانیوە ئەم ڕاستیە بشارنەوە. لەوتاری باوەڕپێکراوی سامی بەریتانیادا کەلەسلێمانی لە ١١– ئاب–١٩٣٠دا پێشکەشی کرد ووتی:

– بینیم هەندێك لایەنی نابەرپرسیار پێیان وایە سیاسەتی حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانی بریتیە لەهاندانی نەتەوەی کوردی، ئەوەش ڕاست نیە نەك لەبەرئەوەی کۆسپ دەخاتە بەردەم حکومەتی عێراقی بەتەنها، بەڵکو لەبەرئەوەی هەردوو دراوسێ خۆشەویستەکەی کە تورکیاو حکومەتی ئێرانە ئەوانیش ئالۆزی و پشێویان تێدەکەوێت، هیچ شتێکیش نیە دورتر لە– ئەم گومانە– لەڕاستیەوە–.

– بەلام هۆکاری ئەوەی کە ئیدارەی کوردستانی باشور ڕاستەوخۆ پەیوەست نەکراوە بەداگیرکەرەوە خۆلادانە لەو تێچونە زۆرانەی کە داگیرکاریی پێویستی دەبێت. داگیرکەری بەریتانیش لەفەرمانڕەواکانی عێراقدا ئەو پۆلیسەیان بینیەوە کە هەڵدەستێت بە خزمەتی پاسەوانیکردنی عێراق بەکوردستانیشەوە.بەمەش تێچونەکانی هاڕین و دامرکاندنەوەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردی بە جەماوەری زەحمەتێکشی عێراقی دەدات لەبری ئەوەی بکەوێتە سەر شانی خەزێنەی بەریتانیاوە.

هەروەك چۆن بەوەش تورکیاو ئێرانی دڵنیاکردەوە کە لەسەر جەستەی لەتکراوی کوردستان ڕێکەوتنیان لەگەڵدا کرد.

دواجاریش هێشتنەوەی حوکمی سەر بە بەریتانیا لەعێراقدا، بەوەی گەلی کوردی لەناویدا بهێڵرێتەوە بێ دۆزینەوەی چارەسەرێکی دادپەروەرانە بۆ گەلی کوردی، وا

دەكات عێراق لاواز بێت لەرووی بونیادو پێکهاتەیەوە، بەدەست مەسەلەی کوردی و سلبیاتەکانیەوە دەناڵێنێت، بەدەستەواژەیەکی تر مەبەست لەیەکێتی عێراقی هەرگیز رەچاوکردنی بەرژەوەندیەکانی عەرەب نەبووە، بەڵکو مەبەست پێی چاودێریکردنی بەرژەوەندیەکانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی بووە.

دکتۆر شاکر خصباك دەڵێت:[150]

-کاتێك کە جەنگی جیهانی یەکەم بە بەزینی دەوڵەتی عوسمانی کۆتایی هات هیواکانی کورد و عەرەب یەکێك بوون لەرزگاربوون لە نێڵەی حوکمی عوسمانی بەشێوەیەکی تایبەتی و بیانی بەشێوەیەکی گشتی و حوکمی خۆیان بەخۆیان وە ئەگەر کوردەکان لەسەرەتای ئەوە ماوەیەدا داوای دەوڵەتێکی سەربەخۆیان کردبێت مانای ئەوە ناگەیەنێت بەرژەوەندیەکانیان لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی عەرەبدا پێکدا دەکێشێت، چونکە عەرەب هیچ رۆژێك لەرۆژان ئارەزووی ئەوەیان نەکردوە دەست بەسەر کوردستاندا بگرن و بیخەنە سەر زەوی خۆیان، سەرەرای رەتکردنەوەی دانیشتوانەکەی بۆ هەر جۆرە زەلیلی و ژێردەستەییەك.

- سەرەرای هەموو ئەمانەش بەریتانیا پێی وابوو دروستکردنی هەر جۆرە فەرمانرەواییەکی نیشتمانی کوردی لەکۆتایدا دەبێتە هۆی ئازادبوونی تەواوەتی و پاشانیش دەرچونی کوردستان لەژێر دەسەلاتی، بەتایبەتی کە ئەو تاقمێکی کوردی لایەنگری خۆی نەبوو پشتی پێ ببەستێت لە بەرێوەبردنی جڵەوی کاروبارەکان و بەرپرسیاریەتیەکاندا وەك ئەوەی لەعێراق هەیبوو، کە سەرانی فەمانرەوایی لە داردەست و بەکرێگیراوانی بەریتانیای مەزن بوون و دروستکراوی خۆی بوون.

بەمشێوەیە کوردستان بووە قوربانی داگیرکەرو پیلانەکانی، هەروەك چۆن داگیرکەر بووە دوژمنی سەرەکی سەرسەخت وناستەنگی یەکەم لەبەردەم گەلی کوردی و مافە نەتەوەییەکانی.

---

[150] - مامۆستا شاکر خصباك لەکتێبەکەیدا- کوردو مەسەلەی کورد لەعێراق لا ٨١ چاپە عەرەبیە یەکەمەکە بەغداد ١٩٥٩.

## بەریتانیاو پەیماننامەی سیڤەر[151]

بەریتانیا -لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم- بەرهەڵستی نەدەکرد لەپەیدابوونی حکومەتێکی کوردی لەکوردستانی ناوەندیدا- کەلەژێر دەسەلاّتی تورکیادا مابۆوە سەرەڕای ئەوەی کە ئارەزوی نەدەکرد یان مەیلی نەدەکرد پێکبێت. ئەگەر وا بوایە ئەوا یەکسەر دروستی دەکرد دوای ئەوەی بەندەکانی ٦٢,٦٣,٦٤ لەپەیماننامەی سیڤەر تێیدا هات کە ئەو کوردانەی لەژێر دەسەلاّتی تورکیادا ماونەتەوە مافی ئەوەیان هەیە حکومەتێك پێك بهێنن کەبەشێوەیەك بێت بکرێت بگۆڕێت بۆ حکومەتێکی تەواو سەربەخۆ، ئەمە لەکاتێکدا کە ئەو کوردە نیشتمانپەروەرانەی لەوێ بوون ئامادەبوون هەتا ڕازیبن بەوەیش بەریتانیا سەرپەرشتی حکومەتە کوردیەکەیان بکات، کەواتە هیچ کات پلانێکی بەریتانی بوونی نەبووە بۆ دروستکردن و پەیدابوونی حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ لەو بەشەی کوردستاندا کە دەکەوێتە ژێر دەسەلاّتی تورکیاوە، بەلاّم دژ نەدەوەستایەوە لەوەی حکومەتێکی کوردی هەبێت – کە خاوەن حوکمێکی زاتی بێت- لەماوەیەکی دیاریکراودا و لەژێر رەوشێکی دیاریکراودا، واتە بەریتانیا دژ نەدەوەستایەوە لەوەی کە بەندەکانی ٦٢,٦٣,٦٤ بخرێتە ناو پەیماننامەی سیڤەرەوە.

بەلاّم بۆچی بەریتانیا لەدژی ئەوە نەدەوەستایەوە؟ ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم خالاّنەی خوارەوە:-

١- ئەو بەشەی کوردستان کە دەقەکانی پەیماننامەی سیڤەر دەیگرتەوە پشکی ڕوسیای قەیسەری بوو بەپێی پەیماننامەی سایکس بیکۆ، پاشان بووە ناوچەیەك کە ڕێکەوتنی لەسەر نەکرا لەنێوان بەریتانیاو هاوپەیمانە داگیرکەرانەکانی تری بەتایبەتی فەرەنسا. بۆیە بەریتانیا نەیدەتوانی لەبەرچاوی جیهان قوتی بدات، هەروەها لەبەردەم ململانێی ئیتالی و فەرەنسی لەگەڵ بەریتانیادا، بۆیە هیوای بەریتانیا ئەوە بوو بتوانێت لەڕێگەی بەدەستهێنانی لایەنگرەوە بۆ خۆی لەکوردستان جێگەی پێی خۆی بکاتەوە و قەڵەمڕەوی خۆی لەو پارچەیەی کوردستاندا پەرەپێبدات، پاشانیش دەسەلاّتی خۆی

---

[151] - پەیماننامەی سیڤەر لە ١٠ی ئابی ١٩٢٠دا لەشاری پاریس لەفەرەنسا بەسترا.

بەسەردا بسەپێنێت بەتایبەتی کە چاوەڕوانکراو بوو ڕەوشەکان ئەم حکومەتە کوردیە ناچاربکەن دۆستایەتی لەگەڵ بەریتانیادا بکات و لێی نزیك بێتەوە بۆ ئەوەی پارێزگاری لەبوونی خۆی بکات لەبەر مەترسی تورکی.

٢- خستەڕووی مەسەلەی ئەرمەنی و مەسەلەی کوردی بۆ بەردەم کۆنگرەی ئاشتی لەپاریس، دوای ئەوەی پروپاگەندەکان کە وڵاتانی هاوپەیمان بڵاویان کردەوە رەواجیان پەیداکردو گوێی جیهانیان پڕکرد دەربارەی مافی گەلان لەدیاریکردنی چارنوسیان بەدەستی خۆیان و، مافی گەلان کە دەکەونە ژێر دەسەڵاتی تورکیەوە لەرزگاربوون لەجەور و ستەمی و، دوای بڵاوبونەوەی بنەماکانی -ویلسن-ی سەرۆکی ئەمریکا، پاشان ڕوونی دادپەروەریی داخوازیەکانی شاندی کوردی و هەستانی بەچالاکیەکی بەرفراوان و هاوکاریکردنی لەگەڵ شاندی ئەرمەنیدا[152] لەسەر پێشکەشکردنی پرۆژەیەکی هاوبەش و، نەبوونی ئۆپۆزسیۆنێکی بەهێزی تورکی، هەموو ئەمانە وڵاتانی داگیرکەری ناچارکرد بەندەکانی پەیماننامەی سیڤەر دابنێن کە پەیوەستە بەگەلی کوردەوە.

٣- سیاسەتی بەریتانیا تێدەکۆشا بۆ ئەوەی تورکیا لاواز بکات و بواری پێنەدات بۆ ئەوەی جارێکی تر وەك وڵاتانی بەهێز دەربکەوێت و پاشانیش هەوڵیدەدا کە ئیمپراتۆریەتە کۆنەکە پەرت بکات. باشتریشە بۆ بەریتانیاو پروپاگەندەکەی کە دابەشکردنی هەندێك لەبەشەکانی ئیمپراتۆریەتەکە کۆك بێت لەگەڵ هیواکانی گەلان و مافی چارەی خۆنوسیندا ئەمەش پروپاگەندەی بەریتانی سودی لێوەردەگرێت بۆ ئەوەی مۆرکێکی مرۆیی دۆرینە بداتە سیاسەتە داگیرکەرانە دژ بەگەلانەکەی.

---

[152] - لەیەکی ئازاری ١٩٢٠دا هەردوو نوێنەری کوردی و ئەرمەنی یادداشتێکیان بەناوی هەریەکەیانەوە بەرزکردەوە بۆ ئەنجومەنی باڵای هاوپەیمانان تێیاندا ئەو ڕێکەوتنە هەبوو کە پێیگەیشتبوون، ئەنجومەنەکە بەشێوەیەکی مەبدەئی لەسەر یادداشتەکە ڕەزامەندبوون. ژەنراڵ شەریف پاشا لە ٢٢ ئازاری ١٩١٩دا یاداشتێکی بەرزکردەوە بۆ ئەنجومەنی باڵای هاوپەیمانان تێیدا داوای سەربەخۆیی کوردستان و یەکێتی گەلی کوردی کردبوو یاداشتەکەش لەژێر ناوی :.Memorandum sur les revendications du people kurde (یاداشتێك دەربارەی گێڕانەوەی مافەکانی گەلی کورد).

٤- بەریتانیا دەیویست ئەو مادانەی کە لە -سیڤەردا- هاتبوون وەك چەکێك بەکاربهێنێت بۆ ترساندنی حکومەتەکانی تورکیاو ئێران و تاقمە عەرەبیە کۆنەپەرستەکان و ناچارکردنیان بۆ ئەوەی ملکەچ بکەن بۆی. بۆیە رزگاربوونی کوردستان یان چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردی چارەسەرێکی دیموکراتی دادپەروەرانە مانای داخستنی رێگایە بەڕووی پیلانە داگیرکەرانەکانیشدا.

٥- دەیوست سود لەوە وەربگرێت بۆ گرەنتیکردنی سەپاندنی دەسەلاتی بەسەر -میسۆپۆتامیا-،- دۆڵی دوو رووباردا و هەروەها بەسەر کوردستانی باشووریشدا. بەتایبەتی هەوڵیدەدا گرەنتی دورخستنەوەی هەموو نارەزاییەکی تورکی بکات و زاڵ بێت بەسەر هەموو بانگەشەیەکی تورکیدا دەربارەی ویلایەتی موصڵ دەوڵەمەند بەنەوت. تورکیایەك - ئەو کوردستانەی کە پێشنیار کرابوو دەوڵەتێکی سەربەخۆی لێ دروست بکرێت- جیای دەکاتەوە لەویلایەتی موصڵ ناتوانێت بانگەشەگەلێکی مەعقول لەبارەیەوە پێشکەش بکات.

بەریتانیا سود لەم مادانە وەردەگرێت هەتا لەحاڵەتی جێبەجێنەکردنی ئەم مادانەشدا کە دەیکاتە --نرخی- رێکەوتن لەگەڵ تورکیادا. هەروەك چۆن ئەم مادانە دەکرێت سودیان لێوەربگیرێت بۆ ترساندنی بزوتنەوەی کەمالیزم و ناچارکردنی بۆ ئەوەی لەگەڵ بەریتانیادا رێکبکەوێت و دوربکەوێتەوە لەسیاسەتی رزگاریخوازی دژ بەداگیرکەر چونکە بزوتنەوەی کەمالیزم بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی بوو دەیوست لەسەر داروپەردوی ئیمپراتۆریەتە روخاوەکەی هەستێتەوە، پاشانیش بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی بورجوزای خاوەن ئامانجێکی فراوانخوازی و ئیستیغلالی بوو دژ بەگەلی کورد.

٦- کردنی کێشەی کوردستانی ناوەندی بەکێشەیەکی نێودەوڵەتی سیاسەتی بەریتانیا سودی لێوەردەگرێت بۆ ئەنجامدانی رێکەوتنەکانی لەگەڵ تورکیادا بەتایبەتی و لەو پەیماننامە نێودەوڵەتیەدا کە لەوانەیە جێگەی پەیماننامەی سیڤەر بگرێتەوە بەگشتی، هەرواشبوو بەریتانیا سودی وەرگرت لەوە بۆ ئەوەی هانی بزوتنەوەی کەمالیزمی نەتەوەیی بدات بە چاوتێبڕینی لەکوردستان، بۆئەوەی دوری بخاتەوە لەدۆستایەتی لەگەڵ ڕوسیای سۆڤیەتیدا و نزیك بوونەوە لە ولآتانی داگیرکەرو

پاشانیش بۆ سەرلەنوێ گێڕانەوەی بزوتنەوەی تورکی بۆ ناو گەلەکانی بزوتنەوە کۆنەپەرستیە شۆفێنیەکان ئەوەش وەك ڕێگەخۆشکردنێك بۆ ئەوەی تورکیا سەرلەنوێ بخرێتەوە سەر سەربازگەی کۆنەپەرستی جیهانیی، لەڕاستیشدا بەریتانیا دواتر ئەم کارە داگیرکەرانەیەی بەدیهێنا، بەسودوەرگرتن هەروەها لەم بەندانە، کاتێك چووە ناو ئەو دانوستانانەوە کە دواتر ئەو ڕێکەوتنەی لێکەوتەوە کە بە پەیماننامەی –لۆزان– ناسراوە کە لە ٢٤– تەمموزی ١٩٢٤دا ئیمزا کرا، ئەم پەیماننامەی کە دەقەکانی پەیماننامەی سیڤەری هەڵوەشاندەوە لەبارەی مافەکانی گەلی کوردەوە کەوا سیاسەتی داگیرکەرانەی بەریتانیا لەبەرامبەر کوردستاندا بەنکوڵیکردنی تەواوەتی کۆتایی هات لەبەرامبەر مافەکانی گەلی کوردی و ڕەزامەندی کۆتایی لەسەر کۆیلەکردن و دابەشکردنی کوردستان کە لاپەڕەیەکی نوێی کردەوە لەهاریکاری عێراق و تورکیاو بەریتانیا لەدژی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردو ئەوەش لەبەرامبەر سازشکردنی تورکیا لەبانگەشەکانی دەربارەی ویلایەتی موصلّ سازشکردنێکی کرداریی، کاتێك ڕازی بوو بەوەی مەسەلەکە بخاتە بەردەم کۆمەڵەی گەلانەوە کە بەوە ناسرابوو لایەنگیریی بۆ بەریتانیا هەبوو.

هەروەك چۆن بەریتانیا هەردوو حکومەتی بەغدادو تارانی بەمەسەلەی کوردی ترساندو هانیدان بۆ ناو باوەشی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی بەڕەزامەندی دەربڕین لەسەر پەیماننامەگەلێکی ئابوریی پەیوەست بە تاڵانکردنی نەوتی ئێران و عێراق و بەسەپاندنی ئینتیداب بەسەر ڕوسیادا بەشێوەیەکی فەرمی.

بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە مەسەلەی کوردی لەدەستەچن و دروستکراوی بەریتانیایە. هەروەك شۆفێنیەکان ئەمڕۆ بانگەشەی بۆ دەکەن و دوێنیش کۆنەپەرستیی تورکی بانگەشەی بۆ دەکرد.

ڕوداوەکان بەڕوونی پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێنن، بەریتانیا بەربەست بوو لەبەردەم ڕزگاربوونی کوردستان و دژ بە دامەزراندنی حکومەتە سەربەخۆکەی بوو وە هەر ئەو بوو کە فڕۆکەو تانك و تۆپ و سوپای ئینگلیزی بەکارهێنا بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی بەسەر کوردستانداو لەناوبردنی حکومەتە نیشتمانیەکەی بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود.

# کۆمەڵەی گەلان و کێشەی کورد

لەواقیعدا کۆمەڵەی گەلان- کۆمەڵەی دزان- ی داگیرکەربوو ئەوانەی کە هیچیان بەلاوە گرنگ نەبوو جگە لە دڵنیاکردنەوەی بەرژەوەندیەکانی داگیرکەر لەتاڵانی و، بەکۆیلەکردنی میلەتانی خۆرهەڵات و ئەفریقی و دابەشکردنی تاڵانیەکان لەنێو وڵاتانی سەرکەوتوودا. بۆیە چارەنوسی گەلی کوردی و مافەکانی بەلاوە گرنگ نەبوو، بەڵام رەوش و بارودۆخە نێودەوڵەتی و خۆرهەڵاتیەکان ناچاریان کرد چەند بڕیارێکی بێهۆشکەر دەربکات کاتێك کەوا گەلی کوردی بێبەشکرا لەمافە هەر مەزنەکەی لەچارەی خۆنوسین. کاتێك کۆمەڵەی گەلان بڕیاریدا کە لیژنەیەك لەئەندامەکانی بنێرێت بۆ لێکۆڵینەوە لەناکۆکی بەریتانی تورکی لەبارەی موصڵەوەو کەلە ١٩٢٥دا سەردانی عێراقی کردو لەڕاپۆرتەکەیدا سەبارەت بەکوردەکان دەڵێت[١٥٢]: پێویستە رەچاوی ئارەزوەکانی کوردەکان بکرێت لەدامەزراندنی فەرمانبەری کورد بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتەکەیان و رێکخستنی کاروبارە دادوەریەکان و فێربوون لەقوتابخانەکانداو زمانی کوردی زمانی فەرمی بێت لەم کاروبارانەدا- کاتێکیش کۆمەڵەی گەلان ڕوانیە ناکۆکی بەریتانی- تورکی لەم بارەیەوە بڕیاری دا: ( داوا لەحکومەتی بەریتانیا دەکرێت بەو پێیەی کە وڵاتی چاودێریکەرە ئەو رێوشوێنانە بخاتە بەردەم ئەنجومەنەکە کە دەیگرێتەبەر لەپێناو جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنانەی کە پەیوەستن بەکارگێڕیی ناوچەیی بۆ کوردەکانی عێراق کە لیژنەی سنور لەدەرئەنجامەکانی ئەم دواییەدا ڕاسپاردەی پێدابوو) هەروەك چۆن کۆمەڵەی گەلان بڕیارگەلێکی دیاریکرد کە پێشتر خرانەڕوو کاتێك باسی لەبایەخی نێودەوڵی ڕاپەڕینی ٦-ئەیلول-١٩٣٠ کرد. بەڕێوەبەری پۆلی ئینتدابیش وێنەی ئەو بڕیارەی ڕەوانە کردەوە لەسەر سکاڵانامەکەی بەڕێز حەفصەی نەقیبزادە کە لە بەرواری ٧ ئەیلولی ١٩٣٠دا ناردبووی بۆ کۆمەڵەی گەلان:

*کۆمەڵەی گەلان*

*جەنوە لە(٥) ئۆکتۆبەر ١٩٣١*

*ژمارە ٦ئەی/١٣/٢٢٤/٦٥٥*

---

[١٥٢] - لاپەڕە ٨٦ لەکتێبی- خناجر وجبال بەڕێز ئەحمەد فەوزی.

*خاتونی بەڕێز:*

ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان لەبڕیارە لەسەردراوەکانی بەرواری ٤ سێپتەمبەری ١٩٣١دا کاریان کردووە بەوەی کە لیژنەی ئینتیدابی هەمیشەیی ڕاسپاردەی داوە پێتان ڕابگەیەنم سکاڵانامەکەتان کە بە بەرواری ٧ سێپتەمبەری ١٩٣٠ هاتووە سەیری کراوەو کۆمەڵەی گەلان هێشتا پشتیوانی دەکات لەوەی کە مافەکانتان ڕێزدارن بەسۆزداریەکی زیاد تێیدا ئەگەر ئەو قەناعەتە هاتەئارا کەوا کوردەکان خزمەتگوزاری تەواو ئەنجام دەدەن لەپێناو پاراستنی هێمنی شانشینداو سەرکەوتنی حکومەتی عێراقی وە بۆ ئەوەی زانیاریتان پێبدەم وێنەیەکی بڕیارەکەتان بۆ دەنێرم لەسەر سکاڵانامەکەتان کە مستەر ڕاپارد بەرزیکردەوە بۆ لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب کە پاشبەندکرا بۆ ڕوداوەکانی دانیشتنی بیستەم لە دانیشتنەکانی لیژنەکە.

خاتونی بەڕێز شەرفمەندم بەوەی خزمەتکارێکی گوێڕایەڵتان بم

بەڕێوەبەری پۆلی ئینتیداب

پوختەی ڕوداوەکانی دانیشتنەکانی بیست کەلەلایەن لیژنەی ئینتدابی هەمیشەییەوە بەسترا ژمارەی سی ٤٢٢ م ١٦٧ و ١٩٣١ شەشەم پی. پی ٢٢٠–٢٢٢ سی. پی ١١٩٨.

## عێراق

سکاڵایەکی بەرزکراوە (١)لەکوردەکانی عێراقەوە نێراوە بۆ لیژنەی ئینتیداب لەلایەن حکومەتی بەریتانیەوە لە ٢٠ فێبرایەر ١٩٣١ و (٢) سکاڵانامەیەکی تر لە تۆفیق وەهبی بەگەوە بەرواری ١٩ ئەپرێلی ١٩٣١.

## راپۆرتی مستەر راپارد

لەسەر خواستی سەرۆکی لیژنەکە شەرەفمەندم ئەم تێبینیانەی خوارەوە پێشکەشی هاوەڵەکانم بکە کە هاتن بەخەیاڵمدا لەدوای خوێندنەوەی سکاڵانامە جۆراوجۆرە کوردیەکان و لێدوانەکانی وڵاتی چاودێریکەر لەسەریان کە داوام لێکرابوو بیانپشکنم.

ئەگەرچی ئەو بابەتانەی خراونەتە بەردەم لەقەبارەی چەند بەرگێکدان بەڵام تێبینیەکانم لەسەریان زۆر کورت و پوخت دەبن بەپێویستی نازانم لەکاتی ئەم تێبینیانەدا ئەو شتانە بگێڕمەوە کەلەهەموو ئەو سکاڵانامانەدا هاتوون وە لێدوانەکانی وڵاتی چاودێریکەر لەسەریان چونکە ئەوە دەمبات بۆ دووبارەکردنەوەیەکی بێ سود وەلەبەرئەوەی کە هاوەڵەکانم دەتوانن خۆیان هەموو ئەو سکاڵانامانە ببینن بۆیە وتەکانم لەمەی خوارەوەدا کورت دەکەمەوە:-

١- لیستێکی سکاڵانامەکان لەگەڵ مێژوەکەیان و سەرچاوەکانیان.

٢- باسکردنی گرنگترین سکاڵاکانی خاوەن سکاڵانامەکان.

٣- پوختەی تێبینیەکانی وڵاتی چاودێریکەر.

٤- پێشکەشکردنی هەندێك دەرئەنجامی پوختە.

١-لیستی سکاڵانامەکان

| نامە | مێژوو | سەرچاوە |
|---|---|---|
| سی. پی. ایم | ٢-٢٤اب ١٩٣٠ | سەرۆکی عەشیرەتی داودە |
| ١١٤٠,١١٥١ | ب- ٣١ اب ١٩٣٠ | کۆمەڵەی نیشتمانی ناوەندیی خەڵکی کوردستانی باشور. حەفصەخانی نەقیب |
| | ج- ٧ ئەیلول ١٩٣٠ | سەرۆکی عەشیرەتی مەریوان و عەشیرەتی فەتاح عەلی بەگ |
| | د-٩ تۆکتۆبەر ١٩٣٠ | سەرۆکە کوردیەکان |
| | هـ-٩ تۆکتۆبەر ١٩٣٠ | شێخ مەحمود و سی سەرۆك لەهۆزی پشدەر |
| | ز- ١٤ تۆکتۆبەر١٩٣٠- | جەعفەر سوڵتان و نۆزدە کەسایەتی گەورەی کورد |
| سی. پی. ایم. ١١٩٢ | لە ١٩ نیسان ١٩٣١ | تۆفیق وەهبی بەگ |

## ٢- سکاڵای خاوەن سکاڵانامەکان

ئەم سکاڵایانەی ووردبینیم کردوون لەرووی درێژیی و زمان و ناوەڕۆکیانەوە جیاوازن، بەڵام هەموویان توڕەیی ئەو گەلە کوردیانە نیشان دەدەن کەلە عێراقدا نیشتەجێن و خاوەنی سکاڵانامەکان و هەموو ئەوانەی بەناویانەوە قسە دەکەن بەپلەی جیاواز ناڕازین لەو سیاسەتە کەبڕوایان وایە سیاسەتی حکومەتی عێراقی و وڵاتی چاودێریکەرە بۆ ئەوەی بخرێنە سەر باقی دانیشتوانەکانی ئەو بەشەی تری وڵات کە لەژێر ئینتیدابدایە، لەکاتێکیشدا کوردەکان لەرووی رەگەزو زمان و نەریتیان و شێوەی ژیانیان و تەماحی سیاسیانەوە جیاوازبوون لەدانیشتوانی دەشتەکان و هەروەك ئەوەی کە دیاریشە هەست بە رێکەوتنی بەرژەوەندیە تایفیەکان دەکەن لەگەڵ کوردەکانی تری نیشتەجێی دەرەوەی عێراقدا بۆیە هەست دەکەم کە ئێمە لەبەردەم مەسەلەیەکی تایبفی رەگەزیداین کە ئەو سیفەتانەی هەیە زۆرجار بە مەسەلەی کەمینەکان ناودەبرێت.

هەندێ سکاڵای خاوەن سکاڵانامەکان زۆر ناڕوونن سکاڵایان تێدایە دەربارەی دڵڕەقی و ئیرهابی دەسەڵاتدارانی عێراقی بەڵام هەندێکیان زۆر ڕوونە هەیانە سکاڵای ئەوە دەکەن فەرمانبەرە غەیرە کوردەکان کە بەرپرسن لەبەڕێوەبردنی ناوچەکەیان زۆرترن سەرەڕای جەختکردنەوەکانی حکومەت لەژێ ئەوە. هەندێکی تر سکاڵا دەکەن لەدانانی باجی زیادە لەسەر مەڕوماڵات و بەرهەمەکانیان. زۆرێکیان سکاڵا دەکەن لە پەیماننامەی ئەم دواییەی نێوان عێراق و بەریتانیا کە تێیدا بەندێك نیە مافە تایبەتیەکانی کورد لەخۆبگرێت. ژمارەیەکیشیان ئەو ئیرهاب و توندوتیژیە بەدرێو دەزانن کە تووشی جەماوەری کوردی هات بەڵکو سەرۆکە کوردەکان لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا لەسلێمانی و دواجاریش دوو سکاڵانامەم بینی کەخەریکە لەرووی شێوازەوە یەکێك بن سکاڵا دەکەن لەوەڵام نەدانەوەی سکاڵاکانیان کە نێراون بۆ بەرپرسی بەریتانی لەعێراق.

## ( ٣- داواكاریەكانی خاوەن سكالأنامەكان )

ئەم سكالأنامانە جگە لەهۆكارەكانی دلّرەقی و بیٰ بەزەیی كەلەسەرەوەدا كورتم كردەوە چەند داواكاریەكی دیاریكراویان تێدایە ئاماژە دەكەن بە پێكهاتە ئیداریی و سیاسیەكان لەو بەشەی عێراقدا كەوا كوردەكانی تێدا نیشتەجێن كە لەجۆریاندا زۆر جیاوازن و هەندێكیان دامەزراندنی حكومەتێكی كوردی سەربەخۆیان دەوێت لەژێر پاراستنی ئینتیدابی بەریتانیدا یان هەر ولأتێكی تر كۆمەڵەی گەلان و ئەوانی تر هەڵبژێرێن داوادەكەن كە ئەم ناوچەیە پێویستە شانشینێكی سەربەخۆ بێت شێخ مەحمود فەمانڕەوایەتی بكات لەژێر پاراستنی دەوڵەتی بەریتانیادا بەلأم تۆفیق وەهبی بەگ لەلایەكی ترەوەو لەنامەو سكالأنامە جۆراوجۆرەكانیدا تەنها داوای ئیدارەیەكی نایابی پێشكەوتوو دەكات بۆ ناوچە كوردیەكان لەعێراق سەرەڕای ئەم داواكاریە گشتیانەش لەبارەی رێكخستنی ناوچە كوردیەكانەوە ئەم سكالأیانە دوو داوایان تێدایە یەكەمیان ئازادكردنی ئەو كەسانەی زیندانی كراون یان دورخراونەتەوە لەرۆژەكانی پشێویەكانی سلێمانیداو دوەمیشیان گواستنەوەی فەرمانبەرەكان لەناوچە عەرەبیەكانەوە بۆ كوردیەكان.

## ( ٤- پوختەی تێبینیەكانی ولأتی چاودێر )

ولأتی چاودێر كەئەم سكالأ جۆراوجۆرانەی بەرزكردۆتەوە بۆ لیژنەكە بەووردی پشكنیویەتی و ووردبینی كردووە و هەڵوێستی خۆی لەبەرامبەر ئەم سكالأیانەدا لەو تێبینیانەدا باسكردووە كە لەچەند بەندێكدا هاوپێچی كردووە لەو راپۆرتەیدا كە بەرزكراوەتەوە لەبارەی گەشەو پێشكەوتنی عێراقەوە لەساڵی ١٩٢٠ وە بۆ ١٩٣١ هەروەها لە وتەی كەسە باوەڕپێكراوە پەیوەندیدارەكانیەوە. بەبیٰ چوونە ناوەوەی دوورودرێژی خاڵە جۆراوجۆرەكانی ناكۆكی، پێویستە بزانرێت كە ولأتی چاودێریكەر نكوڵی دەكات و رەتیدەكاتەوە كە ئەو مافەی خاوەنی سكالأنامەكان داوای دەكەن راوبۆچونی زۆرینەی گەلی كوردی بێت هەروەها رەتیدەكاتەوە ئەو پەیماننامانەی گرێدراون هیچ بەڵێنێكیان تێدا بێت ئاماژە بە سەربەخۆیی كوردەكان بكات یان

ئیدارەیەکی نایابیان پێبدرێت و بەڵێنی لەو جۆرانە لەکاتی دامەزراندنی رژێمی ئینتدابیدا لەعێراق نەدراون.

ولاتی چاودێریکەر دان دەنێت بەوەی بۆ مافی ئەوەی بۆ فەراهەمکردون زمانی خۆیان بەکاربهێنن و فەرمانبەرانی کورد دابمەزرێن بەلام وایدادەنێت کە حکومەتی عێراق کاری کردووە یان بەم نزیکانە کار دەکات بۆ جێبەجێکردنی ئەم جێبەجێکردنانە لەشێوەی رێکەوتنی سیاسەتی گشتیدا، بەلام رەتیدەکاتەوە نارەزایی و تورەییەکی گشتی هەبێت لەنێو کوردەکانی عێراقداو سوپاسی میانرەوێتی دانایی زۆرینەی گەلی عێراق کرد چونکە ئێمە متمانەی تەواومان هەیە کە مافەکان و پێگەی کەمینەی کوردەکان هەمیشە رێزلێگیراوە هەتا دوای چوونی عێراق بۆ ناو کۆمەلگەی نێودەوڵەتی وەك ولاتێکی سەربەخۆ، ئەمەش ئەوەیە کە لیژنەکە پێداگرانە راسپاردەی پێدەدات.

(٥- پێشکەشکردنی هەندێك دەرئەنجامی پوخت)

بەو پێیەی کە رژێمی حکومەتی عێراقی زیاتر لەپلەی باشبوونێکی مەزندایە بێهودانە هەوڵ دەدەین رێسایەك دابنێین کەلەسەر کۆمەڵێك بریاری دیاریکراو بونیاد بنێین لەسەر هەریەك لەو داخوازیانەی کە خاوەن سکالانامەکان داوایان کردووە. چونکە زۆربەی ئەم داواکاریانە لەرووی فرەیی و بایەخەوە زیاتر داوای دامەزراندنی شانشینێك دەکەن کەلەتوانای رێکەوتننامەکان و پەیماننامە عێراقیە بەریتانیەکاندا نیە، کە ئینتداب بەپێویستیەکانی هەستێت.

کەواتە ئەم سکالایانە بەشێوە راستەقینەکەی قەبولکراو نیەو پێویست بە هەر جۆرە لێدوانێك ناکات لەسەریان لەلایەن لیژنەکەوە. بەلام لەبارەی ئەو سکالانامانەوە کە ئاماژە بە ئازادی بەکارهێنانی زمانی کوردی دەکەن. ئەوا ولاتی چاودێریکەر دەڵێت کە ئەوان خەریکە پلەیەکی رازیکەر بەدەستدێنن مادام سیاسەتی گشتی رێگە بەروانین لەو مەسەلەیە دەدات.

هاوەڵەکانم بەلایانەوە گرنگ دەبێت کە بزانن دەوڵەتی چاودێریکەر رەزامەندی دەربریوە لەسەر بریارەکانی حکومەتی عێراقی لەبارەی هەڵوێستی لەبەرامبەر مەسەلەی کوردیدا.

هەروەك چۆن بریکاری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لەمانگی ئابی ١٩-١٩٣٠دا رایگەیاند حکومەتی عێراقی بڕیاری داوە لەئاییندەدا بایەخ دەدات بەداخوازی کوردەکان بەوەی کە پێداگری بکات لەسەر فەرمانبەرەکانی حکومەت ئیدی لەهەر جۆرێك بن پێویستە شارەزابن لەزمانی کوردیدا زۆرباشترە لەوەی کە بەڕێوەبردنی ناوچە کوردیەکان بدرێتە فەرمانبەرانی کورد.

لیژنەکە ناچارە ئەوە قەبوڵ بکات مادام ئەم بڕیارە ئارەزووی ئەوە دەردەخات لەئاسانکردنی بۆنەکان لەنێوان دانیشتوانە کوردەکان و کارگێڕیداو مادام بوار دەکاتەوە بۆ فەرمانبەرە کوردەکان لەناوچە غەیرە کوردیەکاندا.

لەلایەکی ترەوە ناکرێت لیژنەکە هەرگیز ئەو بیرۆکەیە پەسەند بکات بێ سەرنجدان لەمەبەستەکەی ئەگەر ببێتە هۆی مومارەسەکردنی ئەوەی کوردەکان بێبەش بکرێن لەبوونی ئەو فەرمانبەرانەی کە رەوشیان رێگەیان پێدەدات بەرزببنەوەو بەئاواتە رەواکانیان بگەن.

دەوڵەتی چاودێریکەر لەلایەکی ترەوە جەختدەکاتەوە کەوا کردەوەکانی ستەم و توندوتیژی کە تووشی خاوەن سکاڵانامەکان و ئەوانە هاتووە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن بەرگریی لە ناوچەکانیان دەکەن یان خەیاڵین یان ڕاستن و هۆکارەکەی رەفتاری ئەوانەیە کە چاودێرکەران تاوانیان دەرهەق ئەنجامداون .

ئەم سکاڵانامە هەمەجۆرانە کەلەلایەن بەشێکی زۆر لەو کەسانەوە بەرزکراوەتەوە کە مەحاڵە بتوانرێت پلەو پێگەیان ئاشکرا بکرێت وە ئەو رونکردنەوە دورو درێژو قەناعەتپێکەرانەی کە وڵاتی چاودێریکەر خستویەتەڕوو لیژنەکە دەخاتە پێگەیەکی زۆر تەنگ و لەقەوەو هەرگیز هەست بە لاوازی لیژنەی ئینتیداب ناکەم لەبەڕێوەبردنی لە مەسەلەی سکاڵانامەکاندا زۆر زیاتر لە جەنگینی لەناوەڕاستی ئەم ئامانجە فێڵاویە لە لێدوانەکان و رەتکردنەوەو رونکردنەوەکان و لە نەدانی بوارێك بۆ لوانی بەکارهێنانی پێویستیەکان لەلێکۆڵینەوەکانی لیژنەکە کەناچارە لێدوانەکانی وڵاتانی چاودێریکەر قەبوڵ بکات کە.

لەم حاڵەتەدا دەتوانین ئەوە بکەین بەبێ هیچ دودڵیەك مادام وا دەردەکەوێت سکالای خاوەن سکالانامەکان بەووردی لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە کراوەو مادام ئەم سکالایانە زیاتر پەیوەندیان بەعێراقەوە هەیە زیاتر لەوەی پەیوەندیان بەحکومەتی مەزنی بەریتانیاوە هەبێت و ووردبینی و پشکنین لەسەر ئەم سکالایانە کراوە لەلایەن دەسەلاتێکەوە بەرپرسە لەو خراپ بەکارهێنانەی کە خاوەن سکالانامەکان بانگەشەی بۆ دەکەن و ئەوەی سوك و کەمکردۆتەوە بەدەستێوەردانی لەکاروبارە کارگێڕیەکاندا.

کەواتە ئایا پێویستە لەسەر لیژنەکە داوای خاوەن سکالاکان پوچەڵبکاتەوە بەتەواوەتی؟ وە بەخۆی بڵێت کە بەتەواوەتی قەناعەتی بەتێبینیەکانی وڵاتی چاودێریکەر کردووە پێموایە نەخێر.. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم سکالا جۆراوجۆرانە بوونەتە مایەی رەخنەلێگرتنیان بەهۆی نەزانینی پێگەی خاوەنەکانیان بەکەم و جۆری ناوەڕۆکە متمانەپێنەکراوەکانیان و دووەمیش ناکرێت بۆ کەسێکی چاودێری بێ لایەنی خۆی لەم بیرۆکەیە لابدات بەڵکو دەڵێت مەسەلەی کورد لەعێراقدا مەسەلەیەکی ڕاستەقینەیە هەتا ئەگەر توڕەیی کوردەکان کەمێك یان زۆرێك وە لەوەش زیاترو هەمەگیرتر بوو وەك خاوەن سکالانامەکان دەڵێن، وا دیارە کە بوونی هەیەو وڵاتی چاودێریکەریش ئەوەی دووپات نەکردۆتەوە.

کەواتە ئەگەر ئەم خەشم و توڕەییە بەڕاستی بەردەوام بووە دەبێت هەستپێکراوبێت هەم ئەم ماوەیەی کە تێیدا حکومەتی بەریتانی سەرەڕای لێهاتوویەکەی قەڵەمڕەوی ڕاستەقینەی خۆیی بەکارهێناوە لەرێگەی دادپەروەریەوە کەواتە ترس نیە لەوەی توڕەییەکی لەمشێوەیە زیاترو هەمەگیر دەبێت ئەگەر واز لەحکومەتی عێراقی هێنرا خۆی بەرێوەبەرێت و ئەوەش دێتەڕێی ئەم توڕەییە کە ڕەنگە هەمیشە ڕوبدات و بۆ گێڕانەوەی ڕۆحی نیشتمانی دوژمنکارانە لەناو هاوڵاتیە عەرەبەکانیدا.

ئەگەر هاوڵەکانیشم هاوڕابن لەگەڵمدا کە بەدەستم هێناوە لەکاتی لێکۆڵینەوەم لەم بەڵگەنامانەی کەلەسەرەوە بەپوختی باسم لێوەکردن ئەوا دەتوانن ئەم ڕاستەیە تۆماربکەن بەهەڵبژاردنی ئەم بڕیارەی خوارەوە بۆ پێشکەشکردنی بە ئەنجومەنەکە.

لیژنەی ئینتیداب دوای ووردبونەوە لە سکالا هاتوەکان کە بەرزکراونەتەوە لەلایەن کۆمەڵەکان و کەسە جۆراوجۆرە کوردیەکانەوە لەعێراقدا لەگەڵ ئەو تێبینیانەدا کە ولآتی چاودێریکەر خستونیەتەڕوو شەرەفمەندە ئەم ڕاسپاردانەی خوارەوە بدەنە ئەنجومەنەکە:

١- سوپاسی ولآتی چاودێریکەر بکرێت لەو بایەخپێدانەی کە نیشانیدا لەلێکۆڵینەوەکانیداو ئامادەکردنی ئەو تێبینیانەیدا کەلەئەنجامی ئەم سکالآنامە جۆراوجۆرانەوە دروست بوون.

٢- داوا لەولآتی چاودێریکەر بکرێت پێداگری بکات لەحکومەتی عێراق بەوەی کە پێویستە لەمامەڵەکردنی لەگەڵ هاولآتیە کوردەکانی ئارامییەکی زۆری هەبێت بەرامبەر کەمینەیەك کە مافی ئەوەی هەیە ڕێزی لێبگیرێت و دڵسۆزبوونی بۆ حکومەتەکەی بەوە گەشەدەکات رزگاربکرێت لەهەموو هێڵێك ناپاکی دەرهەق بە مافە بنچینەییەکانی بکات کەهەریەك لە ولآتی چاودێریکەرو کۆمەڵەی ولآتان دانیان پێداناوە.

٣- ئەوە بە خاوەن سکالآنامەکان ڕابگەیەنرێت کۆمەڵەی گەلان هەمیشە کاردەکات و وا لەمافەکانیان دەکات ڕێزلێگراوبن و ئەوەش بەهاوسۆزیەکی فرەترەوە دەکات ئەگەر لیژنەکە ڕاسپاردەی دا کە کوردەکان بەدڵسۆزیەوە بەشداری تەواوەتی دەکەن لەدابینکردنی هێمنی و سەرکەوتنی دەوڵەتی عێراقیدا.

٤- سەرنجی تەواوەتی ڕابکێشرێت بۆ ئەو نیگەرانیەی گومانی تێدا نیە زاڵ بووە بەسەردانیشتوانە کوردەکانداو لەو ناڕۆشنی بەختەیانەوە دروست بووە کە چاوەڕوانیان دەکات لەپاراستنی حکومەتی بەریتانی بەهێزە مەعنەویەکەیەوە کە سودیان لێوەرگرتووە زیاتر لەدە ساڵ کە پێویست بوو لەسەری بکشێتەوە.

## شۆڕشی کوردی بەسەر شۆڤێنیزم و فراوا نخوازی بزوتنەوەی کەمالیزمدا

**١٩٢٥-١٩٣١**

چەند نامۆیە ئەوەی نەتەوایەتی لەبەرگریکردن لەنیشتمانەوە بگۆڕێت بۆ هێرشێك بۆ زەوتکردنی کەسانی تر- دەستەواژەیەکی ڕاستگۆیانەیە جەواهێر لال نەهرۆی سەرکردەی ناسراوی هیندی لەکاتی لێدوانی لەسەرگۆڕانی بزوتنەوەی کەمالیزم ووتویەتی کە لە بزوتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی نەتەوەییەوە بگۆڕێت بۆ بزوتنەوەیەکی دوژمنکاریی کە دژایەتی گەلی کوردی دەکات کە لەپێناو ڕزگاربونیدا خەبات دەکات، لەبزوتنەوەیەکەوە بۆ بەرگریکردن لەتورکیا لەدژی داگیرکەرو زەوتکەران بۆ بزوتنەوەیەکی کۆنەپەرستی زەوتکەر ئازادی کوردەکان زەوت دەکات و بەهێزی ئاگرو ئاسن نیشتمانەکەیان داگیردەکات لەسەر هەمان پەیڕەو شێوازی داگیرکەران. ئەمەش تەواو ئەوەیە کە بزوتنەوەی کەمالیزم دوای سەرکەوتنی لەبەرامبەر گەلی کوردیدا کردی. ئەو سەرکەوتنەی کە قەرزداری گەلی کوردە کە بە بڕێکی گەورە بەشداریان تێدا کرد. لەکاتی داگیرکردنی چەند بەشێك لەتورکیا لەلایەن سوپای بەریتانی و فەرەنسی و یۆنانیەوەو ڕۆژگارێك کەوا کەمال پاشا داوای دەکرد تورکیا- نیشتمانی هەمووان- ڕزگار بکرێت کوردەکان چوون بەدەم بانگەوازەکەیەوەو یارمەتیدانی بزوتنەوە دژ بەداگیرکەرەکەی هەتا بەڕادەیەك کە سەرکردایەتی خۆیانیان ڕادەستکردو ئەوەیان لەبیرچۆوە کە نابێت و پێویست ناکات گەلێکی ستەمدیدەو ژێردەست سەرکردایەتی هێزەکانی خۆی تەسلیم بە بورجوازیەتی نەتەوەیەکی سەردەست و دەسەڵاتدار بکات، بەڵکو پێویستە لەسەری هێزەکانی خۆی ڕێکبخاتەوە لەژێر سەرکردایەتی پێشڕەوەکانیداو یەکخستنی خەبات لەدژی داگیرکەر لەگەڵ بزوتنەوە نیشتمانیەکانی گەلانی تردا لەناو بەرەیەکی نیشتمانیدا، ئەوەش بۆ ئەوەی گرەنتی ئایندەی خۆی بکات و ئەو هێزە ڕێکخراوەی هەبێت کەبتوانێت بەرگریی لێبکات لەکاتی پێویستدا لەمەڵگەڕانەوەی نەتەوایەتی بورجوازی نەتەوەی فەرمانڕەواو زاڵبوونی لایەنە ئاساییە سلبیەکەی- لایەنەکانی چاوتێبڕین لەزەوی و خاکی خەڵکانی ترو فراوانکردن لەسەر حسابی نەتەوەکانی ترو حەزی زاڵبوون.

ئەگەر ئەوە ڕوبیدایە ئەوا بزوتنەوەی کەمالیزمی نەتەوەیی بورجوازی نەیدەتوانی بەو ئاسانیە هەڵبگەڕێتەوەو نکوڵی لەو بەڵێنانەی بکات کە دابووی بەکوردەکان بەوەی ڕێز لەمافەکانیان بگیرێت کاتێکیش کە قوربانیدانە زۆرەکانی کوردەکان لەپێناو ڕزگارکردنی تورکیادا بەفیڕۆ ڕۆیشت، ئەو قوربانیانەی بەڕادەیەك مەزن بوون کە وەزیری بەرگریی تورکیا کاتێك وتارێکی لەسەر مەزاری سەربازی وون پێشکەش کرد ووتی- زۆر گومان دەکەم ئەم سەربازە کورد بێت- پرۆفیسۆری سۆڤیەتی- فیلجیفسکی- لەبارەی یارمەتیدانە بەنرخەکانی نیشتمانپەروەرە کوردەکانەوە بۆ بزوتنەوەی کەمالیزم نوسیویەتی و دەڵێت[151] لەکاتی شۆڕشی کەمالیەکاندا کوردەکان هاوکاریکردنی خۆیان لەگەڵ شۆڕشی تورکیدا لەدژی بیانیەکان سەلماند، لەکۆنگرەی سەرکردە نیشتمانیەکاندا کەبەسترا لەهەمان ئەوکاتەدا کۆنگرەی کەمالیەکان بەسترا بەناونیشانی- کۆنگرەی بەرگریکردن لەهەق- کۆنگرەی سەرکردە کوردیەکان بڕیاری هاوسۆزی لەگەڵ بزوتنەوەی کەمالیزم و هاوکاری و هاریکاریکردنی توندوتۆڵ لەگەڵ بزوتنەوەی نەتەوەیی ڕزگاریخوازی گەلی تورکی دا، وەك وەفایەکیش بۆ بەڵێنامەکانی کۆنگرەکە برکی چەکدارانی کوردی بەشی بنچینەیی پێکهێنا لەسوپای تورکی لەکاتی جەنگانی لەدژی ئینگلیزو فەرەنسیەکان و یۆنانیەکان و داگیرکەران- زیاتر لەوەش سەرکردە تورکیەکان خۆیان و لەناویشیاندا مستەفا کەمال پاشا و عیصمەت پاشا ئینۆنۆ و فەتحی بەگ و حسێن عەونی بەگ ئاماژەیان بەڕۆڵی شەرەفمەندانەی کوردەکان کردووە لەڕزگارکردنی تورکیاداو ئەمەی دواییان لەوتارێکیدا لەئەنجومەنی نیشتمانی تورکیادا دەڵێت:- مافی قسەکردن لەسەر ئەم مینبەرە بۆ هەردوو نەتەوەی تورکی و کوردییە- هەرچی سەرکردەی بزوتنەوەی نەتەوەیی تورکی مستەفا کەمال پاشا خۆیە ئەوا بەڵێنی بەگەلی کوردیدا کە حوکمێکی زاتی پێبدات لەکورستان پانتاییەکەی زۆر فراوانتر بێت لەوەی کە پەیماننامەی سیڤەر دیاری کردبوو، کەلە ١٠- ئۆگۆستس-١٩٢٠ لەلایەن هاوپەیمانانەوە ئیمزاکرا دوای کۆششێکی زۆر کە شاندی کوردی بەسەرۆکایەتی ژەنراڵ شەریف پاشا دای کە نوێنەرایەتی- کۆمەڵەی تەعالی کورد- و ، کۆمەڵەی

---

[151] - لە ئەترۆحەکەی دکتۆر شەمزینیەوە وەرگیراوە.

سەربەخۆیی کوردستان، کۆمەڵەی پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکان و، هەموو ڕێکخراوە کوردیەکان و هەروەها شێخ مەحمودو سەرۆکە کوردەکانی تری عێراق[١٠٠] کرد، دوای ڕێکەوتنی شەریف پاشا لەگەڵ بۆگس پاشای سەرۆکی وەفدی ئەرمەنی لەپاریس و پێشکەشکردنی یاداشتێکی هاوبەش لەیەکی ئازاری ١٩٢٠ دا بۆ ئەنجومەنی باڵای هاوپەیمانان کەرێکەوتنەکەیانیان تێدا دانابوو، هاوپەیمانان ڕەزامەندنیان لەسەر پەیماننامەی سیڤەر نیشاندا.

داگیرکەری بەریتانی هۆکاری سەرەکی یەکەم بوو لەتووشکردنی گەلی کورد بەدابەشکردنی و بەکۆیلەکردنی وڵاتەکەی کوردستان و زەوتکردنی هەموو مافە نەتەوەییەکانی، کە ئەگەر داگیرکەری بەریتانی نەبوایە ئەوا گەلی کوردی دەیتوانی کوردستانی نیشتمانی رزگاربکات کە بەشە باشوریەکەی لەژێر دەسەڵاتی هیچ کەسێکدا نەبوو، وە خاوەنی هێزێکی چەکداری پێویست بوو بۆ ڕێگرتن لەهەر لایەنێکی تر لەوەی دەسەڵاتی خۆی بەسەردا بسەپێنێت، واتە ئەگەر داگیرکەری بەریتانی نەبوایە ئەوا چارەسەرێکی دادپەروەرانە بۆ مەسەلەی کورد دەدۆزرایەوە.

بەوشێوەیە دەبینین کەمەسەلەی کورد داگیرکەری بەریتانی دروستی نەکردوە، بەڵکو ئاڵۆزی کردەوە و ئاستەنگی لەبەردەم چارەسەرکردنیدا داناوە، دژایەتی هێزە تێکۆشەرەکانی کردووە کە وویستویانە چارەسەرێکی دادپەروەرانەی بۆ بدۆزنەوە.

---

[١٠٠]- مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەیادداشتەکانیدا باس لەوە دەکات پێش پێکهێنانی وەفدی کوردی، هەوڵی کوردی -عوسمانی هاوبەش هەبووە بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ مەسەلەی کوردی لەچوارچێوەی تورکیادا هەر بۆیە بڕیاردرا لیژنەیەك بە سەرۆکایەتی شێخی ئیسلام ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەریی و ئەندامێتی میرئەمین عالی بەدرخان و شێخ عەبدولقادری گەیلانی ئەندامی ئەنجومەنی ئەعیان پێکبهێنرێت و لیژنەکە گەیشتە:

١- دانان بەمافی سەربەخۆیی زاتی بۆ کوردستان لەناو کۆمەڵەی عوسمانیدا.

٢- دەستکردن بەگرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویستی خێرا بۆ هێنانە بوونی کوردستانێك کەخاوەن حوکمێکی زاتی بێت. بەڵام وەزارەتەکەی فەرید پاشا ڕەتیکردەوە ئەم بەندانە جێبەجێ بکات ئەمەش کۆمەڵە نیشتمانیە کوردییەکانی ناچارکرد وەفدێکی کوردی بنێرن بۆ پاریس هەروەك مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەیادداشتەکانیدا لەلاپەڕە ١٩٥-١٩٦ باسی دەکات.

مەسەلەی کورد پێش بوونی سەربازی بەریتانیی لەخۆرهەلات ئەم بوونی هەبووە لەناویشدا عێراق و کوردستان، بەو پێیەی مەسەلەیەکە بەشێوەیەکی مێژوویی دروست بووە وەك ئەوەی پێشتر لەم کتێبەدا خرایەڕوو. خەباتی شۆڕشگێڕیی کوردیش بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی و تێیدا چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردی چارەسەرێکی دادپەروەرانە بوونی هەبووە پێش سەدەیەك لەبوونی سەربازی بەریتانی لەعێراق و کوردستان رەنگیشە سەرهەڵدانی شۆڕشی کوردی لەدژی داگیرکەری بەریتانی کەهەمیشە هێزی سەرەکی بووە لەسەرکوتکردنیدا هەر لەوکاتەوەی کەهاتۆتە ناو عێراق هەتا دەرکردنی رەنگە لەوەدا بەڵگەی تەواو هەبێت لەسەر درۆ و دەلەسەکانی شۆفێنیزمی فارسی و تورکی و سەلماندنی بڕەرو ڕوون لەسەر دوژمنایەتی بەریتانیای داگیرکەر دژ بەگەڵی کوردی و بزوتنەو رزگاریخوازەکەی و هەوڵە جۆراوجۆرەکانی بۆ رزگارکردنی کورستان و بەهرەداربوون لەمافی چارەی خۆنوسین، گوندە وێران بووەکان بەبۆردومانی هێزی ئاسمانی بەریتانی و، گۆڕەکانی شەهیدانی گەلی کوردی کەداگیرکەری بەریتانی کوشتنی و مانەوەی کوردستانێکی دابەش بوو بێ بەش لەهەموو مافە نەتەوەییە جۆراوجۆرەکان لەڕووی ئابوریی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریەوە بەڵگەی زیندوون لەسەر حەقیقەتی سیاسەتی بەریتانیا لەبەرامبەر مەسەلەی کورددا.

بەڵام بەریتانیا هەوڵیداوە و هەوڵدەدات و لەئاییندەشدا بەردەوام دەبێت، وەك وڵاتە داگیرکەرەکانی تر، سود لە هەموو کێشە و مەسەلەکانی نێوان نەتەوەکان و حکومەتەکان وەربگرێت بۆ پیادەکردنی بەرژەوەندیەکانی و تێپەڕاندنی پیلانە داگیرکەریەکانی ئەمە لەکاتێکدا مەسەلەی گەلان لەدژی داگیرکەران و رێگە بەڕووی هەوڵەکانیدا پێویستە بەپێی بنەماکانی مافی چارەی خۆنوسین و برایەتی و بەرژەوەندیە هاوبەشەکانی گەلان بێت.

## ئەو دەقانەی پەیوەستن بەگەلی کوردیەوە
## لە پە یماننـامەی سیڤەردا.

لەبەشی سێیەم و لەژێر ناونیشانی کوردستاندا بڕیار لەسەر ئەم بەندانەی خوارەوە درا:

بەندی٦٢- لیژنەیەك ئامادە دەکرێت کە ناوەندەکەی لەقوستەنتینیە بێت پێکاتبێت لەسێ ئەندام هەریەکەیان یەکێك لەسێ حکومەتەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتالی دایاندەنێت، ئەمە لەماوەی شەش مانگدا لەمێژووی جێبەجێکردنی پەیماننامەی سەربەخۆیی زاتیەوە، ئەمە سەبارەت بەو ناوچانەی رەگەزی کوردیان تێدا نیشتەجێیە، کە پێکهاتووە لەخۆرهەلاتی فورات و پێشەوەی سنوری باشوری ئەرمینیا هەروەك چۆن دەکرێت دواتر دیاری بکرێت، سنوری تورکیش لەگەلْ سوریاو عێراقدا بەپێی ئەو وەسفە دەبێت کە لەهەردوو دەقی دووەم و سێیەمدا لەبڕگەی دووەم لەبەندی ژمارە ٢٧ دیاریکراوە... بەلاّم لەحالەتی رێکنەکەوتن لەسەر هەر بابەتێك ئەوا بەئاگاداری هەریەك لە ئەندامەکانی لیژنەکە رەوانەی حکومەتەکانیان دەکرێت، پێویستیشە ئەم پرۆژەیە گرەنتی پێویستی هەبێت بۆ پاراستنی کلدانەکان و ئاشوریەکان و کەمینەکانی تر چ رەگەزی و چ ئاینی بن لەو ناوچانەدا.

بۆ ئەم مەبەستەش لیژنەیەك لەنوێنەرانی بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیاو عەجەم و کورد سەردانی ناوچەکان دەکەن بۆ پێشکنین و نەخشەسازیەکان، ئەگەر وابینرا پێویستە لەسەر سنوری تورکیا بەئەنجام بگەیەنرێت ئەوا بەپێی دەقەکانی ئەم پەیماننامەیە ئەو سنورەی باسکراوە لەگەلْ سنوری عەجەمدا دەگونجێت.

بەندی ٦٣- حکومەتی عوسمانی بەلێن دەدات هەر لەئەمڕۆوە کەبڕیارەکانی هەردوو لیژنەی کۆمسیۆن کەلەبەندی ٦٢دا باسیان کراوە قەبولْ بکات و جێبەجێیان بکات لەماوەی سێ رۆژدا لەبەرواری ئەو ئاگادارکردنەوەوە.

بەندی ٦٤- ئەگەر لەماوەی سالێکدا لەبەرواری جێبەجێکردنی ئەم پەیماننامەیەوە گەلی کورد کە لەو ناوچانەدا نیشتەجێیە لەبەندی ٦٢ی کۆمەلەی گەلاندا دیاریکراوە کە زۆرینەی گەلی ئەم ناوچانە ئارەزوی ئەوە دەکەن سەربەخۆبن لەتورکیادا، ئەگەر کۆمەلەی ناوبراویش زانی ئەم گەلە توانای سەبەخۆیی هەیە راسپاردە دەدات بەوەو

تورکیاش لەئێستادا بەڵێن دەدات کار بەو راسپاردەیە بکات و سازش دەکات لەهەموو مافەکانی و ئیمتیازەکانی لەم ناوچانەداو، وردەکاریەکانی ئەم سازشەش بەپێی رێکەوتنێکی تایبەت دەبێت کەلەنێوان گرنگترین ولاّتانی هاوپەیمان و تورکیادا دەبەسترێت. لەکاتی روودانی سازشیشدا و کاتێك کە رووو دەدات لەلایەن ولاّتانی هاوپەیمانەوە کەناویان هێنرا هیچ نارەزاییەك بەرز ناکرێتەوە بەرامبەر بەکوردەکان کە لەبەشێك لەکوردستاندا نیشەجێن و ئەمرۆ دەکەوێتە ویلایەتی موصڵەوە ئەگەر بەئیرادەی تەواوی خۆیان لەگەڵ حکومەتی سەربەخۆی کوردەکاندا یەکبگرن.

ئەمە بریتیە لە دەقەکانی پەیماننامەی سیڤەر کەپەیوەندی بەگەلی کوردی و کوردستانیەوە هەیە، کە مستەفا کەمال پاشا بەڵێنی پێدان بەحوکمێکی زاتی فراوانتر لێی. بەلاّم ئەم بەڵێنەی مستەفا کەمال پاشا هیچ نەبوو جگە لە مانۆرێکی فێلاّویی. مەبەستی بوو پێی لەبەرەی خۆرهەلاّتی دلّنیابێتەوە کاتێك لەبەرەی خۆرئاواوە دەجەنگێت، هەروەها پشتیوانی کوردەکان بەدەست بهێنێت شانبەشانی تورکەکان لەجەنگان، ئەوەش جێگەی داخە ئەم مانۆرە فێلاّویە بەسەر نیشتمانپەروەرە کوردەکاندا گوزەری کرد کەلەگەڵ کەمال پاشادا رێکەوتن و پشتیوانیان لێکرد بەبێ هیچ قەیدو مەرجێك یان رێکەوتنێکی پێش وەخت. هیواداریشم خوێنەر وا لێم تێنەگات کە من نارازیم یان هاوکاری کورد لەگەڵ بزوتنەوەی کەمالیزم لەداگیرکەر بەهەڵە دەزانم. نەخێر بەپێچەوانەوە من پێموایە ئەم هاوکاریە ئەرك بوو بەلاّم پێویست بوو لەسەر کوردەکان سەرکردەکانی خۆیان تەسلیم بەبزوتنەوەکە نەکەن بێ هیچ قەیدو مەرجێك بەڵکو پێویست بوو یەکگرتنی لەگەڵ کەمالیەکاندا یەکگرتنێکی تێکۆشانی بوایە دژ بە داگیرکەری هاوبەش و لەپێناو مافەکانی هەردوو گەلی تورکی و کوردیدا پێکەوە.

# هاوپه یمانان کوردەکان بێهۆش دەکەن

بەپێچەوانەوە وا پێویست بوو لەسەر کوردەکان سوود لەو ڕەوشانە وەربگرن کە هاتبوونە پێشەوە و حکومەتە نیشتمانیە سەربەخۆکەیان پێکبهێنن و ڕێگە نەدەن داگیرکەرانی ئینگلیز فێڵیان لێ بکەن و بێهۆشیان بکەن بە بەڵێنی درۆزنانەو چەواشەکارانەو ڕێگەیان لێبگرن لەجوڵان و شۆڕشکردن لەپێناو مافەکانیاندا وەك دکتۆر بلەچ شێرکۆ لەکتێبەکەیدا (مەسەلەی کورد) لەو بارەیەوە دەڵێت:

سەرۆکەکانی هاوپەیمانان لەپاریس جەختیان لەسەر ئەوە بۆ ژەنراڵ شەریف پاشا دەکردەوە کەسەرۆکی شاندی کوردی بوو لەکۆنگرەی ئاشتیدا کەپێویستە ئارامی و دانبەخۆداگرتن هەبێت بۆ ئەوەی هیواو ئاواتە نەتەوەییەکانی کوردی بەدیبێن و هەر هەوڵێکی مادیی بۆ تێکدانی ئارامیی ئەوا داواکارییە نیشتمانیەکان دەخەنە بەر مەترسیەوە هەروەها سەرکردەکانی هاوپەیمانان و نوێنەرە باڵاکانیان لەئیستانە هەمان ئاوازیان لێدەدا بۆ نوێنەرانی کۆمەڵە کوردیەکان.

هەروەك چۆن سەرکردەی هێزەکانی بەریتانی لەکوردستان لەوکاتەدا کە ژەنراڵ ماك ئەندرۆکان بوو بلاّوکراوەیەکی بەزمانی کوردی دابەش کرد کەئەمەی خوارەوەی تێدا هاتبوو:

–بەوپێەی چارەنوسی زەویەکانی عوسمانی کەزۆرینەی دانیشتوانەکەیان لەرەگەزی کوردن لەکۆنگرەی ئاشتیدا بڕیاری لەسەر دەدرێت و ئاواتە نەتەوەییەکانی کوردی و مافە سروشتیەکانی کوردو کوردستان بەدیدەهێنێت ئەوا لەم حاڵەتەدا پێویستە لەسەر کوردەکان پابەندی ئارامی و هێمنی بن و دڵنیابن لەدادپەروەری ئینگلتەرا کەپارێزگاری لەمافەکانی کوردەکان دەکات.. لەحەڵەبیش برکادێر– عەمید– بیل سەرۆکی هەواڵگری ئینگلیزی ڕێگریی لەبلاّوکراوەیەکی کوردی کرد کە داوا لەکوردەکان دەکات بەئاگاو وریابن کاری کرداریی بکەن بۆ بەدیهێنانی حوکمی زاتی و سەربەخۆیی بێ پشت بەستن بە بەڵێنەکان و، بەسکرتێری کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستانیش دکتۆر ثریا بەدرخان وترا کە مەزنترین خزمەتێك پێشکەش بکات بەگەلی کوردی بریتیە لە داواکردنی بۆ ئارامی و ئۆقرەگرتن.

زیاتر لەوەش کاتێك هۆشیارانی کورد ئەوانەی کە بەئاگابوون لەفێڵ و فریوەکانی دوژمنان لەچیاکانی (کاخته) کۆبوونەوە بۆ ئەوەی هێزێکی چەکداری رێکبخەن بەئامانجی دروستکردنی سوپایەکی کوردی بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی چاوەڕوانکراوی کەمالی ئەم بریکاردێر–بیل–ە مێجەر نۆئیلی نارد بۆ لای نوێنەرە کوردەکان بۆ ئەوەی بەناوی حکومەتی بەریتانیاوە داوایان لێبکات پێویستە یەکسەر هێزە کوردیەکان بلاوە پێ بکرێن.

لەقۆناغێکی دیاریکراودا –سەرەتای روخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دەرکەوتنی بزوتنەوەی کەمالیزم، داگیرکەری بەریتانی هەوڵی دەدا پشتیوانی خەلیفە بکات دژ بە مستەفا کەمال و هانی کوردەکان بدات بۆ ئەوەی پشتی خەلیفە بگرن و رێی لێدەگرتن لەهەستان بەهەر کارێك تەنها بەهاوکاری نەبێت لەگەڵ دەسەلاتە لاوازەکانی خەلیفەدا.

هەربۆیە نوێنەری بالای بەریتانی لەبروسکەیەکدا بەژمارە ١٤٣٧ کە ئاراستەی وەزارەتی دەرەوە کراوە لە لەندەن لەبەرواری ١٠,١١ی تەمموزی ١٩١٩ دوای ئاماژەکردنی بۆ داخستنی یانەی کورد لەدیاربەکر لەلایەن دەسەلاتدارانەوە دەلێت[١٥٦] :– وادیارە سەرکردە کوردیەکان زۆر نیگەرانن بەهۆی چالاکیەکانی مستەفا کەمالەوە.. لەحاڵەتی هەستانیان بەهەر کارێك دژی مستەفا کەمال دەیانەوێت بزانن کەئایا نوێنەری بالای بەریتانی چاو لەکارەکانیان دەپۆشێت. پێیان بلێ... پێویستە هیچ رێوشوێنێك لەدژی مستەفا کەمال وەرنەگرن تەنها بەهاوکاری نەبێت لەگەڵ دەسەلاتدارە کوردیەکاندا کەهەن و دانپێدانراون... هەموو ئەوە رونی دەکاتەوە کە چۆن داگیرکەری بەریتانی ئاستەنگی لەبەردەم هەوڵ و کۆششەکانی نیشتمانپەروەرە کوردەکان دروستکردو رێگری دەکردن لەهەستان بەچالاکیەکی کرداریی بۆ بەدیهاتنی ئامانجە نەتەوەییەکانیان.

بەلام دادپەروەریی بەریتانی کە ژەنراڵ ماك ئەندرۆی بەریتانی بەڵێنیدا مافەکانی کورد دەپارێزێت، ئەوا گەلی کوردی حەقیقەتەکەی وەك خۆی بینی، کە پێکهاتبوو لەزوڵمێکی

---

[١٥٦] –لاپەرە ٢٤ لەکتێبی ئەندازیار صەلاحەدین سەعدوڵلا– کوردستان و بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی – چاپە عەرەبیە یەکەمەکە.

داگیرکەری و دوژمنکاریی چەکداری و غەدرو فێڵ و فریودان و لەناوبردنی مافەکانی گەلی کوردی و دابەشکردنی کوردستان. بەڵێ گەلی کوردی دادپەروەری ئینگلتەرای بینی بەشێوەی بۆمبی تەوقیتکراو و سوتێنەرو وێرانکەر کە فڕۆکە بەریتانیەکان بەسەر شارەکان و گوندەکانی کوردستانی ئارامدا دەیانخستە خوارەوە بۆ ئەوەی منداڵان و ژنان بکوژێت.

## هەڵگیرسانی شۆڕشی کوردی

دادپەروەری ئینگلتەرا کە نیشتمانپەروەرە کوردەکانی بێهۆشکردو ڕێگریی کردن لەبەدیهاتنی ئامانجەکانیان بەکاری شۆڕشگێڕانەی کاریگەر هەمان ئەوەیە کە دواتر غەدری لێکردن کاتێك کە بەریتانیا لەگەڵ مستەفا کەمال لەپەیماننامەی لۆزاندا ڕێکەوتن بەمشێوەیە لەبەردەم کوردەکانداو دوای ئەوەی هاوپەیمانان و کەمالیەکان پێکەوە لەخشتەیان بردن وفریویاندان هیچ ڕێگەیەك نەمایەوە جگە لەڕێگەی تێکۆشانی شۆڕشگێڕانە نەبێت...دوای ئەوەی کە هەلێکی زۆر بەنرخیان لەدەست چوو. ئەم ڕێگایە کە تاکە ڕێگاو ڕاسترین بوو بۆ بەدەستهێنانی مافەکان، نیشتمانپەروەرە کوردەکان زانیان چیان لەکیس چووە کە دەبوو پێش چەندساڵێك بیانزانیایە، بۆیە دەستیان کردەوە بەرێکخستنەوەی ریزەکانیان و کۆکردنەوەی هێزەکانیان و خۆئامادەکردن بۆ شۆڕش و ڕێکخراوە کوردەکان گرتنەبەری پلانەکانی شۆڕش و سازکردنیان لەساڵی ١٩٢٥ دا دایە ژەنراڵ خالید جوبرائیلیی – کەدواتر تورکەکان لەسێدارەیاندا– ئەمیش دەستیکرد بەدابەشکردنی هێزەکانان و سەرکردەکان، بڕیاریدا کە دەستکردن بەشۆڕشێکی گشتگیر لەبەیانی ڕۆژی نەورۆز ٢١ مارتی ١٩٢٥ز بێت بۆ ئەوەی نەوەکانی کاوەی ئاسنگەری پاڵەوانی کوردی ئەفسانەیی کە دەوترێت پێشەوایەتی شۆڕشێکی میللی کردووە لەهەمان ئەم ڕۆژەدا، بۆ ئەوەی شکۆمەندی شۆڕشگێڕیان بەجوانترین و نایاب ترین شێوە بگێڕنەوەو وای لێ بکات لەئاستی سەردەم و ئەرکەکان و هێواکاندا

بێت، بەڵام ئەوە رویدا کە هێزێکی تورکی چوونە ناو گوندی (پیران)ەوە بارەگای شێخ سەعیدی لێبوو دیارترین سەرکردەکانی ئەو شۆڕشە بوو کەوا پلانی بۆ دانرابوو، لایەنگرەکانی وایانزانی بۆ ئەوە هاتوون شێخ دەستگیر بکەن بۆیە جەنگێك لەنێوان هەردوولادا رویداو بووە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕش لە ۷/مارتدا پێش وادەی دیاریکراو بەدوو هەفتە، ژەنراڵ خالیدو زۆربەی ئەفسەرەکان ئەوانەی رۆڵی سەرکردایەتی شۆڕشی چەکداریان پێ درابوو لەدەرەوەی ناوچەکانی شۆڕشەکەوە بوون و دەسەلأتدارانی تورکی زۆربەیانی دەستگیرکردو بەبێ دادگایکردن کوشتنی. دکتۆر بلەچ شێرکۆ لەسەر ئەمە دەڵێت: " سەرەڕای ئەوەی کە ئەم شۆڕشە پێش کاتی دیاریکراوی خۆی تەقیەوە، بێبەشکرا لەدەستی ئەوانەی رێکیانخستبوو وە لەسەرکردە شارەزاکانی لەبواری هونەرەکانی جەنگیداو نهێنیەکانی شۆڕشەکاندا ئەوا لەماوەیەکی زۆر کەمدا تەشەنەی کردوو بلأبۆوە، بۆ پانتاییەکی فراوان کە زۆربەی ئەو ناوچە کوردیانەی دەگرتەوە کەلەژێر دەسەلأتی تورکیدا بوون. هەروەها دکتۆر بلەچ شێرکۆ رەخنە لە شێوازە جەنگیە ستراتیژیەکان دەگرێت کەوا شۆڕشگێڕە کوردیەکان گرتیانەبەر لەو شۆڕشەداو دەڵێت: " شۆڕشگێڕە کوردەکان لەم شۆڕشەدا کاتە بەنرخەکانیان لەدەستدا بەرشتنی خوێنی پاکی خۆیان لەپێناو دەستگرتن بەسەر شارە گەورەکان و قایمکراوەکاندا، چونکە پێیان وابوو سەرکەوتن بەسەر حکومەتی تورکیدا بێ ئەوە نابێت ئەمە لەکاتێکدا تورکەکان پێشڕەویان بەسوپاکان دەکرد لەهەموو بەرەکانەوە بۆ کوردستان و تەنها بەفرقەکانی هێزە تورکیەکان وازیان نەهێنا لەبەرەکانی  سیواسی و ئەرزەڕۆم و کەنارەکانی دەریای ڕەش بەڵکو هەڵمەتێکی بەهێزیان نارد کەپێکهاتبوو لە بیست و پێنج هەزار سەرباز لەرێگەی هێڵی ئاسنی سوریەوە لەرێگەی حەڵەبەوە ئەمەشە بریتیە لەهۆکارگەلێکی مەعقول بۆ پاساودانی رەخنەکانی دکتۆر بلەج شێرکۆ، هەروەها لەهۆکارەکانی ئاسانکردنی کارەکانی تورکەکان بوو لەداپلۆسینەوەی شۆڕشدا ئەگەرچی بۆ ماوەیەکیش بێت. تورکە کەمالیەکان بەتوندترین و دڕندانەترین شێوە ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانەی کوردیان لەناوبردو دامرکاندەوەو هەڵمەتێکی پاکتاوکردنی بەربەریان لەدژی گەلی کوردی و بۆ لەناوبردنی نیشتمانەکەیان رێکخست.

ئارمسترۆنگ لەکتێبەکەیدا مستەفا کەمال: گورگی بۆر دەڵێت[157]: ئاگرو شمشێر لەکوردستاندا کەوتنەگەڕ هەتا بووە چۆڵەوانی- پیاوەکانیان دوای ئەشکەنجەدان کوشت و گوندەکان سوتێنران و کێڵگەکان وێران بوون و ئابڕو شەرەفی ژنان و منالاّن پێشێلکران و پاشان سەربڕان... تورکەکانی مستەفا کەمال کوردەکانیان سەربڕی، بەهەمان رەقی و ئەو دڕندایەتیەی کەوا تورکەکانی سوڵتانی بەکاریان هێنا کاتێك کەوا یۆنانیەکان و ئەرمەنیەکان و بولگاریەکانیان سەردەبڕی، مستەفا کەمال دادگایەکەی سەربازی دانا ناوی لێنا دادگاکانی ئیستیقلال کوردەکانی کوشت و بەهەزارانیانی خستە زیندانەوەو زۆرێکیشی ئەشکەنجەدان- سەرژمێرییە بەراییەکان ئاماژەیان بەوەداوە کەوا هێزەکانی تورکیا زیاتر لە ٨٧٥٨ خانوویان روخاندو ٢٠٦ گوندی کوردیان وێرانکردو نزیکەی نیو ملیۆن کوردیان کوشت.. کەمالیەکان ئامرازی ترسناك و تۆقێنەریان بەکارهێنا لەکوشتن و ئەشکەنجەداندا، با گوێ لەتێکۆشەری پێشکەوتنخوازی تورکی- س. وستون کول بگرین لە یادداشتەکانیدا لەبارەی تاوانە دزێوەکانەوە کەلەدژی کوردەکان ئەنجامدرا ئەم نیشتمانپەروەر تورکیە دەڵێت[158] برك و مەفرەزە چەکداریەکان بەدرێژیی و پانیی ولاّتدا گەڕان، ئەوکات من زیندانی بووم لەگەڵ شیوعیەکانی تردا لەیەکێك لە قەلاّکاندا رۆژانە چەندین کۆمەڵ لەکوردە زیندانینەکان دەبران و بەگوللە دەکوژران لەکەنگەلاّنێك لای دیجلەوە، ژەندرمە تورکەکان لەزینداندا بازرگانیان بەپشتێنی ئاوریشمینی کوردە لەسێدارەدراوەکانەوە دەکرد. زۆرباش لەیادمە رۆژێکیان هاتن بۆ ژورەکەی بەرامبەری ژوورەکەم و کوردێکی لاوی تەمەن نزیك بیست ساڵیان هێنا دەیانووت کەچەند ئەفسەرێکی تورکی کوشتووە لەکاتی پێکدادانیدا بەبڕکە تورکیەکاندا، ژەندرمەکان زۆر ئەشکەنجەیان داو بۆ ماوەی چەندین رۆژ ئەوان بە دەرزی تفەنگەکانیان داخیان دەکرد بەلاّم نەیانتوانی یەك ووشەی لێ دەربێنن. جەستەی ئەم لاوە کوردە بووە پارچەیەك لەبرینی سوتاو و بەزۆری کرم تێیدان. ئەم لاوە کوردە

---

[157] - لاپەرە ٩١ لەکتێبەکەیدا (قاسم والاکراد- خناجر وجبال) دانەرەکەی ئەحمەد نوری- چاپە عەرەبیە یەکەمەکە.

[158] -لەئەتروحەکەی دکتور شەمزینیەوە وەرگیراوە.

بوێره لەتوندی ئازارەکانی بۆ ماوەی چەندین رۆژ خۆی دەگەستەوەو بەلێبڕان و توانایەکی لەڕادەبەدەرەوە ڕووبەڕووی مردن بۆوە و بە بەردەوامی و بێدابڕان یەك ووشەی دووبارە دەکردەوە ئەویش ووشەی : تۆڵە... تۆڵە...تۆڵە بوو...هتد.

ئەمە یەك نمونەیە لەو هەڵمەتەی کەتووشی نیشتمانپەروەرە کوردەکان هات دوای ئەم ڕاپەڕینە کەبەهەزاران کەس لەباشترین ڕۆڵەکانی گەلی کوردی و سەرکردەکانی بوونە قوربانیی.. لە ١٢-نیسان- ١٩٢٥دا سەرکردەکانی کۆمەڵەی- تەعالی کوردستان- دەستگیرکران لەوانەش سەرۆکی کۆمەڵەکە شەهیدی نیشتمانپەروەر عەبدولقادر دکتۆر فوئاد و پارێزەر محمد تۆفیق و پارێزەر -حاجی ئاختی و ئەوانی تر. دوای دادگاییەکی شۆڕشی دادگای سەربازی بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ ٩١ ئەندامی کۆمەڵەکە دەرکرد لە ٢٧-مایس-١٩٢٥ و هەموویان یەکسەر لەو گۆڕەپانەدا لەسێدارەدران کەدەکەوێتە بەردەم مزگەوتی گەورەی دیاربەکر-ئامەدە-وە.

لە ٧ حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥دا دادگا بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ ژمارەیەکی تر دەرکرد کە ژمارەیان ٤٧ نیشتمانپەروەر بوون و بڕیارەکەش جێبەجێکرا، کەلەناویاندا شێخ سەعیدو حاجی خالید و ژەنراڵ ئیسماعیل و یوزباشی فەخری هەبوون وە لە ٢٨ حوزەیران ١٩٢٥دا دادگا بڕیاری لەسێدارەدانی بەسەر وەجبەی سێیەمدا دا کە ژمارەیان ٩٣ نیشتمانپەروەری کورد بوون و یەکسەر سزاکە بەسەریاندا جێبەجێکرا لەهەمان گۆڕەپاندا لەبەردەم مزگەوتی گەورە لەدیاربەکر.

جەواهیر لال نەهرۆ لەبارەی ئەم قەسابخانەوە بۆ ئەندێرای کچی نوسیوە- دوای ئەوەی کەمال پاشا بێ رەحمانە کەوتە لەناوبردنی کوردەکان و دادگاکانی ئیستیقلالی تایبەتی دانا بۆ دادگاییکردنیان و هەردوو سەرکردەی کورد شێخ سەعیدو دکتۆر فوئاد و ئەوانەتی تر لەسێدارەدران ئەوانەی کە مردن و لەسەر لێوەکانیان ئاواتی سەربەخۆیی کوردستان هەبوو- بۆ پاساودانی ئەم قەسابخانانەو ژەهراویکردنی مێشکی لاوە تورکەکان و شێواندنی ڕای گشتی تورکی، پڕوپاگەندەی تۆرانیەت کەوتە نەفیکردنی ئەوەی کەلەبنچینەدا نەتەوەی کوردی بوونی هەبێت، بەکوردەکان دەوترا- تورکە شاخاویەکان- زیاتر لەوەش ئەم پڕوپاگەندەیە مۆرکێکی دەستوری وەرگرت کاتێك

کەلەمادەی ٨٨ لەدەستوری تورکیدا بەڕاشکاوانە دەڵێت هەموو دانیشتوانی تورکیا- بەچاوپۆشین لەئاینەکانیان و نەتەوەکانیان تورکن.

ڕۆژنامەگەریی تورکیش ڕاڤەی ئەم مادەیەی کردو بەدەستەواژەیەکی ڕاشکاوانە ووتی: پێویستە لەسەر نامۆکان- غەیرە تورکەکان- یان ئەوەتا لەگەڵ ڕەوتی تورکیزمدا تێکەڵ بن یان بمرن.. لەگەڵ ئەم ستەم و دوژمنکارییە تۆرانیەدا نەتەوەی کوردی زیندومایەوە ئەگەرچی بریندارە، لەبەرئەوەی وەك بونەوەرێکی مێژوویی مەحاڵە بەزەبرو زەنگ و کوشتن لەناوببرێت. لەساڵی ١٩٢٧دا شۆڕشی نیشتمانی کوردی دوای دروستبوونی حزبی خۆیی بوون سەریهەڵدایەوەو یەکەم جار لەچیاکانی ئاراراتەوە بەسەرکردایەتی ژەنراڵ ئیحسان نوری پاشاو سەرپەرشتی حزبی خۆیبوون و ئەم شۆڕشە بەردەوام بوو تاساڵی ١٩٣١ز و ئەوکاتەی کە هێزەکانی تورکیا توانیان شۆڕشگێڕە کوردەکان ناچاربکەن پەنابەرنە بەرئێران دوای ئەوەی کەرەستە خۆراکیەکان و چەك و تفاقی جەنگیان لێبڕا.

جارێکی تر لەکوردستاندا هەموو جۆرەکانی چەکی جەنگی نوێی ترسناك و لەناوبەریان تاقیکردەوە لە دامرکاندنەوەی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیی.. تۆپ و فڕۆکەکان هێزە کوردیەکانیان تەفروتوناکرد. برك ومەڕومالآتەکانیان تالآنکران و دانیشتوانەکان سڕانەوە بێ جیاکردنەوە لەنێوان جەنگاوەرێکی چەکدارو منالێکی بچووك و پیرە ژنێکدا. تۆرانیەکان تاوانەکانی کوشتنی بەکۆمەڵیان ئەنجامداو بەسەدان گوندیان سوتاندو لەناوچەی نزیك بەچیاکانی ئاکرێ ٢٢٠ گوندی کوردیان وێرانکردو پاشماوەی دانیشتوانەکانی ئەم گوندانەیان لەدۆڵی -زیلان- کۆکردەوەو نزیکەی دەهەزار ژن و منالَ و کچ و پیرو لاو دایاننە بەر ئاگری فڕۆکەکان و تۆپەکانیان و بەوەش ئەو خەڵکانە سوتان و بەدزێوترین شێواز جینۆسایدکران. لەناوچەی -وان-یش حکومەتی تورکی نزیکەی سەد لەڕۆشنبیرانی کوردی قۆڵبەست کردو قاچیانی شەتەك داو خستنیە قوڵآیی دەریاچەی -وان- بۆ ئەوەی بەزیندویی تێیدا بخنکێن. لەنزیکەی چیای (تندرك) نزیکەی چوارسەد گوندی کوردیان وێرانکرد- لەویلایەتی وان-یش هێزەکانی تورکیا کەوا کمال سامی پاشا سەرکردایەتیان دەکرد دایان بەسەر چاڵدێراندا، ٨٣ گوندیان

وێرانکرد ٥٩٠ کەسیان کوشت، بەپێی سەرژمێرییەك کە ڕۆژنامەی (الاحوال)ی بەیروتی بلآویکردەوە لە ١٣ ئابی-١٩٣٠دا ئەم قەسابخانەیەو جینۆسایدە هەستی مرۆیی لای عەرەب و تورك و فارسە نیشتمانپەروەرەکان وروژاندو ئیدانەیان کرد، هەروەها ئەوەی زانی پێی وروژاو دەنگی خەڵکانی خێرخواز و مرۆڤ دۆست لە ئەورووپاو خۆرهەلآتدا لەدژی بەرزبۆوە.

لیژنەی جێبەجێکردنی نوسینگەی کرێکارانی سۆشیالیستی نێودەوڵەتی لەزوریخ لە ٣١- ئاب- ١٩٣٠دا بڕیارێکی نارەزایی دەرکرد لێرەدا بلآویدەکەینەوە وەك ئەوەی کەلەڕۆژنامەی ئەهرامدا لەبەرواری ٩- سێپتەمبەر-١٩٣٠دا هاتووە.

## کوردو نوسینگەی کاری سۆشیالیزمی نێودەوڵەتی

لیژنەی تەنفیزی نوسینگەی کاری سۆشیالیزمی نێودەوڵەتی لەزوریخ لە ٣٠- ئۆگۆستسی-١٩٣٠دا کۆبۆوە ئەم بڕیارەی دەرکرد- لیژنەی تەنفیزی نوسینگەی کاری سۆشیالیستی نێودەوڵەتی سەرنجی جیهان بۆ ئەو کوشتارگانە رادەکێشێت کە حکومەتی تورکی پێی هەڵدەستێت نەك تەنها دژ بەو کوردانەی خەبات دەکەن لەپێناو سەربەخۆییاندا بەڵکو دژ بە گەلی کوردی بێ چەك و بێوەی ئەنجامی دەدات بەوەش تورکەکان دەیانەوێت کوردەکان لەسەردەستیاندا ئەوەیان ڕووبەڕووبێتەوە کەڕوبەڕوی ئەرمەنەکان بۆوە ئەمە بێ ئەوەی ڕای گشتی لەوڵاتە زلهێزەکان نارەزایی دەربرێت لەدژی ئەو دڕندایەتیە...هەروەها لیژنەکە سەرنجی هەموو لایەك ڕادەکێشێت بۆ ئەو مەترسیە جدیانەی رەنگە هەڕەشە لەئاشتی بکەن بەپێشێلکردنی حورمەتی زەویە فارسیەکان لەلایەن سوپای تورکیاوە.. دەستەی تەنفیزیش داوا لەجیهان دەکات بۆ ئەوەی نارەزایی دەربرێت لەسەر ئەوەی کە لەکوردستاندا دەگوزەرێت لەڕووداوی خوێناوی کەوا گەلی کورد دەبنە قوربانی و بەلآم تۆرانیەکان بایەخیان بەڕای گشتی و بڕیاردان نەداو (داسو) پێشێلی هەموو بەهاو نەریتە مرۆییەکان و یاسا نێودەوڵەتیەکانیان کرد، بەمەبەستی لەناوبردنی گەلی کوردی و بزوتنەوە نیشتمانیەکەی بەلآم بەربەریتی تۆرانیی شکستی هێنا لە لەناوبردنی گەلی کوردیداو نەیتوانی وەرو

ئیرادەی شۆڕشگێڕانەی کوردەکان لەناوبەرێت لێرەدا ئەو ووتەیەی شەهیدی نیشتمان شێخ عەبدولقادر ئاماژە پێدەدەم کاتێك سەرکەوت بۆ سەر پەتی سێدارەو بەڕووی ستەمکارەکاندا نەڕاندی و ووتی[159]: "ئەی جەلادەکان شەرەفمەندین بچینە بەردەم پەتی سێدارە لەپێناو ئازادی نیشتمانەکەماندا. ئێوە بە لە سێدارەدانمان تەنها تورەیی گەلی کورد بەدەست دەهێنن و زیاتر ورەو ئیرادەی بەهێز دەکەن بۆ خەباتکردن لەپێناو ئازادی و سەربەخۆییدا، بژی کوردستان بژی خەباتی گەلی کوردی.

بەکردەوەش ڕووداوەکان ووتەکەی شەهید خالیدی دکتۆر فوئادی سەلماند کە چوو بەرەو پەتی سێدارە بۆ ئەوەی بەدەستی خۆی گوریسەکە بخاتە گەردنیەوە و هاواری بژی کوردستانی دا بەڕووی جەلادەکاندا.

–ئەی خوێنرێژەکان هەرگیز وامەزانن کە ڕمەکانی تورکی بەسەر مەسەلەی کورددا زاڵ دەبێت گەلی کورد بەعەزیمەت و پێداگرییەکی زیاترەوە خەبات دەکات و بەدڵنیایشەوە ئازادی و سەربەخۆیی خۆی بەدەست دەهێنێت.

بەڵام ئێوە ئەی خوێنرێژەکان هیچ قازانجێك ناکەن جگە لەتۆمارکردنێکی ڕەش نەبێت لەمێژوی خۆتاندا.

جارێکی تر هێزە شۆڕشگێڕە کوردیەکان کۆبونەوەو ریزەکانیان ڕێکخستەوەو بەردەوام بوون لەسەر ڕێنوێنی ووشەکانی شێخ سەعیدی پیران کە بەجەلادەکانی ووت: شەرەفمەندین بچینە بەر پەتی سێدارە بەهۆی خەباتمانەوە لەپێناو ڕزگارکردنی وڵاتەکەمان لەبەندایەتی ئێوە. خەباتمان ئەرکێکی نیشتمانی و بەشەرەفەوە بەجێمان گەیاندو ئەرکیشە لەسەر هەموو کوردێکی بەشەرەف خەبات بکات لەپێناو ڕزگارکردنی وڵاتەکەی کوردستانی زوڵملێکراو لەلایەن ئێوەوە کە زوڵم و ستەمەکەی بەرادەیەکە تەحەمول ناکرێت.

هێشتا چەند ساڵێکیش بەسەر شۆڕشی ئاراراتدا تێنەپەڕیبوو شۆڕشێك لەدەرسیمەوە لەساڵی ١٩٣٧دا هەڵگیرسا. ئەم شۆڕشە دوو ساڵ بەردەوام بوو بەگژ سوپای تورکی پڕچەك و پڕ تفاقی سەربازیدا چووەوە کەلەلایەن وڵاتە داگیرکەرەکانەوە پێیدرابوو.

---

[159] – ووتەی شەهیدە سەربەرزەکان کە لەئەتروحەکەی دکتۆر شەمزینیدا وەرگیراوە.

## شۆڕشی کوردی کۆماری کوردستانی دیموکراتی لەموکریان

## ١٩٤٥-١٩٤٧

ناوچەی موکریان لەکوردستانی خۆرهەلآت دەکەوێتە ناو ئیالەی رەزاییەوە-ئورمیە- ی ئێستا و ئیالیەی ئازربایجان حکومیی کە وەك موتەسەریفیەتێك وایە- موکریان ئەو ناوچەیەی کە هەر لەشۆڕشی شەمزینانەوە ناسرابوو بەرۆحیەتی شۆڕشگێڕیی. کاریگەریەکانی بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی تازە گەشەسەندو و دوای جەنگی جیهانی یەکەم و بەتایبەتی شۆڕشی یەکەم کە شێخ مەحمودی حەفید پێشەوایەتی کرد دیارو هەبوو لەموکریاندا. بەلآم دیکتاتۆریەتی ستەمکار هەناسەکانی خنکاندبوو هەروەها رێگاکانی پەرەسەندنی لەئاگایی و رێکخستندا بەستبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەڵقەی نیشتمانپەروەرە کوردەکان هەبوو نمونەی بەرێزان مەلا داودی و عەبدولرەحمان زەبیحی و حسێن فروهر، کەوا پێش جەنگ لەژێر ناوی ئازدایخوازی کوردستان- کاری دەکرد بایەخی دەدا بەئەدەب و هۆنراوەو بلآوکردنەوەی هۆشیاریی نیشتمانی لەنێوان ئەو کەسانەدا کەپشتی پێدەبەستن. سەرەڕای ئەو هێواش بوونەوەش کە تووشی چالاکی و کارکردنی ئەم کۆمەڵە بووەوە ئەوا وەك ئەڵقەیەکی چالاك مایەوە بەردەوام بوو بۆ خەبات لەچوارچێوەیەکی تەسکدا بەلآم بەئەرکێکی شۆڕشگێڕیی لەشاری مەهاباد- سابلآخ-ی پایتەختی ناوچەی موکریان.

## دامەزراندنی كۆمەڵەی ژ. ك ( كۆمەڵەی ژیانەوەی كوردستان )

كاتێك سوپاكانی هاوپەیمانان چوونە ناو ئێرانەوە لەساڵی ١٩٤١ و دەسەڵاتی ناوەندی روخا کەوا ناوچەو ئیالەتە جۆراجۆرە ئێرانیەکانی بەچنگێکی ئاسنین گرتبوو، چەمکی دیموکراتی دژ بەفاشیزم بڵاوبۆوە بەتایبەتی لەناوچەی داگیرکەری سۆڤیەتی کە ئەو کات سۆڤیەتەکان بیرۆکەکانی مافی گەلان لەدیاریکردنی چارەنووس بڵاودەکردەوەو قسەیان دەکرد لەبارەی جیهانێك کەداگیرکەری تێدا نەبێت و سۆزێکی قوڵیان بۆ گەلی کوردی دەردەبڕی لەناوچەی کوردستان(موکریان)دا کە لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بوو، ئەوکات هیواکان بوژانەوەو کوردەکان کاریگەربوون بەم چەمکانە کەوەڵامدەرەوەی خواست و هیواکانیان بوو. نیشتمانپەرەوەرە کوردەکان چالاك بوون بازنەی شۆڕشگێڕی نیشتمانی کەمابۆوە لەناو کۆمەڵەی ئازادیخوازی کوردستاندا کۆبوونەوە لەگۆڕەپانی کاری نیشتمانیدا. دوای پەیوەندیکردن بەحزبی هیواوە کەلەوکاتەدا لەعێراقدا کاری دەکرد لە ١٦ ئابی ١٩٤٢ نیشتمانپەروەرە کوردەکان بەئامادەبوونی رائد میرحاج ئەحمەد ئەندامی حزبی -هیوا-کوردی لەعێراق کۆبونەوەیەکیان لەباخچەی حاجی داود لەکەناری شاری مەهاباد بەست و کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستانیان دامەزراند کە بە (ژ.ك) ناسراو رێکەوتن لەسەر پەیرەوێك بۆ کۆمەڵەکەو سیاسەتی کارکردنی و سودوەرگرتن لەئەزمونەکانی حزبی هیوا، هەروەها بەیاننامەیەکیان پێشکەشکرد کە لەشوێنێکی تری ئەم کتێبەدا خراوەتەڕوو. کۆمەڵەی ژ. ك- دەستی بەچالاکیەکانی کردو گۆڤاری -نیشتمان- ی بەنهێنی دەرکرد. بۆ بڵاوکردنەوەی بیرۆکەکان و چەمکە نیشتمانیە کوردیەکان و بیرۆکە دیموکراسیەکان و دروشمەکان و هۆنراوە نەتەوەییە حەماسیەکان. کۆمەڵەکە بەخێرایی فراوان بوو چەندین لقی لێ کرایەوە و پەیوەندیەکانی لەگەڵ کوردەکانی تورکیاو عێراقدا پتەوکرد و نوێنەرێکی نارد بۆ عێراق کەئەویش بەرێز محمد ئەمین شەرەفی بوو دیدارێك سازکرا لەنێوان نوێنەری دەستەیەکی کوردی نیشتمانپەروەر لەتورکیا کەئەویش مەلا وەهاب و لەنێوان نوێنەری کۆمەڵەکەدا و پاشانیش سەرکردەکانی لەمەهاباد و لەدوای ئەم دیدارانەشەوە کۆبونەوەیەك سازکرا لەسەر سنوری ئێرانی تورکی عێراق لەسەر زەوی کوردستانی دابەشکراو لەنێوان ئەو

ولأتانەدا کەناونرا کۆبونەوەی – س ۳ سنور–[١٦٠] کە لەعێراقەوە شێخ عوبەیدوللا و لەلایەن کوردستانی تورکیاوە قازی مەلا وەهاب و لەئێرانیشەوە کۆمەڵەی ژ.ك بەرێز قاسم قادری بەشداریان کردبوو کە بڕیار درا هاوکاری و یارمەتی لەنێوان نیشتمانپەروەرە کوردەکاندا ئاڵوگۆڕ بکرێت.

پاشان ژ. ك لقێکی خۆی لەعێراق کردەوە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد سەرۆکایەتی دەکرد پێشتر هەروەها مامۆستا ئیسماعیل شاوەیسی لەگەڵ بەرێز عوسمان دانشدا ناردبوو بۆ مەهاباد بۆ پەیوەندیکردن بە سەرکردایەتی کۆمەڵەکەوەو پتەوکردنی پەیوەندیەکان. هەروەك چۆن لەکوردستانی تورکیاش لقێکی لێ دروست بوو بەلأم بەهێز نەبوو.

جەنگی جیهانی دووەم تازە خەریك بوو بار و بارەگای دەناوەیەك کۆمەڵەی ژ. ك بووە کۆمەڵەیەکی بەهێز کە تۆڕی رێکخستنەکانی هەموو ناوچەی موکریانی دەگرتەوەو خاوەن قەڵەمڕەویەکی بەهێز بوو لەڕیزەکانی گەلی کوردیداو ئامانجەکانی چۆڕپەست بوونەوە لەبەرپاکردنی حوکمێکی نیشتمانی دیموکراتی کوردی لەکوردستانی ئێرانداو بایەخدان بەئەدەب و زمان و رۆشنبیری کوردی و ئەنجامدانی چاکسازیە کۆمەلأیەتیە دیاریکراوەکان.

لەگەڵ ئەوەشدا کەوا کۆمەڵەکە جەماوەرەکەی و سەرکردکانی لەرۆڵەکانی جەماوەری کاسبکار بوو بەلأم کەمی ئاگایی و هۆشیاریی نیشتمانی و رۆشنبیری زانستی دیاربوو پێیەوە. ئەمەو کۆمەڵەکە تیرۆرێکی زانستی نەبوو یان تەبەنی نەکردبوو وە لەمبارەیەوە ئەزموندیدە نەبوو.

---

[١٦٠] – بگەڕێرەوە بۆ لاپەڕە ٣٦ لەکتێبی کۆمار ١٩٤٦– کوردی لە چاپە ئینگلیزیەکەی کە دانەرەکەی دبلۆماسی ئەمریکی بەرێز ولیەم ئایگلتنی کورە.

# ئەندامێتی شەهید قازی محەمەد

شــەهید قــازی محەمــەدی کــوڕی قــازی عــەلی کــوڕی قــازی قاسـم لــە بــەهێزترین کەسایەتیەکانی مهاباد بوو لە کۆمەڵـەی (ژ. ک)دا لەسـەرەتایەوە بـەڵام کەسایەتیەکەی بــەرێز بــوو لەســەر ئاســتی گــشتیدا، پەیوەندیــەکی تونــدو پتــەو بــە بەرپرســە سۆڤیەتیەکانەوە دەیبەستەوە ئەوانەی لەمدا کەسایەتیەکی رۆشنبیریان دەبینیـەوە کـە زمانی روسیی و فارسی و ئازربایجانی و عـەرەبی دەزانـی- وە خـاوەن قەڵەمرەوییـەکی میللی و لەهەڵگرانی بیری دیموکراسی بوو- هەروەها خاوەن قەڵەمرەویەکی میللیـی بـوو پێشبینیان دەکرد لێی ببێتە تەوەری بزوتنـەوەی کـوردی تـازە گەشەسـەندو لەوکاتـەدا لەموکریان و لەژێر کاریگـەری ئـارەزووی ئـەوەی کۆمـەکی کرداریـی لەیـەکێتی سـۆڤیەت بەدەستبخرێت کۆمەڵەکە لەخوالێخۆشبوو قازی محەمەد نزیك بۆوەو وویستی بەدەستی بێنێت سەرەڕای نارەزایی دەستەیەکی هۆشیار لەسەرکردایەتی ژ. ك کە دەرکیان بـەوە کردبوو قـازی بـەهۆی ئـەو دەسـەڵات و قەڵەمرەویـەوە کـە هەیـەتی زاڵ دەبێـت بەسـەر کۆمەڵەکەو بەسـەر سـەرکردایەتیە میللیەکەیدا کـە پێگـەو مـاڵ و ناوەنـدی کۆمەڵایـەتی بەرزیان نەبوو بەڵکو دەستیەکی نیشتمانی بوون هەڵقوڵاوی ناو جەماوەری میللـی بـوون دوای وتوێـژکردنێکی بـەرایی لەگـەڵ قـازی محەمـەد لـەرۆژێك لـەرۆژەکانی ئۆکتۆبـەری ١٩٤٤دا بانگهێشت کرا بۆ ماڵی بەرێز ئەحمەد ئیلاهـی لەشـاری مـەهاباد لـەوێ کۆمـەڵێك لەئەندامانی دیاری ژ. ك چاوەڕوانی هاتن و سوێندخواردنی قازیان دەکـرد بەسـوێندی - کۆمەڵـەی ژ.ك ئـەوەش لەهـەمان رۆژدا ئـەنجام دراو قـازی محەمـەد بـووە ئەنـدامێك لـە کۆمەڵەکـەدا لـەو رۆژەوەو هێنـدەی نـەبرد زاڵ بـوو بەسـەر دەزگـا جۆراوجۆرەکـانی کۆمەڵەکـەداو بـێ ئـەوەی ئەنـدامێکی سـەرکردایەتی بێـت تێیـدا بـووە بەرپرسـی زاڵ و دەسەڵاتدار بەسەر هەموو شتێك لەکۆمەڵەکەدا و نازنـاوی قـازی محەمـەدیش- بینـایی- بوو لەکۆمەڵەی ژ.ك دا.

# حزبی دیموکراتی کوردستان

## نۆڤەمبەر ١٩٤٥

لەساڵی ١٩٤٥ز دوای کۆتایهاتنی جەنگ لەدژی فاشیزم بەسەرکەوتنی بەرەی دیموکراسی و مەزن بوونی قەڵەمڕەوی ژ. ك و دوای ئەوەی حزبی تودەی ئێرانی لەناوچەی ئازربایجان دەستیکرد بەگۆڕینی- فرقەی دیموکراتی- ئازەربایجان- بۆ حزبی دیموکراتی ئازەربایجانی- شەهید قازی محەمەد تەبەنی بیرۆکەی گۆڕینی ژ. ك کرد بۆ حزبی دیموکراتی کوردستان و دوای رێکەوتن لەسەر ئەوە لەگەڵ سەرکردایەتی ژ.ك و هەندێك کەسایەتی کوردی دەسەلآتدارو سەربەخۆ لە ژ. ك کۆبونەوەیەك لەماڵی دامەزراوەی رۆشنبیریی سۆڤیەتی لەمەهاباد بەسترا تێیدا باس لە پێویستی تەبەنی کردنی دیموکراسیەت کرا لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیداو گۆڕینی کۆمەڵەی ژ. ك بۆ -حزبی دیموکراتی کوردستان- بۆ ئەوەی بتوانێت ئەرکە نیشتمانیەکان رابپەڕێنێت کە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی رووبەڕووی دەبێتەوە ئەوەش لە مانگی نۆڤەمبەری ١٩٤٥دا بوو کۆبونەوەکە رەزامەندی دەربڕی لەسەر پێشنیارەکانی قازی محەمەد. ئامادەبووەکانیش لەسەرکردەکانی ژ. ك و هەندێك لەکەسایەتیە عەشاریەرە قەڵەمڕەوکان بوون و دوای ماوەیەك پەیڕەوی حزبی دیموکراتی کوردستان ڕاگەیەنرا. کە پێشتر باسی کراو لیژنەی مەرکەزی هەڵبژێراو لەسەروویەوە قازی محەمەد کە بووە سەرۆکی حزب و سەرکردەی و ئاراستەکەری سیاسەتەکانی و دەسەلآتداری یەکەم تێیدا.

# راگەیاندنی کۆماری کوردستانی دیموکراتی
# خاوەن حوکمی زاتی
## ٢٢ کانونی دووەم ١٩٤٦

دوای دامەزراندنی حزبی دیموکراتی کوردستان و راگەیاندنی دروستبوونی ئازەربایجانی دیموکراتی خاوەن حوکمی زاتی[١٦١] نیشتمانپەروەرە کوردەکان چالاك بوون بەسەرکردایەتی حزبی دیموکراتی کوردستان و بەسەرۆکایەتی قازی محەمەد بۆ راگەیاندنی کۆماری کوردستانی خاوەن حوکمی زاتی. دوای خۆسازکردن و ئامادەکاریی کۆبونەوەیەکی میللی گەورە لە ٢٢ کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦دا لەشاری مەهاباد بەسترا لەگۆڕەپانی چوارچرا– کە سەکۆیەکی تەختە دانراو رازێنرایەوە بە ئاڵای کوردی و نیشتمانی و دروشمی نەتەوایەتی و شارەکە بەرگی جەژنی گەورەی پۆشی. قازی محەمەد لەسەر سەکۆکە وەستا بۆ ئەوەی بەپشتبەستن بە مافی گەلان بۆ دیاریکردنی مافی چارەنوس پێکهاتنی کۆماری کوردستانی دیموکراتی رابگەیێنێت لەچوارچێوەی قەوارەی گشتی ئێرانیدا.

بەرێز ولیەم ئایگلتنی کوڕ دەڵێت[١٦٢]:

–قازی بەهێواشی چووە سەر سەکۆکە جەختیکردەوە لەسەر ئەوەی کورد گەلێکی جیایە و لەسەر زەوی نیشتمانەکەی دەژی و مافی چارەی خۆنوسینی هەیە وەك هەموو نەتەوەکانی تر. کوردەکان راپەڕین و بوونە خاوەن دۆستێکی بەهێز لەم ساتەدا کۆماری کوردستانی زاتی دامەزرا.

---

[١٦١] – کۆماری ئازربایجان لە ١١ کانونی یەکەم ١٩٤٥ لەشاری تەبریز راگەیاندرا کەبووە پایتەختەکەی.

[١٦٢] –لاپەڕە ٦٣– کتێبی ولیەم ئایگلتنی کوڕ– کۆماری ١٩٤٦ی کوردی– چاپە ئینگلیزیەکە.

## دانانی وەزارەتەکان

دوای هەڵبــژاردنی قــازی محەمــەد بەســەرۆك كۆمــار وتوێــژەكانی دەســتپێكرد بــۆ دروستكردنی حكومەت و لەبەرابیەكانی شوباتی ١٩٤٦دا كۆبونەوەیەكی لەگەڵ هەندێك لەئەندامانی لیژنەی ناوەندی حزب و هەندێك لەكەسایەتیەكان سازكرد بۆ ئەوەی بابەتی پێكهێنانی وەزارەتەكان باس بكات لە ١١ شوباتی ١٩٤٦دا پێكهاتەی وەزاریی راگەیەنرا كەبەمشێوەیە بوو:-

-حاجی بابە شێخ- سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

-محمد حسێن سەیفی قازی- جێگری سەرۆك وەزیران و وەزیری بەرگری.

-مەناف كەریمی- جێگری سەرۆك وەزیران و وەزیری مەعاریف.

- عەبدولڕەحمان ئێلیخانی زادە- وەزیری دەرەوە.

-ئیسماعیل ئاغا ئێلێخانی زادە- وەزیری گەیاندن.

-ئەحمەد ئیلاهی- وەزیری ئابوریی.

-خەلیل خەسرەوی- وەزیری كار.

-كەریم ئەحمەدیان- وەزیری بروسكەو تەلەگراف و تەلەفونەكان.

- محەمەد ئەمین مەعینی- وەزیری ناوخۆ.

-مەلا حسێن مەجدی- وەزیری داد.

-مەحمود وەلی زادە- وەزیری كشتوكاڵ.

لەپێكهاتەی حكومەتەكەوە دەردەكەوێت كۆماری كوردستان كۆمارێك نەبووە خاوەن حوكمی زاتی بێت بەڵكو لەواقیعدا جۆرێك بووە لە كۆمارە فیدراڵیەكان ئەگەرچی ئەوە قەبوڵكرا كەوا شاهنشاە شای هەموو ئێران بێت لەناویشیدا هەردوو كۆماری ئازربایجان و كوردستان و دراوی ئێرانی دراوی فەرمیی بێت. هەردوو كۆماری ئازربایجان و كوردستان رایانگەیاند كەئامادەن بچنە ناو دانوستانەكانەوە لەگەڵ حكومەتی تاراندا بۆ هەماهەنگی و دروستكردنی پەیوەندیەكان لەگەڵیدا. هەروەها بوو وەفدێك بەسەرۆكایەتی قازی محەمەد و وەفدێكیش لەئازربایجانەوە چوون بۆ تاران و گەیشتنە دانپێدانانێكی بنەمایی

بەمافەکانی کوردستان و ئازربایجاندا لەچوارچێوەی یەکێتی ئێرانیدا کەدواتر حکومەتی ئێرانی لە ڕێکەوتنەکە کشایەوە.

## ڕێکەوتننامە لەگەڵ ئازربایجاندا.

هەردوو حکومەتی ئازربایجان و کۆماری کوردستانی دیموکراتی ڕێکەوتنێکیان گرێدا بۆ گۆڕینەوەی پارمەتیەکان و بەرگریی هاوبەش لە ٢٣ ئەپرێلی ١٩٤٦دا لەمادەی ٤ی ڕێکەوتننامەکەدا هاوپەیمانی سەربازی لەنێوان هەردوو حکومەتەکەدا جەختی لێکراوەتەوە هەروەها پێویستی ئاڵوگۆڕی پارمەتیەکان لەنێوانیاندا هەروەك ئەوەی لەمادەی سێی ڕێکەوتنەکەدا هاتووە بۆ دروستکردنی لیژنەیەکی هاوبەش و مادەی پێنجیشدا هاتووە کە دەبێت دانوستانەکان لەگەڵ تاراندا بەڕەزامەندی هەردوو حکومەت بێت هەروەك چۆن لەهەردوو مادەی ٢ و ٦دا باس لەوە دەکات دەبێت کەمینەی کوردی لەئازربایجان و کەمینەی ئازەری لەکوردستان بەهرەمەندبن لە مافە کارگێڕیی و ڕۆشنبیریەکانیان، هەروەها مادەی حەوتەم لەڕێکەوتنەکەش ئەوەی کردۆتە ئەرك کە سزای هەرکەسێك بدرێت بیەوێت کە یەکێتی مێژوویی نێوان هەردوو گەلی کوردی و ئازەری تێکبدات یان لاوازی بکات.

ئەو وەفدە کوردیەش کە هەستان بە دانوستانەکە پێکهاتبوون لەبەرێزان قازی محەمەد، محەمەد حسێن سیف، سەید عەبدوڵلا گەیلانی، عومەرخانی شکاك، ڕەشید بەگی هەرکی، زیرۆ بەکی هەرکی، قازی محەمەد خرزی، قازی شنۆ- بەڵام وەفدی ئازربایجانی پێکهاتبوون لە جەعفەر پیشەوەری، حاجی میرزا عەلی شایستەری، صادق بادکان، سەلام الله جاوید، محەمەد بیریا.

*دەسکەوتی تر*

کۆماری کوردستان کۆمەڵێك دەسکەوتی ناوخۆیی گرنگی بەدەست خست ئەویش بەسەپاندنی ئیدارەیەکی کوردی لەهەموو ناوچەکانی وڵات و پارێزگاری لەئارامی و سستم کردو قوتابخانەی لە شارەکان و گوندەکاندا بەزمانی کوردی کردەوە و

دەزگایەکی بلاّوکراوەی دامەزراند و گۆڤاری –کوردستان–ی دەرکرد بەزمانی کوردی بۆ ئەوەی ببێتە زمانحالّی حکومەت و حزب. هەروەها گۆڤاری تر بەزمانی کوردی دەرچوون و شاندێکی رۆشنبیری نێررا بۆ یەکێتی سۆڤیەت کەپێکهاتبوو لەنزیکەی پەنجا قوتابی و هەروەها بەدەیان قوتابی نارد بۆ زانکۆی تەبرێز.

هەروەها یەکێتی ژنانی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی جوانانی دیموکراتی کوردستان دامەزران– ئەم دوو رێکخراوە دەستیان کرد بەکارو چالاکیە نیشتمانی و پەروەردەییەکانیان.. حکومەت بەدانانی گرفتەکانی خۆراك و هەناردەو هاوردەی چارەسەرکرد. هەروەها توتنی فرۆشت بەیەکێتی سۆڤیەت و خۆراك و کەرەستەی پزیشکی پێویستی خستە بازارەوە و هەندێك بنکەی تەندروستی لەشارۆچکەکانی کوردستاندا کردەوە

## کەوتنی کۆماری کوردستان

## ١٥ کانونی یەکەم ١٩٤٦

هێـزە چـەکدارەکانی کۆمـاری کوردسـتانی دیمـوکراتی پێکهـاتبوون لـە خۆبەخـشە عەشـایەرەکان، هـەروەك چـۆن کۆمارەکـە دەسـتیکرد بـە دامەزرانـدنی یەکـەی نیزامـی لەناوچەی مەهاباد، کە شەهیدی موقەدەم لە سوپای شۆڕشـگێڕی کوردسـتانیدا مـستەفا خۆشناو فەرماندەی ناوچەی مەهابادو فەجی مەشقکردن بوو تێیدا.

بەڵام هێزە عەشایەریەکان ئەوا هەمیشەیی نەبوون واتـە لـەکاتی داواکـردن و پێویـستیدا ئامادە دەبوون و دەچوون بۆ بەرەکان و لەژێر سـەرکردایەتی ئاغـاو سـەرۆك هۆزەکانـدا بوون کە زۆربـەیان ڕاڕابـوون و هەندێکیـشان لـەکاتی وویـستندا خیانـەتیان کـردو، یەکـە عەشاریەکان بەشداریان نەکرد لەجەنگە گرنگەکاندا بۆ بەرگریکردن لـە کۆمارەکـە بـەڵکو بەپێـچەوانەوە کاتێـك کـەوا هێـزە چـەکدارەکانی ئێـران دەسـتیان بەجوڵـە کـرد بـەرەو کوردستان و ئازربایجان دوای کشانەوەی هێزەکانی یەکێتی سـۆڤیەت لەبـەهارو هـاوینی ١٩٤٦دا زۆرێـك لەسـەرۆك هۆزەکـان دەسـتیان کـرد بـە پەیوەنـدیکردنی نهێنـی لەگـەڵ سـەرکردەکانی سـوپای ئێرانیـداو پـشتی مەنجـەڵیان بەسـەر کۆمـاری کوردسـتانی دیموکراتیدا قلێپکردەوە.

هەرواش بوو کاتێك هێزەکانی ئێرانی گەیشتنە کوردستان سەرۆك هۆزەکـان پەیوەنـدیان پێـوە کـردن و جـەختیان لەخیانـەتی مێـژوویی خۆیـان کـردەوە لەبەرامبـەر بزوتنـەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردیدا.

لە کانونی یەکەم ١٩٤٦ دا هێزەکانی ئێرانی دەستیان بە هێرشکرد بۆ سەر کوردسـتان و ئازربایجان.

بەوشـێوەیە هێزەکـانی ئێـران لـە ١١ کـانونی یەکـەم ١٩٤٦دا چـوونە نـاو تـەبرێزەوە پایتەختی ئازربایجان دوای هەڵهاتنی سەرکردەکانی بێ بەرگریکردن.

قازی محەمەد ڕەتیکردەوە پەنا بەرێتە بەر یەکێتی سۆڤیەت وەك جەعفەر پیشەوەری و هەندێك لە پشتیوانەکانی ئەوانەی کەپـەنایان بـۆ یـەکێتی سـۆڤیەت بـردو پـێ باشـتربوو خۆی بدات بەدەست تارانەوە دوای ئەوەی بە بەڵێنەکانیان فێڵی لێکرا بـەوەی کـە لێـی

دەبوورن. بڕوا وابوو کە پێویستە لەگەڵ دانیشتوانی شاری مەهابادا بمێنێتەوە بۆ ئەوەی بەشداری ناخۆشیەکانیان بکات هەروەك چۆن لەخۆشیەکاندا لەگەڵیاندا بەشداربوو.

هێزەکانی ئێرانی بێ هیچ بەرگریەك کەشایانی باسکردن بێت گەیشتنە شاری مەهاباد ئەوەش لە ١٥ کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦دا بوو بەوەش کۆماری کوردستانی دیموکراتی رووخا.

حکومەتی ئێرانی پایەکانی کۆمارەکە و سەرکردەکانیان دەستگیرکرد دوای دوو رۆژ لەهاتنیە ناو شارەکەوەو ناردنی بۆ بەندکردن. ژمارەیەکی کەم لە سەرکردەکانی حزب هەڵهاتن بۆ عێراق و خۆیان رزگارکرد دوای ئەوەی ملکەچی و خۆبەدەستەوەدانیان رەتکردەوە.

کاتێکیش قازی بەند نەکرا هەندێك پێیان وابوو حکومەتی ئێرانی مومارەسەی سیاسەتێکی دانایانە دەکات بەڵام هێندەی نەبرد قازی محەمەدی دەستگیرکردو دوای دادگاییەکی رواڵەتی لەبەردەم دادگایەکی سەربازیدا حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردا سەپێنرا. هەروەها سزای لەسێدارەدان بەسەر سەیف قازی وەزیری بەرگریی صەدر قازی نوێنەری مهاباد لەپەرلەمانی ئێرانی سەپێنرا کەوا بەرێز- ئایگلتن- بەپشتیوانیکردنی بەردەوامی لە نوێنەرەکانی حزبی تودە لەپەرلەمان و بەرگریکردن لێیان تۆمەتباری دەکات.

## لەسێدارەدانی قازی محەمەد و براکانی

سزای لەسێدارەدان بەسەر شەهید قازی محەمەدو هاوەڵەکانیدا سەپێنرا لەبەرەبەیانی ڕۆژی ٣١ی مارتی ١٩٤٧ لەگۆڕەپانی چوارچرا- لەناوجەرگی مەهاباد هەمان ئەو گۆڕەپانە بوو کە تێیدا قازی محەمەد حکومەتی کوردستانی دیموکراتی ڕاگەیاند لە ٢٢ کانونی دووەم ١٩٤٦دا قازی پاڵەوانانە چووە بەردەم پەتی سێدارەو پەتەکەی گرت بەدەستیەوەو بەڕووی جەلادەکاندا هاواریکردو ووتی:- ئێوە بە لەسێدارەدانی من تەنها یەك قازی محەمەد دەکوژن بەهیوای ئەوەی بەسەر گەلی کورددا زاڵ بن نەخێر ئێوە بەهەڵەدا چوون هەموو نیشتمانپەروەرێکی کوردی قازی محەمەدێکە لەتێکۆشاندا. نیشتمانپەروەرەکان هەڵدەستن بە ئەنجامگەیاندنی ئەرکی خەبات و بەردەوامی پێدانی هەتا سەرکەوتن.. بەدڵنیایشەوە ئەوان ڕەحم بە جەلادەکانی گەلی کوردی ناکەن.. شەهید محمد حسین خان سەیف کاتێك چووە بەردەم پەتی سێدارە ووتی:- شانازی بەشەهیدبوونەوە دەکەم لەپێناو نیشتماندا بژی کوردستان- ئەمە و دواتریش دەیان نیشتمانپەروەری کورد لەسێدارەدران لەناویاندا هەندێك لەبەگزادە نیشتمانپەروەرەکان و هەندێك لەئەفسەرەکانی کۆماری کوردستان.

لەوانەش کە لەسێدارەدران لە ٧- نیسان- ١٩٤٧ لەمەهاباد ئەم شەهیدانە بوون:

١- سەرۆك حەمید مازوچی

٢- سەرۆك ڕەسول نەغەدە

٣- مولازم عەبدوڵلا ڕۆشنفکر

٤- مولازم محمد ناظمی.

<u>لەبۆکانیش هەر یەك لە:</u>

١- عەقید عەلی شێرزادی

٢- عەقید ئەمین کەسنەزانی

٣- ئەحمەد خان فاروقی لەگەڵ دوو براکەیدا لەسەرۆکەکانی فەیزوڵلا بەگی

٤- محمد بەگ شێرزادی

٥- ئەحمەد خان کلتەکی

٦- محمودخان تورکمان کەندی

٧- محمد خان بابا خان بەگ

٨- ئاغا صدیق یاز بلاخی

٩- عەلی ئاغا تموتە

١٠- رەسوڵ ئاغا میرەدی لەسێدارەدران.

## هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی شۆڕشی کورد لەبەدیهێنانی ئامانجەکانی نیشتماندا

سەرنەکەوتنی شۆڕشی نیشتمانی کوردی لەبەدیهێنانی ئەرکەکانیدا سەرەڕای پاڵەوانیەتیەکان و قوربانیی و ئازایەتیەکان، بۆ ئەم سەرنەکەوتنە لەبەدیهاتنی ئامانجە رزگاریخوازی و دیموکراتیەکانی گەلی کوردیدا چەندین هۆکار هەیە لەوانەش ئەوەیە داگیرکەران و بەتایبەتی ئینگلیز چەندین سەدەیە کاریان کردووە لەدژی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد هەروەك چۆن بەرژەوەندیەکانی وڵاتانی گەورە لەروسیای قەیسەریەوە بۆ ئینگلتەرا ویستویانە دوژمنایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بکەن و رێگە نەدەن کوردستان رزگاربێت هەروەك چۆن رەوشەکان و بارودۆخە نێودەوڵەتیەکان چەندین جار دژو پێچەوانە بوونەتەوە لەگەڵ بزوتنەوەی شۆڕشگێڕیی رزگاریخوازی لەکوردستان.

دوای جەنگی جیهانی یەکەم داگیرکەری بەریتانی بووە دوژمنی سەرسەختی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی و ئاستەنگی یەکەم لەبەردەم رزگاربوونی کوردستاندا. داگیرکەری بەریتانی سوپا پرچەکەکەی بەچەکی قورس و فرۆکەو تانك و تۆپە قورسەکان بۆ ماوەی نزیکەی چل ساڵ کە لەعێراقدا بوو لەدژی شۆڕش و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بەکارهێنا.

ئەمەو سەرەڕای دژایەتیکردنی داگیرکەرانی گەلی کوردی لە کۆنگرە نێودەوڵەتیەکان و کۆمەڵەی گەلان و نەتەوە یەکگرتوەکان، بەڵام بێجگە لەمە هۆکاری تریش هەبوون پەیوەندیان هەیە بە بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد خۆیەوەو بەرەوش و

بارودۆخەکانی گەلی کوردەوە بەکوردستانەوە، کۆمەڵێك هۆکار هەبوون کاری دوژمنانی ئاسان دەکرد لەتواندنەوەو لەناوبردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردیدا. ئەم هۆکارانەش زۆرن و هەندێکیان گرنگن و هەندێکیشیان لاوەکین لێرەدا باسی لەهەندێکیان دەکەین ١- شۆرش زۆرجار هەڵگیرساوە لەکاتێکدا لەلایەن دوژمنانەوە سەپاوە، لەئەنجامی هێرشی چەکداریی بۆ سەری یان بۆ سەر مافە سروشتیەکانی واتە شۆڕشی کوردی هەڵدەگیرسا بێ ئەوەی هەموو پێداویستیەکانی پێبگەن و مەرجە پێویستەکانی بۆ سەرکەوتنی فەراهەم بین هەروەها بەبێ ئەوەی زەمینەسازی تەواوی بۆ بکرێت.

کاتێکیش شۆڕش لەلایەکی کوردستانەوە هەڵدەگیرسا ئەوا ناوچەکانی تری کوردستان نەدەهاتن بەدەمیەوەو کۆمەکی بکەن بەڵکو زۆربەی جار هەر یارمەتیشی نەدەدا ئەمەش کاری ئەوەی بۆ دوژمنەکان ئاسان دەکرد بتوانن هەموو هەوڵەکان و تواناکانیان لەسەر ئەو شوێنە چڕبکەنەوەو بالآدەست بن و شۆڕش لەتاکە یەك شوێندا قەتیس بێت، کاتێکیش شۆڕش لەشوێنێك دادەمرکایەوە لەشوێنێکی ترەوە سەریهەڵدەدایەوە.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی یەککگرتوو نەبوون و لەژێر یەك سەرکردایەتیدا نەبووە بەڵکو بەش بەش و پارچە پارچە بووە بەسەر خۆیدا ئەمەش – بە تەنیشت سەرهەڵدانیەوە لەچەند ناوچەیەکی جیاوازدا– چەندین هەلی بۆ سەرکەوتن لەکیس داوە.

کورتبوونەوەی بزوتنەوەی شۆرشگێڕیی تا جەنگی جیهانی دووەم بەتایبەتی سەرکردەکانی پێکهاتبوون لە تاقمە عەشایەریەکان و بالآکانی کۆمەڵگەی کوردستانی و جوتیارەکان بەشداریان لەشۆڕشدا دەکرد بێ بوونی هۆشیاریی و بێ بەستنەوەی بەرژەوەندیە جوتیاریەکانیان بەمەسەلەکەوە یان تێبگەیەنرێن لەو بارەیەوە بێ ئەوەی شۆڕش هەلگری ئەو دروشمگەلانە بێت کەوا گوزارشت لەبەرژەوەندیە ئابوری و کۆمەلآیەتیەکانیان بکات و پاشانیش بزوتنەوەکە ئامانجەکانی خۆیی کورتکردەوە لەلایەنی سیاسی گشتی رووتداو نەبوونی پەیرەوێك بۆ چاکسازی کۆمەلآیەتی و گوزارشتکردن لەهیواکانی جەماوەر و داخوازییە ژیانیەکانی تر.

نەبوونی حزبێکی پێشڕەوی بەئەزمون خاوەن سەرکردایەتیەکی شۆڕشگێڕی داناو قاڵ بووی هۆشیار کەهێزە جەماوەرییە میللیەکان لەگەڵ هێزەکانی گەل و دەستە نیشتمانیەکاندا یەك بخات و پێشەوایەتی بکات لەشۆڕش دژی داگیرکەرو زەوتکەران ئەمەش لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی شۆڕش بوون لەبەدیهاتنی ئەرکەکانی و ئامانجەکانیدا، هەروەها نەزانی دیاریکردنی هێزە سەرەکیە هاوپەیمانەکان و پاشانیش پشت نەبەستن بە جوتیاران و کرێکاران و زەحمەتکێشان و هاوپەیمانەکانیان لەبورژوازیەتی بچووك و نیشتمانیی لەخەباتی شۆڕشگێڕیی و نەبوونی ڕێکخستنیان لەتێکۆشاندا.

دەرکەوتنی تاقمە دەرەبەگیەکان یان موڵکدارەکان یان ئاینیە خیانەتکارەکان کە هاوکاری دوژمنیان دەکردو پروپاگەندەیان بۆ دەکرد بە سود وەرگرتن لە هەستی ئایینی بەشێوەیەکی ناڕاست و بوون بە بەرەیەکی تر جگە لەبەرەی دوژمن بۆ دوژمنایەتیکردنی شۆڕشی نیشتمانی کوردی.

نا هاوتایی ئاستی هێزەکان، چ لەڕووی ژمارەوە چ لەڕووی کەرەستەو تفاقی سەربازیەوە، لەنێوان شۆڕشگێڕە کوردەکان داگیرکەران و ئەوانی تر لە زەوتکەرانی کوردستان. وە کەمی چەك و کەرەستەی سەربازی لای شۆڕشگێڕەکان و سەرەتایی بوون و سادەیی ئەگەر هەبووبێت لەکاتێکدا سوپاکانی دوژمن بەدە قات لەپێش ئەمانەوە بوون باشترین و نوێترین چەکی قورس و لەناوبەریان پێ بوو هەروەها لەڕووی ژمارەشیانەوە زۆرتربوون لەژمارەی هێزە کوردیەکان جگە لەجیاوازی ئاستی سەربازیان و شارەزاییە هونەرەکانی جەنگی لەنێوانیاندا.

مانەوەی سستمی دەرەبەگایەتی و دواکەوتنی کوردستان لەڕووەکانی ئابوریی و پیشەسازی و، کشتوکاڵی و تەکنیکی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و رۆشنبیریەوە ئەمەش وایکرد یەکخستنی هێزەکان و ڕێکخستنیان ئەرکێکی قورس بێت و نەتوانرێت چەك و پارەیان پێ بدرێت و ئەمەش کارئاسانی بۆ دوژمنەکان کرد پیلانەکانیان پیادە بکەن و پلانی –جیاوازی و ناکۆکی بخەرەوە زاڵ و باڵا دەست دەبیت– بەکار بێنن و هەروەها دروستکردنی ململانێکان و پەرتکردنی ڕیزەکانیش.

لاوازی هێــزە نوێیەکــە لەکۆمەڵگــەدا لــەرووی چــەندی و چــۆنیەتیەوە- کرێکــاران و ڕۆشنبیران و بورجوازیەتی نیشتمانی و چینی نوێی کرێکار (پرۆلیتاریا).

یــەك نەخــستنی پارچــەکانی بزوتنــەوەی شۆڕشــگێڕیی نیــشتمانی کــوردی کاتێــك کــەوا دوژمنـــەکان هێزەکانیـــان و کۆشـــشە ســـەربازی و سیاســـیەکانیان یەکخـــست بـــۆ دژایەتیکردنی.

بێبــەش بــوونی بزوتنــەوەی نیــشتمانی شۆڕشــگێڕی کــوردی لەپــشتیوانی دەرەکــی و سەپاندنی تەوقێك لەدەوری لەلایەن داگیرکەران و دوژمنانەوە.

فریوخواردنی کوردەکان بەعوسمانیەکان بەکاریگەریی پروپاگەندەکان و جادویی ئـایینی و بــە بەڵێنــەکانی هاوپــەیمانان- داگیرکــەرانی خۆرئــاوا- لــەدوای جــەنگی جیهــانی یەکەمەوە، هــەروەها فریوخواردنیــان لەلایــەن کەمالیەکانــەوەو خۆرئــاواوە لەســەرەتادا.

هــەروەها دەرك نــەکردنی ســەرکردەکانیان بەحەقیقــەتی هەڵوێــستی ئــەو دوژمنانــە و جەوهەری پیلانە دۆزەخیەکانیان لەدژی گەلی کورد.

رادەستکردنی سەرکردایەتی، سەرکردایەتی بزوتنەوەی نیشتمانی کـوردی لـەبوارەکانی خەباتی هاوبەشدا، بە هێزە بیانیەکان کە خاوەن سروشتێکی ئیستیغلالی چینایەتی بوو، بێ دانانی هیچ کۆت و مەرجێك وەك ئەوەی لەگەڵ کەمالیەکاندا روویداو، رێك نەخـستنی هێزە کوردیەکان لەژێر دروشمەکانیداو بەسەرکردایەتی پێشرەوە تایبەتەکەی بۆ چـوونە نـاو بەرەیــەکی یــەکگرتوو لەگــەڵ هێزەکــانی گەلــە هاوســێکاندا نــەك تێکــەڵبوونی و تێهەڵکێش بوون لەگەڵیدا. ئەمەش بەهۆی جیانەکردنەوەی ووردەوە لـەنێوان دۆسـتان و دوژمنانـدا دروسـت بـوو، لـەنێوان چـینە کۆمەڵایەتیـە ئیـستیغلالیە دوژمنــەکان و چـین زەحمەتکێشە هاوپەیمانەکاندا. جیاکردنەوەی وورد لەنێوان دۆستان و دوژمنانـدا لەسـەر ئاسـتی نیـشتمانی و نێودەوڵـەتی لـەگرنگترین پێداویـستەکانی سـەرکەوتن بـوون بـۆ بزوتنەوەی شۆڕشگێریی.

# بەشی چوارەم

# حزبی دیموکراتی کوردستان
# پێشڕەوی خەباتی گەلی کورد

- کورتەیەك لەبارەی حزبەوە
- دەسکەوتەکانی پارتی لەفیلدی تێکۆشانی نیشتمانیدا
- پارتی و شۆڕش و کۆماری ١٤ تەمموز
- پارتی و حوکمی عەبدولکەریم قاسم
- پارتی و دیموکراتیەت
- پارتی دژی جیابوونەوە تێهەڵکێشیە
- پارتی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی عەرەبی
- پارتی و یەکێتی عێراقیی.

## کورتەیەك لەبارەی حزبەوە

لەناو پەرەسەندنەکان و ئەو گۆرانکاریانەدا کە بەسەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا هاتن لەکوردستان ئەم بزوتنەوەیەیان کردە بزوتنەوەیەکی میلیی شۆرشگێریی دیموکراتی خاوەن ناوەرۆکێکی پێشکەوتنخوازی پێکهاتەو بنکە جەماوەریی، لەئەنجامی کارلێکیشی لەگەڵ بیرۆکە دیموکراتیەکان و پێشکەوتنخوازیەکان و پێوەن بونیەوە لێی حزبی دیموکراتی کوردستان وەك وەڵامدانەوەیەکی لۆژیکی بوو بۆ پێویستیەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و داخوازیەکانی تەیارکردن و رێکخستن و سەرکردایەتیکردنی هێزەکانی جەماوەری شۆرشگێریی دیموکراتی؟

دوای جەنگی جیهانی دووەم بزوتنەوەی دیموکراتی مەزن بوو بیرۆکە پێشکەوتنخوازیەکان لەناو ریزەکانی گەلی کوردیدا بلاّبونەوە حزبە کوردییە کۆنەکان بێ مایەبوون، هەروەها حزبە نەتەوەییە بورجوزایەکان و سەرکردەکانی سازش ئاشکرابوون ئیدی بوونی حزبێکی کوردستانی لەجۆرێکی نوێ کە بگونجێت لەگەڵ رادەو پلەی پەرەسەندنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی دیموکراتی گەلی کوردی و پێشکەوتنیداو بتوانێت بە ئەرکە پێشرەویەکانی هەستێت تێیدا. دامەزراندنی حزبی دیموکراتی کوردستان لەسەر هەمان ریتم و جۆری حزبی دیموکراتی کوردستان بوو لەئێران بەو چۆنیەتیەی کەلەشوێنێکی تردا باسی کرا.

راستە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی هەر لەدەیەی یەکەمی سەدەی بیستەمەوە لە حزبەکان و کۆمەڵە کوردیەکانەوە گەلاّلە بوو بوو وە حزبەکان و کۆمەڵە سیاسیەکان لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا نوێ نین، بەلاّم حزبی دیموکراتی کوردستان لەسەر شێوەو شێوازی حزبە کۆنەکان و ئەو کۆمەلاّنە نەبوو کە پێشتر هەبوون لەرووی پێکهاتەو ئامانجەکان و سەرکردایەتیەوە. ئەو بەحوکمی هەڵقولاّنیەوە لەپەرەسەندنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردی و گۆرانی بۆ بزوتنەوەیەکی جەماوەری میللی و بەحوکمی ئەوەی دروستبونیەوە لەخۆراکپێدانی ئەم بزوتنەوەیەوە بە بیرۆکەی دیموکراتی و شۆرشگێری و پێشکەوتنخوازی زانستی و بەحوکمی ئەرك و ئەو قۆناغەی کە تێیدا پەیدابوو ئەوا حزبێك بوو لە جۆرو مۆدیلی نوێ، حزبێکی پێشرەویی جەماوەری

و دیموکراتی شۆڕشگێڕیی. پەیڕەوەکەی پێشکەوتنخوازی زانستی بوو گوزارشتی دەکرد لــە پێویــستیەکانی پەرەســەندنی کۆمەڵایــەتی لــەقۆناغی رزگــاربوونی نیــشتمانی و دیموکراتیدا.

شـێوازی کارەکـەی شۆڕشـگێڕیی و دیمـوکراتی بـوو. دروشمـەکانی برایـەتی عـەرەبی و کوردی و یەکێتی خەباتی هـەردوو گـەلی عـەرەبی و کوردیـان بەرجەسـتە دەکـرد لـەدژی داگیرکەرو پاشایەتی و کۆنەپەرستی و لەپێناو عێراقێکی دیموکراتی ئازاد دا.

ئامانجـەکانی حـزب چـڕدەبونەوە لـە تێکۆشـان بـۆ رزگـارکردنی عێـراق لەداگیرکـەرو هاوپەیمانێتیـەکان و پەیماننامـە زاڵـم و سـتەمکاریەکان و لـە حـوکمی کۆنەپەرسـتی و ئۆتـۆکراتی و پێکهێنـانی کۆمـارێکی دیمـوکراتی پەرلـەمانی ئازادیـە دیموکراتیـەکان بـۆ عێـراق دەسـتەبەر بکـات و بـۆ کوردسـتانی عێـراقیش حـوکمێکی زاتـی پەرەسـەندو لەچوارچێوەی یەکێتی نیشتمانی گەلی عێراقدا.

لەلایەنی ئابوریەوە حزب داوای خۆماڵیکردنی کانزاکان و سامانە سروشـتیەکان و نـەوتی کـرد.. هـەروەها وەبـەرهێنانی لەلایـەن دەوڵەتـەوە. هـەروەها بونیادنـانی پیـشەسازی قورسـی خۆمـاڵیی کـە بنـچینەیی سـەرەکی بێـت بـۆ پیـشەسازی نیـشتمانی سـووك کـە پێویستە هانبدرێت و بـاجێکی هەڵکشاوی بسەپێنرێت و رێگـە لـەقۆرخکردن بگیرێـت.. هەروەها بانکەکان خۆماڵی بکرێن و بازرگانی دەرەکی لەرێگەی دەوڵەتەوە بێـت و هـانی بازرگانی ناوخۆیی بدرێت. هەروەها حزب هەر لەساڵی ١٩٥٠ەوە داوای هەڵوەشاندنەوەی سستمی دەرەبەگایەتی و زاڵبوون بەسەر پاشماوەکانیداو دابەشکردنی زەویەکان بەسـەر جوتیارەکانـدا لەگـەڵ بایەخـدان بەکۆمەڵـە هەرەوەزیـە کـشتوکاڵیەکان و دروسـتکردنی کێڵگەی حکومی و یارمەتیدانی پەرەسەندنی کشتوکاڵی.

لەبواری فێرکردنیشدا حزب تێکۆشـاوە بـۆ بنبڕکردنـی نەخوێنـدەواری و بـەزۆرفێرکردنی سـەرەتایی و ناوەنـدی و کردنـەوەی خوێندنگـەی ئامـادەیی و پیـشەیی و کردنـەوەی کۆلیژەکان و پەیمانگا باڵاکان لەکوردستان وەك رێگەخۆشکردنێك بۆ کردنەوەی زانکۆی کوردسـتان و کردنـی زمـانی کـوردی بـەزمانی فـەرمی و خوێنـدنی وانـەکانی ئـەدەب و مێژووی کوردی لەقوتابخانەکاندا.

هەروەها حزب خەباتی کرد لەپێناو ئازادکردنی ژنان لەکۆت و بەندی کۆنەپەرستی و یەکسانکردنی تەواوەتی لەگەڵ پیاو لەهەموو بوارەکانداو رۆشنبیرکردنی و کردنی بەهاولاتیەکی چالاك. هەروەها حزب تێکۆشاوە لەپێناو مافەکانی کرێکاران و باشکردنی رەوشی ژیانیان و دامەزراندنی سەندیکاکان بۆیان و بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی چینایەتی و نیشتمانی لەناو ریزەکانیاندا.

هەروەها لەپەیرەوەکەیدا هاتووە بایەخی جدیی بدرێت بەبزوتنەوەی جوتیاران و دامەزراندنی کۆمەڵە جوتیاریەکان و هۆشیارکردنەوەیان بۆ ئەوەی بتوانن ئەرکەکانیان لەکشتوکاڵ و گۆرەپانی نیشتمانیدا بەئەنجام بگەیەنن. حزب لەپەیرەوەکەیدا داوای ژیانێکی پەرلەمانی دروستی کرد هەروەها رەهاکردنی ئازادیە دیموکراتیەکان وەك ئازادیەکانی رێکخستنی سیاسی بۆ هێزە نیشتمانیەکان.. هەروەها رێکخستنی سەندیکایی و پیشەیی و ئازادی رۆژنامەگەری و بڵاوکردنەوەو کۆبونەوەو وا لە ئیدارە ناوچەییەکان بکرێت بەشێوەیەکی دیموکراتی ئەنجومەنەکانیان هەڵبژێرێت لەلایەن گەلەوە هەروەها شارەوانیەکانیش.

هەروەها حزب هەر لەسەرەتای بونیەوە باوەری بەوە هەبووە بەرەیەکی یەکگرتووی نیشتمانی دابمەزرێت لەهەموو هێزە نیشتمانی و دیموکراتیەکان لەعێراقدا. بەڵام لەسیاسەتی دەرەوەدا حزب داوایکرد دژایەتی داگیرکەریی و جەنگی داگیرکەری و جیهانی بکرێت و پشتیوانی بزوتنەوە رزگاریخوازیەکانی گەلان بکرێت و پەیوەندیە تێکۆشانیەکانی عێراق لەگەڵ ولاتانی عەرەبی ئازادبوو و گەلەکانیاندا بەهێز بکرێت هەروەها بۆ باوەربوون بە بنەماکانی پێکەوە ژیانی ئاشتیانەو کۆنگرەی باندۆنك و پەیماننامەی مافەکانی مرۆڤ.

هەروەها حزب هەمیشە داوایکردووە پەیوەندیەکان لەگەڵ ولاتانی سەربازگەی سۆشیالیستیدا بەگشتی و یەکێتی سۆڤیەت و چینی میللیدا بەتایبەتی پتەو و توندوتۆڵ بکرێن. سستمی ناوخۆیی حزب– ژیانی ناوخۆیی– لەسەر بنەمای دیموکراتیەتی ناوەندیی و ئازادی رەخنەگرتن و رەخنە لەخۆگرتن و سەرکردایەتی دەستەجەمعی و زنجیرەی بەرپرسیارێتی و دابەشکردنی کارەکان بەسەر ئەندامەکاندا بەرپابوو، لەگەڵ

چاودێریی جێبەجێکردن و شوێنکەوتەی کەمینە بۆ زۆرینـە لەگـەڵ گرەنتیکردنـی مـافی کەمینە لەخستنەڕووی گۆشە نیگاکانیدا بەپێی پەیڕەوی نـاوخۆیی، بـەڵام پێکهاتـەی حزبەکـە جەماوەریـەو حـزب نمایـشی بەرژەوەندیـەکانی کرێکـاران و جوتیـاران و زەحمەتکێشان و کاسبکاران و ڕۆشنبیران و شۆڕشگێڕان دەکات. زۆرینـەی ئەندامـەکانی حـزبیش لـە جوتیـاران و کرێکـاران و خوێنەوارەکانـە- لەخوێنـدکاران و مامۆسـتایان و پارێزەران و فەرمانبەران و پزیشکەکان- و کاسبکاران و زەحمەتکێشان و شۆڕشـگێڕان. کادیرکانی حزب سەر بەجەماوەری میللین و سەرکردایەتیەکەی پێکهـاتووە لەڕۆشـنبیران و شۆڕشگێڕان ئەوانەی سەر بەچینە زەحمەتکێش و مامناوەندەکانن.

حزب هەر لەدامەرزاندنیەوە هەتا ئێستا شەش کۆنگرەی بەستووە. چـەندین ئـاڵوگۆڕیش کراوە لەسەرکردەکانیدا ئەمەش ئەوە دەردەخـات کـە دەسـتەو تـاقمێکی دیـاریکراو زاڵ نەبووە بەسـەر حزبـدا نوێگـەریی لـە سـەرکردایەتیدا لەپێویـستیەکانی گەشـەی حـزب و شۆڕشگێریەکەی لەتایبەتمەندیەکانی پارتیە.

حزب تائێستا چەندین ڕۆژنامەی نهێنی و ئاشـکرای دەرکـردوە ئـەو گۆڤـارەش زمانحـاڵ بـوو تاسـاڵی ١٩٥٦ بـریتی بـوو لـە گۆڤـاری- رزگـاری- بـەزمانی عـەرەبی و کـوردی دەردەچوو پاشان بووە -خەباتی کوردستان- زمانحاڵی حـزب و پاشـانیش - خـەبات- لەسەردەمی ئاشکرایدا زمانحاڵی حزب بوو.

هەروەها حزب بەتەنیشت ئەم گۆڤارە نهێنیانـەوە گۆڤارەکـانی مـرۆ و نرکـەی جوتیـار و ڕێگەی نوێ و پێشڕەو خـەباتمان و بـانگی کوردسـتان و رزگـاری کوردسـتان و تیـشك و دەنگی پێشمەرگەی دەردەکرد.

حزب لەساڵەکانی چالاکی ئاشکرایدا ١٩٥٩-١٩٦١ ڕۆژنامەی خەباتی بەزمانی عـەرەبی و کوردی دەردەکرد ئەندامەکانی لەسەردەمی پاشایەتیدا گۆڤـاری گەلاوێـژ و ڕۆشـنبیری و نـزار- سیاسـی و کۆمەلایـەتی و ڕۆشـنبیریان دەردەکـرد. هـەروەها حـزب ١٤ سـاڵ بـێ مۆڵەت کاریکردو بەشێوەیەکی نهێنی و بەردەوام بـوو لەسـەر خـەباتی شۆڕشـگێڕیی بـێ ئەوەی تیرۆرو لەسێدارەدان و زیندانیکردن و ترساندن و ڕاودونـان لاوازو بێتینـی بکـەن.

لەساڵی ١٩٦٠دا مۆڵەتی پێدرا هەتا ئەیلولی ١٩٦١ تا ئەوکاتەی کە حوکمی قاسم دایخست. هەتا ئێستاش چ بەئاشکراو چ بەنهێنی بەردەوامە لەخەباتکردن.
حزبی دیموکراتی کوردستان تۆکمە بوو وە بنەماکانی و بیرۆکەکانی چەسپان لەناو ریزەکانی جەماوەرداو لەنێو ناکۆکیەکاندا لەگەڵ هێزە نیشتمانیەکان و ململانێی ناوخۆیدا حزب چەندین تاقمی جیابۆوەی بەزاند کە هەندێکیان لەلایەن دیارترین سەرکردەکانی پێشویەوە سەرکردایەتیان دەکرا، حزبی دیموکراتی کوردستان بە رەقی و تۆکمەیی جەماوەرەکەی و دەستگرتنی توندی بەحزب و ئامانجەکانی و بنەما رێکخستنیەکانیەوە ناسراوە، حزبی دیموکراتی کوردستان پێشڕەوی خەباتی گەلی کورد دەکات و سەرکردایەتی شۆڕشەکەی کردووە لەساڵی ١٩٦١-١٩٦٤ و لەسەر پەیڕەوی شۆڕشگێڕیی مێژوویی بزوتنەوەی گەلەکەمان رۆیشتووە و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی پاراستووە لە لادان و فێڵکردن و جەوهەرە پێشکەوتنخوازی و دیموکراتیەکەیی هەمیشەو لەهەموو بارودۆخێکدا پاراستووە.

## دەستکەوتەکانی حزبی دیموکراتی کوردستان لەبواری تێکۆشانی نیشتمانیدا

ڕاستە حزبی دیموکراتی کوردستان لەئەنجامی پێشکەوتنی بزوتنەوەی میللی شۆڕشگێڕیدا لەکوردستان دەرکەوت و خۆراکپێدانی بەبیرۆکەی پێشکەوتنخوازیەکان، کە بەرهەمی نزیکبونەوەیەتی بە بیرۆکە شۆڕشگێڕیە پێشکەوتنخوازیەکان، شۆڕشی کوردی لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە گەلاڵە بوو وە هێنایە بوونەوە، بەڵام ئەم حەقیقەتانە راستی و حەقیقەتێکی تری گرنگ نەریّ ناکەنەوە ئەویش ئەوەیە حزب بەرۆڵی خۆی کاری کردۆتە سەر بزوتنەوەی میللی کە لێیەوە هەڵقوڵاوەو پەیدا بووە بۆ رێکخستنی و بۆ سەرکردایەتیکردنی و پاشانیش کاری کردۆتە سەر بزوتنەوەی نیشتمانی عێراقیش لەرێگەی کارکردنە سەر پەیوەندیە عەرەبیە کوردیەکان و خەباتی هاوبەش لەنێوان هەردوو گەلی عەرەبی و کوردیدا لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی و لەرێگەی دیاریکردنی هەڵوێستەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لەبەرامبەر مەسەلە عەرەبیەکان و یەکێتی عەرەبیدا. بێگومان حزب بەسەرکەوتووی کاریکرد بۆ ئەوەی وا لەبزوتنەوەی

رزگاریخوازی کوردی بکات ببێتە حزبێکی جەماوەری پێشکەوتنخواز بەچوونە ناوەوەی دروشمەکانی بۆ ناو ڕیزەکانی جەماوەری میللی ماندو و زەحمەتکێش و بەهۆشیارکردنەوەی کرێکاران و جوتیاران و کێشکردنیان بۆ ناو مەیدانی خەباتی نیشتمانی و پاشانیش بەبلاوکردنەوەی هۆشیاری چینایەتی و نیشتمانی دروست لەناو ریزەکانیانداو تێگەیاندنیان بەو رۆڵە پێشرەویی و سەرەکیە لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردیدا هەیانە. وەلەرێگەی ئەوەشەوە حزب بەشەرەفەوە ئەرکی پوختکردنەوەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیی لە نیشتەنی سەرکردە دەرەبەگایەتیەکان و شێوازە عەشایەریەکانی بەشێوەیەکی کۆتایی بەئەنجام گەیاند هەروەها بەکاریگەری رەگەزە بورجوازیەکان کە سازشکاران لەگەڵ داگیرکەرو زەوتکەراندا.

هەروەها لەسەر دەستی حزب سەدان کادیرو رەگەزی شۆڕشگێڕیی پەروەردەکران کە لە ریزەکانی جەماوەری میللیەوە هەڵقولابوون، بۆ ئەوەی ئەم رەگەزانە هەست بە سەرکردایەتیکردنی حزب و بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردی و زیاتر لەوەش حزب جەماوەری میللی لە کرێکاران و جوتیاران لە حەقیقەتی پەیوەندی توندوتۆڵی نێوان داخوازی و ئامانجە بژێویی و ژیاریەکانیان و بزوتنەوەی رزگاریخوازی تێگەیاند هەروەها بە بەردەوامی تێکۆشاوە بۆ بەرگریکردن لە داخوازیە ژیاریەکانی جەماوەر و حزب دەیان هەزار جوتیاری لە کۆمەڵە جوتیاریەکاندا رێکخست هەروەها هەزاران جوتیار لەناو ریزەکانی حزبدا هەروەك چۆن هەزاران کرێکاری لەسەندیکاکان و حزبدا رێکخست وە بەدەستپێشخەری حزب و لەژێر چاودێری ئەودا یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستانی رێکخرا کە دەیان هەزار لاوی لەخۆدەگرت هەروەها یەکێتی قوتابیانی کوردستانیش رێکخرا کە هەزاران قوتابی لەخۆدەگرت هەروەها دامەزراندنی یەکێتی ئافرەتانی کوردستانی دیموکراتی و یەکێتی مامۆستایانی کوردستان و هی تر لە رێکخراوە جەماوەری و رۆشنبیریەکان، هەروەها فەزڵی یەکەمیش دەگەڕێتەوە بۆ حزبی دیموکراتی کوردستان لەپاککردنەوەی بزوتنەوەی کوردی لە بیرۆکە کەنارگیرییە نەتەوەیی و کۆنەپەرستیەکان کەوا گاڵتەی بەبرایەتی و خەباتی هاوبەش دەکرد لەنێوان عەرەب و کوردەکاندا، وەهەر ئەو بوو ئەو دروشمە ناسراوەی دارشت کە دەڵێت لەسەر

تاوێری یەکێتی عەرەبی کوردی داگیرکەرو کلك و هاوپەیمانەکانی کەرت و پەرت دەبن-
بەڕاستیش تێکۆشانی حزب شکستێکی خراپی بەبیرۆکە کۆسمۆپولیتیەکان هێنا کە
خۆی لەژێر دەمامکێکی چەپدا شاردبۆوە بۆ نکوڵیکردن لەبوونی نەتەوەی کوردی و
مافی لەدیاریکردنی چارەنوسدا هەروەها بوونی بزوتنەوەیەکی مێژویی و بابەتی
رەتدەکاتەوە کە بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردیەو لەوێشەوە پێویستی بوونی
حزبی پێشڕەوی و رێکخراوە دیموکراتیەکانی لەکوردستاندا رەت دەکردەوە.
حزب دروشمی برایەتی عەرەبی کوردی گۆڕی بۆ واقیعی بەرجەستە بەبەشداریکردنی
لەسەرو جەماوەری کوردیەوە لەهاریکاریکردن لەگەڵ حزبە دیموکراتیە عێراقیەکاندا
لەراپەڕینی میللیدا وە لە پشتیوانیکردنی بزوتنەوە رزگاریخوازیە عەرەبیەکان بەپێی
تواناکانی خۆی. هەروەها لەخستنەڕووی مەسەلەکانی کورد لەگەڵ هێزە نیشتمانیە
عێراقیەکاندا کە بە وەرگرتنی هەڵوێستی دروست لەبارەیەوە برایەتی عەرەبی کوردی
پتەو بەهێز دەکات هەروەها خەباتی هاوبەشی هەردوو گەل لەدژی داگیرکەرو
کۆنەپەرستی. بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی خاوەن سروشتی دیموکراسی
پێشکەوتنخوازی بەسەرکردایەتی پارتی باڵێك یان لایەنێکی دیموکراتی بۆ بزوتنەوەی
نیشتمانی عێراقی پێکهێنا کەبەشداریەکی بەنرخی کرد لەوا وێڕدانەوەی تای
دیموکراسیەت لەبزوتنەوەی نیشتمانی عێراقیدا.
پارتی بە بەردەوامی هێزێکی کاریگەربووە لەتێکۆشان لەدژی داگیرکەرو هاوپەیمانەکانی
و پوچەڵکردنەوەی چەندین پلانی داگیرکاری و پلانە دۆزەخیەکانی.
لەگرنگترین دەسکەوتەکانی پارتی بەشداریکردنە بەهادارەکەیەتی لەگۆڕینی کۆبونەوەی
چەکداریی لەکوردستان لەساڵی ١٩٦١ بۆ شۆڕشێکی نیشتمانی و دیموکراتی کوردی و
پاشانیش پێکهێنانی یەکەکانی شانەی چەکداری لەکوردستان و داواکردنی مافە
نەتەوەییە ڕەواکانی گەلی کوردی و مافە دیموکراتیەکانی گەلی کوردی بەگشتی و
تێکۆشانی نەبەردانە لەدژی دیکاتۆریەت و کۆنەپەرستی.
هەروەها پارتی هەمیشە خەباتی کردووە لەپێناو بەرەیەکی یەکێتی نیشتمانیدا کەهەموو
هێزە چاك و باشەکان لەخۆبگرێت بۆ کۆکردنەوەی هەموو هێزە نیشتمانی و

دیموکراسیەکان لەبەرەیەکی تێکۆشانی یەکگرتوودا لەپێناو بەدیهاتنی ئەرکەکانی قۆناغی ئێستا لەئامانجە دیموکراتی و رزگاریخوازیەکانی گەل.

هەروەها حزب هاریکاریکرد لەگەڵ حزبی گەل و حزبی شیوعی عێراقیداو پەیوەندیەکی باشی هەبوو لەگەڵ حزبی نیشتمانی دیموکراتی و لەگەڵ بەرەی یەکێتی عەرەبی سۆشیالیستی و حزبی ئیستیقلال و حزبی نیشتمانی دیموکراتی و حزبی شیوعی عێراقیدا. هەتا ئێستاش حزب دروشمی بەرەی پێشکەوتنخوازی هەڵگرتووەو بانگەشەی بۆ دەکات بەوپێیەی تاکە رێگایە بۆ یەکخستنی هێزە نیشتمانیەکانی گەل و بەدیهاتنی ئامانجە هاوبەشەکانی.

## پارتی و شۆڕش و کۆماری ١٤ تەمموز

حزب بەتەنیشت حزبەکان و هێزە نیشتمانیە عێراقیەکانی ترەوە خەباتی کردووە لەدژی داگیرکەرو پەیماننامەکانی و لەدژی حوکمی کۆنەپەستی لایەنگری و هەمیشە تێکۆشاوە بۆ رزگارکردنی عێراق لەداگیرکەرو بەدەستهێنانی سەربەخۆیی تەواوەتی عێراق و بەرپاکردنی سستمێکی دیموکراتی تێیدا.

بەم پاڵنەرەش حزب بەشداریکرد لەهەموو بزوتنەوەکان و راپەرینە جەماوەریەکاندا کە لە دامەزراندنیەوە رویانداوەو بەپێی توانا هاوکار بووە لەگەڵ حزبەکان و هێزەکانی تردا بۆ بەدیهاتنی ئەم ئەرکە. بەڵام حزبی دیموکراتی کوردستان –بەپێچەوانەی هەندێك حزبی نیشتمانیەوە– بە ئەنجامێکی گرنگ گەیشتووە ئەویش ئەوەیە کە بەبێ شۆڕشێکی چەکداری ناتوانرێت حوکمی کۆنەپەرستی لابرێت کە سەر بەداگیرکەرەو رزگاربوون لە پەیماننامەی بەغداو پەیماننامە داگیرکەریەکان و بەبێ رزگاربوونی عێراق ناتوانرێت سستمێکی دیموکراتی تێیدا بەرپابێت، پاشانیش ناکرێت هیواکانی هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی بەدیبێن لەئازادی و دیموکراسیەت.

لەبەرئەوە کاتێك سوپای عێراقی لەبەرەبەیانی ١٤ تەمموز راپەرینی ئەنجامدا بەسەر حوکمی پاشایەتیدا حزب دەستپێشخەری کرد لە لایەنگری راپەرینە چەکداریەکەیداو پاشانیش بۆ بەشداریکردن لەگەڵ حزبەکان و هێزە نیشتمانیەکانی تردا لەو کۆششانەی کەدەدران بۆ گۆرینی بۆ شۆڕشێکی نیشتمانی و دیموکراسی ڕاستەقینە. ئەوەش کاتێك

کرا کە ڕاپەڕینی سەربازی چەکداری لەدوای لەناوبردنی ڕژێمی پاشایەتی سستمی کۆماری ڕاگەیاندو پاشانیش چاکسازی کشتوکاڵی و ڕەهاکردنی ئازادیە دیموکراتیەکان لەماوەیەکی دیاریکراوداو پاشانیش ئەنجامدانی گۆڕانکاریی ڕیشەیی لە بونیادی کۆمەلآیەتیدا.

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری لیژنەی ناوەندی حزب نوسیویەتی و دەڵێت:
دوای ڕاگەیاندنی شۆڕش بەکەمتر لە کاتژمێرێك سەرکردەکانی حزب لەکەرکوك بروسکەیەکیان نارد بۆ سەرکردایەتی هێزە چەکدارە نیشتمانیەکان و پشتیوانی ئەو شۆڕشە پیرۆزەیان کرد و خوازیاربوون ببێتە سەرەتای سەردەمێکی نوێی پەیوەندی عەرەبی  کوردی بەوشێوەیەی کە خەیروباشەو پێشکەوتنی بەدواوە بێت بۆ هەردوو گەل. لە ١٦ی –تەمموز– ١٩٥٨دا حزب بەیاننامەیەکی دەرکرد کە لیژنەی ناوەندی کۆدەنگبوون لەسەری لەو کۆبونەوەیەدا کە لەهەمان ڕۆژدا بەستراو تێیدا هاتبوو:–

## بەیاننامەك بۆ گەلی کوردی

حزبی دیموکراتی کوردستانی پێشڕەوی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی ئەرکی مێژویی خۆی بەهەند وەردەگرێت وە لەپێناو بەدیهاتنی ئامانجەکانی نەتەوەی کورد دا بەڕاشکاوانە ڕایدەگەیەنێت مەزن بوونی هێزی بزوتنەوەی گەلی ڕزگاریخوازی عەرەبی و سەرکەوتنی و ڕزگاربوونی عێراق لەحوکمی پاشایی گەندەڵ و دوژمنی سەرسەخت و، دامەزراندنی سستمێکی کۆماریی ئازادو کشانەوەی عێراق لەپەیماننامەی بەغدا کەوا تیرەکانی ئاراستەکراون بۆ دڵی نەتەوەی کورد، هەموو ئەوە پتەوترین بنەما ساز دەکات بۆ بونیادنانی کۆشکی ژیانێکی پڕ لەخۆشی و ئازادی و یەکسانی بۆ هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی بۆیە حزب بڕیاری دا بەهەموو هێزو توانستەکانیەوە خەبات بکات بۆ بەرگریکردن لەکۆماری عێراق و چەسپاندنی و بوژاندنەوەی.
بۆ جێبەجێکردنی ئەم مەبەستەش هەموو تواناو هێزەکانی خۆی دەخاتە ژێر بەڕێوەبردنی ئەم شۆڕشە شکۆدارەوە. هەروەها هەموو ئەندام و لایەنگرەکانی دەکاتە سەرباز وەك گیانبەخشانێك بۆ کۆماری عێراقی و بەرگریی داگیرکەر و پیلانەکان و

کلکەکانی-.

حزبی دیموکراتی کوردستان- پارتی- بەردەوام بوو لەخەباتی بۆ پشتیوانیکردن لە کۆماری عێراقی تازەپێگەیشتوو سەرەڕای ئەوەی کە سەرکردە هۆشیارەکان هەر لەرۆژانی یەکەمەوە دەرکیان بەحەقیقەتی عەبدولکەریم کردووەو دەرکیان بە نەزعە فەردیی و تێڕوانینە کۆسمۆپۆلیتیەکانیان کردووە کە دژە بە هەردوو نەتەوەی عەرەبی و کوردی- مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد پاش چەند دیدارێکی لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمدا کۆی ئەم ووتانەی لەبەردەم لیژنەی ناوەندیی حزبدا ووت.

بەلأم ئاراستەی روداوەکان و بەدوایەکداهاتنی پیلانە سەربازیەکان بۆ لەناوبردنی حوکمی قاسم لەپشتەوەی گەل و بێ ئەوەی رای وەربگرن.. و ناچاربوونی قاسم تا ئازادیە دیموکراتیەکان رەها بکات تێشیدا ئازادی رێکخستنی سەندیکایی و پیشەیی و پاشانیش حزبی و نزیك بوونەوەی سەرۆکی حزب- لەوکاتەدا- مەلا مستەفای بارزانی کە راگەیاند خۆی بە سەربازێکی عەبدولکەریم قاسم دادەنێت و سەرۆکی حزب هەستا بەکارێك کە وەك کودەتایەك وابوو لەحزبدا ئەویش بەوەی مەکتەبی سیاسیەکی سەپاند کە تەواو سەر بەخەتی خۆی بوون هەموو ئەوە وایکرد کە تەبەنیکردنی تێڕوانینی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەلایەن حزبەوە مەحاڵ بێت.

لەهەفتەکانی یەکەمی شۆڕشدا حزب چەند وەفدێکی رێکخست لەهەموو شارو شارۆچکەکانی کوردستانی عێراقەوە کە وەفدی کوردستانیان پێکدەهێنا. وەك شێوەی خۆپیشاندانێك چوون بۆ وەزارەتی بەرگریی و چاویان بە پایەکانی حکومەتە نوێیەکە کەوت لە ٢٧ی تەمموزی ١٩٥٨ز دا سەرۆکی وەفدی کوردستان مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد وتارێکی پێشکەشکردو تێیدا پشتیوانی و لایەنگریی تەواوەتی گەلی کوردی بۆ شۆڕش راگەیاند هەروەها ئامادەبوونی بۆ بەرگریکردن لێی بەهەر نرخێك بێت هەروەها جەختیکردەوە لە پابەندبوونی گەلی کوردی بەبرایەتی عەرەبی کوردی و، بە یەکێتی خەباتی هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی و لەپێناو پاراستنی کۆماری عێراقی و پەرەپێدانی.

وتاری مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد

وتاری مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری حزبی دیموکراتی کوردستان لەوەزارەتی بەرگریی رۆژی ٢٧ تەمموز-١٩٥٨

*بەرێز سەرۆکی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی*

*بەرێز سەرۆك وەزیران و فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان.*

بەڕوانینێك لە رێکردنی پەیوەندیەکانی کورد و عەرەب هەر لەئیسلامبوونی کوردەوە ئەوەمان بەروونی بۆ دەردەخات هەردوو گەلی دراوسێ بە بەردەوامی دۆستایەتیەکی پتەو بەیەکیانەوە دەبەستێتەوەو ئاشتی و تەبایی بەسەریدا زاڵە لەسەردەمی ئیسلامیدا پەیوەندیەکانیان ئایینی ئیسلام رێکیدەخست کە دەڵێت هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان موسوڵماناناو هەموویان یەکسانن تەنها ئەوەیان نەبێت کە ئایندارو خۆپارێزترە — هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان عەرەبێك و عەجەمێکدا تەنها بەخواپەرستی و خۆپارێزیی نەبێت هەروەها — بەکردەوەی باش— لەسەردەمی عوسمانیشدا هەردوو گەل هاوبەش بوون لە زەلیلی و نەنگیدا هەروەها پێکەوە برسێتی و بێبەش بوونیان چەشتووە بەدەست دوژمنێکەوە کە وڵاتەکەیانی کردۆتە کۆگاو گەلەکەشی بە قشڵەو بارەگای سەربازی بۆ کۆمەکردن و ئاژوخەپێدانی ئەو جەنگە بەردەوامانەی کە پێیان هەڵدەستا. لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمیشەوە وڵاتە داگیرکەرە براوەکان وڵاتی عەرەب و کوردستانیان لەنێوان خۆیاندا دابەشکردو بەتاڵان بردیان ئینگلیز دوای راگەیاندنی ئاگربەست ئەوەی داگیرکرد کە پێی دەوترێت ویلایەتی موصڵ کە زۆرینەی زۆری کوردی تێدا نیشتەجێیە ئیدی ئەو گرفتە بەرپابوو کە پێی دەوترێت گرفتی موصڵ و لەکاتی خۆیدا چارەسەرکرا وەك ئەوەی زانراوە بە راپرسیەکی گشتی کە رای بەشێك لەکوردەکان لەباریەوە وەرگیرا، بەتەنیشت دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردیەوەو ئەوانی تریش بەژیانیان لەگەڵ عەرەبدا بەمەرجێك جۆرێك لەمافی ئیدارەی لامەرکەزیان پێبدرێت، ئیدی ویلایەتی موصڵ و لەناویشیدا کوردستانی باشور بەفەرمی لەساڵی ١٩٢٦دا لکێنرا بەعێراقەوە، ئەمەو کاتێکیش کە دەستوری عێراقی کۆن پێش ئەوە دانرابوو تێیدا رەچاوی ئەوە نەکرابوو هیچ دەقێك بخرێتە ناویەوە پەیوەندی بەمافە نەتەوەییەکانی کوردەکانەوە

هـەبێت ئـەو ئیـدارە تایبەتیـەش کـەوا کوردەکـان وویـستویانە کـە ئـارەزوو دەکـەن لەچوارچـێوەی یـەکێتی عێراقیـدا بـژین و مافـەکانی کوردەکـان و گرەنتیـەکان تێیـدا کورتکراوەتەوە لەهەندێك وتار کە لەلایەن بەرپرسە ئینگلیزو عێراقیەکانەوە لە بۆنەکاندا دراون هەروەها لەسەر هەنـدێك بـەڵێن کەبـەریتانیا لەبـەردەم کۆمەڵـەی گەلانـدا دابـووی بەوپێەی وڵاتی سەرپەرشتیکەرەو حکومەتی عێراقیش لەوکاتـەوە چـۆتە نـاو کۆمەڵـەی گەلانـەوە لەسـاڵی ١٩٣٢دا پێیـەوە پابەنـدبووە سـەرەڕای یاسـای باسـم یاسـای زمانـە ناوچەییەکان، بەڵام سـەرەڕای هـیچ و پووچـی ئـەم مافانـە ئـەوا ئینگلیـزو کەمینەیـەکی عێراقـی فـەرمانڕەوا کـە بەفـەرمانی داگیرکـەران دەجوڵێنـەوە نەیانهێـشت لـەو مافانـە بەهرەمەنـد بـبن بەمـەش کوردەکـان بەدرێـژایی چـەندین سـاڵ کـە تێیـدا پیـاوانی ئـەو سەردەمە حوکمیان دەکرد تووشی دوو جۆر لەستەم و چەوساندنەوە بوونـەوە بەپلـەی یەکەم ئەوان هەموو ئەو دەردو مەینەتی و هەژاریانەیان چەشت کە روبەرووی هەموو گەلی عێـراق بوویـۆوە هـەروەها لـەو زوڵـم و سـتەمانەی کـە تێیـدا دەکـران سـەرەڕای چەوسـاندنەوەی نەتـەوەیی تایبـەت و بێبەشـکردنیان لەمافـە نەتەوەییـەکانیان. ئـەم ڕەوشـەش بـووە هـۆی هەڵگیرسـانی چـەندین شـۆڕش کـە دەیـزانن و داگیرکـەرو کلکـە بـەکرێگیراوەکانیان چـەندین نـاو ناتۆرەیـان لێـدەنا جارێـك پێیـان دەووت بزوتنـەوە جوداخوازەکان و جارێکی تریش پێیان دەووت کۆمۆنیستی ئەمە لەکاتێکدا کـە بـەهیچ جۆرێـك لـەجۆرەکان هـیچ یـەکێك لەمانـە نـەبووە بـەڵکو بزوتنـەوەی نەتـەوەیی ڕزگاریخوازبوون و تێکۆشاون بۆ ڕزگارکردنی وڵات لەداگیرکەر و کلکە خیانەتکارەکانی و سەرلەنوێ بونیادنانەوەی پەیوەندیە عـەرەبی و کوردیـەکان لەسـەر بنەمایـەکی پتـەوتر لەلایـەن هـەردوو گەلـەوە بـێ دەستێوەردان لەلایـەن داگیرکـەرەوە کـەوا کـار لەسـەر سیاسەتی داگیرکەرانەی – دوبـەرەکی بخـەرەوە بـالا دەست دەبیت– دەکات. ئەمـەو داگیرکەرو کلکەکانی لەخەڵکانی تر باشتر دەیانزانی ئەم شۆڕشانە کەوا کوردەکـان پێـی هەڵدەسـتان جوداخـوازی نـەبوون چـونکە کوردەکـان دەزانـن جیابوونـەوە زیـان بەمەسـەلەکەیان دەگەیـەنێت و هەڵوێـستیان لاواز دەکـات هـەروەك چـۆن زیـان بـە بەرژەوەندیەکانی گەلی عەرەبی دەگەیەنێت و هەڵوێستی لاواز دەکات، داگیرکـەر زیـاتر

لەخەڵکی تر دەزانێت ئەم شۆڕشانە دروستکراوی دەستی خۆی نیە ئەگینا بۆچی بەوپەڕی دڕندایەتی و ڕەقیەوە ڕووبەڕوی دەبێتەوەو سەرکوتی دەکات و بۆ ئەم مەبەستەش هەموو تواناکانی خۆی دەخاتە بەردەست خزمەتکارەکانی لەفەرمانڕەوایانی عێراق. پاشان دەبێت بۆ چ مەبەستێك ئینگلیز کوردەکان لەدژی خزمەتکارەکانی خۆی بوروژێنێت کە ئەران گوێڕایەڵترێکن بۆیان لەدەستەکانی خۆیان و بۆچی دەبێت دژی ڕەوشێك بن کە باشترین مومکینێکە کە وێنای بکەن بۆ بەدیهاتنی تەماح و چاوتێبڕینە داگیرکاریەکانیان.. پاشان ئەگەر ئەو بزوتنەوانە لەلایەن هێزە داگیرکەرەکانەوە پشتیوانیان لێدەکرێت ئەی باشە چ شتێك وا دەکات سەر نەکەون؟ پاشانیش ئایا خودی هێزە داگیرکەرەکان بەرپرس نەبوون لەدابەشکردنی وڵاتی کوردان و داگیرکەرو خزمەتکارەکانی نەبوون کە لەخەڵك زیاتر دەیانزانی ئەم شۆڕشە کۆمەنیستی نیە، چونکە پەرەسەندنی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی گەلی کوردی لەقۆناغێکدا نیە کەبتوانێت هەستێت بەهەر بزاڤێکی کۆمۆنیستی بەلام ئەم بانگەشە بەتاڵ و درۆینانە کەلەلایەن داگیرکەران و کلکەکانیانەوە دەوتران بۆ پاساودانی ئەو هەمەجیەتە بوو کە پێی شۆڕشەکانیان لەناودەبردو ئابڕو ناوبانگیان لەکەدار دەکرد و ڕق و تورەیی عەرەبی لەدژی کوردەکان دەوروژاند وەك جێبەجێکردنی سیاسەتی داگیرکەرانەی -دوبەرەکی دروست بکە زاڵ و باڵا دەست دەبیت-. گەلی کورد بەتەنها خەباتی بۆ خۆی نەکردووە، بەڵکو بەشداریکردووە لەهەموو بزوتنەوە رزگاریخوازیەکانی گەلی عێراقدا بەشێوەیەکی گشتی و بەهۆی ئەم بەشداریکردنەشیەوە روبەڕوی زیندان و نەفیکردن و ئاوارەیی و کوشتن بۆتەوە سەرەڕای ئەوەی کە چەشتویەتی بەهۆی شۆڕشەکانیەوە لەکوشتن و ئاوارەبوونی بەکۆمەڵ، دڕنوترین نمونەشیان ئەوەیە کەبەسەر بارزانیە نەبەردەکان و ناوچە جوانەکەیان هات بەهۆی بەرپاکردنی جوڵانەوەیەکی رزگاریخواز لەدژی داگیرکەری ستەمکار و ڕەوش و بارودۆخی خراپ و تاقمی فەرمانڕەوای بەدوخراپەوە.

دەستەی فەرمانڕەوا لەماوەی ڕابردودا سەرەڕای سەرکوتکردنی تاوانکارانەی بۆ بزوتنەوەکانی گەلی کوردی پەنایبردە بەر ئامرازی تر بۆ دژایەتیکردنی ئەم بزوتنەوەیە یەکەمجار بەشداری کرد لە -پەیماننامەی سەعد ئاباد- و پاشانیش پەیماننامەی تورکی

عێراقــی لەســاڵی ١٩٤٦دا گرێــداو دوای ئــەوەش پەیماننامــەی بەغــدای بەســت. ئــەو پەیماننامەو ڕێکەوتنانەی کە مەبەست لێیان تەنگ پێهەڵچنینی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی بوو لەهەموو لایەکەوەو لـەناوبردنی بەشێوەیەکی کۆمـەڵی، لەلایـەکی تریشەوە پەنایبردە بەر ئەوەی ڕێگربێت لەبەردەم پێشکەوتنی کوردەکاندا و ئەویش بەگرتنەبەری سیاسەتی چەوساندنەوەی رەگـەزیی لەبەرامبەریانـدا شـوێنەوارەکانی ئـەم سیاسـەتەش لەهەندێك نمونەدا دەردەکەوێت کە تەنها بۆ نمونە باسیان دەکەم.

یەکـەم- لـەئامێزگرتنی کۆمــەڵێك لەخیانـەتکارو بـەکرێگیراوانی کـورد و رازیکردنیــان و فەرامۆشکردنی گەلی کورد.

دووەم- هــەوڵی لـەناوبردنی زمـانی کـوردی ئـەویش لەرێگـەی بەکارنەهێنانیانـەوە وەك زمانێکی فەرمی لەدامودەزگاکانـداو جێبەجێنـەکردنی یاسـای زمانـە ناوچـەییەکان تـەنها لەچـەند شــوێنێکی کەمــدا نــەبێت و دانــانی ئاســتەنگ لەبــەردەم جێبەجێکردنیــداو بەرتەسکردنەوەی چوارچێوە سنوردارەکەی.

سێیەم- بوارنەدان بەخوێنـدنی ئـەدەب و مێـژووی گـەلی کـوردی هـەتا لەخوێنـدنگاکانی کوردستانیشدا.

چوارەم- گۆڕینی ناوی کوردسـتان بـە -بـاکور-و کوردەکـان بـە باکوریـەکان لەهـەموو بۆنەیەکدا.

پێنجەم- ناردنی ژمارەیەکی زۆر کەم لەکوردەکان بۆ نێردەکان و وەرگرتنی خوێندکاری کەم لەکۆلیژە عێراقیەکاندا بەبێ ڕەچاوکردنی ڕێژەی ژمارەیی کورد. ئەمەش بووە هۆی کەمبوونی ژمارەی کوردە رۆشنبیرەکان لەوەرگرتنی کارە حکومیەکاندا.

شەشەم- رۆیشتن لەسەر سیاسەتی جیاوازی ڕەگەزی سەبارەت بە دامەزراندن و وەزیفە حکومیەکان و بەتایبەتی لەناوەندەکانی وەزارەتەکاندا.

حەوتەم- رۆیشتن لەسەر سیاسەتی جیاوازیکردن لەسـوپادا سـەبارەت بـە بەرزکردنـەوە بـۆ کۆمــەڵێك پلــەی دیــاریکراو و وەرنــەگرتنی کوردەکــان لەکۆلیــژی ئەرکانــدا تــەنها بەشێوەیەکی زۆر سنوردار نەبێت.

هەشتەم- بوارنەدان بەکوردەکان بە بەکارهێنانی هەر مافێکی سیاسـی هـەتا دەرکردنـی

هەر ڕۆژنامەیەکی سیاسی ئیدی ڕەنگ و ئاراستەکەی هەرچۆنێك بێت. ئەم سیاسەتە ڕەگەزپەرستیە هەڵەیە بەمەبەستە بووە هۆی ئەوەی گەلی کورد لەکاروان دوابکەوێت. بەوشێوەیە گەلی کوردی لەعێراق لەسەردەمی پێشودا چەوساوە بوو چەوساوەیەکی دوو لایەنە لەبەرئەوە تێکۆشاوە بۆ بەدیهێنانی دوو ئامانج یەکێکیان ڕزگارکردنی عێراق لەداگیرکەرو لەسستمی حوکمی گەندەڵ و دوەمیش بەدیهێنان و دابینکردنی مافە نەتەوەییەکانی.

ئازادیخوازانی کورد شانبەشان لەگەڵ ئازادیخوازانی عەرەبدا لەهەموو بوارەکاندا لەهەموو جەنگەکاندا تێکۆشاون و چوونە ناو زیندانەکانەوەو کوژراون و دورخراونەتەوە، لەگەڵ ئازادیخوازانی عەرەبدا هیواو بڕوایان هەبووە بەوەی لەناوبردنی داگیرکەرو داروودەستە خیانەتکارەکەی دەستبەری سازاندنی پتەوترین بنەما دەکات بۆ بونیادنانی تەلاری پەیوەندیەکان لەنێوان نەتەوەی عەرەبی و نەتەوەی کورد دا بەڕۆحی برایەتی و یەکسانی کە ئەو پەیوەندیانەیان بەدرێژایی مێژوو بەردەوام بووە و ئازادیخوازانی کورد هەموو بڕوایەکیان بەوە هەبووە هەموو سەرکەوتنێك کە نەتەوەی کوردی بەدەستی دەهێنێت لەخەباتی ڕزگاریخوازیدا سەرکەوتنێکیشە بۆ نەتەوەی عەرەبی بەشێوەیەکی گشتی و لەناوبردنی داگیرکەر و داروودەستەکانی لەعێراق سەرکەوتنە بۆ مەسەلەی هەردوو نەتەوەی عەرەبی و کوردی بەشێوەیەکی تایبەتی.

لەسەر ئەم بنچینەیەو بەم باوەڕەوە کوردەکان بەشداریان کردووە لەو شۆڕشە پیرۆزەدا کەوا سوپای عێراق بەهاوکاری لەگەڵ گەلی عێراقدا بەدەستی هێنا بۆ لەناوبردنی قەڵەمڕەوی تاقمی فەرمانڕەوای خراپکارو گەندەڵ.

لەسەر ئەم بنچینەیەو بەم باوەڕەوە ئەوان ئامادەن بۆ بەرگریکردن لەئازادیان بەخوێن و ڕۆحیانن ئەوەش کە لەدەستوری کاتیدا هاتووە لەدانپێدانان بەمافەکانی نەتەوەی کوردیدا و سەیرکردنی کوردەکان و عەرەبەکان وەك دوو شەریك و هاوبەش لەم نیشتمانەدا بەرهەمی خەباتی هاوبەشمانەو ئەوەش پشتیوانی دەکات و جەختدەکاتەوە لەسەر ڕاستی و دروستی ئەوەی کە ئازادیخوازانی عەرەب و ئازادیخوازانی کورد بۆی چوون لەوەی کە خەباتی گەلان بزوتنەوەیەکی پێکەوە بەستراوە وەك ئەڵقەکانی

زنجیرێك وە ئێمە مژدەدەرین بەم سەرەتا خۆشەی سەردەمی نوێی كۆماریمان و هیواخوازین یاسای پێویست دەربكرێت بۆ جێبەجێكردنی ئەو دەقەی كەلەدەستوردا هاتووە. ئەمەو هەموومان هیواخوازین و باوەڕمان وایە هەر هەنگاوێك كۆمارە نوێ و لاوەكەمان دەینێت سەبارەت بە پتەوكردنی پەیوەندیەكانی لەگەڵ ولآتانی عەرەبی ئازادبوودا ئەوا بەدڵنیاییەوە فراوانكردنێكی زیاتری لەگەڵدا دەبێت لەمافەكانی گەلی كورد بەشێوەیەك هەر هەنگاوێك كە نەتەوەی عەرەبی دەینێت بەرەو ئامانجەكانی لەهەمانكاتدا نزیكبوونەوەیەكی نەتەوەی كورد دەبێت لەئامانجەكانی بەتەنها بەمەش وادەبین كە هەموو كەلێنەكانمان بەڕووی داگیركەران و دارودەستەكانیاندا داخستووەو نمونەیەكمان پێشكەشكردووە كە چاوی لێدەكرێت لەچۆنیەتی پێكەوەژیانی دوو نەتەوەی برا لەژێر سایەی سستمێكی دیموكراسی ئازاد دا.

من بەناوی گەلی كوردەوە كە ئەم وەفدە نوێنەرایەتی دەكات زۆر سوپاسگوزارین لەسەر ئەو دەقەی كە لەدەستوری كاتیماندا هاتووەو دڵسۆزترین هەستی بەرزو بالآ دەردەبڕم كەوا گەلی كورد هەیەتی لەبەرامبەر كۆمارە تازەو لاوەكەمان و سەركردە ئازادیخوازەكانی و سوپا دلێرەكەی و، كوردەكان ئامادەن بە خوێن و بەرۆح و بەماڵ بەرگری لە كۆمارەكەیان و مافە نەتەوەییە بەدەستهاتووەكەیان بكەن.

بژی كۆماری عێراقی كۆماری عەرەب و كورد.

ئەمە دەقی ئەو وتارە بوو كە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد سكرتێری حزبی دیموكراتی كوردستان لەوەزارەتی بەرگری پێشكەشی كرد بەناوی وەفدەكانی كوردستانەوە كەسەردانی بەغدایان كرد دوای شۆڕشی تەمموز بۆ پیرۆزبایكردن لە سەركردەكانی كۆمارەكەو عەرەبەكان لەپشتیوانیكردنی گەلی كوردی بۆ شۆڕشی تەمموز.

## پارتی و حوكمی عەبدولكەریم قاسم

لەرۆژی یەكەمی ڕاگەیاندنی شۆڕشدا جەماوەری شاری سلێمانی و كەركوك و هەولێرو كۆیسنجق و زاخۆو عەمادیە لەژێر سەركردایەتیەكانی رێكخراوەكانی حزبدا خۆپیشاندانیان ئەنجامدا وەك پشتیوانیەك لەشۆڕش و جەماوەر فشاری خستە سەر یەكە چەكدارەكان لەسوپاو پۆلیس، بەتایبەتی لەكەركوك و سلێمانی بۆ ئەوەی

لایەنگری خۆیان بۆ رژێمی نوێ رابگەیەنن.. ئەم هەڵوێستەی گەلی کوردیش بایەخێکی گەورەی هەبوو لەشکست پێهێنانی مانۆڕو پلانگێڕیە داگیرکەریەکان کە وویستی کوردەکان بە عروبەی هەڵکشاو بترسێنێت بەداخەوە بزوتنەوەی نەتەوەیی هەربۆخۆیی لەعێراق لەوکاتەدا هەڵوێستێکی سلبی وەرگرت لەبەرامبەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا ئەم هەڵوێستە زۆر کوردەکانی ترساند لەوەی ببنە کەمینەیەك لەوڵاتێکی عەرەبی گەورەداو چارەنوسیان وەك چارەنوسی کوردەکانی لێ بێت بەدەست نەتەوەییە تورکەکانەوە.

سەرەڕای ئەوەی کە حزبی دیموکراتی کوردستان هەوڵێکی زۆریدا و پەیوەندیکرد بەسەرکردەکانی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی و کۆمارەی عەرەبی یەکگرتووەو سەرکردەکانی حزبی ئیستیقلال بەهیوای ئەوەی رازیان بکات بە داننان بەمافەکانی گەلی کوردیدا و رازیکردنیان بەوەی کە چ زیانێك دەگات بەمەسەلەی هاریکاری عەرەبی-کوردی ئەگەر ئەوان نکوڵی بکەن لەداننان بەمافەکانی گەلی کوردیدا هەروەها بە خودی بزوتنەوەی یەکێتی عەرەبی بەڵام هەڵوێستێکی دروستی دەست نەکەوت جگە لەهەندێك ووتەی دۆستانەو باش نەبێت لەلایەن سەرکردەکانی حزبی بەعسەوە و هەندێك لەسەرکردەکانی حزبی ئیستیقلال لەبەرامبەر گەلی کوردیدا.

پارتی و سەرکردە هۆشیارەکانی ئارەزوی ئەوەیان دەکرد باشترین جۆرەکانی پەیوەندی لەگەڵ بزوتنەوەی نەتەوەیی عەرەبیدا بونیاد بنێن بۆیە هەوڵیاندا بۆ دروستکردنی پەیوەندی ئیجابی لەگەڵ هێزە عەرەبیەکاندا بەتایبەتی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی. بەڵام سەبارەت بەهەڵوێست لە رەوشەکە ئەوا پارتی وای بینی دروشمی راست ئەوەیە کۆماری عێراقی بپارێزرێت و توندوتۆڵ بکرێت لەسەر بنچینەکانی دیموکراسیەت و ئەم دروشمەش وەك دیارترین دروشمەکانی پارتی مایەوە هەتا دوای بەرپابوونی شۆڕشی کوردیش لەدژی عەبدولکەریم قاسم. لەدوایین کۆبونەوەی لیژنەی ناوەندی حزبیشدا لەرۆڵە ئاشکراکەیدا و کاتێك حزب بووە ئۆپۆزسیۆنی حوکمی عەبدولکەریم قاسم، ئەم کۆبونەوەیە کە لەنیسانی ١٩٦١دا گیرا لیژنەی ناوەندی ئەم بڕیارەی خوارەوەی وەرگرت:-

لیژنــەی ناوەنــدی بڕیاریــدا ئــەرکی بنــچینەیی حزبمــان و هــەموو حزبــە نیــشتمانییەکان لەئێستادا ئەوەیە، کۆمارەکە بەهێزو بەتوانا بکرێت و حوکمی تێدا بــەرپا بکرێــت لەســەر بنچینەی دیموکراسیەتی ڕاست و دروست کــە مافــەکانی و ئازادیــە دیموکراســیەکانی بــۆ گەلی عێراق دابین بکات– ئازادی ڕێکخستنی حزبی– بۆ هــەموو لایەنــە نیــشتمانیەکان و، ســەندیکای پیــشەیی و ئازادیــەکانی ڕۆژنامەگــەری و بلاْوکردنــەوەو بیروبــاوەڕ– مــافی مومارەسەکردنی مافە نەتەوەییەکان ببەخشرێتە گــەلی کــورد لەناویــدا مافــە کــارگێڕیی و ڕۆشنبیریەکان ئەوەی کە پەرەسەندنی کۆمەڵگەی کوردستان فەراهــەم دەکــات لــەرووی پیــشەسازی و کــشتوکاڵی و کۆمەلاْیەتیــەوە.. لەکۆبونــەوەی لیژنــەی ناوەندیــدا دوای هەڵگیرسانی شۆڕشــی نیــشتمانی کوردســتان لــە ١١ ئــەیلول ١٩٦١ دا، ئــەم کۆبونەوەیــە لەکانونی یەکەمی ١٩٦١دا بەسترا لەگوندی عەودالاْن، لیژنەی ناوەندی بڕیاریدا بــەردەوام بێت لەتێکۆشان بۆ پاراســتنی کۆمارەکــەو بــەرپاکردنی دیموکراســیەت لەســەر بنــچینەی دیموکراسی و تێشیدا حوکمی زاتی بۆ کوردستانی عێراق وە بڕیاریدا دروشمەکانی حــزب کە ڕۆژنامەی خەبات هەڵیگرتبوون بەمشێوەیە بێت:– هیچ گرەنتیەك نیــە بــۆ پاراســتنی ســەربەخۆیی نیــشتمانی و ســەقامگیریی و بوژاندنــەوەی ولاْت و پێــشکەوتنی تــەنها بەدیموکراسیەت نەبێت دیموکراسیەتیش بوونی نیە بــەبێ ژیــانێکی پەرلــەمانی و ئازادیــە گشتیەکان و بەبێ چارەسەرکردنێکی دادپەروەرانە بۆ مەسەلەی کورد.

ئەی جەماوەری گەلەکەمان تێبکۆشە لەپێناو بەرەیەکی یەکێتی نیشتمانیدا بۆ کارکردن: لەدژی داگیرکەرو پرۆژەکانی و هاوپەیمانیەتیەکان و دارودەستەکانی.

بۆ بەرپاکردنی سستمێکی دیموکراتی پەرلەمانی دروست، بۆ ئەوەی گەلی کوردی بەمافــە نەتەوەییەکانی بگات لەناویشیدا حوکمی زاتی بۆ کوردستانی عێراق.

حزبــی دیمــوکراتی کوردســـتان– پـــارتی– پـــشتیوانی لەشـــۆڕش و حکومەتەکـــەی عەبدولکەریم قاسم کرد کە نوێنەرانی هەموو حزبە نیشتمانیەکانی لــەخۆگرتبوو جگــە لــە پارتی و حزبــی شــیوعی عێــراق کــە وەزیرێکــی هــەبوو لەحکومەتــدا کەئــەویش مامۆســتا ئیبراهیم کوببەی وەزیری ئابوری بوو حزب پشتیوانی لەحکومەت دەکرد تــا ئــەو کاتــەی کە سیاسەتەکەی دیموکراتی بێت. لەچاکسازی وەزاریدا مامۆستا عەونی یوسف کە تــازە

گەڕابوّوە بوّ ناو حزب لەوکاتەدا– چووە ناو وەزارەتەوە بێ راوێژکردن یان رەزامەندی حزب بەڵکو دورخرایەوە لەحزب. کاتێکیش قاسم نکوڵیکرد لەمافە دیموکراتیەکانی گەل و دەستیکرد بە دانانی رێساکانی حوکمە دیکتاتوّریە تاکرەوانەکەی حزب دەستیکرد بە ناڕەزایی دەربڕین لەسیاسەتەکەی، هەتا بەلاّو چورتمی قاسم بەگەل و مافەکانی گەیشتنە رادەیەکی تەحەمول نەکراو دژایەتیەکانی بوّ دیموکراسیەت و دیکتاتوّریەتەکەی ئاشکرابوون. روّژنامەی خەباتی زمانحالّی حزب پەرچەمی ئەم ناڕەزایەتیەی هەڵگرت کەبەروّحێکی بابەتی و زانستی کەوتە دەربرینی ناڕەزایەتیەکان و داوایکرد کە حوکمی عورف و رەوشە هەلاّوێردەییەکان لابرێن و ماوەی گواستنەوە کوّتایی پێبێت و دەستبکرێت بە ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی ئازاد لەکەشێك لەئازادی و دیموکراتی هەروەك چوّن داوای لەحزب کرد زیندانیە سیاسیەکان و حوکمدراوە سیاسیەکان ئازادبکرێن و واز لە راودونانی ژیانی حزبی و سەندیکایی و کوّمەڵە جوتیاریەکان و رێکخراوە دیموکراتیەکان بهێنرێت.

ئەم تێکوّشانەش کە حزب پێی هەستا لەدژی دیکتاتوّریەت بووە هوّی پشێوی و ئالّوّزی لەنێوان حزب و قاسمدا کە لەحزبی دیموکراتی کوردستانیدا ئاستەنگێکی بینیەوە لەبەردەم دیکتاتوّریتە تاکرەویەکەیدا کەوا کاری بوّ چەسپاندنی دەکرد. حوکمی قاسمی بەوە وەلاّمی حزبی دایەوە هەستا بەداخستنی ناوەندو مەڵبەندەکانی و ڕاودونانی سەرکردەکانی و گرتنی ئەندامەکانی و پاشانیش تەنگپێهەڵچنینی جەماوەری جوتیاری لایەنگرانی پارتی و شوێنکەوتوانی. قاسم هانی روّژنامە بەکرێگیراوەکانی خوّیی دا بوّ ئەوەی هێرش بکەنە سەر نەتەوەی کوردی و داوای تواندنەوەی بکەن.

تیروّرو توندوتیژی لەعێراقدا پەرەیسەندو قاسم دەستیکرد بە داخستنی روّژنامەی حزب دوای ئەوەی شکستی هێنا لەوەی حوکمێك لەئەنجومەنی عورفی دەربکات کەوا خەبات لەبەردەمیدا وەستا بەتوّمەتی بلاّوکردنەوەی وتارێك کتێیدا مشتومڕی لەبارەی مادەی دووەم و سێیەمی دەستورەوە کردبوو. لەساڵی ١٩٦١دا ئالّوّزی لەنێوان قاسم و کوردەکاندا گەیشتە ئەوپەڕی و قاسم هێزە چەکدارەکانی کوّکردەوە بوّ لێدانی ئەو گردبونەوە سەربازیەی کە لەکوردستان ڕویدابوو وەك ناڕەزاییەك لەدژی باجی زەوی و

سیاسەتی حوکمی قاسمی.

لەبەرامبەر ئەم حاڵەتەشدا کە مژدە بە شەڕێکی بەربلاو دەدات و هەڕەشە لە یەکێتی نیشتمانی و نەتەوەی کوردی دەکات- حزب پێی وابوو- ئەرکی نیشتمانی خۆیەتی داوا لەحکومەت بکات واز لەم سیاسەتە هەڵەیە بێنێت کە زیان بە بەرژەوەندیەکانی عێراق و پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی دیموکراتی دەگەیەنێت کە دان بەمافە نەتەوەییەکانی کوردیدا بنێت و فەراهەمیان بکات- ئەمەش ئەو بڕیارە بوو لیژنەی ناوەندیی حزب وەریگرت لەبەرامبەرە ڕەوشەکەدا لەگەڵ ڕاسپاردەدان بەپێشکەشکردنی یادداشتێك بەقاسم و هەروایشبوو مەکتەبی سیاسی حزب لە ٢٠-٧-١٩٦١دا یادداشتێکی دایە قاسمی سەرۆك وەزیر.

## یادداشتی حزبی دیموکراتی کوردستان

### دەربارەی ترسناکی ڕەوشەکە لەکوردستان

بەڕێز سەرۆکی وەزیران و سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکان لیوا ڕوکن عەبدولکەریم قاسمی بەڕێز.

لای هیچ کەسێك پەنهان نیە گەلی کوردی هەر لەراگەیاندنیەوە تێکەڵ بەشۆڕش بووە لەپێشەنگیشیەوە حزبی دیموکراتی کوردستان کە هەموو توانستەکانی خۆیی خستۆتە بەردەم سەرکردەکانی شۆڕش هەر لەساتەوەختەکانی یەکەمیەوە ئەمەش کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لەشکست پێهێنانی پیلانگێڕییە داگیرکەریەکان کەوا کۆمارەکەمانی کردبووە ئامانج ئەمەش بەدانپێدانانی دۆست و دوژمن. گەلی کوردی هیواخوازە شۆڕش سەرەتای سەردەمێکی نوێ بێت بۆ پەیوەندیەکان لەنێوان هەردوو نەتەوەی عەرەب و کوردی برادا ئەویش بەوەی بخرێتەسەر بنەمایە لەیەکسانی تەواوەتی لەنێوانیاندا بەشێوەیەك بۆ هەریەکێکیان ئازادی و دیموکراتی و ئاشتی فەراهەم بکات و بواربکاتەوە بۆ بەدیهێنانی ئەوەی خوازیاری بەدەستهێنانیەتی لە مافی نەتەوەیی ڕەوا لەچوارچێوەی یەکێتیەکی عێراقی سەر ڕاستانەدا، لەسۆنگەی ئەم خولیا جەماوەریە دڵسۆزانەیەوە حزبمان هەر لەسەرەتاوە ئەو دروشمانەی بەرزکردۆتەوە داوای

پێکەوەژیانی برایانەی کردووە لەنێوان عەرەب و کورددا لەسایەی کۆماری عەرەبی و کوردی دیموکراتیداو دژ بە هەر جۆرێك لەجیابوونەوەو جوداخوازی بووە.

ئێمە هەموومان خۆشحاڵ بووین بەخستنە ناوی هەردوو بنەمای هاوبەشی لەنێوان گەلی عەرەبی و کوردیداو داننان بەمافە نەتەوەییەکانی کورد دا لەدەستوری کۆماری عێراقیدا وەك دەقێك کە لەمادەی سێدا هاتووە، گەورەترین مژدە بوو، پێشبینیمان دەکرد دەقەکانی ئەم مادەیە بگۆڕێن بۆ حەقیقەتی مادی و شوێنەوارەکانی لەهەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگەی کوردستانیدا رەنگ بداتەوەو لەپەرەسەندنی گەلی کوردی لەنزیکترین کاتدا. ئەمە لەکاتێکدا شتێك لەوە روینەداو پرۆژەی خوێندنی زمانی کوردی کە حکومەت بڕیاری لەسەرداو دوای خاوەخاوکردن و دواخستنی بۆ زیاتر لەساڵێك، بە ئیفلیجی هاتە بوونەوەو هیچ دەسەلات و شایستەگیەکی نیەو بێزراوە، هیچ شتێك لەوە لەخۆی ناگرێت کەوا گەلی کوردی بۆی تێدەکۆشێت هەر لەدامەزراندنیەوە هەتا ناوەکەی واتە ناولێنانەکەش هەروەها بەوشێوەیە نەهات گەلی کوردی ئارەزووی دەکات و دەیەوێت.

راستە گەلی کورد هەندێك کات لەمافە دیموکراسیەکان بەهرەمەند بووە کەوا شۆڕش بۆ هەموو گەلی عێراقی بەتێکڕایی فەراهەمی کرد، بەلاّم ئەوە بەردەوام نەبوو هەروەك چۆن شوێنەواری ئەو شکستەی تووشی دیموکراسیەت هات لەولاّتدا ئەوا دوو قات بوو سەبارەت بەگەلی کوردی کەوا وای لێهاتووە هەست دەکات نە تەنها بێبەشە لەهەموو مافە نەتەوەییەکانی، بەڵکو کراوەتە ئامانج بۆ هەڵمەتێکی چەوساندنەوەی نەتەوەیی توندو تەنها بۆ نمونەش لێرەدا باس لەهەندێك روخساری سیاسەتی چەوساندنەوەی نەتەوەیی دەکەین کەلەدژی گەلی کورد لەعێراقدا گیراوەتەبەر:

١-هەڵپەساردنی مادەی سێ لەدەستور هەڵپەساردنێکی تەواوەتی. فەرامۆشکردنی بەئەنقەستی ئەوەی کۆماری عێراق کۆماری عەرەب و کورد بێت لەهەموو بۆنەکاندا کەوا پێویست دەکات ئەوە باس بکرێت.

٢-هەڵپەساردنی کارەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتی خوێندنی کوردی بەشێوەیەکی کرداری و گۆڕینی بۆ تەنها بەڕێوبەرێتی هەماهەنگی لەنێوان وەزارەتی مەعاریف و هەردوو بەڕێوەبەرێتی مەعاریف لەسلێمانی و هەولێر.

٣-بێبەشکردنی خوێندکاری کوردی لەخوێندن بەزمانە نەتەوەییەکەی لەقوتابخانە ناوەندی و ئامادەییەکاندا وەك ئەوەی مافە مرۆییەکان دەیخوازن وێڕای ئەو مافانەی کەلەدەستوردا دانپێدانراون.

٤-فەرامۆشکردنی بەکارهێنانی زمانی کوردی وەك زمانێکی فەرمی لەدەزگا حکومیەکاندا لەلیوا کوردیەکاندا ئەمە لەکاتێکدا ئەم مافە تەنانەت حکومەتەکانی پێشویش نەیانوێراوە کوردەکانی لێ بێبەش بکەن.

٥-دانەمەزراندنی فەرمانبەرە کوردەکان لەناوچەی کوردستان پێدانی رێژەیەکی زۆر کەم پێیان لەبواری دامەزراندندا بەشێوەیەکی گشتی و لە وەزیفە باڵاو هەستیارەکاندا بەشێوەیەکی تایبەتی..

٦-گواستنەوەو دورخستنەوەی فەرمانبەرە کوردەکان بۆ باشوری عێراق و بەڵکو جێبەجێکردنی رێسای گواستنەوە بەسەر پۆلیسیشدا کەوا دادەنرێن دەبێت لەناوچەکانی خۆیاندا بەکاربهێنرێن. لەماوەی دوو ساڵی رابوردودا بەسەدانیان گوازراونەتەوە بۆ بەغداد.

٧-تەرخان نەکردنی هیچ پشکێك لەپرۆژە پیشەسازی و ئاوەدانی و کشتوکاڵیەکان و پرۆژەکانی تر لە پرۆژەی پلانی ئابوریی بۆ لیوا کوردیەکان و نزیکەی ٩٠٪ی پرۆژەکان کە حکومەت دەیەوێت بەئەنجامیان بگەیەنێت لەم لیوایانەدا بریتین لە پرۆژەی کۆن کە پێشتر بڕیار لەسەریان درابوو یان خەریکبوو تەواو دەبوون کاتێك کە شۆڕش رویدا، نەك تەنها ئەمە بەڵکو حکومەت کەمتەرخەمی نواند لەتەواوکردنی هەندێك لەو پرۆژانەدا سەرەڕای گرنگیەکەی و تێپەڕبوونی ماوەیەکی درێژ بەسەریدا ئەمە و هەندێکی تریان هەڵوەشێنرانەوە وەك پرۆژەی کارگەی شەکر لەسلێمانی. لێرەدا هەر دەبێت ئاماژە بکرێت بۆ تاکە پرۆژەی پیشەسازی کە حکومەت بڕیاریدا بونیادی بنێت لەهەولێر، بەڵام

گواستیەوە بۆ لیوایەك لەدەرەوەی کوردستانەوە. کەئەویش کارگەی گۆرەوی و جلی ژێرەوەو ئەو شتانە بوو.

٨-رێگیریی لە وەرگرتنی خوێندکارانی کورد بەشێوەیەکی تایبەتی لەکۆلیژی سەربازی و بەرز نەکردنەوەی پلەی ئەفسەرە کوردەکان کەشایستەی بەرزکردنەوەن و هەستان بەلێپێچینەوەی ستەمکارانە لەبەرامبەر ئەوانی تردا ئەمەش وایکرد بەشێکی زۆریان داوای وازهێنان بکەن و هەرخێراش وازهێنانەکەیان قەبوڵ کراوە.

٩-هەندێك لەدامودەزگاکانی حکومەت دەرەبەگە کوردەکانیان گرتۆتە خۆیان ئەوانەی لایەنگری داگیرکەرو خزمەتکارانی نوری سەعیدو عەبدولئیلاهن ئەوانەی کەوا گەلی کورد بە خیانەتکاریان دادەنێت و پارەو چەکی زۆرو زەبەندی پێداون، و بە بەردەوامی هانیان دەدات لەسەر ئەو رێبازەیان کە دژ بە بەرژەوەندی گەلی کوردو بەرژەوەندی کۆماری عێراقە.

١٠-بایەخپێدانی هەندێك لە دەزگاکانی دەوڵەت بەو فەرمانبەرانەی کە دوژمنایەتی خۆیان بۆ نەتەوەی کورد دەسەلمێنن و دەستیان پێوە دەگرن و پێشیان دەخەن بەسەر ئەوانی تردا، مەبەستیشم ئەو فەرمانبەرانەیە کە هیچ خەمێکیان نیە ئەوە نەبێت درزی ناکۆکی لەنێوان گەلی کوردی و حکومەتی ئێستادا فراوان بکەن و رۆحی رق و تورەیی لەنێوان عەرەب و کورددا بلاوبکەنەوە بەکردارە جۆراوجۆرەکانیان کە پێچەوانەی یاسا و ئامانجەکانی گەلە لەشۆڕشی ١٤ تەممووزدا.

١١- چەوساندنەوەی حزبەکەمان پارتی دیموکراتی کوردستانی پێشرەوی گەلی کوردی تێکۆشەر لەپێناو مافە نەتەوەییەکانی، گەلی کوردی دڵسۆز بۆ یەکێتی عێراقیی راستگۆیانەو بۆ ئامانجەکانی شۆڕشی ١٤ تەمموزی رزگاریخوازی دیموکراتی چەوساندنەوەیەك زیاتر لەوەی لەسەردەمی رژێمی پێشوودا چەشتوویەتی.

١٢- نەهێشتنی رۆژنامەگەریی کوردی و داخستنی رۆژنامەکان و گۆڤارەکان کە بەزمانی کوردی دەردەچن وەك -خەبات- کوردستان- ئازادی- دەنگی کورد- راستی- هەتاو- ... هتد.

١٣- لێپێچینەوە نەکردن لەگەڵ ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەدا بانگەشە بۆ تواندنەوەی گەلی کوردو نکوڵی کردن لەمافەکانی دەکەن، ئەو هەڵمەتە زاڵمانەیەی کە ساتێك نا ساتێك ئەو ڕۆژنامانە پێی هەڵدەستن کە وا ناسراون پەیوەندی توندوتۆڵیان بەلایەنێك یان لایەنێکی ترەوە هەیە لەو لایەنانەی کە بەرپرسن لەدەوڵەتدا.

١٤- سوکایەتیکردن بەگەلی کوردی بەوەسفکردنی شۆڕشەکانی و ڕاپەڕینەکانی کە پێی هەستاوە لەپێناو ڕزگارکردنی خۆیدا بەتایبەتی و گەلی عێراقدا بەگشتی بەوەی کە بەهاندان و ئیحای داگیرکەر ئەنجامدراون.

١٥- بایەخ نەدان بەهەستی گەلی کوردی و کەرامەتی و، دژایەتیکردنی لەوەی کە وا سەیری خۆی دەکات گەلێکەو خاوەن تایبەتمەندی نەتەوەیی جیاو نیشتمانی تایبەت بەخۆیەتی و، دژایەتیکردنی و زەلیلکردنی و دابەزاندن لەهەستی نەتەوایەتی بەهەموو شێوازو ئامرازێك.

١٦- گرتنەبەری سیاسەتی ناکۆکی بخەرەوە زاڵ و باڵا دەست دەبێت - ی داگیرکەر لەلایەن هەندێك لەلایەنە حکومیەکانەوە بەشێوەیەکی ئاشکرا کەلەنمونەکانی ئەم جۆرە سیاسەتەش ئەوەیە گواستنەوەی ناوەندەکانی مەشقپێکردنی ئەوانەی بەسەرباز دەگیرێن کوردەکان دەنێرن بۆ لیواکانی باشورو عەرەبەکانیش بۆ لیواکانی باکورو گواستنەوەی سەربازە کوردەکان بۆ باشور و عەرەبەکان بۆ کوردستان و بەکارهێنانیان لە سەرکوتکردنی ئەو شڵەژان و پێکدادانانەی کەوا خەڵکی ناوچەکە ئەنجامی دەدەن دیارترین نمونەش بۆ ئەوە بریتیە لە بەکارهێنانی سەربازەکان و پۆلیسە کوردەکان لەڕوبەڕوبونەوەی مانگرتنی شۆفێری ئۆتۆمبیلەکان بەتایبەتی لەناوچەی ئەعزەمیە.

١٧- گرتن و دورخستنەوەو بەندکردنی نیشتمانپەروەرە کوردەکان بەکۆو بەتایبەتی مامۆستاکانیان هەتا هەندێك لەقوتابخانەکان مامۆستایان تێدا بەندکراوە لەناویشیدا بەرێوەبەرەکە ئەمەش بووە هۆی داخستنی دەرگای قوتابخانە بەڕووی خوێندکارەکانیدا وەك ئەوەی لەقوتابخانەی -بیبو- لەناوچەی عمادیە ڕوویدا.

١٨- جیاوازیکردن لەنێوان عەرەب و کوردەکاندا هەتا لەوەی کەپەیوەستە بە ئازادکردنی گیراوەکان و دورخراوەو بەندکراوەکان ئەوانەی کە دەسەڵات فرێیان دەداتە

ناو گرتوخانەکانەوە بێ هیچ پاساوێك. کاتێکیش حکومەت دەیەوێت هەندێکیان بەربدات بۆ ئەوەی شوێنەکە چۆڵ بێت بۆ هەندێکی تر بەروونی جیاوازی دەکات لەنێوان گیراو و دورخراوەو بەندکراوێکی عەرەبی و کوردیدا. پێشتریش هیچ لیستێکی ئازادکردنی کوردێکی لەخۆنەگرتووە مەگەر گومان لەمەسەلەی رەگەزنامەکەیدا هەبووبێت.

١٩- بێدەنگ بوونی حکومەت لەو دەستدرێژی و دەستگیرکردنانەی بەسەر کوردەکاندا هات لەکەرکوك بەتایبەتی و نواندنی هەڵوێستی تەماشەکەرو هاندەر بۆی ئەم کارانەو هی تریش بەروونی روخسارەکانی ئەو سیاسەتە دوژمنکاریە پیشان دەدات کە هەندێك لە لایەنە حکومیەکان دەیگرنەبەر لەبەرامبەر گەلی کوردی دڵسۆزدا بۆ ئامانجەکانی شۆرشی ١٤ تەمموزی رزگاریخوازی دیموکراتی و بۆ برایەتی عەرەبی کوردی و بەرەنگیکار لەدژی داگیرکەرو داودەستەکانی و پیلانەکانی. لەکاتێکیشدا کەوا گەلی کوردی بەدەست شوێنەوارەکانی ئەم سیاسەتەوە دەناڵێنێت بەتایبەتی و لە بێبەشبوونی گەلی عێراقی بەگشتی لەمافە دیموکراتیەکانی بەشێوەیەکی گشتی سەرلەنوێ پلماندن و وروژاندنەکانی بەکرێگیراوانی داگیرکەر پەیدابوەوە ئەوانەی رونمان کردەوە کە چۆن هەندێك لە دەزگاکانی دەوڵەت لەئامێزیان دەگرێت و نازیان دەداتێ و بە پارەو بەماڵ و بەچەك کۆمەکیان دەکات. هەموو ئەو سکاڵاو نارەزایانەش دەرهەق بەم سیاسەتە بەبادا چوون ئەمەش وەك هەمانشێوەکانی تر کاتێك کە ئەم چەتانە دەستدرێژی دەکەن، بەڵکو فەرمانبەرە حکومیە بەرپرسەکان هەستان بە پلیشاندنەوەی راپۆرتەکان لەبارەیانەوەو دەستکاریکردنیان و ناردنیان بۆ بەغداد بەئامانجی داپۆشینی هەڵەو تاوانی هاورێکانیان و فراوانکردنی درزی ناکۆکی لەنێوان حکومەت و خەڵکە کوردە دڵسۆزەکاندا.

لەم کاتەشدا هەروەها دەسەلآتدارە حکومیەکان لەوێ بە ئەرکی خۆیان هەڵنەستان لەرووی پاراستنی ئاسایش و رێگرتن لەرژانی خوێنی هاولآتیان بەڵکو هەندێکیان هەستان بە هەڵگیرساندنی ئاگری فیتنەو دوبەرەکی و دوای کۆتای هاتنی شەرو گەرانەوەی خەڵك بۆ شوێنەکانی خۆیان بیستمان حکومەت هەستاوە بەبلآوکردنەوەی هێزی زۆر لەناوچەکەو دەوروبەری هاوکات پروپاگەندەی ئەوەش هەیە حکومەت بەنیازە

لـەهاولاّتیانی هەنـدێك ناوچـەی کـوردی بـدات و خـودی نەتـەوەی کـوردی لەناوبـەرێت هەروەها ئەو پروپاگەندانەی تر کە بوونە هۆی رەوشێك لەوپەڕی شڵەژان و هەستیاریی و تەنگهەڵچنی، ئەمـەش وا لەهـەر هاولاّتیـەکی دڵسۆزی ئـەم نیشتمانە دەکات هـەروەها هەرکەسێك کە مەسەلەی دورخستنەوەی مەترسی لەیەکێتی خاکی عێراقی بەلاوە گرنگە دەستپێشخەری بکات بۆ چاککردنی رەوشەکەو گێڕانەوەی مەسەلەکان بۆ بنەچەو باری ئاسایی خۆیـان پـێش ئـەوەی کێشەکان کەڵەکـەبن و برینـی قـوڵ بخەنـە نـاو قـەوارەی عێراقیەوە، حزبی دیموکراتی کوردسـتان لـەپێناو بـەرگری لەمافـە نەتەوەییـەکانی گـەلی کوردیدا دڵسۆزە بـۆ یـەکێتی عێراقـی و بـۆ رزگـاری و دیمـوکراتی و ئاشـتی و پێـی وایـە ئەرکی ئەوە لەم کاتەدا نالەباری رەوشەکە و مەزنی بەرپرسیارێتی و مەترسی بارودۆخی کوردسـتان بـەبیر بەرپرسـان بێنێتـەوە. وە بەهـەموو ڕاشـکاویەکەوە بڵێـت بـەردەوامی لەسەر ئەو سیاسـەتەی کـە هەنـدێك لەروخـسارەکانیمان باسـکرد و پـشتیوانیکردنی بـە بلاّوکردنـەوەی سـەربازی و کـارە رووژانـدن و پلماندنـەکان هەڕەشـەی هەڵگیرسـانی جەنگێکی ناوخۆیی لەولاّت دەکات کە هیچ کەسێك لێی سودمەند نابێت داگیرکەرو کلك و داردەستەکانی نـەبێت و هـەردوو گـەلی عـەرەبی و کـوردیش لێـی زەرەرمەنـد دەبـن کـە تائێستا لاپەڕەی پەیوەندیە دێرینەکەیان هەر سپی و پێگەردی ماوەتەوە.

ئەمە و ئێمە لەکاتێکدا گەلی عـەرەبی بـێ تـاوان دەکـەین لـەو کـارە دوژمنکاریانـەی کـە هەنـدێك لایـەنی حکـومی و فەرمانبـەرانی عـەرەب پێـی هەڵدەسـتن بـەپێی پلانـەکانی داگیرکەر وای دەبینین کە هیچ تاکێك یان حکومەتێك ناتوانێت بـرا عەرەبـەکانمان ناچـار بکـات رووی گولـەکانیان ئاراسـتەی سـنگی بـرا کوردەکانیـان بکـەن هـەروەك چۆن وای دەبینین کە هەستان بە خڕکردنەوەی سەربازی لەناوچەی کوردستانی دڵسۆز بۆ کۆماری عێـراق لەکاتێکـدا کـە هێـزە داگیرکـەرەکان و ئەوانـەی لایـەنگری ئـەون هەڕەشـە لـە شوێنەکانی تری کۆمارە خۆشەویستەکەمان دەکەن، کارێکی هەڵەیـەو زیـان دەگەیـەنێت بە بەرژەوەندی ولاّت. بۆیە پێمان وا نیە هەر حکومەتێکی جـدی لەدوژمنایـەتیکردنی بـۆ داگیرکەر بەم کارە هەستێت و پشت لەداگیرکـەری دوژمنـی گـەلان بکـات و رووی ئـاگری تفەنگەکانی بکاتە گەلەکەی و هێزە نیشتمانیە دڵسۆزەکانی تەنها کاتێك نەبێت کەلایەنی

داگیرکەری رامکردبێت. ئێمە هێشتا حکومەت بە بێ بەری دەزانین لەوەی کەئەم جۆرە هەڵوێستە بگرێتەبەر وە بۆ رزگارکردنی وڵات لەمەترسیەك کەلەهەرچوارلاوە دەوری داوەو لەناخەوە هەرەشە لەیەکێتی نیشتمانیمان دەکات، داوا لەحکومەت دەکەین هەستێت بەم لێپێچینەوانەی خوارەوە بەشێوەیەکی خێرا:

–کێشانەوەی هێزەکان کە بەم دوایە نێراون بۆ چەند ناوچەیەکی دیاریکراو لەکوردستان بۆ بنکەکانی پێشوی خۆیان و ئەنجامنەدانی هیچ جموجوڵێکی سەربازی نائاسایی کە پێشتر لەو شوێنانەدا ئەو جولاَندنانەیان پێنەکراوە.

–کێشانەوەی سەرۆکە کارگێڕیی و ئاسایشی و پۆلیسیەکان و ئەو بەرپرسانەی کە رۆڵێکی دیاریان هەیە لە روداوەکانی ئەم دواییەدا ئیدی بە فەرامۆشکردنی ئەنقەست بێت یان هاندان یان شێواندنی ڕاستیەکان بێت، رەوانەی دادگا تایبەتیەکان بکرێن بۆ ئەوەی سزای دادپەروەرانەی خۆیان وەربگرن.

–گێڕانەوەی فەرمانبەرە دورخراوەکان و گوێزراوەکان بۆ کوردستان بۆ ناوچەکانیان و دانانی موتەصەریف و قایمقام بۆ لیواکانی کوردستان لەکوردە دڵسۆزەکان بۆ کۆمارو بۆ برایەتی عەرەبی کوردی.

–جێبەجێکردنی مادەی سێ لەدەستوری عێراقی جێبەجێکردنێکی تەواو و بەدیهاتنی یەکسانی تەواوەتی لەنێوان هەردوو نەتەوەی عەرەبی و کوردی لەهەموو ڕوەکانەوە وەك دوو نەتەوەی برا لەسایەی دەوڵەتی عێراقی.

–پاککردنەوەی دەزگاکانی حکومەت لەو کەسانەی کە دژی رۆحی شۆڕشی ١٤ تەمموزی رزگاریخوازن.

–رەهاکردنی ئازادیە دیموکراتیەکان بۆ گەل و کۆتایی هێنان بەماوەی گواستنەوە بەخێراترین کات بۆ ئەوەی وڵات ببرێت بەڕێوە بەپێی سستمی دیموکراتی تەندروست لەلایەن حکومەتێکەوە کە بەرپرس بێت لەبەردەم پەرلەمانێکی هەڵبژێردراودا لەلایەن گەلەوە لەهەڵبژاردنێکی ئازادو ڕاستەوخۆداو هەڵوەشاندنەوەی حوکمە عورفیەکان و نەهێشتنی ئاسەوارەکانی.

-جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆنگرەی مامۆستایانی کوردی ساڵی ١٩٦٠ بۆ پەرەپێدانی ڕۆشنبیری کوردی.

-زمانی کوردی بکرێتە زمانێکی فەرمیی لەهەموو دەزگا فەرمیەکاندا لەناوچەی کوردستان.

-لابردنی شوێنەواری هەموو سیاسەتەکانی جیاکاریی ڕەگەزی کە لەبەرامبەر کوردەکاندا دەگیرێتەبەر لەوانەی پێشتر خرانەڕوو وە سزادانی ئەوانەی کە بانگەشە بۆ جیاکاریی لەنێوان ڕۆڵەکانی گەلی عێرقیدا دەکەن.

-ڕەهاکردنی کشتوکاڵی توتن لە کۆتی دۆنم لەو ناوچانەدا کە شیاون بۆ کشتوکاڵ.

-چاککردنی یاسای باجی زەوی کە ببێتە هۆی سووککردنی باری جوتیاران و لابردنی ئەو بار قورسیەی یاسای نوێ خستویەتە سەرشانیان.

-چارەسەرکردنی بڵاوبونەوەی بێکاری بەدەستکردن بە پرۆژەی ئاوەدانیی و پیشەسازی و خێراکردن لەتەواوکردنی پرۆژە وەستێنراوەکان و دانانی پرۆژەی تر لەپلانی ئابوریدا. -نەهێشتنی گرانی ئەویش لەڕێگەی لێدانی ئەو دەستانەوە کە یاری دەکەن بەنرخەکان و خۆراکی هاوڵاتیان قۆرخ دەکەن.

ئێمە لەکاتێکدا داوا لەحکومەتی عێراقی دەکەین هەستێت بەم کارانە بەشێوەیەکی خێرا بۆ نەهێشتنی ئەو مەترسیەی کە لەپێشەو ڕێگریی لەبەردەم پیلانەکانی داگیرکەرو هاوبەشە نەوتیەکانیان و کلك و دارو دەستەکانیان و پشتیوانی لەچەسپاندنی یەکێتی عێراقی ڕاستگۆیانە، داواش لە ڕۆڵەکانی گەلی عەرەبی دەکەین لەعێراق هەروەها هاوڵاتیانی تریش هەستن بەهەمووو ئەوەی کە دەتوانێت وا لەحکومەتی عێراقی بکات هەستێت بەجێبەجێکردنی ئەم داخوازیە ڕەوایانە بەنزیکترین کات هەروەك چۆن داوا لەهەموو حزبە نیشتمانیەکان دەکەین پشتیوانی لەتێکۆشانمان بکەن بۆ پاراستنی یەکێتی عێراقی و نەڕژانی خوێنی ڕۆڵەکانی گەلی عێراقی و شکستپێهێنانی پرۆژە داگیرکەریەکان کە ئامانجی لەناوبردنی هەموو دەسکەوتەکانی شۆڕشە نەمرەکەمانە لە ١٤ تەممووزداو بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتی داگیرکەر و کۆنەپەرستی بەد بۆ وڵاتەکەمان.

بژی یەکێتی عێراقی ڕاستگۆیانە.

بژی کۆماری عێراق کۆماری عەرەب و کورد
بژی برایەتی عەرەبی کوردی بۆ هەمیشە.
مردن و سەرشۆڕیی بۆ داگیرکەران و کلکەکانیان و دوژمنانی سەرسەختی گەلان.
"مەکتەبی سیاسی حزبی دیموکراتی کوردستان". ٣٠-٧-١٩٦١
-وێنەیەکی بۆ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی شکۆدار.
- بۆ هەموو حزبەکان و دەزگا نیشتمانیەکان.

رەتکردنەوەش لەلایەن قاسمەوە چارەنوسی ئەم یاد داشتە بوو، دوای ئەوە قاسم زیادەڕۆیی کرد و هەوڵیدا بەهێزی چەکداری گەلی کوردی ملکەچ بکات. زیاتر هێزی سەربازی لەکوردستاندا بلاوکردەوە و دەستیکرد بە پرۆسەیەکی فراوان بۆ کڕینی لایەنگرو بەکرێگیراو ، حزبیش پەنای بردە بەر شێوازێکی تر بۆ رازیکردنی بەوەی کە هەوڵەکانی نەزۆکن و نیشاندانی هاوکاری گەلی کوردی لەگەڵ یادداشتەکەیدا، هەربۆیە داوایکرد مانگرتنێکی سیاسی گشتی لەکوردستان و لە بەرواری ٦ ئەیلولدا ئەنجام بدرێت کە رێکەوتە لەگەڵ یادی راپەڕینی ئەیلولی شکۆداریشدا. مانگرتنەکە رویداو سەرکەوتوو بوو لەهەموو ناوچەکانی کوردستانداو بازاڕەکان داخران و کارگەو شوێنەکانی کار و جموجوڵی هاتوچۆو گواستنەوە لەهەموو شوێنەکانی کوردستاندا وەستان ئەم مانگرتنە سیاسیەش بێ هاوتابوو کە پارتی بەشارەزاییەوە پێشەوایەتی کردو رێکیخست.

بەلام لیوا قاسم گوێی لە دەنگی عەقلّ و بانگی لۆژیك نەگرت و دەستیکرد بە جولاندنی هێزە سەربازیەکان و لە رۆژی ٩ ئەیلولدا کۆبونەوە کوردیەکانی بەتۆپ و فرۆکە بوردمانکرد - لەدەربەندیخان- پاشان دەستیکرد بە هێرشە گشتیەکەی بۆ کوردستان لە رۆژی ١٠-ئەیلول١٩٦١ لەبەرامبەریشدا بزوتنەوەی بەرگریی چەکدار بۆ وەلامدانەوەی هەلگیرسا.

حزب چەکی بەرووی حوکمی قاسمدا هەلگرت و بڕیاریدا دروشمی خستنی حوکمی دیکتاتۆری قاسمی هەڵبگرێت بەو پێیەی قاسم هەموو دەروازەکانی تێکۆشانی ڕەواو ئاشتیانەی بەڕووی حزب و گەلی کوردیدا داخست بەڵکو هەموو گەلی عێراقی.

پارتی راستگۆیانە وویستی حوکم لەعێراق بگۆڕێت بۆ حوکمێکی دیموکراتی پەرلەمانی بەشێوازی ئاشتیانە واتە بەشێوازی تێکۆشانی جەماوەری ناچەکداریی. بەڵام لادانی قاسم و زوڵم و ستەم و هەوڵەکانی بۆ سەپاندنی حوکمە دیکتاتۆریە تاکڕەویەکەی و بەردەوامی پێدانی و پاشانیش دژایەتیکردنی توندی بۆ دەسکەوتە دیموکراتیەکانی گەل و پەنابردنی بۆ هێزی چەکداری بۆ سەرکوتکردنی تێکۆشانەکانی گەل و ڕێگرتن لە پەرەسەندنی عێراق بەرەو دیموکراسیەت و هۆکارەکانی تر کەباسکران، هەموو ئەمە پارتی ناچارکرد شێوازی خەباتی چەکداری بگرێتەبەر.

# پارتی و دیموکراسیەت

بزوتنــەوەی رزگــاریخوازی کــوردی و لەسەروشــیانەوە پــارتی یــەکێك بــوو لەقــەڵاکانی بزوتنەوەی دیموکراتی لەعێراق. تیمێکی پێشڕەوی پێکهێنا لێی و بەشێوەیەکی ئۆرگانی پەیوەست بوو پێیــەوەو، حــزب لەخەباتیــدا تێکۆشــا بــۆ بــەدیهێنانی ژیــانی دیمــوکراتی لەعێراق بەو پێیەی کە کلیلی چارەسەری هەموو گرفتە سیاسی و ئابوریەکانە کەوا گــەلی عێراق بەدەستیەوە دەناڵێنێت.

لەسەردەمی پاشایەتیدا، هەروەها لەســەردەمی کۆماریــشدا حــزب خــەباتی کــرد لــەپێناو رەهــاکردنی ئازادیــە دیموکراتیــەکان لەناویــشیدا ئــازادی هەڵبژاردنــەکان و حزبــەکان و سەندیکاکان و بلاَوکردنەوەو بیروڕا.

دوای روخانی حوکمی پاشایەتی لە ١٤–تەممووز– ١٩٥٨ حزب بەردەوام بوو لەتێکۆشــان لــەپێناو دیموکراتیــەت و هۆشــیارانە دەرکــی بــەوە کردبــوو کــە فــەرمانڕەوایی لــەعێراق سەقامگیر نابێت و سودی نابێت ئەگەر لەســەر بنەماگــەلێکی دیموکراســی دانەمــەزرێت و گەل و هێزە نیشتمانیەکانی تێکڕا لەئازادی بیرو باوەڕ بەهرەمەند نەبن. هەروەها ئازادی رێکخستنی سیاسی و سەندیکایی و پیشەیی و ئازادی رۆژنامەگەری و بلاَوکردنەوە. بۆیە حــزب هەمیــشە جەختیکردۆتــەوە لەســەر پێویــستی کۆتایهــاتنی مــاوەی گواســتنەوە بەخێرایی و گواستنەوەی ولاَت بۆ ژیانی پەرلەمانی و شۆڕشگێڕیی، هەروەهاحزب لەدژی هەوڵە کۆنەپەرستیەکان وەستایەوە کەدژایەتی دیموکراسیەت دەکات هــەروەك چــۆن لــەدژی ئاراســتەی لیــوا قاســم وەســتایەوە کاتێــك وویــستی تاکڕەوانــە حــوکم بکــات و دیکتاتۆریەتی فەردیی خۆی بسەپێنێت.

لەبارەی دیموکراسی کە حزبی دیموکراتی کوردستانی پێی باشــە و بــۆ عێــراق بەشــیاوی دەزانێــت رۆژنامــەی – خــەبات– لــەژمارە ١٤٧دا کــە لــە ١٧– کــانونی دووەم– ١٩٦٠ دەرچووە وتارێکی نوسیوە لەژێر ناونیشانی– سستمی دیموکراسیمان و پێویستە چۆن بێت– تێیدا هاتووە:– " ئەو تێکۆشانە دوورو درێژەی گەلی عێراق بەعەرەب و کوردیــەوە گرتویەتەبــەر لــەدژی داگیرکــەرو تاقمــە فــەرمانڕەواکانی پێــشوو بــەئامانجی بونیادنــانی کۆمەڵگەیەکی دیموکراسی بووە لەسستمە سیاسی و ئابوری و رۆشنبیریەکەیدا".

هەروەها بەردەوام دەبێت و دەڵێت:" ( ئەو دیموکراسیەتەی لەکۆنەوە گوزارشتی لێکراوە بەوەی حوکمی گەلە بۆ گەل، شمەکێك نیە کە وەسفەکانی دیاریکراوبن و هاوردەی بکەین بۆ نیشتمانەکەمان بەڵکو چەمك و ناوەڕۆکەکەی دەگۆڕێت بەگۆڕانی وڵاتان و رەوشە مێژوییەکان کەتێیدا دروست بوون ئەمە جگە لەوەی گەوجێتیە هەوڵبدەیت جۆرێکی دیاریکراو لەفەمانڕەوایی لەوڵاتێکی دیاریکراوەوە هاوردە بکەیت، سەرەڕای ئەوەیش کە سستمە کۆمەڵایەتیەکان لەدایك بووی پێویستیە مادیەکانە بۆ پەرەسەندن و بەستراوەتەوە بە ئیرادەی گەلان و توانستەکانیان و بەخەباتی هێزە کۆمەڵایەتیەکان و رەوشە بابەتی و خودیی و جیهانیەکان).

پاشان خەبات ووتی- : " لەسەر رۆشنایی ئەو ڕاستیانەی پێشکەشکران و دوای لێکۆڵینەوەی رەوشی وڵاتەکەمان و بارودۆخە تایبەتیەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی گەیشتە ئەو ڕاستیەی دیموکراسیەتێکی ئاراستەکراو بەمۆرکە عێراقیەکەی کە وەرگیرابێت لە رەوش و واقیعمانەوە باشترین سستمی دیموکراسیە کە ئامانج و هیواکان بۆ گەلەکەمان بەکوردو عەرەبیەوە بەدیبهێنێت. بۆیە لەمادەی چواری پرۆگرامەکەیدا هاتووە: تێدەکۆشین لەپێناو پاراستنی کۆماری دیموکراتی و پتەوکردنی و فراوانکردن و قوڵکردنەوەی ئاراستە دیموکراسیەکەی لەسەر بنچینەی دیموکراسیەتێکی ئاراستەکراو کە رەهاکردنی ئازادییە تاکی و گشتیەکان فەراهەم بکات وەك ئازادی ڕاد،ربڕین و بیروباوەڕو ئازادی رۆژنامەگەری و رێکخستنی حزبی و سەندیکایی بۆ هەموو هاوڵاتیان و دانانی دەستورێکی هەمیشەیی لەگەڵ گرەنتیکردنی ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی دیموکراسی راستەوخۆ کە هەموو ئەو کەسانەی تەمەنیان گەیشتۆتە هەژدە ساڵ لە نێرو مێ بەشداری تێدا بکەن".

بەم کۆپلانەش کۆتایی دێنین بەو پەرەگرافانەی لە خەباتمان وەرگرتوون:-

" لەو مادەیەدا کە باسمان کرد ئەوە رون دەبێتەوە حزبی دیموکراتی کوردستانی داوای سستمێکی دیموکراتی ئاراستەکراو دەکات کە ئازادی بۆ گەل فەراهەم بکات و بیپارێزێت لەدوژمنەکانی ئەمەش لە پێویستیەکانی پاراستنی کۆمارەکەن و پاراستنی دەسکەوتەکانی گەلە لەشۆڕشە شکۆدارەکەیدا سەرەڕای ئەوەی کە خۆی پێویستەیەکی

جەختلێکراوە بۆ پەرەپێدانی کۆمەڵگەکەمان لەرووەکانی ئابوری و سیاسی و رۆشنبیری و بۆ فەراهەمبوونی سەقامگیریی بۆ هاولاٌتیان و لەلایەنە بەهێزەکانی ئەم سستمە دۆزینەوەی ژیانێکی پەرلەمانی دروست و فەراهەمکردنی ئازادی هەڵبژاردنی گەلە بۆ نوێنەرەکانی لەپەرلەمان و هەڵگۆزینی وەزارەت لەپەرلەمان و سەپاندنی چاودێریەکی جەماوەریی پەرلەمانی لەسەر حکومەتێك کە لەلایەن زۆرینەی پەرلەمانیەوە پشتیوانیکراوبێت.

" بەرژەوەندی گەل دەخوازێت هەموو هێزە نیشتمانیە دڵسۆزەکانی یەکبخرێن و پێکەوە بەشداری پێبکرێن لەحوکمکردنی ولاٌت لەرێگەی وەزارەتێکی ئیئتیلاف یان ئەنجومەنێکی راوێژکاریی کە نوێنەرانی هێزە نیشتمانیەکان لەخۆبگرێت ئەگەر مەحاڵ بوو بەرەیەکی نیشتمانی یەکگرتوو پێکبهێنرێت هەمووان لەحوکمکردنی ولاٌتدا بەشداری پیٌ بکات.

گومانی تێدا نیە رێزگرتن لە ئازادیە تاکی و گشتیەکان و فەراهەمکردنی بۆ هەموو هاولاٌتیان و چەسپاندنی ژیانی حزبی و پەرلەمانی و نوسینەوەی ئەمە لەدەستوری هەمیشەییدا لە لایەنە بەهێزەکانی سستمی دیموکراتی ئاراستەکراوە".

بەوشێوەیە دەبینن سوربوونی حزبی دیموکراتی کوردستانی لەسەر دیموکراسیەت سەرچاوەکەی قەناعەت بوونیەتی بەوەی کە ئەم رژێمە دیموکراسیە باشترینە بۆ گەلی عێراقی و گونجاوە لەگەڵ رەوش و بارودۆخەکانی و پێویستەکانی پەرەسەندنی کۆمەلاٌیەتی و ئابوری و سیاسی و رۆشنبیریی..هتد وە لەپێویستیەکانی سەقامگیریی و جێگیریە. هەروەك چۆن حزب پێی وایە لەسایەی دیموکراسیەتێکی راستەقینەدا دەکرێت چارەسەرێکی ئاشتیانەی دادپەروەرانە بۆ مەسەلەی کورد بدۆزێتەوە، دەکرێت مافە نەتەوەییەکان بۆ گەلی کوردی بەدیبێن و پاشانیش دەرك بە پەیوەستیی تۆرگانی دەکرێت لەنێوان دیموکراسیەت و مافەکانی گەلی کوردی. وەلەبارەی – پەیوەستیی توندوتۆڵەوە لەنێوان دیموکراسیەت و مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد– سکرتێری لیژنەی ناوەندی حزب مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەوتارێکدا کە رۆژنامەی خەبات کردویەتە دەستپێکی ژمارە ٢٨٩– خۆی لە ٢١-١٢-١٩٦٠دا بلاٌوبۆتەوە تێیدا هاتووە:

" سەرنجێك كە مرۆڤ لە رووداوەكانی ساڵەكانی دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە تا ئێستا بیدات بەڕوونی ڕادەی پەیوەندی توندوتۆڵ دەردەكەوێت لەنێوان دیموكراسیەت و لەنێوان مافە نەتەوەییەكانی گەلی كورد، نەك تەنها لەعێراق، بەڵكو هەروەها لەهەموو ئەو وڵاتانەدا كەوا لەسایەیاندا گەلی كورد دەژین، هەركاتێكیش بزوتنەوەی دیموكراتی لەیەكێك لەم وڵاتانەدا بواژبێتەوە بینیومانە كەوا گەلی كوردی چەوساوە چەوساندنەوەیەكی دولایەنە، یەكەمینی ئەوانە بووە كە لەخێروفەڕی بەهرەمەند ببێت. سەرەڕای مومارەسەكردنی ئەو ئازادیانەی كە فەراهەمی دەكات بۆ كۆی گەل ئەوا سوودی لێوەردەگرێت بۆ رێكخستنی ریزەكانی و فراوانكردنی بانگەشەكەی و توندوتۆڵكردنی تێكۆشانەكەی بۆ داواكردنی مافە نەتەوەییە ڕەواكانی. ئەم ڕاستیە حزبمان بڕوای پێیەتی بڕوایەكی قوڵ و هەڵقوڵاو لەبنەماكانیەوەو ئامانجەكانیەوەو، جەماوەری گەلەكەمان لەرێگەی ئەزموون و تاقیكردنەوە هۆشیار بووە پێی. لەبەرئەمە گەلی كوردمان ئەوساو ئێستاو لەئایندەشدا وەك بەرگریكارێكی دڵسۆزو ئەمین لەدیموكراسیەت دەمێنێتەوە لەهەموو ئەو وڵاتانەدا كە لەسایەیاندا دەژی".

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەوتارەكەیدا بەردەوام دەبێت و دەڵێت:– بەبڕوای ئێمە پتەوكردنی سستمی دیموكراتی رێبازی بنچینەییە بۆ دەسكەوتنی مافە نەتەوەییەكانی گەلی كورد لەچوارچێوەی ئەو وڵاتاندا كەوا حوكمی كوردستان دەكەن... ئەم بڕوایەو تێكۆشانمان لەپێناویدا تەنها لایەنێك پێكدەهێنێت بۆ مەسەلەی پتەوكردنی سستمی دیموكراتی و هەروەها مەسەلەی بەهرەمەندبوونی گەلی كورد بە مافە نەتەوەییەكانی.

لایەنی دووەم ئەوەیە ئەو گەلانەی كەئێمە لەگەڵیاندا دەژین و هاوبەشیان لەگەڵیاندا وێڕای ئەو چەوساندنەوە نەتەوەییەی كەتەنها ڕووبەڕووی ئێمە دەبێتەوە، ئەم گەلانە پێویستە لەسەریان بزانن ناتوانن لە دیموكراسیەت و ئازادی بەهرەمەندبن و ناتوانن هەتا بانگەشە بۆ ئەوە بكەن ئەگەر تێنەكۆشن و پشتیوانی لەخەباتی گەلی كوردی نەكەن لەپێناو مافە نەتەوەییە ڕەواكانیدا نەك بەوەی كە بەبزوتنەوەیەكی دادپەروەری و ئەركێكی مرۆیی دابنرێت تەنها.. بەڵكو بەوپێیەی كە ئەم پشتیوانەیە بەشێكە لەخەباتی لەپێناو مافە دیموكراسیە ڕەواكانیداو هەروەها ئازادیەكانیدا ناكرێت بانگەشە بە بوونی

دیموکراتی و ئازادی بکرێت لەولاتێك لەولاتەکاندا ئەگەر بە ملیۆنان کەس هەبێت بێبەش بن لەمافە نەتەوەییەکانیان و پێویستە ئەم گەلانە ئەو حەقیقەتە لەیاد نەکەن کەلەرێگەی ئەم ووشە نەمرەوە دەدرەوشێتەوە- ناکرێت گەلێك ئازاد بێت.. کە خۆی گەلانێکی تر دەچەوسێنێتەوە- ئەرکی گەلانی عەرەبی و تورکی و فارسیە دەرك بەم حەقیقەتە بکات و یارمەتی گەلی کوردی بدات لەخەباتیدا لەپێناو مافە نەتەودییە رەواکانی بەوپێیەی کە ئازادیەکەی ناتەواو دەبێت ئەگەر گەلێکی برا هەبێت کەبەناوی ئەوەوەو لەژێر پەردەی بەرگری لەبەرژەوەندیەکانی بچەوسێتەوە-.

سەبارەت بەهەڵوێستیش لە دیموکراسی و پەیوەندی بە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردەوە.. لیژنەی ناوەندی حزبی شیوعی عێراقی لەراپۆرتەکەیدا- ئازار ١٩٦٢- بڕیاری لەسەر ئەم حەقیقەتەی خوارەوە داوە:

-دیموکراسیەت مانای هیچ ناگەیەنێت و دەگۆڕێت بۆ قسەی پڕوپوچ و بەتاڵ بەنسبەت گەلی کوردیەوە ئەگەر توانستی کرداریی بۆ فەراهەم نەکرێت بۆ ئەوەی بەهرەمەند بێت لەمافە نەتەوەییەکانی و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی و ئەوەش بەدی نایەت تەنها لەرێگەی حوکمی زاتیەوە نەبێت-.

سەیریش نیە ئەگەر کاتێك ببینین حزبی دیموکراتی کوردستان لەبەرامبەر حوکمی کۆنەپەرستیدا راپەڕێت و بەدەستێکی چەك و بەدەستەکەی تری دروشمێك لەرووی سەرەوەی لاپەڕەی رۆژنامەی خەباتدا بچەسپێنێت لەقۆناغی نهێنیدا و بڵێت- سەرکەوتن بۆ شۆڕشی گەلەکەمان لەپێناو دیموکراسیەت بۆ عێراق و حوکمی زاتی بۆ کوردستان-.

لەکاتی شۆڕشی چەکداریی کوردیدا لیژنەی ناوەندی پارتی ئەم بڕیارەی خوارەوەی وەرگرت-تێکۆشان بۆ کۆکردنەوەی حزبە نیشتمانیەکان یان زۆرینەیان لەبەرەی یەکێتی نیشتمانی تێکۆشان پێکەوە لەدژی داگیرکەرو دیکتاتۆریەتی کۆنەپەرستی و لەپێناو بەرپاکردنی کۆمارێکی دیموکراتی پەرلەمانی کە سیاسەتی ناوخۆیی لەسەر بەدیهاتنی ئامانجەکانی گەلی عێراقی دامەزرابێت هەروەها لەئازادیە دیموکراتیەکان و بەهرەمەندبوونی گەلی کوردی بەمافە نەتەوەییەکانی لەسەر بنچینەی حوکمی زاتی.

هەروەها بنەماكانی سیاسەتی دەرەكی لەسەر بێ لایەنی ئیجابی بونیاد نابێت..
هەروەها دژایەتی داگیركەرو جەنگ و پشتیوانی كردن لە تێكۆشانەكانی رزگاربوونی گەلان و بەشداریكردن لە پاراستنی ئاشتی جیهانی و پێشكەوتنی مرۆڤایەتی-.
ئەمرۆش دوای ئەزمونە سەختەكان كە عێراق پێیدا تێپەری حزب زیاتر بروای بە هەڵوێستە بنەماییەكانی دەبێت دەربارەی دیموكراسیەت و پێوستی بەرپاكردنی حوكمی نیشتمانی لەعێراق لەسەر بنكەكانی بەوپێەی گرەنتی سەرەكییە بۆ پێشكەوتنی وڵات و گەشانەوەی و سەقامگیریی و بۆ پەرەپێدانی كۆمەڵگەی عێراقی بەرەو باڵاترو باشترو بۆ چارەسەركردنی مەسەلەی كوردی چارەسەرێكی ئاشتی و دادپەروەرانە.
ئەمەو سەرەرای ئەوەی كە بزوتنەوەی رزگاریخوازی كوردی كە پارتی لێیەوە هەڵقوڵاوەو بۆ سەركردایەتیەكەی بزوتنەوەیەكی خاوەن ناوەرۆكێكی دیموكراتی، بزوتنەوەیەكی میللی ئامانجی لێپێچینەوە كۆمەڵایەتیەكانە كە خاوەن سروشتێكی دیموكراسیە بەتەنیشت ئامانجە سیاسی و رۆشنبیریەكانیەوە.
ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت كە دیموكراسیەت پەیوەست دەبێت پەیوەستیەكی ئۆرگانی و بنچینەیی بە بزوتنەوەی رزگاریخوازی كوردیەوە گەلاڵە بوو دوای پێوەن بوونی بە بیرۆكە پێشكەوتنخوازیەكان پارتی كە رێكیدەخات و پێشرەویی دەكات لەگۆرەپانی خەبات و لەپێناو ئامانجەكانیدا.
ئەگەریش روانیمان بۆ ئەو قەیرانە گشتیەی حوكم لە گەرداوەكەیدا دەسورێتەوەو گەلی عێراقی بەهەردوو نەتەوەی عەرەب و كوردەوە پێیەوە دەناڵێنێت، ئەوا دەبینین هیچ دەرەچەیەك و چارەسەرێك نیە بۆی لەوڵاتێكی خاوەن نەتەوەو ئایین و حزب و چینی كۆمەڵایەتی فرەچەشندا تەنها بەدیموكراتی شۆرشگێریی نەبێت، بۆیە پارتی دروشمەكانی لەسەر لاپەرەكانی رۆژنامەی خەبات بەرزكردەوەو دەڵێت- هیچ گرەنتیەك نیە بۆ پاراستنی سەربەخۆیی نیشتمانی و بوژاندنەوەی وڵات و سەقامگیریی تەنها بەدیموكراسیەت نەبێت دیموكراسیەتیش بوونی نابێت بەبێ ژیانی پەرلەمانی و ئازادیە گشتیەكان و بەبێ چارەسەرێكی دادپەروەرانە بۆ مەسەلەی كوردی لەسەر بنچینەی حوكمی زاتی.

# پارتی دژبه جوداخوازیی و چوونه نێویەکی دەبێتەوە

حزبی دیموکراتی کوردستان ئەوساو ئێستاش لەوانە بووە بەتوندی بڕوای هەبووەو دەستگرتوو بووە بە برایەتی عەرەبی کوردی و یەکێتی عەرەبی- کوردی- لە تێکۆشان لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی و، لەپێناو مافە نەتەوەیی و دیموکراتیەکانیداو هەروەها ژیان پێکەوە لەژێر سایەی دەوڵەتێکی دیموکراتی یەکگرتوو. پارتی پێیوایەو بڕوای بەوە هەیە کە بەرژەوەندیەکانی عەرەب و کورد دەخوازێت و پێویست دەکات پێکەوە بژین لەسایەی دەوڵەتێکی دیموکراتی یەکگرتوودا.

بەڵام حزب بەردەوام بڕوای وابووە ئەم یەکگرتنە پێویست دەکات بۆ ئەوەی چەسپاو و جێگیربێت و مانەوەی بەهێز بێت، دەبێت یەکگرتنێکی ئیختیاری برایانە بێت یەکەم، دووەمیش لەسەر بنەماکانی یەکسانی تەواوەتی لەمافەکان و ئەرکەکاندا بەرپابووبێت، سێیەم: هەروەها رێز لەیەکگرتن بۆ بوونی نەتەوەیی و مافە نەتەوەییەکان. چوارەم: رێزگرتن لەو ڕاستیەی گەلی عەرەبی لەعێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەبی، هەروەك چۆن گەلی کوردیش بەشێکە لە نەتەوەی کوردی. پێنجەم: بەرژەوەندیەکانی هەردوو نەتەوە یەکێکە و پەیوەندیە ئۆرگانیەکانیان توندوتۆڵە بەشێوەیەك هەر سەرکەوتنێك نەتەوەی عەرەبی لەتێکۆشانیدا لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی بەدەستی دەهێنێت سەرکەوتنێکە بۆ نەتەوەی کوردی و هەموو سەرکەوتنێکیش بۆ نەتەوەی کورد لەتێکۆشانی دادپەروەرانەی سەرکەوتنێکیشە بۆ نەتەوەی عەرەبی،.

نمونەی ئەم یەکگرتنە ئیختیاریە لەژێر سایەی یەك دەوڵەتدا ئەوەیە کەوا گەشە دەکات و تۆکمە دەبێت و گەلان پێی ڕازی دەبن و مافە نەتەوەییە ڕەواکەی تێردەکات. بەپێچەوانەشەوە یەکێتی زۆرەملێ و پێوەلکاندن کەلەسەر خستنەسەری بەزۆرو ناچارکردن بەپاربووبێت لاوازو فشەڵ دەبێت و خۆی ناگرێت لەبەردەم روداو گۆڕانکاریەکانداو رق و تورەیی لەنێوان گەلاندا دەوروژێنێت و هەمیشە ئەگەری ئەوەی لێدەکرێت بڕوخێت.

ئەمە راستیگەلێکن مێژووی پڕ لە یەکگرتنە زۆرەملێیەکان و یەکێتی پێکەوەلکاندن سەلماندونی کە شکستیان هێناوەو روخاون و ئێستا نمونەی ئەم جۆرانە تەنها لەچەند وڵاتێکی کەمدا دەبینرێن مابنەوە. ئەم مێژووەی هەروەها شایەتی دەدات کە یەکگرتنی ئیختیاری برایانە لەنێوان نەتەوەکان دەمێننەوە پتەو و تۆکمە دەبن. دەوڵەتی عوسمانی سەرەڕای پەیوەستیە ئایینی و ئیسلامیەکان نەیتوانی تا کۆتایی بژی چونکە لەسەر پێکەولکاندن و خستنەسەری زۆرەملێیانە بەرپابوو بوو، ئەمە لەکاتێکدا کە یەکێتی سۆڤیەت بەهێز دەبێت – یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستیە سۆڤیەتیەکان– هەروەها یەکێتی کۆمارەکانی یوگسلافیای سۆشیالیستی گەشە دەکەن هەروەها یەکێتی سویسری (دیموکراتی) چونکە هەموویان لەسەر یەکێتیەکی ئیختیاری و لەسەر بنەمای رێزگرتن لەبوونی نەتەوەکان بونیادنراون کەلەسایەیاندا نەتەوەکان پێکەوە دەژین واتە یەکگرتنەکانیان ئیختیاری بووە بۆیە وەك خەمخۆریەك بۆ برایەتی عەرەبی کوردی و یەکێتی تێکۆشانیی عەرەبی کوردی ئەوا حزبی دیموکراتی کوردستان– پارتی هەمیشە داوا دەکات کەیەکێتی عێراقی پێکەولکاندنیی کە داگیرکەری بەریتانی دروستی کردووە بگۆڕێت بۆ یەکگرتنێکی ئیختیاری برایانەی بنەما پتەو و بەهێز لەچوارچێوەی یەك دەوڵەتی یەکگرتودا هەربۆیە ئەو دژی پێکەوەلکاندن و جوداخوازیی و بوون بەیەکییە پێکەوە.

لەواقیعدا بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی هەر لەجەنگی جیهانی دووەمەوە دروشمی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆی جیا لەعێراقی خستۆتە لاوەو لەبری ئەوەی دروشمی حوکمی زاتی بۆ گەلی کوردی هەلگرتووە بە چەمکە دیموکراتیەکەی لەچوارچێوەی دەوڵەتی عێراقیدا!.

ئەم دروشمە لەپەیڕەوی حزبی دیموکراتی کوردستانیدا بەرجەستە بووە هەر لەدامەزراندیەوە هەروەك چۆن هەڵوێستی زانستی دەربارەی یەکێتی ئیختیاری لەسیاسەتی حزب و پرۆگرامەکانیدا بەرجەستەبوون.

حزب هەستا بە پروپاگەندەیەکی فراوان بۆ بنجداکوتان و جێگیربوونی ئەم راستیانە لە عەقڵ و هزری جەماوەری میللی و دژایەتی مەیلی جوداخوازیی و یەکێتی پێکەوە

لکانـدنیی و بانگەشـەکانی بـوون بەیـەکی پێکـەوە کـردووە. حـزب لەسـاڵی ١٩٤٧دا بڵاوکراوەیـەکی رۆشـنبیرکردنی تایبـەتی بڵاوکـردەوە بەناونیـشانی– یـەکگرتن نـەك جیابوونەوە– تێیدا هەڵوێستی حزب لەیەکێتی عـەرەبی کـوردی روندەکاتـەوە و جـەخت دەکاتـەوە لەسـەر پابەنـدبوون پێیـەوە زیـاتریش لـەوە حـزب دروشمـی جیابونـەوەی لەدەوڵـەتی عێراقـی بـەرز نەکردۆتـەوە هـەتا لـەکاتی بـەرپابوونی کۆمـاری کوردسـتانی دیموکراتیشدا لە موکریان لەکوردستانی ئێران بەڵام بزوتنـەوەی رزگـاریخوازی کـوردی و پارتی دیموکراتی کوردستانی پێشرەوی دەربـازی نـەبووە لـە تۆمـەتی جودخـوازیی لای داگیرکـەرو شـۆفینیزم بەلکانـدنی بەهـەر بزوتنەوەیەکـەوە هـەتا ئەگـەر ئامانجیـشی بەدەست هێنانی مافە رۆشنبیریەکان بێت بۆ گەلی کورد.

هۆکاری راستەقینەی شاراوە لەپـشت هـەوڵی لکانـدنی تۆمـەتی جوداخـوازیی بریتیـە لـە شێواندنی حەقیقەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی دیموکراتی کـە لەسـەر بنـچینەی یـەکێتی تێکۆشـانی شۆرشـگێریی دەرهاوێـژە بـووە هـەروەها ئامانجـە گـشتیەکان لەگـەڵ ئـەو گەلانەدا کە نەتەوەی کورد لەگەڵیاندا نیشتەجێن لەلایەك و بۆ ئیـستیغلالکردن و تۆمـەت دروستکردن و فێڵکردن لەم گەلانە و هاندانی رۆڵەکانی لـەدژی بزوتنـەوەی رزگـاریخوازی کوردی لەلایەکی ترەوەو دروستکردنی بۆشاییەکی گەورە و دوژمنایەتیەکی توند لەنێوان گەلی کوردی و گەلانی عەرەبی و فارسی و تورکی برا لەلایەکی دیکەوە.

پاشانیش روخاندنی یەکێتی خـەباتی هاوبەشـیان لـەدژی داگیرکـەرو کلکـە کۆنەپەرسـتە خیانـەتکارەکانی دەبێـت هـۆی درێژکردنـەوەی وادەی دەسـەلاتی داگیرکـەری– بـەپێ

ووتەی رۆژنامەی – خەبات– لە ژمارە ٦٨دا کە دەرچووە لە ٣٠ ئەیلول– ١٩٥٩.

لەبەرئەوە بانگەشە داگیرکەریەکان و کۆنەپەرستیەکان ئەم تۆمەتە دەلکێـنن بـە هـەموو بزوتنەوەکان و شۆرشـەکان و کۆمەڵـەکان و حزبـە کوردیـەکان لەهـەموو سـەردەمەکاندا دوای جەنگی جیهانی دووەم و رۆژێك کە حزب لە پرۆگرامیـدا بانگەشـەو بڵاوکراوەکانیـدا بەئاشکرا بانگەشەی کرد بۆ یەکگرتنی ئیختیـاریی لـەنێوان هـەدوو نەتـەوەی عـەرەبی و کوردیدا لەکاتی ئەو تێکۆشانەشدا کەوا گەلی کورد پێی هەستا هەروەها شانبەشانی گەلی عەرەبی لەعێراق بۆ پشتیوانیکردن لەشۆرش کاتێك کەوا مصر رووبەرووی دوژمنکاری سـێ

لایەنە بۆوە لەساڵی ١٩٥٦دا داگیرکەران و نوری سەعیدی بەکرێگیراویان ئەم تۆمەتیان دووپاتکردەوە و کردیانە بیانوویەك بۆ هەندێك لەپرۆژەکانیان و بۆ سەرکوتکردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بەشێوەیەکی دڕندانە. دوای شۆڕشی ١٤ تەمموز و کاتێك هەموو گەلی کورد ڕاپەڕین بۆ پشتیوانیکردن لەشۆڕش و پاراستنی و وەفدە گەورەکەیی نارد کە نوێنەرایەتی هەموو شارو ناوچەکانی کوردستان دەکرد بۆ ئەوەی بچن بۆ بەغدادو پیرۆزبایی لەسەرکردەکانی شۆڕش بکەن وەك بەشداریکردنێك لە تێکۆشانی گەلی عێراقیمان و سووربوونی گەلی کوردیان بۆ دووپات بکەنەوە لەسەر پشتیوانیکردن لەشۆڕش و چەسپاندنی بنەماکانی، ئەوکاتەو کاتێك کوردستان لەسەر زمانی سەرۆکی وەفدەکەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد داوای پتەوکردنی برایەتی عەرەبی کوردی دەکرد لەسەر ڕێساگەلێکی جێگیرو پتەو و وا لە یەکێتی پێوەلکاندنی کۆن بکاتە یەکێتیەکی ئیختیاری برایانە ئیدی جارێکی تر زوڕناکانی کۆنەپەرستی و دیکتاتۆریەتی شۆفێنیی– درۆی جوداخوزایان لەدژی بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی ژەنیەوە.

حزبیش ئەم –درۆی جوداخوازییەی– لەیادادشتێکدا رەتکردەوە کە پێشکەش بە سەرۆك وەزیران و جێگری سەرۆك وەزیرو حزبەکان و کەسایەتیە عێراقیەکان کرد لەبەرواری ١١–٩–١٩٥٨ و تێیدا هاتووە– ئەو بیرۆکە ژەهراویانەی کە پەخش دەکرێن دەربارەی بوونی بزوتنەوەیەك لەنێو گەلی کوردیداو لەپێناو جیابوونەوە لەکۆماری عێراق تێدەکۆشێت لەچەند سەرچاوەیەکی دیاریکراوەوە دەردەچن لەسەر ئەم بیرۆکانەش مۆرکی سەرچاوەکانی هەیە ئەویش ئەوانەن کە هیواکانیان لەسەر تاوێری یەکێتی عەرەبی کوردی تێکشکا.

ئەو داگیرکەرەی کە شۆڕشی ئازاو نەبەردی عێراقی گورزی لێوەشاندووە بێ هیوا نەبووە لەئەگەری بەدەستهێنانەوەی زوڵم و زۆرو دەسەڵاتەکەی بەجێبەجێکردنی ئەو پلانەی کە لەسەر سیاسەتە داگیرکەرانەکەی (ناکۆکی بخەرەوە باڵادەست دەبیت)بونیادنراوە کەهەمیشە لەجێبەجێکردنیدا گەیوترین بەرهەمی چنیوەتەوە ئەو و کلکەکانی و دەستەیەك لەو فەرمانبەرانەی کە پشتیوانی لەرژێمی پێشوو دەکەن و، کەمینەیەك لەوانەی کە لە بەرژەوەندیەکانی خۆیان و دەسەڵاتی سیاسیان دەترسن

لەیەکگرتنی هەردوو نەتەوەی عەرەبی و کوردی و مەزن بوونی هێزیان ئەمانەن کە ڕەواج بەم پڕوپاگەندە نزم و ڕیسوایانە دەدەن.

بەوشێوەیە حزب هەڵوێستی بنەمایی خۆیی لەجیابوونەوە خستەڕوو کەلەهەمان یاد داشتدا دەڵێت:- جیابوونەوە لەڕوانینی ئێمەدا شتێکی ئەبستراکت نیە دەکرێت بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەرەوشە ناوخۆیی و دەرەکیەکان توێژینەوەی لەبارەوە بکرێت بەچاوپۆشین لە ئەنجامەکانی سەبارەت بەوەی پەیوەندی هەیە بە بەهێزبوون یان لاوازبوونی لایەنە جۆراوجۆرەکان لەجیهاندا جیابوونەوەی هەرگەلێك لەگەلانی جیهان پێویستە بەپێی بڕوابوونمان لەلایەنێکی دیاریکراوەوە بێت ئەویش ئەوەیە ئایا ئەم جیابوونەوەیە دەبێتە هۆی لاوازکردنی دەسەڵاتی داگیرکەرو جوڵاندنی ناوەندەکەی و بەهێزکردنی بەرەی گەلان و سەرخستنی و لەخەباتکردن لەپێناو ئاشتی و ئازادی و دیموکراتی.

ئەگەر وەڵامەکەش بەسلبی بوو ، واتە بووە هۆی بەهێزبوونی داگیرکەرو چەسپاندنی پێیەکانی و لاوازکردنی بەرەی گەلان و ئاستەنگ خستنە بەر خەباتەکەی و جیابوونەوە، ئەوا جیابوونەوە شەڕو ڕق و کینەیە نەك بەنسبەت ئەو وڵاتانەوە کە دەیانەوێت جیاببنەوە لێی بەڵکو بەنسبەت ئەو گەلەوە کە خۆی داوای جیابوونەوە دەکات لەم حاڵەتەشدا پێویستە دژایەتی جیابوونەوە بکرێت.

پارتی لەیادداشتەکەیدا بەردەوام دەبێت و حەقیقەتی هەڵوێستی خۆی لە جیابوونەوە لەکۆماری عێراقی دەخاتەڕوو دەڵێت- لەسەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستیە پێشکەشکراوانە بەروونی دەردکەوێت کە جیابوونەوەی کوردستان لەکۆماری عێراقی لاو کارێکە دژە بە بەرژەوەندیەکانی  هەردوو گەلی عەرەبی و کوردیە بەشێوەیەکی بنچینەیی و خزمەتی داگیرکەر دەکات و ناوەندەکەی بەهێز دەکات نەك تەنها لەعێراقدا بەڵکو لەهەموو وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و دووریش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆش دەبێتە هۆی لاوازکردنی ڕزگارکردنی گەلانی ئەم ناوچەیە بەتێکڕا تێشیدا گەلی کوردی-.

لەبەرئەوە یادداشتەکە جەخت دەکاتەوە گەلی کوردو پێشڕەوەکەی -پارتی- دژ بەهەر مەیلێك بۆ جیابوونەوە دەوستنەوە ئەگەر بەدیارکەوت، بەڵام ڕوداوەکان دەیسەلمێنن

که بزوتنەوەیەکی جوداخوازی لەناو ڕیزەکانی گەلی کوردیدا لەعێراق بوونی نیە خەبات چەندین جار ئەم حەقیقەتەی ڕونکردۆتەوەو داوای لە هێزە دیموکراسی و پێشکەوتنخوازەیەکانی تری عێراق کردووە بۆ ئەوەی ڕۆڵی مێژوویی خۆیان بگێڕن کەوا پێویستی بەهێزکردنی برایەتی عەرەبی کوردی دەیخوازێت هەروەها پێویستی لەناوبردنی پروپاگەندەکان ، هەروەها لەوتارەکەیدا – جوداخوازیی درۆیەکی داگیرکەریی دەڵێت[163] :-

هێزە نیشتمانی و دیموکراتی و پێشکەوتن خوازەکان بانگهێشتکراون بۆ دژایەتیکردنی درۆی جوداخوازیی چونکە یەکەم درۆیەکی داگیرکەرییە. وەلەبەرئەوەی کە هیچ ڕەوتێك بوونی نیە لەناو ڕیزەکانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیدا دووەم، هەروەها لەبەرئەوەی گومان و دو دڵیی لەبەرامبەر بزوتنەوەی نیشتمانی کوردیدا دروست دەکات کە باڵی دووەمە بۆ بزوتنەوەی شۆڕشگێڕیی عێراقی و بەڵگەی بەهێزە بۆ کۆمارە لاوەکەمان و پاشانیش دەبێتە هۆی لاوازکردنی یەکێتی برایەتی عەرەبی کوردی و سێیەمیش مانای ئەوە دەگەیەنێت کەوا خەڵك سەرقاڵ بوون بە ئەفسانەیەکی خەیاڵییەوەو هێزەکانی تەرخان دەکات بۆ جەنگێکی وەهمیی، واتە پاڵدانی بۆ جەنگێکی دۆنکیشۆتی لەبری ئەوەی تیرەکانی تێکۆشان ئاراستە بکرێن بۆ دوژمنان و پیلانگێڕیەکانیان چوارەم.

بەوشێوەیە دەبینین حزبی دیموکراتی کوردستان –پارتی– بانگەشەی کردوەو تێکۆشاوە بۆ بەرپاکردنی پەیوەندیە براییەکان لەنێوان هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی برادا لەسەر بنچینەی دروست و پتەو و لەبەرئەمە دژ بە جوداخوازی وەستاوەتەوە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە دژی بەیەککردن و پێوەلکاندنیش وەستاوەتەوە کەئەم دووانە لەسەر فەرامۆشکردنی بوون و مافەکانی گەلی کوردی وەستاون و نکوڵیکردن لە مافە نەتەوەییەکانی و بانگەشە دەکەن بۆ تواندنەوەی گەلی کوردی و بەزۆر خستنیە سەر یەکێتیەکی زۆرەملێیانە لەلایەکی ترەوە.

---

[163] – ئەم وتارە بریتیە لە دەستپێك یان سەروتاری ژمارە ٦٨ ی بەرواری ٢٠ ئەیلولی ٩٥٩.

حزب وریایی داوە لە ئاکامی سیاسەتی تواندنەوەو یەککردنی فاشیستانەو سروشتە داگیرکەری و کۆنەپەرستیەکەیی ئاشکراکردووەو ئەو مەترسیە زۆرەی خستۆتەڕوو لەسەر یەکێتی عەرەبی کوردی و خەباتی هاوبەشیان بەو پێیەی کە سیاسەتێکی داگیرکەرانەی روخێنەرەو لە بنەمای داگیرکەریی ناسراوەوە -ناکۆکی بخەرەوە زاڵ و بالاّ دەست دەبیت- هەڵقولاّوە، لەبەرئەوەی دەبێتە هۆی دروستکردنی رق و کینەو دوژمنایەتی لەنێوان عەرەب و کورد دا، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەمان بەهەند وەرگرت گەلی کوردی وەك هەموو گەلەکانی تر- بەتوندی دژ دەوەستێتەوە لەبەرامبەر هەوڵەکانی تواندنەوەو تێهەڵکێشکردنی و لەناوبردنی بوونە نەتەوەییەکەی-.

هەر لەرۆژەکانی یەکەمی دامەزراندنی حزبەوە داوای یەکگرتنێکی ئیختیاری برایانەی کردووە لەنێوان عەرەب و کورددا و دژی جیابونەوەو تێهەڵکێشکردن بووەو بەتوندی جەنگاوە لەدژی بانگەشە تواندنەوەییەکان و بەرگریی کردووە لە حەقیقەتی ئەوەی کە پێکەوە ژیان لەنێوان ئەو گەلانەدا کەلەسایەی یەك دەوڵەتدا پێکەوە دەژین بە لکاندن و تێهەڵکێشی زۆرەملێیانە سەر ناگرێت و بەردەوام نابێت، بەڵکو بە رێزگرتن لەمافە نەتەوەییەکانی و یەکێتیە براییەکانیان دەبێت.

هەتا ئێستاش حزب داوا دەکات حوکمێکی زاتی بدرێتە کوردەکان لەچوارچێوەی قەوارەی عێراقێکی یەکگرتوودا بەو پێیەی ئەوە گونجاوترین شێوەی یەکگرتنە لەقۆناغی مێژوویی ئێستادا.

هەروەك چۆن حزب رونیکردۆتەوە مەحاڵە بیرۆکەی تێهەڵکێشکردن و تواندنەوەی فاشیانە سەر بکەوێت چونکە دژ دەوەستێتەوە لەگەڵ پەرەسەندنی سروشتی نەتەوەکان و لەگەڵ پێداویستیەکانی پەرەسەندنی کۆمەلاّیەتی و لەبەرئەوەی کە نەتەوەکان بەشێوەیەکی مێژوویی دروست بوون و سیاسەتە تێهەڵکێشکردنیەکان نایتوانێننەوە چەند تەوق و کۆت بکرێت. ئەمەو سەرەڕای ئەوەی کە لەرووی مێژوییەوە ناتوانێت بژی چونکە رق و کینە دەوروژێنێت لەنێوان ئەو گەلانەدا کە بەرژەوەندی خۆی نابینێتەوە تەنها لەناو برایەتی و ئاڵوگۆڕی کۆمەك و یارمەتی نەبێت لەنێوانیاندا. بێگومان خەبات- بەرگری کردوە لەبوونی نەتەوەیی گەلی کوردی و سەرکردایەتیەکەی

هەڵمەتێکی فراوانی سەرکەوتوی کرد کاتێك کە رۆژنامەی شۆڕشی قاسمی وتارێکی بڵاوکردەوە داوای ئەوە دەکات پێویستە نەتەوەی کوردی لەناو بۆتەی نەتەوەی عەرەبیدا بسرێتەوەو بتوێنرێتەوە: بەڵکو بەکارهێنانی هێزیش لەکاتێکدا کە بۆ جێبەجێکردنی ئەم پرۆسە کۆنەپەرستیە پێویست بوو. زۆرێك لەکەسایەتیە نیشتمانیە عێراقیەکان نارەزاییان لەبەرامبەرە ئەم بانگەشە روخێنەرەدا دەربڕی لەوانەش وەزیرە نیشتمانیەکان وەك مامۆستا مستەفا عەلی و دکتۆی فەیصەڵ سامرو دکتۆر تەلعەت شەیبانی و چەندین کەسی تر لەکەسایەتیە دیموکراتیەکان.،

خەبات- یش چەندین وتاری نوسی و تێیدا مشتومڕی بیرۆکەی تواندنەوەی فاشیستانەو مەترسیەکەی لەسەر پەیوەندیەکانی عەرەبی کوردی کرد. لەوتارە سەرەکیەکەشیدا لەژمارە ٤٤٠، ٢٢-٢-١٩٦١ی رۆژی هەینیدا بەناونیشانی - هەوڵەکانی تواندنەوەی نەتەوەی کوردی و دەرئەنجامە حەتمیەکانی- نوسیویەتی و دەڵێت: نەتەوەی کوردی ڕاستەیەکی مێژوویی رەق و پتەوەو لەسەریدا هەموو هەوڵە تاوانکاریەکان لە تێهەڵکێشکردنی و پێکەولکاندن و جۆرەکانی تر لەهەوڵەکانی داگیرکەر لەرابردوداو فاشیزم لەئێستاد تێکدەشکێت... لەرابردو لەئێستاشدا هەوڵە بێ هیواکان دەستەوسان بوون و دەستەوسانیش دەبن لە ئایندەدا لەتواندنەوەی نەتەوەکان یان تێهەڵکێشکردنیان، ئیدی ئەم هەولانە چەندە بەهێزو پڕ زەبرو زەنگ بن.

ئەو سیاسەتەی بەرپایە لەسەر هەوڵدان بۆ تێهەڵکێشکردنی گەلان و تواندنەوەیان.. سیاسەتی هیتلەرو مۆسۆلۆنین.. هەروەها ئەو سیاسەتانەی تر کەوا مرۆڤایەتی و ئیرادەی گەلانی جیهان ئیدانەی کردوون و لەگەڵ ئیرادەی گەلان و پێداویستیەکانی پەرەسەندن و پێشکەوتنی لەئەمڕۆوە هەرگیز ئەو سیاسەتە سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت. ئەزمونی تۆرانیش لەتورکیا بەرامبەر بەگەلی کورد بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کە تواندنەوەی نەتەوەی کوردی هەرگیز بەدی نایەت.. خەبات بەردەوام دەبێت لە ژماردنی دەرئەنجامەکانی سیاسەتی تواندنەوەو تێهەڵکێشکردن بەمشێوەیەی خوارەوە:-

١- مومارەسەکردنی سیاسەتی توانەوەو تێهەڵکێشکردن دەبێتە هۆی وروژاندنی رق و کینەو دوژمنایەتی و لەبەریەك هەڵوەشاندنی یەکێتی نیشتمانی. کوردەکانیش ناکرێت سوربن لەسەر یەکێتیەك کە جگە لەکۆیلایەتی و بێبەشکردن لەمافە نەتەوەییەکان و نکوڵیکردنی نەتەوەییان و ئاگرو ئاسن و کۆت و زیندان هیچی تری بۆ نەهێناون.

٢- ئەم سیاسەتە سەرەڕای شکستخواردنی لەبەدیهێنانی تواندنەوەو تێهەڵکێش دەبێتە هۆی هێنانی بەڵاو نەهامەتیەکان و جەنگە ئەهلیەکان بۆ ئەو وڵاتەی کە مومارەسەی دەکات ئەمەش دەبێتە هۆی گەیاندنی مەزنترین زیانی مادیی و مەعنەویی پێی.

٣- قەوارەی هەر وڵاتێك کە نمونەی ئەم جۆرە سیاسەتانە مومارەسە دەکات فشەڵ و لاواز دەمێنێتەوەو خۆی لەبەردەم رەشەباو گەردەلولەکاندا ناگرێت و نمونەی ئەم دەوڵەتەش پەرت و دابەش دەبێت هەرکاتێك کەوا رەوشەکە گۆڕاو هەل هاتەپێشەوە.

٤- گەلی ئەو وڵاتەی کە مومارەسەی ئەم سیاسەتە دەکات لەژێر نیڵی کۆیلایەتی و باری گرانیی باجەکاندا دەمێنێتەوەو بێبەش دەبێت لەمافەکان و ئازادیە دیموکراتیەکان ئەو گەلەی گەلێکی تر دەچەوسێنێتەوە ناکرێت ئازاد بێت... -خەبات- وتارەکە بە ووتەیەك کۆتایی پێدێنێت کە دڵسۆزیی بۆ یەکێتی نیشتمانی و برایەتی عەرەبی کوردی لەنەهێشتنی هەوڵەکانی دنەدان بۆ لەناوبردنی نەتەوەی کوردی و نکوڵیکردن لەبوونی نەتەوەی کوردو مافەکانی حەشاردراوە.

ئەوەیش شایانی باسە هێزە پێشکەوتنخوازیە عەرەبیەکان ئیدانەی بانگەشەکانی تواندنەوەو تێهەڵکێشکردنیان کردووەو داوای یەکێتیەکی برایانەیان کرد لەنێوان عەرەب و کورد دا.

دکتۆر شاکر خصباك دەڵێت[١٦٤]:

[١٦٤] - د. شاكر خصباك لەكتێبەكەیدا " كوردو مەسەلەی كوردی لەعێراق لا ٨٤ چاپە عەرەبیە یەكەمەكە شوباتی ١٩٥٩.

بەڕای ئێمە یەکێتی عەرەبی کوردی پێویستە ئەم ڕاستیە گرنگە بخاتە پێش چاوی خۆیەوە، ئەویش داننانە بە نەتەوەی کوردیدا دانپێدانانێکی ڕاستەقینە و تەواو، نەك دانپێدانانێکی ساختە وەك ئەوەی حکومەتەکانی پێشوو ئەمەیان دەکرد.

یەکگرتنی کوردەکان لەگەڵ عەرەبدا مانای تواندنەوەی نەتەوەکەیان نیە لەناو نەتەوەی عەرەبیداو هەڵەیە ئەگەر ڕاستیەکان بگۆڕین و ئاماژە بە ڕەگەزی عەرەبی بکەین لەسەر حسابی نەتەوەو ڕەگەزی ئەوان. بەڵام یەکگرتنیان لەگەڵ عەرەب بەرەزامەندیەوە وایان لێدەکات ببنە بەهێزترین پشتیوانی نەتەوەی عەرەبی ئازادو سەربەست. لەم حاڵەتەشدا پێویستە عەرەبیش لەبەرامبەریاندا هەمان مامەڵە بکات ببنە پشتیوانانی ڕاستەقینە بۆ نەتەوەی کوردی ئازادو سەربەست و، پەیوەندی نێوان کوردو عەرەب پەیوەندییەکی بەرژەوەندی و رۆحییە ئەمەش ئەو یاسایە کە تەحەکوم دەکات لە پەیوەندی هەر نەتەوەیەك بە نەتەوەیەکی ترەوە لەجیهاندا پەیوەندی نێوان گەلەکانیش لەسەر پایەکانی ئیستیغلالکردن ناچەسپێت بەڵکو لەسەر پایەکانی برایەتی و بەرژەوەندی هاوبەش دەبێت.

داننانیش بە نەتەوەی کوردیدا بێگومان دەبێتە هۆی چەسپاندنی یەکێتی عەرەبی و کوردی.. پێشتریش ئاماژەمان کرد بە ووتەی مامۆستا هلال ناجی کەوا ئیدانەی هەوڵەکانی نکوڵیکردنی نەتەوەی کوردی و دوژمنایەتیکردنی دەکات و داوای برایەتی دەکات لەگەڵیداو داننان بە بوون و مافەکانیدا هەروەها پێداویستیەکانی گەشەکردنی بەڵام کوتلەی بەعسی کە دواتر حزبی کرێکارانی شۆڕشگێڕیی عەرەبیان دامەزراند لەبەیاننامەی سیاسی کۆنگرەی حەوتەمدا – لەبارەی مەسەلەی کوردەوە لەعێراق ووتی:–

گەلی عەرەبی کە بەدەست هەوڵەکانی بەتورککردنەوە لەخۆرهەڵاتی عەرەبی و هەوڵەکانی فەرەنسیەوە لەخۆرئاوای عەرەبی نالاندویەتی و، تێکۆشاوە لەدژی بەچەك بەتوندی و بێ هیچ خۆپارێزیەك ئیدانەی هەموو ئەو بانگەشانەی هەندێك لە ڕەگەزە عەرەبیە شۆفێنیەکان دەکات کەهەوڵ دەدات وا دابنێت کوردەکان بەشێکن لەعەرەب– ڕەگەزە عەرەبیە شۆفێنیەکان کە وا دەزانن لەمێژویەکی نزیکدا کوردەکان دەتوێنەوەو

بڵاوبونەوەی رۆشنبیری و شارستانیەت و لەیەکچوونی گرفتە کۆمەڵایەتیەکان کۆتایی بەکورد دێنن وەك نەتەوەیەك، ئەوا دەکەوێتە ناو هەڵەیەکی گەورەوە، مێژوویی بابەتی ئەمرۆ لەسەر تێهەڵکێشکردن و تواندنەوەی کوردەکان ناڕوات لەناو نەتەوە ئێرانی یان تورکی یان عەرەبیەکاندا–..

شیوعیەکان و نیشتمانپەروەرە پێشکەوتنخوازەکان و نیشتمانپەروەرە دیموکراسیەکانیش نارەحەتی و دڵگرانی خۆیان راگەیاند سەبارەت بەهەوڵەکانی تواندنەوەی نەتەوەی کوردی و مافەکانی.. هەموو ئەوە دەیسەلمێنێت کە عەرەبیش وەك کورد دەرك بەوە دەکەن سیاسەتی تواندنەوەی فاشیانە لەبەرژەوەندی هەردوولادا نیە بەڵکو لەدژیەتی و ئەمەش مژدە بە چاکەو باشبوون دەدات لەپەیوەندیەکانی هەردوو گەلدا لەگەڵ یەکترداو خەڵکە باشەکانی عەرەب زۆرباش دەزانن بەرژەوەندیەکانی بەهێزکردنی برایەتی عەرەبی کوردی و یەکێتی نیشتمانی گەلی عێراقی دەخوازێت کە دان بە بوونی گەلی کوردی و مافە نەتەوەییەکانیدا بنرێت و پاشانیش پتەوکردنی پەیوەندیە عەرەبی و– کوردیەکان لەسەر بنەمای دیموکراتی دروست لە یەکسانی و برایەتی. بۆیە ئەوان دژی سیاسەتی تێهەڵکێشیی و جوداخوازی دەبنەوە بەو پێەی کەوا دژی برایەتی عەرەبی کوردیە.

تێهەڵکێشیی و جوداخوازی برایەتی عەرەبی– کوردی لەبەریەك هەڵدەوەشێنن و هەڕەشە لە یەکێتی نیشتمانی گەلی عێراقی دەکەن و بە خراپترین چارەنوس و ئاکام بۆیە پێویستە لەسەر دڵسۆزانی یەکێتی عەرەبی– کوردی بەتوندی لەدژی ئەم سیاسەتە بوەستنەوە. پارتی ئەرکی خۆی لەم بوارەدا بەئەنجام دەگەیەنێت کاتێك دژی تێهەڵکێشی و جوداخوازی دەبێتەوە پێکەوە، هەروەها بانگەشە بۆ یەکێتیەکی ئیختیاریی دەکات لەنێوان هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی برادا.

ماوەتەوە رۆڵێکی ترسناك کەوا پاشماتەکانی هەڵگرتنی دەکەوێتە ئەستۆی ئازادیخوازانی عەرەب و ئەوانەیان کەوا پەرۆشی برایەتیانن لەگەڵ برا کوردەکانیاندا.

ئازادیخوازانی عەرەبیش رۆڵی تەواوەتی خۆیان ناگێڕن تەنها ئەوکاتە نەبێت کەبەتوندی لەدژی بیرۆکەی تێهەڵکێشی و پێوەلکاندن دەبنەوەو تێکۆشاون لەپێناو مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردیدا.
پاشهاتەکانی دژایەتیکردنی جوداخوازی بەپلەی یەکەم و سەرەکی دەکەوێتە ئەستۆی رزگاریخوازان و پێشکەوتنخوازانی عەرەبەوە.

## پارتی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی عەرەبی

برایەتی عەرەبی کوردی ریشەی قوڵی خۆی لەناو مێژوودا رۆچووە. بەرژەوەندیە هاوبەشەکان و پەیوەستیە نیشتمانی و ئایینە یەکگرتوەکان و بوونی یەك دوژمنیان و نەهامەتیەکان هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی بەیەکەوە دەبەستێتەوەو وا لەپەیوەندیەکانیان دەکات پتەو تۆکمە بێت و ئەرکی یەکخستنی هێزەکان و ئاڵوگۆڕی یارمەتی لەتێکۆشان لەدژی داگیرکەران و زەوتکەرانی مافەکانی هەردوو گەل دەخاتە ئەستۆی پێشەنگ و رۆڵەکانیانەوە هەروەها لەپێناو مافە نیشتمانی و نەتەوەیی و دیموکراسیەکانیاندا. ئەوەیش کە ئەم ئەرکە جوامێرانەیە ئاسان دەکات بریتیە لەپاکوبێگەردی پەیوەندیە کوردی و عەرەبیەکان و نەبوونی هیچ جۆرە دوژمنایەتی و ململانێیەك لەنێوانیاندا هەر لەهاتنی ئیسلامەوە هەتا ئەمڕۆمان و بوونی مۆرکێکی برایانە و پشتگیریی و هەست دۆستانە لەگەڵ یەکتردا، بەشێوەیەك هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی لەخۆشی و ناخۆشیدا بەشدار دەبن هەر لەوکاتەوە چوونەتە ناو ئیسلامەوەو هەستی برایەتی لەنێوانیاندا پتەو بووە هەتا وای لێهاتووە کەسی کوردی هەمان هەستی عەرەبی هەیە لەوەی کەوا روبەڕوی دەبێتەوە لە بەڵاو نەهامەتیەکان و دەستدرێژیەکان و خۆش و ناخۆشیەکان، بەشێوەیەك گەلی کوردی هەر سەرکەوتنێك گەلی عەرەبی بەدەستی دەهێنێت بەسەرکەوتنی خۆیی دەزانێت.
بەم باوەڕە راستگۆیانە کەوا حزب گوزارشتی لێکرد لەسەر زمانی سکرتێرەکەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە وتارێکدا کە رۆژنامەی -خەبات- لە ژمارە ٣٩٢دا لەبەرواری ٢٥-٢-١٩٦٠دا بڵاویکردەوە حزب بەردەوام بوو لەسەر جێبەجێکردنی پەیماننامەو

پرۆگرامەکەی کەوا هەمیشە گوزارشتیان کردووە لە بڕوای حزب لەبارەی پێویستی پتەوکردنی برایەتی عەرەبی کوردی و بەهێزکردنی خەباتی هاوبەشی نێوان هەردوو گەل و ئاڵوگۆڕی یارمەتیەکان لەنێوانیاندا، وە دەربارەی هەڵوێستی حزب کە پشتیوانیکەرە لەهەموو مەسەلەکانی ڕزگاربوونی نیشتمانی لەخۆرئاواو خۆرهەلآت لەسوریاو لوبنان و میصرو سودان و جەزائیر، لەباشوری عەرەبی یەمەن و عەممان.

حزب هەر لەدامەزراندنیەوە گوزارشتی لە پشتیوانی گەلی کورد کردوە بۆ تێکۆشانی گەلی عەرەبی لەهەموو دەوڵەتەکانیدا لەپێناو سەربەخۆیی نیشتمانی و دیموکراتی و، حزب بەشداری هەموو حزبە نیشتمانیە عێراقیەکانی کردووە لەتێکۆشانیاندا بۆ پشتیوانیکردن لە تێکۆشانی عەرەب لەهەموو شوێنەکانیاندا. خوێنی کوردی عێراقی لەگەڵ خوێنی عەرەبی عێراقیدا لەجەنگی فەلەستینی ساڵی ١٩٤٨دا پێکەوە ڕژا بۆ بەرگریکردن لە عەرەبی بوونی فەلەستین.

هەردوو حزب لایەنگریی لەخەباتی سوریا کرد لەدژی دیکتاتۆریەت و هەمیشە داوای بەرگریی کردووە لەبوونی لەکاتی فشارخستنە سەریەوە لەلایەن عێراق و تورکیاو داگیرکەر لەساڵانی ١٩٥٦-١٩٥٧ ز، هەروەها لەدژی فەرمانڕەوایانی عێراق وەستانەوە کە پیلانیان لەدژی سوریای ئازاد دادەنا.

لەکاتی دوژمنایەتی سێ قۆڵیشدا بۆ سەر میصر گەلی کوردی لەگەڵ گەلی عەرەبیدا لەعێراق شانبەشانی میصرو ڕۆڵەکانی خۆپیشاندانیان سازکرد لەدژی ئەو دوژمنکاریە و پشتیوانیان لەمیصری ئازادکردو بەمەش سەرکردەکانی حزب ڕاپێچی دادگا کران: ئیبراهیم ئەحمەد، عومەر مستەفا، مەلا عەبدوڵلآ ئیسماعیل، دەیان کەسی تری حزب بەتۆمەتی لایەنگریی میصر و تێکۆشان لەدژی حکومەتی عێراقی کە بەو نسکۆیە شاد بوو، ئەم سەرکردانە بەخۆڕاگریەوە لەبەردەم دادگا عورفیەکاندا وەستان کەلەدژیان حوکمی هەڕەمەکی و ستەمکارانەیان دەرکرد.

بێگومان حزبمان حزبی دیموکراتی کوردستان پشتیوانی لە هاریکاریی عەرەبی کردووە و داوای حوکمێکی نیشتمانی کردووە لەعێراق تا دەبێتە ڕاستی و واقیعێك. لێرەدا هەندێك برگە لە ڕۆژنامەی - خەبات- وەردەگرین لەژمارە ٣٩٨ ی بەرواری ٦١/١/١ بۆ ئەوەی

ببینین گەلی کوردی خۆی بەهاوبەشی عەرەب دادەنێت لەخۆشی و ناخۆشیداو هەر سەرکەوتنێك نەتەوەی عەرەبی بەدەستی دەهێنێت سەرکەوتنە بۆ ئەو، گەلی کورد هەست بە ئازارو خۆشیەکانی عەرەب دەکات هەروەك چۆن ئەوان هەستی پێدەکەن.
بۆیە هاریکاریی عەرەبی لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی و زایۆنیزم و لەپێناو بەدیهاتنی هەموو ئامانجە ڕەواکاندا بۆ نەتەوەی عەرەبی شکۆدار پێویستیەکی نەتەوەییە گەلی عێراقی بەهەردوو نەتەوەی عەرەب و کوردیەوە لەسەری کۆك و هاوڕان.
(خەبات) بەردەوام دەبێت و دەڵێت:- پارتی دیموکراتی کوردستانمان گوزارشتی لە پشتیوانی و لایەنگریی نەتەوەی کوردی کردووە بۆ هاریکاریی عەرەبی لەپەیڕەو لە راپۆرتەکانیدا کەوا مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری حزب پێشکەشی کۆنگرەی پێنجەمی حزب کردو لەچەندین وتاریشدا کە رۆژنامەی - خەبات-ی حزب بڵاویکردەوە بەلام سەبارەت بە یەکێتی یان یەکبوون لەنێوان گەلانی عەرەبیدا ئەوا حزب بە بەردەوامی پشتیوانی خۆی دەبڕیوە بۆ تێکۆشانی عەرەب لەپێناو ئازادی و دیموکراسی و یەکبووندا. لەو کۆنگرە رۆژنامەوانیەشدا کەلە سەرەتای حوزەیرانی ١٩٦٢دا لەبەیروت سازیکرد دەربارەی پەیوەستبوونی ئەم چەمکانە پەیوەستبوونێکی ئۆرگانیی گوزارشتی لەڕای حزب کرد.
کاتێکیش ناکۆکیەکان لەنێوان عێراق و لەنێوان هێزە عەرەبیە جۆراوجۆرەکاندا توندبوویەوە لەبارەی یەکێتی و یەکبوون حزبی دیموکراتی کوردستان- پارتی- گوزارشتی لەهەڵوێستی خۆی کرد لەدووتوێی یادداشتێکدا کە لە ١١-٩-١٩٥٨ ز پێشکەشی سەرۆك وەزیرانی و جێگرەکەی عەقید عارف کرد کە ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی:-
مەسەلەی یەکێتی و یەکبوون مەسەلەیەکە پێش هەمووشێتك لە دوولایەنەوە بەلامانەوە گرنگە، یەکەم- رادەی پاراستنی و بەدیهاتنی ئامانجە هەنوکەیی و دورەکان کەوا گەلی عێراقی بەتێکڕای خەباتیان لەپێناویدا کردووەو هەتا ئێستاش لەپێناویدا خەبات دەکات.
دووەم- رادەی پاراستن و بەدیهێنانی بنەمای هاوبەشی لەنیشتمانداو رادەی فراوان

بـوونی بـۆ مافـە نەتەوەییـەکانی گـەلی کـوردی کەلەدەسـتوری کۆمـاری عێراقیـدا دانیپێدانراوە.

جگە لـەم دوو لایەنـەش ئێمـە بەشـێوەیەکی بنـەمایی پێمـان وایـە مەسـەلەی یـەکێتی و یەکبوون پەیوەندیان بەگەلی عەرەبیەوە هەیە بەپلـەی یەکـەم، چـونکە بەشـێك لـەمافی گەلی برا پێکدەهێنن لە دیاریکردنی چارەنوسـی خـۆی بەدەسـتی خـۆی، ئـەوەش مـافی رەهاو مەزنە کەوا پەیماننامەی مافەکانی مرۆڤ بـۆ هـەموو گـەلانی زەوی بڕیـاری لەسـەر داوەو پاشانیش گەلانی ئاسیایی و ئەفریقایی لەکۆنگرەی باندۆنگدا کەوا گەلی کوردی بـە پشتیوانیەکی یاسایی دادەنێت لەخەباتی رزگاریخوازی خۆیدا. لەسـەر ئـەم بنـچینەیەش ئێمە پشتیوانی ئەوە دەکەین کەوا ڕای گەلی عەرەبی لەسـەری دەگیرسـێتەوە سـەبارەت بـەوەی کەپەیوەسـتە بـە بڕیـاری چارەنوسـی و بەوشـێوەیەی کـە هەڵیدەبـژێرێت بـۆ رێکخستنی پەیوەندیەکان لەنێوان بەشەکانی نیشتمانی عـەرەبی پارچـە پارچـە بوودا. ئەمەش بەشێوەیەکی بنەمایی رەها، بەڵام سەبارەت بەو ڕەوشەوە کەلەعێراق هەیە ئەوا ئێمە پێشتر ئەو دوو لایەنەمان خستەڕوو کە بەلامانەوە گرنگە لەم مەسەلەیەداو ناتوانین دەسـتبەرداری بـین، بـۆ بـەدیهاتنی لایـەنی یەکـەمیش کـە پاراسـتنی ئامانجـە دورو هەنوکەییەکانـە کـەوا گـەلی عێراقـی لەپێناویـدا تێکۆشـاوە. وە خێراکردنـی تێکۆشـان لەپێناویدا، ئەوا ئێمە پێمان وایە ڕێگەی دروست بریتیـە لـەوەی پەلـە نـەکرێت لەچوونە پێـشەوە بـۆ هـەر یـەکێك لـەو دوو هـەنگاوە یـەکێتی و یـەکبوون– پـێش لێکۆڵینـەوەو بژارکردن و بێ تەواوکردنی هەنگاوە پێویستە زۆرە بەراییەکان و پێش گەڕانەوە بۆ گـەلی عێراقی لەمەسەلەکەدا بەتایبەتی کەشـی نێودەوڵـەتی و عـەرەبی و عێراقـی یارمەتیـدەر دەبێـت لـە پێـدانی بـواری پێویـست بـۆ نمونـەی ئـەم بیرکردنـەوەو چـوونە پـێش و بـۆ وەرگـرتن و تـەواوکردنی ئامادەکارییـە پێویـستەکان بەشـێوەیەکی دروسـت و بـەتاڵ لەهەردوو رەگەزی سەرپێی و لەناکاوە.–

... ئەو پێکهاتەیەی کە روودەدات بەسروشتی حاڵ دروست بوونێکە رۆڵەکانی نەتـەوەی عەرەبی سەردەست و زاڵ دەکات، کوردەکانیش کە لەسایەی دەوڵەتدا دەژین ژمارەیـان کەم دەکات بەڕادەیەکی زۆرو بە ڕوانین بۆ زۆرینەی هەر زۆری عـەرەبی و ئەمـەش وایـان

لێدەکات کە زیاتر پابەندبن بەمافە نەتەوەییەکانیانەوەو زیاتر هەستیارو سۆزداربن بۆ ڕوانین بۆ هەر شتێك کە پەیوەندی بەم مافانەوە هەبێت چەندەش دووربێت، هەروەها ڕاڤەی هەموو هەڵسوکەوتەکان و کارە تازە دروستبووەکان دەکەن بەم زهنیەتەو لەسەر ئەم ڕۆشناییەش و بەتایبەتی ئەزمونەکانیان لەگەڵ تورکەکان لەبزوتنەوەی کەمالیزمداو لەگەڵ فارسەکان لەچەندین بۆنەدا ئەم وانە سەختەی فێرکردون. ئەم ڕەوشەش وا دەکات بچوکترین هەڵەیەك کەوا بەرپرسەکان تێی بکەون و پەیوەندی بەمافەکانی نەتەوەی کوردیەوە هەبێت خراپترین ئەنجام و پاشهاتی دەبێت.

.. هەر هەنگاوێك نەتەوەی عەرەبی دەینێت بەرەو ئامانجەکانی پێویستە فراوانکردنێکی زیاتری لەگەڵدا بێت بۆ مافە نەتەوەییەکانی کوردو ، هەنگاوێکیش بێت بۆ ئەم بەرەو ئامانجەکانی و گرفتیش نیە کە هەنگاوی هەریەك لەو دوو نەتەوەیە گونجاوبێت لەگەڵ پێگەو ڕەوشەکەیداو بۆ دانانی ئەم ڕێسایشە بۆ بواری جێبەجێکردن پێشنیار دەکەین:-

یەکەم: لەحاڵەتی ئەوەی کە عێراق ئارەزووی کرد بچێتە ناو یەکێتیەکی فیدراڵیەوە لەگەڵ ولاَتانی عەرەبی ئازادبوودا پێویستە دان بەجۆرێك لەحوکمی زاتی بنرێت بۆ کوردستان لەچوارچێوەی یەکێتی عێراقیدا.

دووەم: لەحاڵەتی ئەوەی کە عێراق ئارەزووی کرد لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوودا ببێت بەیەك ئەوا پێویستە دان بەنەتەوەی کوردیدا بنرێت لەعێراق بەوەی ببێتە ئەندامێکی فیدراڵی لەچوارچێوەی پێکهاتە نوێیەکەدا.

ئەوەش هەڵوێستی زانستی پارتیە کەوا ڕوداوەکان و ڕۆژەکان جەختیان لەڕاستی و دروستی کردەوە. لیژنەی ناوەندی حزبیش لەکۆبونەوەیەکیدا کە لە ١٤-١٢-١٩٦٢دا لە ئەشکەوتی - مالومە- لە لیوای سلێمانی بەسترا تەبەنی ئەم هەڵوێستەی کردو جەختی لەسەر کردەوە لەڕەوشەکانی دوای شۆڕشی نیشتمانی کوردی لەدژی قاسم.

هەروەها حزب پشتیوانی و لایەنگریی لە خەباتی جەزائیر کرد لەپێناو ئازدیدا. وە گەلی کوردی لەهەموو بەخشینەکاندا بەشداری کرد هەروەها قوتابیانیش بەشداریان لە مانگرتنی خوێندنگاکان و کۆلیژەکان و خۆپیشاندانەکاندا کرد وەك پشتیوانی لە تێکۆشانی نیشتمانی جەزائیر، لەو کۆبونەوەی جەماوەری گەورەدا کەوا بەغداد لەساڵی

١٩٥٩دا رێکیخست وەك پشتیوانیەك لە گەلی جەزائیری مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد وەك نوێنەری حزب وتارێکی پێشکەش کردو لایەنگری لەتێکۆشانی گەلی جەزائیری کردو گوزارشتی لەهاریکاری و پشتیوانی رەهای گەلی کورد کردەوە لەگەڵیدا.

هەروەها رۆژنامەی حزب و بڵاوکراوەکانی و پشتوانیان لە تێکۆشانە عەرەبیە رزگاریخوازیەکان کرد لەیەمەن و باشوری عەرەبی داگیرکراو و عەممان و هەموو شوێنەکانی تری وڵاتانی عەرەبی.

لەکۆنگرەی شەشەمی حزبی دیموکراتی کوردستانیشدا- کەلەکۆتاییەکانی مارتی ١٩٦٧ بەسترا- حزب تەبەنی ئەم دەقەی خوارەوەی کرد لەپەیرەوی خۆیدا لەبارەی مەسەلەی یەکێتی عەرەبیەوە.

پارتی پشتیوانی لەتێکۆشانی نەتەوەی عەرەبی دەکات لەهەموو بەشەکانی نیشتمانە گەورەکەی لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی و لەپێناو مافی دیاریکردنی چارەنوسی و دیاریکردنی شێوەی بەیەککردنی دەوڵەتەکانی بەپێی ئارەزوو و بەرژەوەندی عەرەبی لەگەڵ چاودێریکردن و گرنتی مافە نەتەوەییەکانی کوردی- برگەی- ٢٢- مادەی شەشەم لە پەیرەو پرۆگرامی پارتی.

لەم دەقەی پێشەوەش ئەم راستیانەی خوارەوە دەردەکەون:

١-پشتیوانیکردنی پارتی بۆ تێکۆشانی نەتەوەی عەرەبی لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستیی.

٢-پشتیوانیکردنی پارتی لە خەباتی نەتەوەی عەرەبی لەپێناو یەکێتی عەرەبی بەوشێوەیەی کە جەماوەری میللی عەرەبی ئارەزووی دەکات بەپێی بەرژەوەندی ئەم جەماوەرە میللیە. واتە پارتی پشتیوانی لە یەکێتیەکی عەرەبی کۆنەپەرست ناکات- وەك یەکێتی هاشمیی- بەڵکو پشتیوانی لە یەکێتیەکی عەرەبی دەکات کە بەرژەوەندیەکانی جەماوەری میللی دەکات و ئارەزووەکانی بەدیدەهێنێت و پاشانیش خزمەتی کێشەی تێکۆشانی دەکات لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی ئەوەش وەك بەشێك لەمافی نەتەوەی عەرەبی لەدیاریکردنی چارەنوسی.

٣-پارتی داوا دەکات یەکێتی عەرەبی گرەنتی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد بکات.

بەوشێوەیە هەڵوێستی برایانەی حزبی دیموکراتی کوردستان دەردەکەوێت لەبەرامبەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی عەرەبیداو گومانیشی تێدا نیە ئەم هەڵوێستە بەشداری کردوە لەبەهێزکردنی یەکێتی نیشتمانی و تێکۆشانی لەنێوان عەرەب و کوردەکاندا بەلاَم دەبێت هەڵوێستێکی هاوشێوەش هەبێت لەلایەن نیشتمانپەروەرە عەرەبەکانەوە بۆ ئەوەی بەهێزکردنی ئەم یەکێتیە زیاترو زیاتر بێت.

بەبێ نمونەی ئەم هەڵوێستەش ناکرێت ئەم هەڵوێستەی حزب تا کۆتایی پارێزگاری لە کاریگەریە قوڵەکەی بکات لەسەر جەماوەری کوردی. هەڵوێستێکی لەمشێوەیە لەلایەن عەرەبەوە لەبەرامبەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیدا پێویستە بۆ بەهێزکردنی برایەتی عەرەبی کوردی و یەکێتیە نیشتمانیەکەی و لەمبارەیەوە رۆژنامەی- خەبات- لەژمارە ٤٢١-٢-٢-١٩٦١دا لەسەر وتاریدا خۆیدا وتارێکی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری حزبی دیموکراتی کوردستانی بلاَوکردۆتەوە بلاَوکردنەوەی لێرەدا بەسود دەبێت کە بەم ناونیشانەیە:

## بۆ پتەوکردنی برایەتی عەرەبی کوردی
## پێویستە عەرەب پشتیوانی لە مەسەلەکانی گەلی کورد بکات

دەقی سەر وتاری رۆژنامەی (خەبات) کەلە ژمارە ٤٢١٤-٢-٢-١٩٦١ دا بلاَویکردوەتەوە لەژێر ناونیشانی بۆ پتەوکردنی برایەتی عەرەبی کوردی پێویستە عەرەب پشتیوانی لە مەسەلەکانی گەلی کوردی بکات کە لەلایەن مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستانیەوە نوسراوە.

پەیوەندیە مێژوویی و ئاینیەکان و، بوونی کوردەکان شانبەشانی عەرەب لەسایەی کۆماری عێراقدا، کۆماری عەرەب و کوردەکان و لەهەرێمی باکوریی لەسایەی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو یەك دوژمنی و یەك بەرژەوەندی و ئازار و هیواکان هەردوو گەلی برای عەرەبی و کوردی پێکەوە دەبەستێتەوەو ئەرکی یەکخستنی تێکۆشانی هاوبەش لەدژی

داگیرکەران و زەوتکەرانی ولأتەکەیان دەخاتـە ئەسـتۆی رۆلّەکانیـەوە هـەروەها لـەپێناو بەدیهاتنی ئەوەی کە چاویان تێبڕیوە لـە خواسـتی نەتـەوەیی رەواو ژیـانێکی بـەرێزدا ئـەوەیش کـە بەجێگەیانـدنی ئـەم ئەرکـە سـوك و ئاسـان دەکـات بریتیـە لەبێگـەردی پەیوەندیە کوردی و عەرەبیەکان و نـەبوونی هـیچ دوژمنکـاری و ململانێیـەکی خوێنـاوی بـوونی مـۆرکێکی دۆسـت و برایانـەو پـشتیوانیکردن لەیـەك هـەر لـەزۆر کۆنـەوە کەبەیەکگەیشتوون.

بێگومان خوێنی هەردوو گەلەکەش تێکەلّ بەیەك بووە بەدرێـژایی سـەردەمەکان لـەپێناو بـەرگریکردن لەنمونـە بالأکـەیان و بەرژەوەندەیـە هاوبەشـەکانیان لـەدژی زەوتکـەران و داگیرکـەران. کـاتێکیش کەوتنـە ژێـر دەسـەلأتی عوسمانیـەوەو پاشـانیش داگیرکـەرانی خۆرئاواییـەوە عـەرەب و کـورد بـەردەوام بـوون لەتێکۆشـان لـەدژی زەوتکـەران و داگیرکەران و لەپێناو ئازادییان و مافیان لەدیاریکردنی چارەنوسیان.

پەیوەندیـەکانیش لـەنێوان کـورد و عەرەبـدا لـەم سـەردەمانەدا لەوپـەڕی دۆسـتایەتی و برایەتیدا بـوو. زۆرێـك لـە رۆشـنبیرانی کـورد بەشـداریان لەڕاپـەڕینی فیکریـی بزوتنـەوە رزگاریخوازە عەرەبیەکاندا کردووە. کاتێکیش کە خـەبات و تێکۆشـانی ئـەم گەلـە ڕووی لەهەلّکشان کرد لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە گەلی کوردی لەسەر زمـانی پێـشڕەوە دیموکراتی و شۆڕشگێڕیەکانیەوە پـشتیوانی رەهـای خـۆی بـۆ خـەباتی عـەرەب لـەدژی داگیرکەرو زایۆنیزم راگەیاند وەلەپێناو بەدیهاتنی هەموو ئامانجـە نەتەوەییـە ڕەواکانیـدا بۆیــە شــتێکی سروشــتیە کوردەکــانیش چـاوەڕوانی یارمــەتی و پــشتیوانی لــەبرا عەرەبەکانیان بکەن لەدەرەوەو ناوەوەدا. کوردەکانیش لەداواکردن لـەبرا عەرەبـەکانیان پشت بە پەیماننامەی برایەتی عەرەبی کوردی نابەستێت، پەیماننامەی برایەتی عـەرەبی کوردی، کە بەخوێنی شەهیدانی ئاوێتەبوو و پەیوەست بوو لـە پەیوەسـتەگیە مێـژوویی و نیـشتمانی و ئاینیـە توندوتۆلّـەکان بەتـەنها بـەلّکو پـشتیوانیکردنی عـەرەب لەمافـە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی و کێشەکانی رۆلّێکی مەزن و گرنگ دەگێڕێت لەبـەهێزکردنی برایەتی عەرەبی کوردی و چەسپاندنی پایەکانی لەلایەکی ترەوە.

کوردەکان کاتێك دەبینن برا عەرەبەکانیان پشتیوانی لە کێشە ڕەواو دادپەروەرانەکەیان دەکەن و پشتیوانی لە داخوازیە ڕەواکانیان دەکەن زیاتر پەیوەست دەبن بەبرایەتی عەرەبی کوردی و بەیەکێتی نیشتمانیەوە. وە دڵنیا دەبن لە ئایندەی پەیوەندیە عەرەبی و کوردیەکان نەك تەنها لەچوارچێوەی عێراقیداو لەکۆماری عەرەبی یەککگرتوودا، بەڵکو هەروەها لەچوارچێوەی نیشتمانی عەرەبی گەورەو هەموو کوردستاندا.

واتە لەنێوان هەموو نەتەوەی عەرەبی و کوردیدا بەتێکڕا ئەمەش دەبێتە هۆی توندوتۆڵکردنی پەیوەندیەکان لەنێوانیانداو هەموو ڕێگاکان لەسەر هەموو بانگەشەیەکی داگیرکەری یان جیابونەوەیی دادەخات و ناکۆکیەکانی نێوان هەردوو گەلی برای عەرەبی و کوردی لادەبات. ئەمە سەرەڕای پشتیوانی عەرەب بۆ تێکۆشانی گەلی کوردی لەدژی دەسەلآتی داگیرکەرو کۆنەپەرستی و دژی سیاسەتی سەرکوتکردن و تێهەڵکێشکردن و لەپێناو مافە نەتەوەیی و دیموکراتیەکاندا لەهەردوو بەشی کوردستانی کە سەر بەتورکیاو ئێرانن. هەروەك چۆن پشتیوانیەکە بۆ مەسەلەی ئازادی گەلانی عەرەبی کە لەهەموو ناوچەکانی جیهاندا ڕادەپەڕێت بۆ سەرخستنی مەسەلەی ئازادی ئەگەرچی لەدورترین شوێنیش بێت ناشێت و نابێت سەرخستنی مەسەلەی گەلی کوردی برا بچوکەکەی خۆی فەرامۆش بکات کە لەگەڵیدا دەژی و بەتەنیشتیەوەیەتی. حزبی دیموکراتی کوردستان کە وایدادەنێت بەرگریکردن لە ئازادی و دیموکراسی و سەربەخۆیی نیشتمانی و تێکۆشان لەپێناویدا لەولآتانی عەرەبیدا بەڵکو لەهەموو جیهاندا تێکۆشانێکە لەپێناو مافە نەتەوەییە ڕەواکان، گەلی کوردی زۆر خۆشحاڵ دەبێت ببینێت کەوا برا عەرەبەکانمان بایەخ بە کێشە رزگاریخوازی و نەتەوەییە ڕەواکانی دەدات بەو پێیەی بەشێکی جیا نەبۆوەیە لەتێکۆشانی گشتی لەپێناو سەربەخۆیی نیشتمانی و ئازادی و دیموکراسیدا.

سەرەڕای ئەودش کە باسکرا سەبارەت بەوەی کە پەیوەندی هەیە بەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردەوە لەعێراق و ئەوەی پەیوەستە بە مافە رۆشنبیریەکانی کوردەکانەوە لەسوریا ڕاستەیەك هەیە پێویستە لەیادمان نەچێت کە زۆرێك لە ماندویی و

زۆرێك لە بەربەست لەبەردەماندا لادەبات لەپێناو تێكۆشانمان لەپێناو ژیانێكی ئازادی ئازادو سەربەست ئەویش ئەوەیە وەك چۆن پێویستە لەسەر تێكۆشەرە كوردەكان بڕوایان هەبێت بە پەیوەندی توندوتۆڵ لەنێوان مافە نەتەوەییەكانی گەلی كوردی و سەركەوتنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی و دیموكراسی لەو ولاَتانەدا كە حوكمی كوردستان دەكەن بەتایبەتی و ولاَتانی ناوچەكە بەگشتی ئەوا لەسەر سەركردەكانی ئەم گەلە ئازادو تێكۆشەرانەیە هەروەها بزانن كە سەركەوتن نیە بۆ ئازادی و دیموكراسیەت لەناوچەكەدا بەبێ ئەوەی گەلی كوردی مافە نەتەوەییەكانی بەدەست بێنێت و لێی بەهرەمەند بێت.

لەكۆتایشدا پارتی دیموكراتی كوردستان كە بە بەردەوامی پشتیوانیكردووەو پشتیوانی دەكات لەهەموو مەسەلەو كێشە عەرەبیە دادپەروەرەكان و پشتیوانی لەتێكۆشانی عەرەبی كردوە كەوا هاریكاری نێوان هەردوو كۆماری عێراقی و عەرەبی یەككرتوو بەردی گۆشە پێكدەهێنێت تێیداو هەمیشە شانبەشان لەگەڵ حزبەكان و دەستە و رێكخراو و دەزگا عەرەبیەكاندا وەستاوە پێویستە ئەوانیش پشتیوانی بكەن لەوەی كەوا كوردەكان بەمافە نەتەوەییە رەواكانیان بگەن لەناوەوەداو پشتیوانیكردن لە كێشەكانیان لەدەرەوەو یارمەتیدانیان لەناوەندو بوارە نێودەوڵەتیەكاندا ئەمەش لەپێناو بەهێزكردنی نیشتمانی و برایەتی عەرەبی و كوردی و بەجێگەیاندنی ئەركی خۆی لەبەرامبەر گەلی كوردی براو دۆست و دڵسۆز بۆ گەلی عەرەبی جوامێر، هەر لەكۆنیشەوە شاعیری عەرەبی ووتویەتی:

*نە ئەسپت هەیە ببیەخشی و نەماڵ  با قسەت باش بێت گەر باش نەبوو حاڵ."*

وەفدی كوردی هەڵبژێراویش لەكۆنگرەی كۆیە كە تێیدا پارتی و سەركردەی لایەنە پشتیوانەكان و بارزانیەكان و سەرۆك هۆزكان بەشداربوون ،.. ئەم وەفدە كەوا مام جەلال سەرۆكایەتی دەكرد جارێكی تر جەختی لەو ڕاستیانە كردەوە كەباسكران لەكاتی بوونیان لەبەغدا لەبەهاری ١٩٦٣ بۆ دانوستان كردن لەگەڵ حكومەت لەوكاتەدا دەربارەی مافە نەتەوەییەكانی گەلی كوردی لەچوارچێوەی یەكێتی سێ لایەنەی

پێشنیارکراو لەنێوان میصرو سوریاو عێراقدا. لەکاتی وتوێژەکانی یەکێتی سێ قۆڵیی لەقاهیرە وەفدی کوردی نامەیەکی بە بەرواری ٨ نیسان ١٩٦٣ دایە نوێنەرانی حکومەتەکانی میصرو سوریاو عێراق کەوا بڵاوکردنەوەی دەقەکەی لێرەدا بەسود دەبێت:—

## یادداشتی وەفدی کوردی

*بۆ بەرێزان سەرۆکان و ئەندامانی وەفدە کۆبووەکان.*

بە بۆنەی ئامادەبونتان لەکۆبونەوەکانی قاهیرە کە بەستراوە لەنێوان نوێنەرانی کۆماری عێراقی و کۆماری عەرەبی یەکگرتوو و کۆماری سوریاداو، بەڕوانین لە سروشتی وتوێژەکان کە لەمیانەیدا بەرێوەدەچن و پەیوەندی شوێنەوارە گشتیەکانی بە گەلی عێراق و لەناویشیدا بەگەلی کوردەوە کە بەچەند رەوشێکی تایبەت بەخۆی دەوردراوە وە بۆ گرفتەکانی بینمان ئەرکی سەر شانمانە وەك ئەندامانی وەفدی کوردی سەرپشکراو بەدانوستان لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا دەربارەی ئەوەی کەوا گەلی کوردی بتوانێت ممارەسەی مافە نەتەوەییەکانی بکات لەسەر بنچینەی لامەرکەزیەت وەفدی عێراقی بەرێز لە ڕای گەلی کوردی و هەڵوێستی لەجۆری ئەو پەیوەندیە ئاگادار بکەینەوە کەوا رەنگە دروست ببێت لەنێوان عێراق و دەوڵەتێك یان دەوڵەتانی عەرەبیدا بۆ ئەوەی ئەو بڕیارانەی کە پێی دەگەن لەبارەی ئەوەوە گونجاو بێت لەگەڵ سروشت و پێگەی گەلی کوردی لەعێراق و ناکۆکیەکی تێدا نەبێت لەدژ وەستانەوە لەگەڵ مافە نەتەوەییەکانیدا:

<u>یەکەم</u>: سەرەتا دەڵێین سروشتی ئەو گشتگیریەی کە وتوێژەکانی قاهیرە دەیخوازێت گەلی کورد نوێنەری هەبێت تێیدا بەجۆرێك لەجۆرەکان چونکە ئەوەی کە وەردەگیرێت تێیدا لەبڕیارەکان لەبارەی رێکخستنی پەیوەندیەکان لەنێوان هەر سێ کۆمارەکەدا کاریگەریان دەبێت لەسەر گەلی کوردی و مافەکانی لەکۆماری عێراقیدا، ئەم شوێنەوارە یان کاریگەریەش بەڕای ئێمە درێژدەبێتەوە بۆ بابەتی لامەرکەزیی وەك لەچێوەی ئەم یادداشتەدا بۆتان رون دەبێتەوە.

دووەم: بۆتـان رون دەكەینــەوە گـەلی كـوردی رۆژێـك لـەرۆژان بـەرووی ئـیرادەی گـەلی عەرەبیــدا ناوەســتێتەوە لــەجۆری ئــەو پەیوەندیــەی كەلەگــەڵ بەشــەكانی تــری و حكومەتەكانیـدا بـەرپای دەكـات. مایـەی شانازیـشە بـۆ گـەلی كـوردی هـەلی ئـەوەی بـۆ برەخسێت بۆ ئەوەی شەرەفی بەشداریكردنی هەبێت لەئاسـانكردنی زەحمـەت لەبابـەتی ئـەو پەیوەندیـەی، كـە دەویـسترێت بدۆزرێتـەوە لـەنێوان هـەموو پارچـەكانی نیـشتمانی عەرەبی بەگشتی و ولأتانی عەرەبی ئازاد دا بەتایبـەتی ئیـدی جـۆری ئـەو پـەیوەندیـە و مەوداكەی هەرچۆن و هەرچەند بێت.

سێیەم: بۆ خۆلادان لەئەگەری هەر گرفتێك لەئایندەداو لابردنی هـەر پێكادانێـك لـەنێوان بڕیـار لەسـەردراوەكاندا كــە لەكۆبونــەوەكانی قــاهیرە دەكەونــەوەو لــەنێوان مافــە نەتەوەییــەكانی گــەلی كوردیـدا لــەعێراق.. لێـرەدا راوبۆچـونی كـورد كـورت و پوخـت دەكەینــەوە كــە لــە سروشـتی بـوونی و پێگەكەیــەوە لــەعێراق سەرچـاوەی گرتـووە وەلەرێگــەی خــەبات و ئەزمونەكانیــەوە لــەماوەی مێـژوودا لەچـۆنیەتی پـەیوەندیـەكان لەنێوانیداو لەنێوان گەلی عەرەبیدا لەهەموو جۆرە رەوش و بارودۆخەكاندا:

أ- ئەگەر عێراق مایەوە بەبێ گۆڕانێك لەقەوارەیدا ئەوا داخـوازی گـەلی كـوردی لـەعێراق لەچوارچــێوەی جێبــەجێكردنی ئــەو بەیاننامەیــەدا دەمێنێتــەوە لــەبارەی مافــە نەتەوەییەكانی گەلی كورد لەسەر بنچینەی لامەركەزیەت.

ب- ئەگەریش عێراق چووە ناو یەكێتیەكی فیدراڵیەوە، ئـەوا پێویـستە حـوكمیكی زاتـی بەچەمكە ناسراوەو باوەكەی بەكورد بدرێت بێ تەئویلكردن و بەرتەسكردنەوەی.

ج- ئەگەریش عێراق چووە ناو یەكێتیەكی تەواوەوە لەگەڵ ولأتانی تـری عەرەبیـدا ئـەوا گـەلی كـوردی لـەعێراق دەبێــتە هــەرێمێكی پەیوەسـت بــە ولأتــە یەكگرتوەكــەوەو بەشێوەیەك كە ئەو ئامانجە بەدی بێت كە پاراستنی بوونیەتی و لەهەمانكاتیشدا دەبێـت جیابێتەوەو پەردپێدانی پەیوەندیـە توندوتۆڵـەكان لـەنێوان هـەردوو گـەلی بـرادا بـەرەو ئایندەیەكی باشتر زامن بكرێت.

**سەرۆكی وەفدی كوردی**

**جەلال تاڵەبانی**

لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە هەڵویستی گەلی کوردی و پێشڕەوەکەی پارتی دیموکراتی کوردستانی لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی عەرەبی هەڵوێستێکی دۆستانەی برایانەیە هەڵوێستێکە لایەنگرو پشتیوانیکەرە بەشێوەیەکی گشتی و لەرووی بنەماوە.
بەڵام لەناو بزوتنەوەی رزگاریخوازی عەرەبیدا بەتەنیشت لایەنە پێشکەوتنخوازیەکەی و سروشتە دوژمنکاریەکەی بۆ داگیرکەرو کۆنەپەرستی لایەنێکی شۆفێنیی هەیە لەبەرامبەر نەتەودی کوردیدا. بەدەستەواژەیەکی ووردتر رەوتێکی نەتەوەیی شۆفێنی هەیە لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی عەرەبیدا بەتەنیشت ئاراستەو رەوتە دیموکراسی و پێشکەوتنخوازیەکەیەوە.
*نەتەوەپەرستێکی عەرەبیش هەڵوێستی شۆفێنی خۆی بەمشێوە دەخاتەروو کاتێک دەڵێت:*
رێسای نەتەوەیی دەڵێت سنوری عەرەبی لەباکوریەوە بریتیە لە چیاکانی تۆرۆس و ئەو زەویەش لەباشوری ئەم زنجیرەیەوە زەوی عەرەبین و دانیشتوانەکەی چەند قەوم و نەتەوەیەکن بە کەمینە دادەنرێن لەنیشتمانی عەرەبیداو دەکرێت بنێرێن بۆ دەرەوەی ئەم سنورە ئەگەر هەر کێشەو گرفتێکیان بۆ نەتەوەی عەرەبی دروستکرد.
واتە گەلی کوردی کە هەزاران ساڵە تێیدا نیشتەجێیە لەگۆشەنیگای ئەم نوسەرەو کەمینەن لەنیشتمانی عەرەبیدا، دەکرێت لەکوردستان بکرێنە دەرەوەو — دوربخرێنەوە— بۆ دەرەوەی سنور.
لەبارەی ئەم کۆمەڵە شۆفێنیانەوە — خەبات— لەسەروتاری ژمارە ٢٤٥ یدا کە لە ٢١ — حوزەیران— ١٩٦٠ نوسیویەتی دەڵێت:
کۆمەڵە توندڕەوەکان لەبانگەشەکەرانی نەتەوەی عەرەبی دروشمێکیان هەڵگرتووە کەوا لەکۆنەپەرستیدا نوقم بووە بەرامبەر بە نەتەوەی کوردی وەك دروشمی ئەوەی کە بە بەشێك دابنرێت لە نەتەوەی عەرەبی لەرێگەی فێڵی فراوانکردنی چەمکی نەتەوەی عەرەبیەوە: واتە گرتنەبەری هەڵوێستی نکوڵیکردن لەبوونی نەتەوەی کوردی و کارکردن لەسەر تواندنەوەی و تێهەڵکێشکردنی وەك ئەوەی کە داگیرکەرانی فاشیست و تۆرانیەکان بەو نەتەوانەی دەکەن کەدەکەونە ژێر دەسەڵات و فەرمانڕەواییانەوە یان

وەك دروشمی ئەوەی کەوا گەلی کورد بە کەمینەیەکی نەتەوەیی دابنرێت کەلەسەر زەوی خەڵکی تر دانیشتبێت. -خەبات- بەردەوام دەبێت و دەڵێت:- کاتێك لەدژی لایەنی دوژمنکاری و دەستدرێژکاری وەستاینەوە لەبزوتنەوەی هەندێك لەکۆمەڵە نەتەوەییە عەرەبیەکان و لەدژی رەوتی فراوانخوازی دژ بە نەریتەکانی نەتەوەی عەرەبی شکۆدارو پێداگریی لەسەر ئەوەی هەموو نەتەوەکان پێویستە مافەکانی خۆیان بەدەست بێنن ئێمە دەرکمان بەپێویستی ئەو کارە دەکرد نەك بۆ پاراستنی مافەکانی کورد و خستنەڕووی ڕاستی بزوتنەوە رزگاریخوازیەکەیان و بەدرۆخستنەوەی بیرۆکە هەڵەکان لەبارەیەوە بەتەنها بەڵکو دەرکمان بەپێویستی ئەوە کرد لەپێناو خودی مەسەلەی عەرەبیشداو لەپێناو ئایندەی پەیوەندیە کوردی و عەرەبیەکانیشدا-.

لەبارەی ترسناکی ئەم لایەنە دوژمنکاریەی نەتەوەی عەرەبیەوە خەبات لە ژمارە ٢١٧ی بەرواری ١٥-مایس-١٩٦٠دا نوسیویەتی و دەڵێت:

- ئەم لایەنە دوژمنکاریەی نەتەوەی عەرەبی مەترسیەکی راستەقینە هەیە نەك لەسەری نەتەوەی کوردی بەتەنها، بەڵکو لەسەر خودی نەتەوەی عەرەبیش ئەو بزوتنەوەی نەتەوەیی عەرەبی بە روخسارێکی کۆنەپەرستی داگیرکەری نیشان دەدات لەلایەك- و لایەنگری لە بانگەشەکانی داگیرکەرو زایۆنیزم دەکات لەبارەی ئەوەی پێی دەوترێت داگیرکەری عەرەبی و- ژینگەی هەردوو نەتەوەی برا ژەهراوی دەکات و جۆرێك لەکەلێن دروست دەکات لەنێوانیاندا لەلایەکی ترەوە لەمەشدا خزمەتێکی گەورە بەداگیرکەرو زایۆنیزم دەکرێت کە مەلاسی لەعەرەب گرتووە - .

بۆیە پێویستە لەسەر عەرەب دەرك بکەن بە بایەخی برایەتی عەرەبی کوردی و یەکێتی نیشتمانی گەلی عێراقی و دوژمنایەتی لایەنی داگیرکەری بانگەشەکانی عەرەبیە نەتەوەپەرستە راستڕەوکان بکەن بەو پێیەی کە ئەم لایەنە دژ دەوەستێتەوە لەگەڵ جەوهەری نەتەوەی عەرەبی پێشکەوتنخوازی کەدژ بەداگیرکەرو کۆنەپەرستیە.

# پارتی و یەکێتی نیشتمانیی

مێژووی مرۆیی دوو جۆری سەرەکی لە پەیوەندیەکان لەنێوان ئەو نەتەوانەدا دەزانێت کە لەژێر سایەی یەک دەوڵەتدا دەژین لەم دووجۆرە سەرەکیەشەوە جۆری تری هاوشێوە جیادەبێتەوە.

کۆنترینیان یەکێتی پێوەلکاندنە، ئەویش بریتیە لە خستنەسەری بەزۆرەملێی ئەو نەتەوانەی کە دۆڕاون بۆ سەر نەتەوە باڵادەستەکە لە دەوڵەتە سەرکەوتوەکەدا، ئەم یەکێتیەش سەرەڕای ئەوەی زۆرەملێیی پێوەلکاندنە بەسوک تەماشاکردنی مافەکانی نەتەوەکان یان ئەو نەتەوانەی کە ژێردەستە بوون و ڕوبەڕوی چەوساندنەوەی نەتەوەیی یان جیاکاری ڕەگەزی دەبنەوە بەوپێیەی کەلەنەتەوە پلە دووەکانن، پاشانیش یەکێتیەکە لەسەر ئارەزوو یان ئیختیاریی یان یەکسانیی لەنێوان لایەنەکانیدا بەرپا نەبووە.

نمونەی ئەم جۆرە کۆنەپەرستیە دێرینەش بریتیە لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و بەریتانی و فەرەنسی و روسی کۆن.

بەڵام جۆری دووەم- نویٚ- ئەوا یەکێتیەکی ئیختیاری برایانەیە لەنێوان نەتەوەکاندا کەوا گوزارشت لەئیرادەی ئازادیان دەکەن لەپێکەوە ژیان لەگەڵ یەکترو لەسایەی یەک دەوڵەتی یەکگرتووداو نمونەی ئەم جۆرە یەکگرتنەش- وێڕای ئەوەی کە ئیختیاریە- هەروەها یەکسانیەکی تەواوەتیش هەیە لەنێوان لایەنەکانیداو پاراستنی بوونی نیشتمانی بۆ هەر نەتەوەیەکی هاوبەش تێیداو پاراستنی مافە نەتەوەییەکانی لەچوارچێوەی قەوارەی ئەم وڵاتە یەکگرتوەدا کە نمایشی هەموو نەتەوەکان دەکات نمایشێکی ڕاست و ئازاد. نمونەی ئەم جۆرە یەکێتیە ئیختیاریە بریتیە لە یەکێتی سۆڤیەت و یەکێتی سویسری و یوگسلافیاو چیکۆسلۆفاکیا.

ئەم دوو جۆرە سەرەکیەش لەپەیوەندیەکان لەنێوان ئەو نەتەوانەدا کەپێکەوە دەژین لەسایەی یەک دەوڵەتدا جیاوازیەکی گەورە هەیە لەڕووی دروستبوون و پێکهاتەوە، جۆری یەکەم زۆرەملێیی و پێوەلکاندنە بەپێچەوانەی جۆری دووەمەوە کە ئیختیاری ئازاد دەبێت و نەتەوەی گەورە یان پەرەسەندوە کە باڵا دەست دەبێت و بەناوی

نەتەوەکانی ترەوە فەرمانڕەوایی دەکات ... ئەمە لەکاتێکدا نەتەوەکان یەکسان دەبن و خاوەن دەزگای فەرمانڕەوایی نیشتمانی تایبەت بەخۆیان دەبێت لەجۆری دووەمدا.
پێکهاتەی ئەو دەوڵەتەی کە لەسەر بنچینەی یەکێتی ئیختیاریی دروست دەبێت بەهێزو پتەو دەبێت و شایستەی گەشەکردن و بوژاندنەوە دەبێت و بەتاڵ دەبێت لەململانێکان، کە یەکسانی تەواوەتی باڵ دەکێشێت بەسەریداو رۆحی برایەتی و ئاڵوگۆڕکردنی یارمەتیەکان لەنێوان لایەنەکانیدا بەرجەستە دەبێت.
ئەم دوو جۆرە سەرەکیەش لقی تریان لێ جیادەبێتەوە لەهەندێك روخسارياندا بەلآم لەجەوهەرياندا هاوشێوەو وەك یەکن، با ئێستاش لەسروشتی یەکێتی عێراقی پاشایی بکۆڵینەوە کە بەردەوام بوو هەتا هەڵگیرساندنی شۆڕشی ١٤ تەمموزی ساڵی ١٩٥٨.

## سروشتی یەکێتی عێراقی پادشایی

گومانی تێیدا نیە یەکێتی عێراقی – پاشایی– سەر بەیەکێك لەدوو جۆرە سەرەکیەکەیانە... بەلآم کامەیە ئەو جۆرە؟ بەدەستەواژەیەکی تر کامەیە جۆری یەکێتی عێراقی؟ ئایا یەکێتیەکی پێوەلکاندنە یان یەکێتیەکی ئیختیارییە؟.
سەیرکردنێکی چۆنیەتی دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی لەسەر دەستی داگیرکەری بەریتانی سروشتی یەکێتی عێراقیمان بۆ دەخاتەڕوو، ئاشکرایە کە حکومەتی عێراقی ئێستا لەدوای جەنگی جیهانیەوە ساڵی ١٩٢٠ دامەزراوە بێ ئەوەی ناوچەی کوردستانی باشوری بگرێتەوە کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردن لەنێوان بەشداریکردن لە ریفراندۆم بۆ هەڵبژاردنی ئەمیر فەیسەڵ یان دورکەوتنەوە لەوەو بێگومانیش داگیرکەری بەریتانی لەو کاتەوە هەستاوە بەئەرکی لکاندنی کوردستانی باشور بەحکومەتی عێراقیەوە وەك ئەوەی لەبەشێکی پێشوودا رونمکردەوە.
یەکێتی عێراقی پادشایی یەکێتیەکی ئیختیاری نەبوو لەسەر یەکسانی تەواوەتی بەرپا بووبێت لەمافەکان و لەسەر رێزگرتن لە قەوارە نەتەوەییەکانی عەرەب و کورد پێکەوە. گەلی کوردی بێبەشە لەدەزگا کارگێڕی و ئاوەدانی و تەندروستیە تایبەتیەکان و هەروەها لەحوکمی زاتیش.

# یەکێتی عێراقی - کۆماریی

شۆڕشی ١٤ تەمموزی رزگاریخوازیی کۆشك و تەلاری پاشایی سەر بەداگیرکەری روخاندو بنەما کۆنەپەرستیەکانی هەڵوەشاندنەوە کەوا یەکێتی عێراقی پاشایی لەسەر بونیادنرابوو، بنەمای داگیرکەریی کەوا هەردوو نەتەوەی عەرەبی و کوردی بەیەکەوە بەستبۆوە، بنەماکانی لکاندن و تێکەڵکردنی کۆنەپەرستی – دەرەبەگایەتی کە هەردوو نەتەوەی بە پەیماننامەی کۆیلایەتی و داگیرکەریەوە بەستبۆوە هەروەك چۆن شۆڕشی تەمموز دانی نا بەبوونی نەتەوەی کوردی و بنەمای هاوبەشی لەنیشتمان لەنێوان عەرەب و کورد دا هەروەها جەختی کرد لەپێویستی داننان بە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورددا لەمادەی سێیەم لەدەستوری کاتی و سەرەڕای مانەوەی بونیادی کارگێڕیی و دەستوری عێراق لەسەر شێوازە کۆنەکە بەڵام کۆماری ١٤ تەمموز گۆڕانکاری گرنگی ئەنجامدا لەسستمی کۆمەڵایەتی عێراقیدا ئەمەش کاریکردە سەر سروشتی یەکێتی عێراقی. بۆ یەکەمجاریش لەمێژووی دەوڵەتی عێراقیدا مۆڵەت درا بە رۆژنامەی سیاسی کوردی و مۆڵەت بە پارتی دیموکراتی کوردستان دراو رێگە بەچالاکیەکانی خوێندکاران و لاوانی کوردی درا بەشێوە نیمچە ئاشکراکەی.

بەوشێوەیە یەکێتی عێراقی وەك پێشوو بە یەکێتیەکی زۆرەملێیانەی داگیرکەری نەمایەوە بەتایبەتی کاتێك کەوا زۆرینەی هەرە زۆری گەلی کوردی گوزارشتی لەپەیوەستی توندی خۆی کردەوە کاتێك کەوا بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردی و پێشرەوەکەی –پارتی– نارەزایی لەجوداخوازیی دەربڕی و دژایەتی کرد.

بەڵام یەکێتی عێراقی بەشێوەیەکی کارگێڕیی و دەستوری نەگۆڕا بۆ یەکێتیەکی برایانەی راستەقینە لەنێوان هەردوو نەتەوەدا ئەویش بەهۆی بێبەشبوونی گەلی کوردی لە دامودەزگا کارگێڕیی و رۆشنبیری و سیاسی و نەتەوەییەکانی کەدەتوانێت بەهۆیەوە ممارەسەی مافە نەتەوەییەکانی بکات. بۆ ئەوەی یەکێتی عێراقیش ببێتە یەکێتیەکی برایانەی پتەو راستگۆو بەهێز پارتی دروشمی داواکردنی جۆرێك لەحوکمی زاتی بەرزکردەوە لەچوارچێوەی کۆماری عێراقیدا.

# یەکێتی نیشتمانی بۆ گەلی عێراقی

بەڵام یەکێتی نیشتمانی بۆ گەلی عێراقی کە لەئەنجامی هاوپەیوەستی خەباتی نێوان عەرەب و کوردەوە لەدژی داگیرکەرو کۆنەپەرستی دروست بووە دژە بە یەکێتی زۆرەملێییە کەوا داگیرکەرو کۆنەپەرستی دروستیان کردووە.

یەکێتی نیشتمانی گەلی عێراقی دەخوازێت یەکێتی عێراقی بگۆڕێت بۆ یەکێتییەکی ئیختیاریی لەنێوان هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی برادا بۆ ئەوەی یەکێتی فەرمیی لەگەڵ جەوهەری یەکێتی نیشتمانیدا بگونجێت تێکۆشانی گەلی کوردیش بەسەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ پتەوکردنی یەکێتی نیشتمانی گەلی عێراقی بەردەوام دەبێت هاوشان لەگەڵ خەباتی بۆ گۆڕینی یەکێتی عێراقی بۆ یەکگرتنێکی ئیختیاری پتەو وەك مەرجێك بۆ پاراستنی ئەم یەکێتیە و هەروەها بەهێزکردنی.

*باشە ئەوە چۆن بەئەنجام دەگات؟*

بۆ بونیادنانی تەلاری یەکێتیەکی ئیختیاری لەنێوان هەردوو گەلی برادا دەبێت دانبنرێت بەحەقیقەتی بوونی هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی کەلەسەر زەویەکانیان دەژین.

گەلی عەرەبی لەعێراق بەشێك پێکدەهێنێت لەنەتەوەی عەرەبی و، گەلی کوردیش لەعێراق بەشێك پێکدەهێنێت لەنەتەوەی کوردی، بەڵام بەرژەوەندی ئەم دوو گەلە برایە دەخوازێت پێکەوە بژین لەژێر سایەی کۆمارێکی دیموکراتی یەکگرتوو- کەوا کۆماری عێراقیە کە دەبێت لەڕاستیدا دیموکراتی بێت.

نکولیکردن لەم ڕاستیە مێژوییە یەکێتی ئیختیاریی نێوان هەردوو گەل دەخاتە مەترسیەوە. ڕاستە شۆفێنیە عەرەبەکان نکولی لەبوونی گەلی کوردی دەکەن لەعێراق بێ ئەوەی ئەمە هیچ شتێك لەواقیعی بوونی بگۆڕێت بەڵام نەتەوەیی تری عەرەب هەن نکولی لەبوونی گەلی کوردی ناکەن.

-ئەوەی کە لەبەیاننامەی حکومەتی روسی سۆڤیەتیدا- بەیاننامەی ئاشتی-دا هاتووە کە ف. ا لینین بەلێهاتوییەوە خستویەتەڕوو لەبارەی چەمکی زانستی پێوەلکاندنەوە بۆ هەندێك لە کۆمۆنیستە عەرەبەکان باس دەکەم.

*لەبەیاننامەکەدا هاتووە:-* ئەگەر هەر نەتەوەیەك بەشێوەیەکی زۆرەملێیی لەسنوری

دەوڵەتێکی دیاریکراودا مایەوە، ئەگەریش سەرەڕای ئەو ئارەزووەی کە گوزارشتی لێکردووە- ئیدی لە ڕۆژنامەدا بێت یان لەئەنجومەنە میللیەکاندا یان لەبڕیارەکانی حزبەکاندا یان لەڕێگەی شۆڕشەکان و ڕاپەڕینە چەکداریەکانەوە لەدژی ستەمی نەتەوەیی، لەمەدا هیچ کێشەیەك نابێت-... ئەو مافە نەدراوە کە بەدەنگدانێکی ئازاد بڕیار بدرێت دوای کشانەوەی تەواوەتی سوپای نەتەوە داگیرکەرەکە یان نەتەوە بەهێزترەکە بەشێوەیەکی گشتی واتە بەبێ هەر فشارێکی مەسەلەی دژواری بوونە سیاسیەکەی، ئەوکات خستنەسەری ئەم نەتەوەیە بۆ دەوڵەتەکە پێوەلکاندن دەبێت.. واتە دەستبەسەراگرتن، یان زەوتکردن دەبێت[١٦٥].

بەڕێز ئەحمەد فەوزی کە نەتەوەییەکی عەرەبیە لەعێراق دەڵێت[١٦٦]-

"... نەتەوە عەرەبی دان بەوەدا دەنێت گەلی کوردی کە لەژێر فشاری ستەمە کۆنەپەرستیەکاندا ماندو کفتەکار بووەو ئامانجی پیلانگێڕییە داگیرکەریەکان بووە ئەم گەلە یەکێتیەکی گونجاو هاوچەشنە خاوەن تایبەتمەندی نەتەوەیی تێروتەسەلە" ئەو فاکتەرانەی کە فەراهەم بوون بۆ نەتەوەی عەرەبی و لێیەوە نەتەوەیەکی خاوەن تایبەتمەندی نەتەوەیی تەواو دروست بووە هەمان ئەو فاکتەرانە یان زۆربەیان بۆ گەلی کوردیش دروست بوون.

گەلی کوردی بەزمانێکی تایبەت بەخۆی قسە دەکات. وە خاوەن مێژویەکی هاوبەش و ، پێکهاتەیەکی دەروونی و ئامانجگەلێکی هاوبەشە".

بەیاننامەی سیاسی بۆ کۆنگرەی نەتەوەیی حەوتەم کە حزبی کرێکارانی عەرەبی لەم بارەیەوە دەریکرد تێیدا هاتووە[١٦٧]: گەلی کوردی لەناوچەی خۆرهەلاتی ناوەڕاست نیشتەجێیە: تورکیا. ئێران. عێراق، سوریا، قەوقازی سۆڤیەتی. وە بەچاوپۆشین لەهەندێك ئیعتیباراتی تیۆریی پەیوەست بە رەگەزە پێکهێنەرەکانی نەتەوەوە ئەوا کوردەکان نەتەودیەکی تایبەت و جیاواز پێکدەهێنن، سەرەڕای بوونی جیاوازی لەشێوە

---

[١٦٥] - ڕۆژنامەی برافدا (١٧١) ٢٠ تشرینی دووەم ١٩١٧.

[١٦٦] - لاپەرە ٦٢ لەکتێبی قاسم و کوردەکان (خناجر وجبال) ی بەڕێز ئەحمەد فەوزی، چاپە عەرەبیە یەکەمەکە ١٩٦٢.

١٦٧ - لاپەرە ١٥٢ لە (بەیاننامەی سیاسی بۆ کۆنگرەی نەتەوەیی حەوتەم) بۆ حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی چەپڕەو.

زاریاندا، یان زمانداو فەراهەم نەبوونی یەکێتیەکی ئابوریی و ئیمکانیەتی تەواوکاری ئابوریی لە ئایندەیەکی نزیکدا.

لە سۆنگەی ئەم ڕاستیەوە ئەوا هەموو قسەکردنێك لەبارەی ئەوەی کەوا کوردەکان بەشێکن لەعەرەب یان تورك یان ئێرانیەکان، هەوڵدانێکە بۆ نکوڵیکردن لەواقیعی حەقیقەتێکی بەرجەستە. کورد نەتەوەیە، هەست بە قەوارەی نەتەوەیی و جیاوازی نەتەوەیی خۆی دەکات ".. کەواتە بوونی گەلی کوردی لەسەر زەوی کورستانەکەی ڕاستیەکی واقیعیە هەتا بەدانپێدانانی نەتەوەییە عەرەبەکانیش.

ئاشکرایە گەلی کوردی وەك گەلانی تر، مافە نەتەوەییە ڕەواکانی هەیە تێشیدا مافی چارەی خۆنوسین. ئەم مافەش مافی دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ یان حکومێکی زاتی پێدەبەخشێت.

بەڵام بەرژەوەندی گەلی کوردی لەرەوشە مێژووییە هەنوکەییەکاندا ئەوە دەخوازێت گەلی کورد مافی خۆی بەکار نەهێنێت لەبڕیاردانی چارەنوسی خۆی بەشێوەی جیابونەوە لەعێراق لەبەر دژوەستانەوەی ئەمە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی گەلی کوردی و گەلی عەرەبی و کۆی بزوتنەوەی رزگاریخوازی دیموکراتی. بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت گەلی کوردی مافی دیارکردنی چارەنوسی خۆیی نیە، بەڵکو ئەوە مانای ئەوە دەگەیەنێت کەپێویستە لەسەر گەلی کوردی ئەم مافەی خۆی بەکار بهێنێت بەشێوەیەك جگە لەشێوەی جیابوونەوە. گونجاوترین و باشترین شێوەکانیش بریتیە لە حوکمی زاتی لەباردۆخی ئێستادا. ئایندەش پەیوەستە بەو باروددۆخانەوە کە دێنە ئاراوە لەلایەك و، بەچۆنیەتی مامەڵەی گەلی عەرەبی برا لەگەڵ گەلی کوردی برایدا لەلاکەی ترەوە.

ئەگەر گەلی عەرەبی براش وای لە گەلی کوردی برای کرد هەست بکات مانەوەی لەگەڵیدا لەسایەی کۆماری عێراقیدا یان وڵاتی عەرەبی یەکگرتوودا گونجاوترین و شیاوترینە بۆی ئەوا گەلی کوردی لەگەڵ گەلی عەرەبیدا لەیەکێتیەکی فیدراڵی ئازادی پتەودا دەمێنێتەوە بەوشێوەیە ئەوا چارەنوسی یەکێتی ئیختیاری لەنێوان کوردو عەرەبدا بەپلەی سەرەکی لەسەر برا گەورەو زیاتر پەرەسەندو وەستاوە کە ئەویش گەلی عەرەبیە یەکەم و، لەسەر بەرژەوەندی هەردوو گەلە دووەم. یەکێتی لەنێوان نەتەوەکاندا ئەگەر لەسەر بنەمایەك لەیەکسانی و ئاڵوگۆڕی یارمەتیەکان و بەرژەوەندیە هاوبەشەکان و مافی

مومارەســەکردنی مافــە نەتەوەییــەکان وەســتابوو لەرێگــەی دەزگــا نەتەوەییــە تایبەتەکانــەوە، ئــەوا زیــاتر شــیاو و بەســودە بــۆ پەرەســەندنی نەتــەوە بــچوکەکان و بوژاندنەوەیان.

... لەبەر هەموو ئەم هۆیانە ئــەوا گــەلی کــوردی لــەعێراق بــەردەوام دەبێــت لەتێکۆشــان لەژێر سەرکردایەتی پارتی پێشڕەویدا – بۆ بونیادنانی نمونــەی ئــەم یەکێتیــە ئیختیاریــە برایانەیە لەسەر داروپەردوی یەکێتی زۆرەملێیی پێوەلکاندنی کەئێستا هەیە.

دکتۆر شاکر خصباك لەم بارەیەوە دەڵێت[168]

" دەبێت جارێکی تر جەخت بکرێتەوە لەوەی رێگە بەهەڵەکانی رابردو نــەدرێت دووبــارە ببنەوە. ئەمە دەخوازێت ئەو ڕاستیە مێژوییــە بخەینــە پــێش چــاوی خۆمانــەوە ئــەویش ئەوەیە کوردەکان کەمینەیەك نین لەکەمینــە رەگەزیــەکان کــە هــاتبن بــۆ عێــراق، بــەڵکو ئەوان دانیشتوانی رەسەنی ئەم ناوچەیەن هەر لەهەزاران ساڵەوە و مافەکانیان یەکسانە بەمافەکانی عەرەب بەتەواوەتی. مادامیش رێکەوتووین لەسەر هاوبەشی لەم نیــشتمانەدا بۆیە دەبێــت هەوڵبــدەین باشــترین رێگــە بگرینەبــەر بــۆ پــشتیوانیکردن لــەم هاوبەشــیە. نمونەی رونیشمان هەیە لەسستەمەکانی وڵاتەکان کە فرە نەتەوەن کەپێش ئێمە کــەوتون لەبواری کارگێڕیداو واباشە بۆ ئێمە هەوڵبــدەین ســود لەئەزمونــەکانیان وەربگــرین لــەژێر رۆشنایی رەوشەکەماندا، ئەگەر بمانەوێت تەلاری دەوڵەتەکەمان لەسەر بنەمایەکی پتــەو دابمەزرێنین کە هەواو ئارەزوو خواستە کەســیەکان نــەجولێنێت و کــار لــەجێگیرو قــایمی نەکات بەدرێژایی ساڵان".

لەراستیدا دکتــۆر خــصباك ناوجەرگــەی حەقیقــەتی پێکــاوە کاتێــك دەڵێــت" کوردەکــان نیشتەجێی رەسەنی ئــەم ناوچــانەن هــەر لەهــەزاران ســاڵەوە" هــەروەها کاتێــك کــە داوا دەکات سود لە ئەزمونی وڵاتە فیدراڵیەکان وەربگیرێت.

کوردەکــان نەتەوەیــەکی تایبــەتن ئەگەرچــی نەتــەوەی بــچوکیش بــن لەعێراقــدا، بــەڵام کەمینەیەکی نەتەوەیی نین چونکە کەمینەی نەتەوەیی واتــە کۆمــەڵك خــەڵکی دیــاریکراو لەسەر زەوی گەلێکی ترو لەناو ئەو گەلادا دەژین.

---

[168] لاپەرە ٨٦ لەکتێبی ( الکرد والمسألة الکردیة في العراق) بەپێنوسی دکتــۆر شــاکر خــصباك چاپە عەرەبیە یەکەمەکە ١٩٥٩.

وە شیاوە بۆ سۆشیالیستە عەرەبەکان ئەوانەی پەیوەندیەکی تونـدوتۆڵیان بە سەربازگەی سۆشیالیستیەوە هەیە بەتایبەتی یەکێتی سۆڤیەتی و یوگسلافیاوە چاو لەم دوو دەوڵەتە بکەن.

رەوشی گەلی کوردی لەعێراق- لەسنورێکی دیاریکراودا- هاوشێوەی رەوشی گەلی مەکدۆنیە لەیوگسلافیا کە دوو بەشی ئەم گەلە لەدەرەوەی سنوری یوغسلافیاوە دەژین، لەیۆنان و بولگاریا بەڵام ئەمە رێگر نەبووە لەوەی کە حوکمێکی زاتی نزیك لە حوکمی فیدراڵی بدرێتە گەلی مەکدۆنی لەیوگسلافیادا.

ئەم قسەیە بۆ هەندێك لە نەتەوەییە عەرەبەکان رەوانە دەکەم کە نەیاری ئەوەن حوکمی زاتی بدرێتە کوردستانی عێراق. بە بەڵگەی ئەوەی بوونی گەلی کوردی لەتورکیاو ئێران وا دەکات حوکمی زاتی کوردستانی عێراق بەرەو جیابوونەوە بڕوات.

ئەمە لەکاتێکدا پێدانی حوکمی زاتی بەکوردستانی عێراق دەبێتە هۆی بەهێزکردن و پتەوکردنی یەکێتی نیشتمانی بۆ گەلی عێراقی و بنەماکانی یەکێتی ئیختیاری لەنێوان کوردو عەرەبدا دەچەسپێنێت و پاشانیش جیابوونەوە دور دەخاتەوە نەك نزیکی بکاتەوە. بەتایبەتی چونکە رەوشی گەلی کوردی لەبەشەکانی تری کوردستاندا ڕازیکەر نیە.

نەتەوەییەکانیش لەناو سەرکردایەتی حزبی ئیستیقلال دانیان بەهاوبەشی عەرەب و کورددا ناوە لەعێراقداو لەگەڵ سەرکردەکانی حزبی نیشتمانی دیموکراتیدا کاریان کرد بۆ دانانی بەندێك لەپرۆگرامی حزبی کۆنگرەی نیشتمانی عێراقیدا کە تێیدا باس لە هاوبەشی عەرەب و کوردەکان دەکات لەنیشتمانی عێراقیداو رێزگرتن لەمافە نەتەوەییەکانی کوردەکان، ئەم بەندە کە دواتر بووە مادەی سێیەم لەدەستوری کاتی عێراقی دوای شۆڕشی چواردەی تەمموز.

هەروەها مامۆستا هلال ناجی- کە نەتەوەییەکی عەرەبی عێراقیە داوا دەکات دان بەمافی چارەی خۆنوسینی کوردەکاندا بنرێت لەچوارچێوەیەکی فیدراڵی یان کۆنفیدراڵیدا ئەوەش چارەسەرێکی زانستیە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی هەردوو گەلی عەرەبی و کوردیدا دەگونجێت پێکەوە. بەڵام حزبی کرێکارانی عەرەبی شۆڕشگێڕ داوایکرد : " بڕیاردانی چارەی خۆنوسین مافێکی گەلی کوردە. وە گوزارشتێکی واقیعیە

لەبوونی.. جیابوونەوە لەم قۆناغەدا بەلانی کەمەوە- لەبەرژەوەندی کوردو بەرژەوەندی شۆرشی عەرەبی نیە لەیەککاتدا" " پێویستە دان بەمافە زمانی و رۆشنبیرییەکانی گەلی کوردیدا بنرێت دانپێدانانێکی تەواو. رۆیشتن لەسەر جێبەجێکردنی حوکمی زاتی تا ئەوپەری رادە. بەلام داخوازیە سەربازیەکان ئەوا پێویستە بەتەواوتی رەتبکرێنەوە".

بەلام بەرەی دیموکراتی لەعێراق بە بەردەوامی داوای ئەوەیکردووە کە دان بنرێت بە بوونی گەلی کوردی و مافە نەتەوەییەکانیدا بێ دیاریکردنی ئەو دەزگا یان سستەمەی کەوا گەلی کورد پێی مومارەسەی مافەکانی دەکات، هەتا ئەم دواییانەش کاتێك شیوعیە چەپەکان و دەستەیەك لەدیموکراسیەکان تەبەنی دروشمی حوکمی زاتیان بۆ کوردستان بەرز کردبۆوە.

حزبی شیوعی عێراقیش بەسەرۆکایەتی خوالێخۆش بوو -فەهد- داوایکرد دانبنرێت بە مافی چارەی خۆنوسین بۆ گەلی کورد لەوتارێکدا کە (القاعدة) لەسالی ١٩٤٥دا بلاویکردەوە و کۆنگرەی حزبی یەکێتی نیشتمانیش کەوا مامۆستا عبدالفتاح ئیبراهیم سەرۆکایەتی دەکات لەسالی ١٩٤٧دا تەبەنی مافی چارەی خۆنوسینی کرد بۆ گەلی کورد وەك برگەیەك لەپرۆگرامەکەیدا.

حزبی نیشتمانی دیموکراسیش بەردەوام داویکردوە دان بنرێت بەمافە رۆشنبیریی و کارگێریەکانی گەلی کورددا. بەلام دروشمی حوکمی زاتی بەرز نەکردەوە سەرەرای هەلویستە دۆستانەکانی لەبەرامبەر گەلی کوردیداو سەرەرای ئەو ژیربیژی و بوێرییە کە مامۆستا کامل چادرچی هەیبوو سەبارەت بەمەسەلەی کورد بەشێوەیەکی گشتی.

لەو یادداشتەشدا مامۆستا کامل چادرچی سەرۆکی حزبی نیشتمانی دیموکراسی لە ١٢ ئازار ١٩٦٣دا بۆ لایەنە فەرمی و ناوەندەکانی رای بەرزکردەوە لەبارەی کێشەی کوردەوە تێیدا ئەمە هاتووە:

" باشکردنەوەی ئەوەی کە تووشی یەکێتی عێراقی هات و چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردی. بەرژحێکی بابەتیانە ئەرك و مافەکان بۆ نەتەوەکانی تر دەچەسپێنێت.

لەو یادداشتەدا کەوا مامۆستا کامل چادرچی لە ١ حوزەیران ١٩٦٤دا پێشکەشی کرد لەبارەی نیشتمانپەروەرە دیموکراتیەکانەوە بۆ سەرۆك کۆماری عێراقی لەبارەی کوردەکانەوە تێیدا هاتووە:

" لەنمونەی تری هەروەها ئەوەی کە هاتووە لە مادەی -١٩- لەدەستوری کاتی دەقی ئەوەی تێدایە کە ... هەموو هاولاتیان هاریکاری دەکەن بۆ پاراستنی قەوارەی ئەم نیشتمانە- تێشیدا عەرەب و کوردەکان و ئەم دەستورە دان دەنێت بەمافە نەتەوەییەکانیاندا لەچوارچێوەی یەکێتی عێراقیدا.

" دارشتنی ئەم دەقە بەروونی ئەوە دەردەخات کە هاتووە وەك جێبەجێکردنی بەڵێنێك کە دراوە دوای وەستانی شەڕ لەباکور، روونیشە ئەم دارشتنە دان دەنێت بەمافەکانی عەرەب و کورد دا، لەگەڵ ئەوەی کە مافە نەتەوەییەکانی عەرەب لەعێراقدا لەم بۆنەدا جێی باسە نیە - ئەمەش ئەو مەسەلەیە کەوا برا کوردەکانمان بەپاشگەزبوونەوە راڤەی دەکەن لەوەی کە پەیوەندی هەیە بەمافە نەتەوەییەکانیانەوە لەو دارشتنەی کە پێشتر لەدەستوری کاتی ساڵی ١٩٥٨دا هاتووە هەروەها ئەوەی لەبەیاننامەی وەستانی جەنگ لەکوردستان لەم دواییانەدا هاتووە. ئەمە لەکاتێکدا بەڵگەنامە دەستوریەکان لەولاتاندا کەچارەسەری بابەتی مافە سیاسیەکانی نەتەوە جۆراوجۆرەکانی دەکات یەکەم جار چییەتی ئەم مافانە و روخساریان دیاری دەکات و رێگە دیاری دەکات بۆ مومارەسەکردنیان و ئەو دەزگایانە دیاری دەکات کەلەرێگەیەوە نەتەوەکان مومارەسەی مافەکانیان دەکەن لەگەڵ زەمانەتی پاراستنی یەکێتی نیشتمانیدا. بەوشێوەیە تەنها دەقێك کە دان دەنێت بەمافە نەتەوەییەکانی کوردەکاندا گرفتە سەرەکیەکە چارەسەر ناکات و سود نابەخشێت لەچارەسەرکردنی ئەم رەوشە ئاڵۆزەدا. پێشتریش ئەم دروشمە لە ١٤ رەمەزاندا بەرزکرایەوە بەلام دوای چەند مانگێك دەرکەوت کە ئەم دروشمە نەیتوانی رێگە بگرێت لە سەرهەڵدانەوەی جەنگ کە زۆر بەداخەوە بووین بۆی"

بەلام حزبی شیوعی عێراقی لەراپۆرتی لیژنەی ناوەندیدا لە ئازاری ١٩٦٢دا لەم بارەیەوە بریاری دا:

" بۆ دانانی یەکێتی عێراقی لەسەر بنەماگەلێکی رەق و پتەو لەپێناو تێکۆشانی هاوبەشدا لەدژی داگیرکەرو دەرەبەگایەتی و کۆنەپەرستی و بۆ ئەوەی دیموکراسیەت ناوەرۆکە راستەقینەو ئیجابیەکەی ببەخشێت بەنسبەت گەلی کوردیەوە ئەوا ئەنجومەنی دووەمی حزبمان کە لە ١٩٥٦دا بەسترا دانی نا بە حوکمی زاتیدا بۆ هەرێمی کوردستانی عێراق لەچوارچێوەی یەکێتی عێراقی دیموکراتیدا" هەروەها لەراپۆرتی لیژنەی ناوەندیی

حزبی شیوعی عێراقدا لە –ئازار–١٩٦٢ دا لەبارەی حوکمی زاتیەوە هاتووە:

" حوکمی زاتی لەکوردستانی عێراقدا بەرژەوەندیە بنچینەییەکانی گەلی عێراقی و گەلانی عەرەبی و هەموو چینەکانی گەل و تێشیدا بوجوزایەت و دەسەلاتەکەی بەهێز دەکات لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١–پاراستنی کۆماری عێراقی و سەربەخۆیی نیشتمانی و پەرسەندنی دیموکراتی مەحالە دەبێت بەبێ یەکێتی خەباتی هاوبەش لەنێوان عەرەب و کوردەکاندا و ناکرێت ئەم یەکێتی خەباتە بەرپا بکرێت و بەهێز بکرێت تەنها لەسەر بنەمای دیموکراسی و حوکمی زاتی نەبێت بۆ کوردستان. وەگەرنا یەکێتیەکە دەگۆرێت بۆ یەکێتیەکی زۆرەملێیی کە گەلی کوردی بەرهەڵستی دەکات و ئەمەش دەبێتە هۆی روخانی یەکێتی نیشتمانی و بێ توانایی لە روبەڕووبونەوەی داگیرکەرو پیلانەکانی.

٢–گەلانی عەرەبی کە مێژوویەکی هاوبەشیان هەیە و زمانێکی هاوبەش و تایبەتمەندیەکانی تری نەتەوەیان تێدایە ڕازی نابن یەکێتی و یەکگرتوویی لەنێوانیاندا بێتە دی تەنها لەسەر بنەمای دیموکراسی نەبێت و لەبەرچاوگرتنی رەوشی مێژوویی تایبەت بەهەر ولاتێك و کە پێویستە سەرەتا بورجوزایەتی عەرەبی دان بەگەلی کوردیدا بنێت کە نەتەوەیەکی جیاوازە بەتەواوەتی بەهەمان ئەو مافەی کە پێی داوای یەکێتی و یەکبوونی نیشتمانی دەکات لەنێوان هەموو ولاتانی عەرەبیدا.

ئەزمونی کەرتبوونی یەکێتی لەنێوان میصرو سوریادا پێویستە ببێتە وانەیەك بۆ بورجوزایەتی عەرەبی و لەناویشیدا بورجوزایەتی عێراقی و دەرك بەوە بکات کە ئەگەر یەکێتی زۆرەملێیی لەنێوان دوو گەلی عەرەبیدا مومکین نەبێت ئیدی چۆن لەنێو دووگەلی جیاوازدا مومکین دەبێت. ئەگەر گەلێك لەگەلانی عەرەبی مافی یەکگرتنی ئیختیاری هەبێت ئەوا گەلی کوردیش لەعێراق– بەلانی کەمەوە– ئەم جۆرە مافەی هەیە.

فەرامۆشکردنی حوکمی زاتی بۆ کوردستانی عێراق هەڕەشە لە یەکێتی نیشتمانی دەکات لەعێراقداو بوار دەکاتەوە لەبەردەم دوژمنانی برایەتی عەرەبی کوردیداو هانیان دەدات لەسەر کارکردن لەدژی ئەو هێزانەی بڕوایان هەیە بەتێکۆشانی هاوبەش لەنێوان عەرەب و کورددا.

٣–بێبەشکردنی گەلی کوردی لەمافی حوکمی زاتی لەسایەی سستمێکی دیموکراتی و

بەکارهێنانی هێز بۆ سەرکوتکردن تێکۆشانی وا لەکوردستان دەکات، بەتایبەتی لەم ڕەوش و باردۆخەدا، ببێتە شانۆیەکی هەمیشەیی بۆ شڵەژان و پێکدادانە چەکداریەکان کە ئەمەش دەبێتە هۆی دروستکردنی کەلێن بۆ پیلانگێرییە داگیرکەریەکان لەدژی سەربەخۆی عێراق و یەکێتیەکەی و بەلانی کەمەوە دەبێتە هۆی لەدەستدانی سەقامگیریی لەوڵات و شڵەژاندنی ڕەوشە ئابوریەکان و ئاڵوگۆڕی بازرگانی بەتایبەتی بازاڕ و پاشانیش ئاستەنگ خستنە بەردەم پەرەسەندنی ئابوریی و کۆمەڵایەتی و تێشیدا پەرەسەندنی سەرمایەداری ئازادو دەبێتە هۆی زیادبوونی قەیرانی دارایی و خراپی گوزەران و بەپێچەوانەشەوە پێدانی حوکمی زاتی بەکوردستان ئاسۆی فراوان دەکاتەوە بۆ پەرەسەندنی ئابوری و بۆ بەرزکردنەوەی توانا و هێزی دراو و بەدەستهێنانی زۆرێك لە پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوەی ئابوری کەوا خەیرو بەرەکەتی نەك تەنها بۆ گەلی کوردی دەگەڕێتەوە بەڵکو بۆ ئابوری نیشتمانی هەموو عێراقە ( بنەما مەرکەزیەت، کە پێویستە بۆ پەرەسەندنی سەرمایەداریی حوکمی زاتی (هەرێمی) بەسلبی کاری تێناکات بەڵکو جێبەجێی دەکات بەشێوەیەك بەرەو دیموکراتی نەك بیرۆکراتی و بەبێ ئەم حوکمی زاتیشە کەوا کۆبونەوەی سەرمایە نەختیەکان و گەشەکردنی هێزە بەرهەمێنەکان ئاسان دەکات هەروەها گردکردنەوەی ریزەکانی بوجوزایەت و پرۆلیتاریا لەچێوەی دەوڵەتدا، مەحاڵ دەبێت سەرمایەداریی پەرەبسێنت بەئازادی و بەشێوازێکی خێراو لەئاستێکی فراوانتردا، یان بەلانی کەمەوە زۆر زەحمەت دەبێت، چونکە دەستوەردانی بیرۆکراتی گەورەترین ئاستەنگە لەبەردەم پەرەسەندنی ئابوری سیاسیدا" " -لینین-"... تێبینیە ڕەخنەییەکان لەمەسەلە نیشتمانیەکاندا- ".

٤-حوکمی زاتی لەکوردستانی عێراق دەتوانێت یەکێتی کۆمەڵگەی عێراقی پتەو تۆکمە بکات و کۆماری عێراقی بگۆڕێت بۆ دەوڵەتێکی خاوەن متمانە و پشتیوانیکردنی هەموو نەتەوە براکان و کوردستانی عێراق ببێتە ناوەندێکی سەرنج ڕاکێش و لایەنگریەکی گەرم لەلایەن جەماوەری کوردیەوە لەئێران و تورکیا کەهەردوکیان سەر بەپەیمانی سنتۆی دژ بەعێراق و بەوەش بنکەو پێگەی سنتۆ لەق دەبێت و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کوردی بەتێکڕای دەگۆڕێت بۆ هاوپەیمانێکی بەهێز بۆ کۆماری

عێراق لەرووی هەر هەوڵێکی دوژمنکارانەدا کە داگیرکەری سنتۆ پێی هەستێت.
٥-حوکمی زاتی کوردستانی عێراق دەتوانێت سیاسەتی عێراقی عەرەبی بەهێز بکات و کۆماری عێراقی بە هەنگاوی فراوانتر هەستێت بۆ بەهێزکردن و هاریکاریی و یەکێتی لەنێوان ولاتانی عەرەبی ئازادبوودا لەدژی داگیرکەرو زایۆنیزم بەبێ ئەوەی ئەمە مەترسیەکانی نەتەوەی عەرەبی بوروژێنێت.
٦-حوکمی زاتی کوردستانی عێراق هەڵوێستی عێراق بەهێز دەکات لەململانێیدا لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوتدا کە بەهۆی ئەو کەلێنەی هەیە لەنێوان حکومەت و بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردیدا- بەهۆی سیاسەتی حکومەتی نادیموکراسیەوە رەوشێکی گونجاو دەبینێتەوە بۆ فشاربەکارهێنان و دەستوەردان لەکاروباری عێراقدا بۆ فراوانکردنی کەلێن و بۆشاییەکەو وروژاندنی دوژمنایەتی لەنێوان نەتەوەکان و پاشانیش بەدیهاتنی نیاز داگیرکەرانەکانیان.
٧-حوکمی زاتی دژ ناوەستێتەوە لەگەڵ مەرکەزیەتی حوکمداو لاوازی ناکات بەڵکو پێچەوانەکەی تەواو ڕاستەو حوکمی زاتی بۆ کوردستان لەچوارچێوەی یەکێتی عێراقیدا دەبێتە هۆی بەهێزکردنی هەیبەت و قەڵەمڕەویی حکومەتی ناوەندیی و لەسەر بنەماگەلێکی پتەو دایدەمەزرێنێت. بەڵکو ئەوەی کە حکومی ناوەندیی لاواز دەکات بریتیە لەنەمانی مافە دیموکراتیەکان (تێشیدا مافەکانی گەلی کوردی) بریتیە لە شێوازەکانی رق و تورەیی و توندوتیژی و بیرۆکراسیەتی کارگێڕیی. " مادام هەموو نەتەوەکان یەك دەوڵەت پێکدەهێنن ئەوا مارکسیەکان هەرگیز هەوڵنادەن هەستن بە پروپاگەندە بۆ فیدرالیزم و لامەرکەزیەت. بەلاّم ناشێت ئەوە لەبیر بکەین کاتێك بەرگری لە مەرکەزیەت دەکەین، ئەوا بەرگری لە مەرکەزیەتی دیموکراتی دەکەین تەنها. مەرکەزیەتی دیموکراتی نەفی بوونی حوکمی زاتی و ئیدارەی زاتی ناکاتەوە بۆ ئەو ناوچانەی کەخاوەن رەوشی ئابوریی و بژێویی تایبەت و پێکهاتەی نەتەوەیی تایبەتن... هتد بەڵکو بەپێچەوانەوە نمونەی حوکمی زاتی یان ئیدارەی زاتی دەخوازێت.
" ناکرێت وێنای دەوڵەتێکی هاوچەرخی دیموکراسی ڕاستەقینە بکەین بەبێ نمونەی ئەم حوکمە زاتیە یان ئیدارە زاتیە. دەدرێتە ئەو هەرێمەی کە خاوەن تایبەتمەندی ئابوری یان بژێویی جیاواز و تایبەتە یان پێکهاتەیەکی نەتەوەیی تایبەتە...هتد"- لینین هەمان

سەرچاوە-.

٨-" حوكمی زاتی بۆ كوردستانی عێراق پێگەی نێودەوڵەتی كۆماری عێراقی بەهێز دەكات وەك وڵاتێكی دیموكراتی لەڕوانینی گەلان و هێزە پێشكەوتنخوازەكاندا كە ناكرێت هەموو شێوەكانی چەوساندنەوەی نەتەوەیی قەبوڵ بكەن، لەهەمانكاتیشدا حوكمی زاتی پێگەی عێراق لەنەتەوە یەكگرتوەكاندا بەهێز دەكات وەك وڵاتێك كە سنور شكێنی پەیماننامەكانی و بڕیارەكانی ناكات لەبارەی مافی گەلان لەبڕیاردان لەسەر چارەنوسیان و گەلاڵەنامەی مافەكانی مرۆڤ، بەڵكو ڕێزیان لێدەگرێت.

حوكمی زاتی بۆ كوردستانی عێراق لەچوارچێوەی یەكێتی عێراقیدا واتە: داننان بە كوردستاندا وەك هەرێمێكی ئیداری و دەستەیەكی یاسادانانی هەڵبژێراو كاروبارەكانی دەبات بەڕێوە كە لێیەوە دەسەلاتێكی جێبەجێكردن دروست دەبێت كە ملكەچی چاودێریكردنەكانی گەل دەبێت. بەمەرجێك كەمینە نەتەوەییەكان بەشێوەیەكی دادپەروەرانە نوێنەریان هەبێت لەم دوو دەزگایەداو یەكسانی نەتەوەیی و بەهرەمەندبوون لەمافە نەتەوەیی و رۆشنبیرییە رەواكانیان بەتەواوەتی بۆ فەراهەم ببێت". لەهەموو ئەمانەی لەپێشەوە خرانەڕوو دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە هێزە ڕێكخراوەكان لەعێراق لە نەتەوەیی و دیموكراتی و شیوعیەكان، لەعەرەبی و كوردی هاوڕاو كۆكن لەسەر پێویستی گۆڕینی یەكێتی عێراقی ئێستا بۆ یەكێتیەكی ئیختیاری برایانە بەشێوەیەك كە مافە نەتەوەییەكان لەسەر بنچینەی حوكمی زاتی بۆ گەلی كورد فەراهەم بكات و بۆ گەلی عێراقیش ئازادیە دیموكراتیەكانی.

ئەگەر پارتیش شانازی بكات بەوەوە كە یەكەم حزبی دیموكراتی كوردستانیە بانگەشەی كردووە بۆ یەكێتیەكی ئیختیاری لەنێوان هەردوو گەلی عەرەب و كوردی برادا ئەوا دەبێت شانازیش بكات بەوەی كە تێكۆشانەكەی بەرهەمدار بووە و دروشمەكانی كە تێیدا داوای بەرپاكردنی یەكێتیەكی ئیختیاری پێشنیازكراوی كردوە لەسەر بنچینەی حوكمی زاتی بۆ كوردستانی عێراق دەنگدانەوەو پشتیوانیەكی فراوانی لێكراوە لەناوەندەكانی هێزە دیموكراتی و نەتەوەییە عەرەبیەكان.

ئێستا بۆ هەموو هێزە ڕێكخراوەكان لەعێراق رونبۆتەوە پتەوكردنی یەكێتی نیشتمانی بۆ گەلی عێراقی و چەسپاندنی و بوژاندنەوەی دەخوازێت چاوێك بە یەكێتی عێراقی

پێوەلکاندنیدا بخشێنرێتەوە بەسود وەرگرتن لە ئەزمونەکانی ولآتە فرە نەتەوەکان بۆ بونیادنانی لەسەر بنەما دیموکراتیەکان و پاشانیش بەگرەنتی کردنی مافی حوکمی زاتی بۆ کوردستانی عێراق لەچوارچێوەی یەکێتیەکی فیدرالّی عەرەبی دیموکراتی بەپێچەوانەی ئەمەشەوە ئەوا هەوڵەکانی بەردەوامی پێدانی نمونەی ئەم یەکێتیە بەزۆر پێوەلکاندنە عێراقیە بنەماکانی یەکێتی نیشتمانی هەڵدەوەشێنێتەوەو هەڕەشە لە مانەوەی خودی یەکێتی پێوەلکاندیش دەکات. بۆ مانەوەی عێراقی ئێستا بەیەکگرتووی پێویست دەکات کە دان بەحوکمی زاتیدا بنرێت بۆ کوردستانی عێراق. لەچوارچێوەی کۆمارێکی دیموکراتی عێراقیدا، کۆماری عەرەب و کوردەکان و کەمینەکان.

بڕیارەکانی لیژنەی ناوەندی حزبی دیموکراتی کوردستان هەتا دوای راگەیاندنی شۆڕشی کوردی لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦١- جەخت لەڕاستیەکان دەکاتەوە کە باسکران لەو بڕیارانەدا سەبارەت بەیەکێتی عێراقی و ئەمانەی خوارەوەی تێدا هاتووە:

" کارکردن لەپێناو پاراستنی یەکێتی عێراقی ڕاستگۆیانەو مانەوە لەچوارچێوەی یەکێتی عێراقی کە مافەکان و ئازادیە دیموکراتیەکان بۆ جەماوەری هەردوو گەلی عەرەبی و کوردی فەراهەم بکات لەسایەی سستمێکی دیموکراتی پەرلەمانی دروست مومارەسەی سیاسەتێکی دەرەکی نیشتمانی بکات دژ بەجەنگ و داگیرکەر، حزبیش نمونەی بوونی ئەم دەوڵەتە بەمەرجێکی جەوهەری دادەنێت بۆ بەردەوامی دان و پەرەسەندنی یەکێتی عەرەبی کوردی و پتەوکردنی یەکێتی عێراقی ڕاستگۆیانە".

" سوربوونی حزب لەسەر پاراستنی یەکێتی عێراقی و گرەنتی ئەوەی گەلی کورد بەمافە نەتەوەییەکانی شاد بێت بەشێوەیەکی تەواوەتی لەلایەك و فەراهەمکردنی پێداویستیەکانی بەردەوامی دان بەم یەکێتیە لەلایەکی ترەوە، لەژێر ڕۆشنایی ئەزمونەکانی گەلەکەمان کە نزیك دەبێتەوە لەسێ ساڵ و نیو لەژیان لەسایەی کۆمارێکی دیموکراتی و ئەزمونەکانی گەلانی تر هەموو ئەوەش داوامان لێدەکات پەیوەندیە کوردی و عەرەبیەکان ڕێکبخات و دیاریان بکات لەسەر ئەو شێوازەی لەو ولآتانەدا لەسەری دەڕۆن کە زیاد لەنەتەوەیەك لەسایەیاندا دەژین. ئەوەش بە دانان بە مافی حوکمی زاتیدا بۆ گەلی کوردی (ئۆتۆنۆمی) لەچوارچێوەو سنوری کۆماری عێراقی کۆماری عەرەبی کوردیدا.

